


له بڵاوكراوەكانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی
(٣٦)




# چەند نیگایەك بۆ
# هزری ئیسلامیی


دكتۆر سەباح بەرزنجی


چەند نیگایەك بۆ
هزری ئیسلامیی


٢٠١٦
rawsht


بەرەبەیانی ئاینی ئیسلام لەو پنتە مێژووییەوە سەریهەڵدا كە تاكی مسوڵمان (اقرأ)ی كردە دروشم و لە بیركردنەوەی ئامانجدارەوە بەرەو پراكتیزەكردنی چەمكە ئیمانیی و مەعریفییەكان هەنگاوینا و پاشان لە سایەی تیگەیشتنی ژیربیژانە درێژەیدا بەو بزاڤە فیكرییە ئینسانییە،كە بە پێودانگیی ئێستا بزاڤێكی سەروو نەتەوەیی و سەروو جوگرافیی و سەروو مەزهەبی بووە. لەم رووەوە ناكرێت قسە لەسەر هزر بكرێت بەبێ رەچاوكردنی ئەو رۆڵە جومگەیی و بنەرەتییەی هزر لە پیكهاتنی مرۆڤدا دەیبینێت.





# چەند نیگایەك
# بۆ هزری ئیسلامیی

دکتۆر سەباح بەرزنجی

# چەند نیگایەك بۆ هزری ئیسلامیی

......................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لیکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٣٥)

- نووسینی: دکتۆر سەباح بەرزنجی
- بابەت: بیری ئیسلامیی
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- چاپی یەکەم: چاپخانەی سڤان

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٢٦٤)ی ساڵی ٢٠١٦ پێدراوە

# ناوەرۆك


| | |
|---|---|
| پێشەكی ........................................ | ٥ |
| چەند نیگایەك بۆ هزری ئیسلامی ........................ | ٩ |
| سەرچاوەكانی هزری ئیسلامی ........................ | ١٥ |
| پایەكانی هزری ئیسلامی ........................ | ٢١ |
| بنەماكانی هزری ئیسلامی ........................ | ٣٣ |
| ئازادی بیروڕا لە هزری ئیسلامییدا ........................ | ٧٥ |
| هزری ئیسلامی و یەكتاپەرستی ........................ | ٩٣ |
| پەیوەندیی نێوان ئازادیی مرۆڤ و پێغەمبەران لە هزری ئیسلامییدا | ١١١ |
| هزری ئیسلامی لە وەڵامی هەندێك ڕەخنەدا ........................ | ١٢٧ |
| هزری ئیسلامی ئیعجازی قورئان ڕووندەكاتەوە ........................ | ١٤٩ |
| مافی مرۆڤ و دیدی ئیسلامی ........................ | ١٦٩ |
| تایبەتمەندییەكانی مافی مرۆڤ لە ئیسلامدا ........................ | ١٨٩ |
| مافی مرۆڤ لە ئیسلامدا ........................ | ٢٠٩ |
| مافی جیاوازیی (حق الاختلاف) ........................ | ٢٣١ |

هۆیەکانی جیاوازی ........................................ ٢٤٩
ڕۆڵی زانایان لە ڕیفۆرم و بانگکردنی خەڵکدا ............ ٢٦٧
هۆکارەکانی لادان و گەندەڵی و تێکچوونی ژیانی کۆمەلآیەتی ..... ٢٨٣
مسوڵمان پێویستە چی بزانێت؟ ................................ ٣٠٤
فیقهی مەعریفە ........................................ ٣٢٣
بیردۆزی دژایەتیی شارستانییەتەکان (سامویل هەنتینگتن) ........ ٣٤٥
ئۆپۆزسیۆن لە فیقهی ئیسلامییدا ........................... ٣٦٥
ڕاگەیاندنی ئیسلامی و فەلسەفەی ڕاگەیاندنی ئیسلامی ........... ٣٨٣
ئەرکی مرۆڤ لە دیدی ئیسلامەوە .............................. ٣٩٩
ڕێگاکانی چەواشەکردنی هزریی ................................ ٤٥١
تیۆری ئاکارو ڕەوشتی ئیسلامی .............................. ٤٨٨

بەناوی خوداوەندی بەخشندە ومیهرەبان

# پێشەکی

دیرۆکی هزر سەرەتای هەیە و کۆتایی نییە ، لەو ساتە وەختەوە کە مرۆڤـ پێی ناوەتە سەرزەوی و بیری لە خۆی و ئەفرێنەر و دەوروبەری کردۆتەوە، داستانی هزر دەستپێدەکات و قۆناغ بە قۆناغ شانبەشانی پێشکەوتنی رەوتی ژییان و ژییار گەشەیکردووە و پەرەیسەندووە و مرۆڤی ئاراستەکردوە بەرەو ئاوێتەبوون لەگەڵ بوون و گەردوون. هەربۆیە مرۆڤ پێش ئەوەی کائینێکی کارا بێت کائینێکی بیرمەندە، بیر دەکاتەوە و نەخشەدادەرێژێت ئەوسا کاروچالاکی دەنوێنێت. هەموو داهێنان و ئەفراندنێکیشی بەستراوە بە کارایی هزر و نەخشەکێشانی بیر و لۆجیکەوە. بوونی سیستمێکی هزریی گونجاو توخمیسەرەکیی و پێشمەرجی بەخۆداهاتنەوە و پێشکەوتنی مرۆڤە لە هەر ئاستێکدا بێت و هەڵەین ئەگەر پێمان وابێت بە بێ بیرکردنەوەی ئامانجدار و سیستماتیك دەتوانین روو لە بەرزایی و دوندەکانی داهێنان و مەدەنییەت بکەین. بەرەبەیانی ئاینی ئیسلام لەو پنتە مێژووییەوە سەریهەڵدا کە تاکی مسوڵمان (اقرأ) ی کردە دروشم و لە بیرکردنەوەی ئامانجدارەوە بەرەو پراکتیزەکردنی چەمکە ئیمانیی و مەعریفییەکان هەنگاوینا و پاشان لە سایەی تیگەیشتنی ژیربێژانە درێژەیدا بەو بزاڤە

فیكرییە ئینسانییە, كە بە پێودانگیی ئیستا بزاڤێكی سەروو نەتەوەیی و سەروو جوگرافیی و سەروو مەزهەبی بووە. لەم رووەوە ناكرێت قسە لەسەر هزر بكرێت بە بێ رەچاوكردنی ئەو رۆڵە جومگەیی و بنەرەتییەی هزر لە پیكهاتنی مرۆڤدا دەیبینێت.

هزر دەبێتە خۆراكی رۆح و هەوێنی مەعریفە و بنەمای عیرفان. بە بێ هزر و پرۆسەی بیركردنەوەی ئامانجدار مومكین نییە هیچ بزاڤێكی سیاسی و ئاینی دەستپێبكات و بەردەوامبوونیشی وابەستەیە بە كارایی هزر و ئەندیشەوە.

ئەم پەراوەی بەردەستتان سەبارەت بە هزری ئیسلامیی هەوڵدانێكی بەرابیە بۆ تیشكخستنە سەر چەند بابەتێكی گرنگی ئەو بوارە و بەرهەمی زنجیرە وتارێكی تەلەفزیۆنییە كە لە كەنالی ئاسمانیی پەیامەوە لە ساڵەكانی ٢٠٠٩-٢٠١٠ پیشكەشكراون، دوای خستنە سەركاغەز و پیاچوونەوە و دارشتنەوە ویستمان بیكەینە دیارییەك بۆ كتێبخانەی كوردیی بەو هیوایەی كە مایەی رەزامەندیی خویندەواران و خویندكارانی كوردستان بیت. لەم باسانەدا هەوڵدراوە دەروازەیەك بۆ هزری ئیسلامیی بە زمانێكی گشتی بكرێتەوە. بەدوور لە زمانی ئالۆزیی فەلسەفی و تەكنیكی. ئەگینا دەكرێت ئەم باسانە بە شێوازێكی تایبەتمەند بنووسرێت و پسپۆرییەكی زیاتری تێدا بەكاربێت. بەڵام مەرج نییە زمانی هزر هەمیشە تایبەتمەند و پێویستی بە زاراوەسازیی و قووڵكردنەوە بێت. ویستراوە بابەتەكان وەكوو خۆی و بەبێ دەستكاریی ریشەیی بڵاو بكرێنەوە بۆ ئەوەی شایەتێك بن لەسەر ئەو قۆناغەی كاری

هزروانیی کە رەنگە ئێستا گۆشەنیگای نوێ هاتبێتە کایە و هەندێك لەو چارەسەرانەی جاران تەجاوز کرابن و چارەسەری باشتری بۆ دۆزرابنەوە.

سەنتەری زەهاویی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی بڕوای تەواوی بە ڕێخۆشکردنی هزری بۆ گرووپی بەئامانجکراو هەیە بەتاییەت بۆ خویندکاران و فێرخوازانی زانکۆ و پەیمانگاکان کە بتوانن هەندێك لە بابەت و بنەماکانی هزری ئیسلامیی وەربگرن.

ئەم بابەتانە وەکوو سەرەتایەك بۆ زۆر لە خوێنەرانمان رەنگە دووبارە و چەندبارە بن.بەڵام بۆ زۆرێك لە لاوانی کورد تا ئەندازەیەك نوێن.

هیوادارین ئەم بەرهەمە بە کۆی باس و بابەتەکانی وەڵامی هەندێك لە پرسیارە هزرییەکانی دابێتەوە یان لانی کەم تەکانێك بدات بە زیهن و بیرەکان بۆ گەڕانی بەردەوام بە دوای وەڵامی وردتر و بە پێزتر بۆ ئەو پرسانە ، کە لەمێژە ئەوانی سەرقاڵ کردووە و هەنووکەش وەڵامی زیاتر و پڕتری گەرەکە.

کاروانی هزر کاروانێکی فرە رەهەند و فرە رەوتە بۆیە چاوەروانی بەدواداچوون و توێژینەوەی زیاترین لە رێبوارانی هاوکار و خۆشەویستمان.

جێی خۆیەتی لە سەروبەندیی نووسینەوەو ئامادەکردنی ئەم بەرهەمەدا سوپاسی ئەم بەرێزانە بکەم کە رۆلی کاریگەریان لە ئامادە کردن و نووسینەوەو دارشتنەوە و پیاچوونەوەیدا کردوە:

ـ برایانی کەناڵی ئاسمانی پەیام بەشی بەرنامەکان و ئەرشیف.

ـ برایانی سەنتەری زەهاوی کە ئەرکی چاپ و بلاو کردنەوەیان خستە سەرشانیان.

ـ کاك هیمن زەرایەنی و کاك مەسعوود ئارووزەری کە ئەرکی پیادەکردنی سیدییەکانیان گرتە ئەستۆ.

ـ کاك کۆسار بەرزنجی کە بە نووسینەکەدا چوویەوە و جوانتر دایڕشتەوە.

ـ کاك د. حسین محمد ئیبراهیم کە سەرپەرشتی قۆناغەکانی چاپی کرد.

هیواداریین خوینەرانی هێژا بە چاوی وردبین و سەرنجە زانستییەکانیان هاوکارمان بن بۆ راستکردنەوە و بە پیز کردنی ئەم جۆرە باسانە بۆ چاپەکانی دواتر و بۆنەکانی دیکە کە لە هەواری هزری ئیسلامییدا کۆدەبینەوە.

# چەند نیگایەك بۆ هزری ئیسلامی

## دەروازەیەك بۆ هزری ئیسلامی

پێویستە سەرەتا دەروازەیەك بکەینەوە بۆ چوونە نێو هـزری ئیسلامی، چونکە هـزری ئیسلامی بوارێکی زۆر فراوان و قووڵە، سەرەتای هەیە و بێکۆتایە، دەتوانین خاڵێکی بۆ دەستنیشان بکەین و بڵێین لێرەدا دەستپێدەکات، بەڵام ناتوانین خاڵێك دەستنیشان بکەین بۆ کۆتاییەکەی، دیارە ئەمەش بە پێی توانای خۆمان و ئەو خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی لەو بارەوە کردوومانە و دەرەنجامی خوێندنەوەمان بۆ بەرهەمی زانایان و بیرمەندان.

پێش ئەوەی بڕۆینە ناو درێژەی بابەتەکەوە پێویستە پێناسەیەکی هـزری ئیسلامی بکەین، تا ئاسۆیەك و وێنایەکمان لەسەر ئەو بابەتە هەبێت. تا بزانین مەبەست چییە لە هـزری ئیسلامی.

## هـزری ئیسلامی:

ووشەی (هـزر) وەرگێڕدراوی ووشەی (فکر)ە لە زمانی عەرەبیدا. فیکر لە سەرچاوەکانی زمانی عەرەبیدا بە چەندین شێوە مانا کراوە،

یەکێك لە ماناکانی ئەوەیە کە (ئیبن مەنظور) خاوەنی[١] فەرهەنگی (لسان العرب) باسی دەکات و دەڵێت: (إعمال الخاطر في شيء) واتە مرۆڤ ئەگەر خەیاڵ و بیری بەکارهێنا بۆ هەر شتێك، ئەوە بیری کردۆتەوە و هـزری بەکارهێناوە.

(سیبەوەیهی[٢]) دەڵێت: (فیکر مانایەکی ئەوەندە قووڵی هەیە کە ناتوانیت کۆیبکەیتەوە)، چەند چەمکێکی وەك (فكر، علم، فهم) ناتوانین کۆیانبکەینەوە بڵێین (کۆمەڵە فیکرێك) (یان کۆمەڵە عیلمێك)، لەبەر ئەوە دەڵێت: فیکر لەو ووشانەیە کە کۆناکرێنەوە. بەڵام زاناکانیتر لەم بابەتەدا لەگەڵ (سیبەوەیهی)دا نیین، (ئیبن دورەید) دەڵێت (دەتوانیت کۆیبکەیتەوە بڵێیت "أفكار"، علم کۆبکەیتەوە بە"علوم"، فهم کۆبکەیتەوە بە "أفهام" یان "فهوم")، ئەوە بابەتێکی زمانەوانییە کە ئێمە تەنها ئاماژەیەکمان پێدا.

کە دەڵێین (هـزری ئیسلامی) واتە هەر کاتێك مسوڵمانێك لە ڕێگەی بۆچوونی زانا مسوڵمانەکانەوە بیر و سەرنجی خۆی بەکارهێنا و قووڵبوویەوە لە بابەتێکدا، پاشان ئەم بیرکردنەوە و قووڵبوونەوەی

---

[١] ـ ابن منظور(١٢٣٢ ـ ١٣١١م) ابوالفضل جمال الدين محمد بن مكرم الافريقي، زانای بواری مێژوو و زمان و ڕێزمانی عەرەبی بووە و دەستێکی باڵای هەبووە لە کورتکردنەوەی پەرتووکە درێژەکاندا بەشێوەیەکی زانایانە.

[٢] - سيبويه ابو بشر عمرو بن عثمان بن قنبر البصري(٧٦٠ ـ ٧٩٦م) لە شیراز لەدایکبووە و لە بەسرە گەورەبووە، یەکێکە لە پێشەوایانی زانستی (نەحو و صەرف) لە ڕێزمانی عەرەبیدا، خاوەنی پەرتووکی بەناوبانگی(الكتاب)ە کە سەرچاوەیەکی گرنگی ڕێزمانی عەرەبییە. ئیبن نەدیم دەڵێت: پەرتووکی وەها گرنگ پێش سیبەوەیهی نەبووە و پاش ئەوەیش دانانرێت.

کۆکردەوە و نوسییەوە، ئەوە پێیدەوترێت هـزری ئیسلامی، بەڵام ئەو هـزرە چۆن دەبێت بە هـزری ئیسلامی و دەتوانین ناوزەدی بکەین بە هـزری ئیسلامی؟ ئایا هەندێك پێوەر (معیار)ی هەیە بۆ ئەوەی کە هـزرێك بە ئیسلامی بزانین؟

لە ڕاستیدا ئێمە دەتوانین فیکرێك بە ئیسلامی بزانین کە بنەماکانی ئیسلامی بێت. بنەمای یەکەمیش بریتییە لە یەکخوداپەرستی، وە ئامانجی ئەو فیکرەش بریتی بێت لە ئامانجەکانی ئیسلام، واتە لە لایەنە ئیسلامییەکانەوە دەستپێبکات و لە ئامانجە ئیسلامییەکاندا گەشە بکات، لەبەر ئەوە فیکری ئیسلامی لەگەڵ ئەوەشدا کە ئاڵۆزە بەڵام بە پێی ئەو پێوەرانەی کە دیاریمان کرد دەتوانین جیای بکەینەوە لە هـزری نائیسلامی. کاتێك دەوترێت هـزری (شێخ محەممەد غەزالی[١]) یان (شێخ سەعید نورسی[٢]) یان (عەباسی مەدەنی[٣]) هـزرێکی ئیسلامییە

---

[١] - محمد الغزالی(١٩١٧ ـ ١٩٩٦م) بیرمەندی گەورەی میسری و ناسراو لە جیهانی ئیسلامدا، خاوەنی گەلێك پەرتووکی بە سوودە لەبواری هـزری ئیسلامی و دژایەتیکردنی توندڕەویدا.

[٢] - سەعید نورسی(١٨٧٧ ـ ١٩٦٠م) نووسەر و زانای کورد، لە باکوری کوردوستان لەدایکبووە، پێشەوایەکی گەورەی چاکسازی ئاینی و کۆمەڵایەتی سەدەی بیستەم بووە، ئێستاش نووسینەکانی کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر خوێنەرانی هەیە و وەرگێڕراون بۆ سەر زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان.

[٣] عباس مدنی(١٩٣١م) لەجەزائیر لەدایکبووەو لەسەرەتای لاویەتییەوە بەشداربووە لە خەباتی ڕزگاریخوازی جەزائیردا، چەندینجار لەو پێناوەدا زیندانی کراوە، دکتۆرای لە پەروەردەی بەراوردا وەرگرتووە و پاشان دکتۆرای دووەمی لە پەروەردەدا لە بەریتانیا وەرگرتووە، دامەزرێنەری (الجبهة الاسلامیة للانقاذ)ی جەزائیرە کە لە هەڵبژاردنی ١٩٩١م دا زۆرینەی بەدەستهێنا، بەڵام سوپای جەزائیر ئەنجامی هەڵبژاردنەکەی هەڵوەشاندەوە.

یان کەسێکی وەك (شێخ محەممەدی خاڵ[1]) یان (مەلای گەورەی کۆیە[2]) ئەمانە هـزرێکی ئیسلامییە..هتد، میلاکمان چییە بۆ ئەوەی ئەوان نوسیویانە؟

پێوەرمان ئەوەیە کە لە ڕوانگەی یەکتاپەرستییەوە دەستپێدەکەن، کە ئەم بوونە خوایەکی تاك و تەنها و بەدیهێنەر بەڕێوەی دەبات، ئامانجەکانیشیان ئەوەیە کە پەروەردەی تاك و کۆمەڵ بکەن لەسەر یەکتاپەرستی، دەستی تاك و کۆمەڵ بگرن بەرەو ئەو بەها گەورانەی کە ئیسلام خەڵکی بۆ هاندەدات، وەك دادپەروەری، دەست و داوێنپاکی، ئازایەتی و جوامێری، یارمەتیدان و خۆنەویستی...هتد، ئەمانە هەموو ئەو بایەخانەن کە بانگەوازی پێغەمبەران هەموویان لە پێناوی چەسپاندنیان هەوڵیانداوە لە واقیعدا، کەواتە بە کورتی دەتوانین بڵێین هـزری ئیسلامی بریتییە لە: (کۆی بەرهەمی زانا مسوڵمانەکان بە درێژایی مێژوو لە بوارە جیاجیاکانی وەك بیرو بڕوا، سیاسەت، کۆمەڵایەتی، یاسادانان، ئابوری، پەروەردە و فێرکردن، ئەدەبیات و

[1] - شێخ محمدی خاڵ(١٩٠٤ ـ ١٩٨٩م) زانا و نووسەر و فەرهەنگنووس و خاوەن تەفسیری قورئان بە زمانی کوردی، یەکێکە لە کەسایەتییە دیارەکانی کورد لە سەدەی بیستەمدا. تەفسیری خاڵ و فەرهەنگی خاڵ لەدیارترین نووسینەکانیەتی. هەڵگری هـزری نەتەوایەتی مسوڵمانانە و هاوچەرخ بووە، لە گەلێك شوێنی باشووری کوردستاندا ئەرکی باڵای دادوەری وەرگرتووە.

[2] - مەلای گەورەی کۆیە(١٨٧٦ ـ ١٩٤٣م)، زاناو بیرمەندی نوێخوازی کورد، لە کۆیە لە باشووری کوردوستان لەدایکبووە و خاوەنی تەفسیری قورئانە بە کوردی، دژی نەزانی و نەخوێندەواری خەباتی بەردەوامی هەبووە، لەسەرەتای دانانی قوتابخانەی نوێدا کچی خۆی ناردووەتە قوتابخانە.

هونەرەجوانەکان)، کەواتە بەم پێناسەیە ئێمە دەتوانین ڕەگەزەکانی هـزری ئیسلامی دیاری بکەین:

**ڕەگەزی یەکەم:** بوونی بیرمەند و هـزروانی ئیسلامی، کەسانێك کە بیربکەنەوە و کەسانێك کە ڕێگە بدەن بە خۆیان بیربکەنەوە و پرسیار بکەن و وەڵام بۆ پرسیارەکانیان بدۆزنەوە کە بوونی مرۆڤی بیرمەندە.

**ڕەگەزی دووەم:** بریتییە لەو بوارانەی کە هـزروان (مفکر)ەکە کاری تیادا بکات، کە دەبێت ئەو بوارانە هەبن ئەوانیش بریتیین لە هەموو ئەو بوارە زیندووانەی کە ئێستا لە دونیادا پەیمانگا و زانکۆ و لقوپۆپی زانستییان لێکراوەتەوە کە گرنگترینیان لایەنی بیروباوەڕە(عقیدە) و جیهانبینییە، دۆزینەوەی پرسیارەکانی جیهان بریتییە لە چی؟ جیهان چۆن دروستبووە؟ بۆ دروستبووە؟ بەرەو کوێ دەچێت؟ کێ ئەم جیهانە بەڕێوە دەبات؟ کێ ئەو یاسایانەی داناوە کە ئەم جیهانە بەڕێوە دەبەن؟ ڕەگەزی دووەم بوارەکانی هـزرە، لە پێناسەکەشدا ئاماژەی تێدایە بۆ سەرچاوەکانی هـزر کە دەتوانین لە دوو شتدا کورتی بکەینەوە:

**یەکەم:** دەقە شەرعییەکان یان دەقە ئاینییەکان.

**دووەم:** واقیعی ژیان. بەو مانایەی پێویستە کۆمەڵە دەقێك هەبن ئێمە لەو دەقانەوە بۆچوونمان بۆ دروست ببێت لەسەر ژیان.

هەروەها دەبێت واقیعێکیش هەبێت کە لە ڕوانگەی ئەو دەقانەوە سەیری ئەو واقیعە بکەین، لە ڕوانگەی ئەو دەقانەوە ئەو واقیعە هەڵسەنگێنین، ئینجا پەنجە بخەینە سەر گیروگرفت و کێشەکانی ئەو

واقیعه و له ڕوانگەی دەقەکانەوە بگەڕێینەوە و بزانین چارەسەری ئەو کێشانە چۆن دەبێت.

کەواتە پەیوەندیی ئاڵوگۆڕ لە نێوان دەقەکان و واقیعدا هەیە و کاری کەسی هـزروان ئەوەیە کە ئەو پەیوەندییە ڕوونبکاتەوە و باسی ئەو پەیوەندییە بکات، واتە ئەگەر ئێمە واقیعێکی سیاسییمان هەبوو ئەوە پێویست بەوە دەکات لە دەقەکانەوە دەریبهێنین بۆ ئەو واقیعە سیاسییە، یان کۆمەڵێك دەقی سیاسییمان هەبوو ئەوا بە دوای زەمینەیەکدا دەگەڕێین کە ئەو دەقە سیاسییانەی تیادا پراکتیزە بکرێن و جێبەجێ بکرێن، کەواتە کاری هـزروان ئەوەیە لە ئەنجامدا فیکری ئیسلامی دەبێت بە چی؟ لە ڕوانگەی دروستکردن و ڕونکردنەوە و دەستنیشانکردنی ئەو پەیوەندییانەی کە هەیە لە نێوان دەقەکان و واقیعدا.

# سەرچاوەکانی هزری ئیسلامی

ئێمە دەتوانین سەرچاوەکانی هـزری ئیسلامی کورتبکەینەوە لە سێ جۆر سەرچاوەدا:

**سەرچاوەی یەکەم:** سرووش (وەحی)، ئەو وەحییە چ قورئانی پیرۆز بێت کە پێیدەوترێت وەحی ڕاستەوخۆ، پێشیدەوترێت وەحی (متلو - خوێنراوە)، لەگەڵ وەحی ناڕاستەوخۆ کە پێیدەوترێت سوننەتی پێغەمبەر (د.خ).

**سەرچاوەی دووەم:** بریتییە لە تێکۆشان و هەوڵدانی زانا مسوڵمانەکان، واتە زانا مسوڵمانەکان کاتێك کە ڕووبەڕووی واقیع دەبنەوە لەملاوە هەگبەیەك لە قورئان و سوننەیان لەبەردەستایە، دێن ڕاڤەی دەقەکان دەکەن و وەڵامی پرسیارەکان دەدەنەوە، لە ڕاستیدا دەبن بە پردێك لە نێوان واقیعەکان و ڕاستییەکەدا، لە نێوان دەقەکان و گەلدا، کەواتە کار و بەرهەمی زانا مسوڵمانەکان سەرچاوەی دووەمە، جا ئەگەر زانا مسوڵمانەکان پێکەوە ڕێککەوتبوون لەسەر بۆچوونێك ئەوە پێیدەوترێت (إجماع)، ئەگەر ڕێکنەکەوتبوون لەسەر بناغەی بنەمایەك لە بنەما مەعقولەکان چ ئەو بنەمایە بەرژەوەندی بێت یان لەسەر بنەمای بەراوردکردن بێت، ئەوە پێیدەوترێت (اجتهاد)، کەواتە سەرچاوەی دووەم بریتییە لە (إجماع)و (اجتهاد).

**سەرچاوەی سێهەم: بریتییە لە ئەزمونی مرۆڤایەتی بە گشتی:**

زاناکان، بە گشتی، شتێك بەرهەمدەهێنن کە پێیدەوترێت ئەزمونی مرۆڤایەتی، ئەزمونی مرۆڤایەتی ئەوەیە کە ئێستا ئێمە ڕێگەمان پێدراوە سوود وەربگرین لە هەر شتێکی بە کەڵك، گەرچی لە گەلانی نامسوڵمانیشەوە هاتبێت، ڕەنگە لە بواری تەکنەلۆجیا یان ئابوریدابێت، لەوانەیە لە بواری پەروەردەییدا بێت، واتە فیکری ئیسلامی لە ڕاستیدا فیکرێکی کراوەیە، فیکرێك نییە داخرابێت لەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامی، واتە ئیسلام ڕێی نەگرتووە لە حیکمەت و سوودەکانی مرۆڤایەتی بە گشتی، لەبەر ئەوە ئێستا دەبینین زانا مسوڵمانەکان بەو عەقڵییەتەوە بە جیهاندا بڵاودەبنەوە کە سوود لە زانستی خۆرهەڵات و خۆرئاوا وەربگرن و بە ڕۆڵێکی ئیجابیانە هەستن لە کۆی ژیانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییدا.

کەواتە سەرچاوەکانی هـزری ئیسلامی کورتنەکراونەتەوە لە سەرچاوەکانی ئیسلامدا، بەڵکو سەرچاوە مرۆڤایەتییەکانیش دەگرێتەوە، بۆ نموونە دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب (ر.خ) بۆ بەڕێوەبردنی تۆماری وولاتەکەی، ڕێگەیدا تۆمارەکان بە زمانی فارسی بێت، تا سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان[١]

---

[١] عەبدولمەلیکی کوری مەروان ( ٦٤٦ ـ ٧٠٥م) یەکێکە لە خەلیفە ئومەوییەکان کە لە نێوان(٤٠ ـ ١٣٢ك)دا فەرمانڕوای جیهانی ئیسلامی بوون. لە سەردەمی ئەودا بزووتنەوەی وەرگێڕان لە زمانە گرنگەکانی ئەو سەردەمەوە لە بوارەکانی زانست و ئەدەب و فەلسەفەدا گەشەی کرد و زانا و بیرمەندان و وەرگێڕانی جیهان روویان لە دیمەشقی پایتەخت کرد.

دۆسیەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بە زمانی فارسی بوو، دراوی ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی دراوی فارسی بوو یان دراوی ڕۆمی بوو، بەڵام لە سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕواندا هەستیان کرد خۆیان دەتوانن بە شێوەی متمانەدار ئەو دراوە لێبدەن و دۆسیە و تۆمارەکانیشیان کرد بە زمانی عەرەبی، کەواتە ئەمە سوودوەرگرتنە لە ئەزموونی مرۆڤایەتی، یان (جەمالەددینی ئەفغانی) کاتێك چووە خۆرئاواو بەو شارستانییە ئاشنابوو، بۆی دەرکەوت یەکێك لە ڕێگەکانی هۆشیارکردنەوە و بێدارکردنەوە و هاندانی خەڵك بریتییە لە ڕۆژنامەگەری، لەبەر ئەوە یەکەم کار کە کردی دەیوت: با لە ڕێی ڕۆژنامەوە خەڵکی فێری بابەتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانیان بکەین، پێش ئەوە هیچ پێشینەیەك نەبوو کە زانا مسوڵمانەکان سوود لە ڕۆژنامە وەربگرن، ئێستاش کە سەیر دەکەیت سەردەم سەردەمی کرانەوە و تەقینەوەی زانیارییە، زانا مسوڵمانەکان پێش هەموو کەس هانی مسوڵمانان دەدەن بۆ ئەوەی کە لەو بوارەدا ئەسپی خۆیان تاوبدەن، کەواتە سەرچاوەکانی هـزری ئیسلامی بریتین لە:

١. قورئان و سوننەت (الكتاب والسنه) کە ئەمە (وەحی)یە.

٢. کۆدەنگی و ئیجتیهاد (الاجماع والاجتهاد) کە کۆششی مسوڵمانان خۆیانە.

٣. ئەزمونی مرۆڤایەتی لە هەموو بوارەکانی زانست و تەکنەلۆژیادا، چ زانستە مرۆییەکان بێت چ زانستە سروشتییەکان بێت. واتە ئێمە دەتوانین سوود ببینین لە زانستەکانی یاسا و سیاسەت و ئابوری و

بەڕێوەبردن...هتد، ئەزموونی هەموو ئەوانەی کە لە بوارە مرۆییەکاندا کاریانکردووە بیهێنین لە مزگەوتەکان و ناوەندەکانی خوێندن و زانکۆکاندا بخوێنرێن، زانستە سروشتییەکانیش بخوێنین.

ئێمە کە سەیری مێژووی پرشنگداری ئیسلام دەکەین لە سەدەکانی پێشوودا زانا گەورەکانی وەك (پێشەوا شافعی و ئەحمەد و ئیبن حەزم و...هتد) دەبینین کە هیچ کۆت و بەندێکیان لەسەر قوتابیانی خۆیان دانەناوە کە بڵێت ئێوە هەر دەبێت ئەم زانستە بخوێنن، بەڵێ بە پلەی یەکەم گرنگییان داوە بە زانستی شەرعی، بەڵام ڕێگەی ئەوەیان لێنەگرتوون کە زانستی پێشووش بزانن، واتە زانستی یۆنان و فارس و میسرییەکانیشیان زانیوە، چونکە لە ڕاستیدا زانست میراتی هەموو مرۆڤایەتییە و بە هەمانشێوە هـزریش میراتی هەموو مرۆڤایەتییە، وەك لە پێناسەکەشدا ئاماژەمان پێدا لە بوارەکانی (بیروبڕواو سیاسەت و یاسادانان و ئابوری و پەروەردەو..هتد)، بۆشمان دەردەکەوێت کە هـزری ئیسلامی یەك مانای هەیە بەڵام جۆرو لقوپۆپی هەیە، بۆ نموونە ئێمە هـزری ئیسلامییمان هەیە تەرکیز دەکاتەسەر بڕوا (هـزری بڕوایی، هـزری سیاسی، هـزری کۆمەڵایەتی، هـزری پەروەردەیی، هـزری ئەدەبی، هـزری هونەری)و زانا مسوڵمانەکان زۆر بە چاکی ئاوڕیان لێداونەتەوە، کە سەیر دەکەیت لە هەر بوارێکدا ئێمە سەدان و هەزاران پەرتووكو لێکۆڵینەوە شیکردنەوە و لێکدانەوەمان هەیە.

تێبینی بکەن یەکەم پەرتووکێك کە لە مێژوودا لە بواری پزیشکییدا نووسرابێت (القانون)ی (ئیبن سینا[1])یە کە تا سەدەکانی (١٧)ش لە ئەوروپا وەك مادەیەکی خوێندن و سەرچاوەیەکی بڕواپێکراو بووە لە کۆلێژە پزیشکییەکاندا، لە راستیشدا ئەو پەرتووکەی ئیبن سینا دەچێتە نێو هـزری ئیسلامییەوە لە بورای پزیشکییدا.

یەکێك لە شاکارەکانی (فارابی) کە فەیلەسوفێکی مسوڵمان بووە، کتێبی (الموسیقی الکبیر)ە لە بواری مۆسیقادا، کە تا ماوەیەکی دوورودرێژ سەرچاوە بووە بۆ ئەو کەسانەی کە لە بواری مۆسیقادا کاریانکردووە، ئەمەش هـزری ئیسلامییە، چونکە تۆ دەتوانیت مۆسیقا بە شێوەیەك گرنگی و پەرەپێبدەیت کە خزمەت بە مرۆڤایەتی بکات و خزمەتی کۆمەڵگای ئیسلامی بکات، بەڵام دەشتوانی بە شێوەیەك بایەخی پێبدەیت کە رۆڵی روخاندن و رۆڵی دابڕان و لەناوبردنی بەهاو ڕەوشت ببینێت لە کۆمەڵگەدا.

لە بواری هـزری پەروەردەییدا زانا مسوڵمانەکان چەندین پەرتووك و نامیلکەو کەشکۆڵیان تۆمار کردووە لەو بوارەدا کە بۆ هەریەکێکیان پێویستی بە چەندین دانیشتن هەیە کە باسی بکەین.

[1] - ئیبن سینا یان ئەبوعەلی سینا(٩٨٠ ـ ١٠٣٧م) پزیشك و فەیلەسوف و وەزیر، ناوبانگی لە هەموو جیهاندا هەیە و خاوەنی گەلێك پەرتووکی بەنرخە، بەتایبەت پەرتووکی (القانون) لە پزیشکیدا، کە ئینسکلوپیدیایەکی پزیشکییە.

# پایەکانی هزری ئیسلامی

کاتێك کە باس لە پایەکانی هـزری ئیسلامی دەکەین دەبێت ئەوە بزانین کە هـزر خۆی ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە پێکهێنانی کەسێتی مسوڵماندا، ئەگەر بتەوێت هەر کەسایەتییەك هەڵسەنگێنیت دەتوانیت بەو بارە مەعریفییەی کە هەڵیگرتووە هەڵیسەنگێنیت، هـزری ئیسلامی لە ڕاستیدا دەیەوێت لە کەسایەتی مسوڵماندا یان لە کەسایەتی ئیسلامدا ئەم بەهایانە بەرجەستە ببن، ئەم بەهایانە ـ کە وەك هێزێکی شاراوە لە بوونی مرۆڤدا هەن ـ لە حاڵەتی ماتەوزەوە بهێنێت بۆ حاڵەتی کردەوە و کار، بۆ نموونە ئەگەر دادپەروەری ووزەیەك بێت لە لەشی مرۆڤدا هەوڵدەدات بیکات بە کردەوە لە کارەکانی ئەو کەسەدا.

**پایەی یەکەم:** کە زۆر جەختی لەسەر کراوە مەسەلەی دادپەروەرییە (العدالـە)، هـزری ئیسلامی زۆر جەخت دەکات لەسەر دادپەروەری لەسەر ئاستی تاکەکان و کۆمەڵگا، لەسەر ئاستی دەوڵەتان و هەموو مرۆڤایەتی.

**پایەی دووەم:** پایەیەکی تری هـزری ئیسلامی بریتییە لە ڕاوێژ، بە دەربڕینە قورئانییەکەی بریتییە لە (شوورا). ڕاوێژکردن، واتە ڕێزگرتن

له بۆچوونی مرۆڤەكان، دیاره ئەم پایەیە گرنگییەكی زۆری هەیە. مەسەلەی ڕاوێژكردن لە هەموو بوارەكانی ژیانی مرۆڤدا بوونی بایەخێكە، وەك پیادەكردن (موماموەرەسە)ش بایەخێكی زۆر گەورەی هەیە و هەركەسێك بتوانێت لە شتە پەیوەندیدارەكان بە ژیانی ڕۆژانەوە ڕابگۆڕێتەوە لەگەڵ بەرامبەر، ئەوە خۆی بۆ خۆی پایەیەك لە پایەكانی هـزری ئیسلامی بەدیهێناوە.

**پایەی سێهەم:** پایەی یەكسانی، هـزری ئیسلامی فێری ئەوەت دەكات بە یەك چاو سەیری هەموو تاكێك بكەیت، هەموو گروپو نەتەوە و گەلان بە یەك چاو سەیر بكەیت لە میزانی ماف و ئەركەكاندا.

**پایەی چوارەم:** بریتییە لە ئازادی، ئازادی واتە لێپرسراوێتی، یان مرۆڤـ فێری ئەوە بكەیت كەسایەتییەكی لێپرسراوە، خاوەنی هەستە و لێیدەپرسرێتەوە و هەندێك ئەركی هەیە دەبێت جێبەجێی بكات، هەروەها هەندێك مافی هەیە دەبێت بە دەستیبهێنێت، بەڵام لە چوارچێوەیەكدا، لەبەر ئەوە ئازادی لە هـزری ئیسلامییدا بووە بە پایەیەكو پێناسەیەكی جیاوازی لەو پێناسانەی كە ئێستا لە دونیا هەن، بۆ دانراوە.

**پایەی پێنجەم:** بریتییە لە ئاسایشی كۆمەڵایەتی (الامن الاجتماعی)، هـزری ئیسلامی چاندنی ئەو بیروبڕوایانە بە پێویست دەزانێت لە ڕێگەی فێركردنی ئەو پەیڕەو و پرەنسیپانە كە كۆمەڵگا لە ئاسایشدا بژی بە شێوەیەك كە هیچ كەسێك هەست بە مەترسی نەكات لەسەر بوونی، لەسەر ژیانی، لەسەر گەشەكردنی، لەسەر گەورەبوون و سەروەریی ئەو.

**پایەی شەشەم:** بریتییە لە سۆزداری و بەزەیی، بە شێوەیەك هـزری ئیسلامی ئەگەر لە بیری کەسێکدا چەکەرەی کرد فێری سۆزو بەزەیی دەبێت لەگەڵ هەموو خەڵك، هەموو مرۆڤایەتی.

دوای ئەوەی کە لە مانای هـزر تێگەیشتین، ئێستا چەند تیشکێك دەخەینە سەر حیکمەت:

گەر ئێمە لێمان بپرسن مەسەلەی هـزر چەندێك گرنگی پێدراوە؟ دەتوانین بڵێین ئیسلام بریتییە لە(هـزرو بەرهەمی زانایان)، ئیتر ئەم هـزرە لە بواری تەشریعدا بێت وەك لە فیقهدا دەردەکەوێت، یان بواری بیروباوەڕ بێت کە لە زانستی عەقیدەدا دەردەکەوێت، یان لە بواری ڕەوشتدا بێت وەك لە بواری ڕەوشتدا دەردەکەوێت، لایەنەکان زۆر فراوانن، بەڵام ئێمە کە سەیری قورئانی پیرۆز دەکەین لەگەڵ ئەوەدا کە پەرتووکی بیروباوەڕو مرۆڤـدروستکردنە، پەرتووکی بیرکردنەوەشە، واتە کتێبێك نییە کە هاتبێت بۆت و بیخوێنیتەوە و کوێرانە وەرتگرتبێت، خوای پەروەردگار خۆی دەفەرموێت: ﴿أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا﴾ محمد٢٤، تێنافکرن لە قورئان؟ ﴿تدبُر﴾ واتە تێفکرین و قوڵبوونەوە و تێگەیشتن، چونکە ئەگەر مرۆڤێك قفڵ لە دڵی نەدرابێت کاتێك کە ئایەتێکی قورئان یان دەقێکی قورئانی بۆ دەخوێنرێتەوە تێر لێی ورددەبێتەوە، بۆچی؟ لە قورئاندا شتێك زۆر سەرنجمان ڕادەکێشێت، چەمکێك هەیە زۆر سەرنجمان ڕادەکێشێت چەمکی (حیکمەتە)، حیکمەت کە لە سیاقی ئایەتەکاندا بۆت دەرکەوێت، مەبەستی قورئان شتێکە گەورەترە لە فەلسەفە یان

گشتگیرترە لە فەلسەفە، لە هەمانکاتدا کاراترە لە فەلسەفە. ئەگەر تەماشابکەیت یەکێك لە گرنگترین کاری پێغەمبەران بە درێژایی مێژوو ئەوەبووە خەڵك فێری دوو شت بکەن:

**یەکەم:** فێری پەیامی خودای بکەن، هەروەها ئەو ئەرکانەی کە خودای پەروەردگار بۆ بەندەکانی دیاری کردووە، ئەمەش لە دووتوێی ووشەی (کتاب)دا کۆدەبێتەوە.

**دووەم:** فێری ژیانیان بکەن، چۆنێتی ژیان، وەك خوای پەروەردگار لەسەر زمانی ئیبراهیم دەفەرموێت:﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ﴾ البقرة١٢٩. لێرەدا (حیکمەت) شتێکە لە پەنای (کتاب)دا هاتووە، واتە ئەگەر قورئان نەکەیتەوە ئەو قورئانە ناتوانێت ڕۆڵی هەبێت لە ژیانتدا، ئەگەر بیرکردنەوە (تفکیر) نەبێت قورئان دەبێتە شتێك بۆ پیرۆزی (تەبەڕوك) لە کتێبخانەی ماڵەکان و دادگاکانداو تەنها سوێندی پێدەخۆن، بەڵام مەسەلەی حیکمەت زۆر ڕۆڵدەبینێت.

کەواتە حیکمەت چییە؟... حیکمەت بە پێی ئەم ئایەتە بریتییە لە تێگەیشتنی قورئان، یان بریتییە لە جێبەجێکردنی قورئان، هەروەها لە هەمان سورەتدا دەفەرموێت:﴿كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ﴾ البقرة١٥١. ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ . حیکمەت بریتییە لە چۆنێتی ژیان یان چۆنێتی بەڕێوەبردنی ژیان، خوای پەروەردگار لە سورەتی (الأحزاب)دا ڕوو بە خێزانەکانی پێغەمبەر دەفەرموێت:﴿وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى

فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفاً خَبِيراً﴾ الأحزاب٣٤ ﴿مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ﴾ حیكمەت چییە؟ لەوێدا پێشەوا شافعی بە سوننەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) راڤەیكردووە، بەڵام سوننەتی پێغەمبەر خۆی چییە؟ سوننەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بریتییە لە چۆنێتی ژیانی تا و ژیانی تاكی و كۆمەڵی، بەڵام لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا، هەر لە سوورەتی (البقرة)دا خوای پەروەردگار ڕوودەكاتە هەموو خەڵكو بە تایبەتی بەنی ئیسرائیلو دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنزَلَ عَلَيْكُمْ مِّنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ﴾ البقرة٢٣١ ﴿مِّنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ﴾ هەموو پێغەمبەرێك كە پەرتووكی بۆ نێردراوە شتێكیشی لەگەڵدا هەبووە پێیدەوترێت حیكمەت، حیكمەتیش واتە تێگەیشتنی ڕاست لەو پەرتووكە، تێفكرین لە واقیع، واتە كە قسەت كرد قسەی چاك بكەیت، قسەیەك بكەیت كە ناو دڵی ڕاستی بپێكێت و كردەوەشت بەجێ بێت، ئەوكردەوەیەی كە دەیكەیت كردەوەیەكی بەجێ بێت واتە (القول الصحيح والفعل الصحيح) قسەی ڕاست لەگەڵ كاری ڕاست، قسەی چاك لەگەڵ كاری چاك، لە ڕاستیدا قسەی چاكو كاری چاك خوێندنی دەوێـت، بەڵام قسەی خراپو كاری خراپ پێویستی بە مامۆستا نییە، بۆ قسەی ناشرینكردن پێویست ناكات بڕۆیتە خوێندنگە، لەبەرئەوە پێویست ناكات خۆت ماندووبكەیت بۆ ئەوەی فێری جنێودان بیت، پێوستی بە خۆماندووكردن نییە، زۆر بە ئاسانی دەتوانیت لە خەڵك وەریبگریت، بەڵام قسەی جوان یان قسەیەك بكەیت لە شوێنی خۆی یان كارێك بكەیت كارەكەت لە شوێنی خۆی بێت

و بەجێ بێت ئەمە پێویستیی بە زانست و بەدواداچوون و فێربوون هەیە.

دەبینیت لە سورەتی (البقرة)دا باسی داوود دەکات دەفەرموێت: ﴿فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللّهِ وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ﴾ البقرة٢٥١، خوای پەروەردگار چی دابوو بە داوود؟ دوای ئەوەی کە سەرکردایەتی بەنی ئیسرائیلی کردو بەسەر جالوت و سوپاکەیدا سەرکەوتن، دەفەرموێت: خوا موڵکی پێداو حیکمەتیشی پێدا، واتە چۆنێتی بەڕێوەبردنی موڵکی پێدا، پاشایەتییەکەی پێدا، بەڵام ئەو عەقڵەشی پێدا کە چۆنی ببات بەڕێوە، کەواتە لێرەدا حیکمەت چییە؟ چۆنێتی بەڕێوەبردنی وڵاتە، دیارە چۆنێتی بەڕێوەبردنی وڵات پێویستیی بە فیکرو ئاوەزو زانین و وردەکارییە.

هەر لە هەمان سورەتدا خوای پەروەردگار تێگەیشتنێکی زۆر فراوانترمان پێدەدات لەسەر حیکمەت کە سەرچاوەکەی هەرخوای پەروەردگار خۆیەتی، لەبەرئەوە دەفەرموێت:﴿يُؤتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً﴾ البقرة٢٦٩. کەواتە: کاتێك کە زاناکان پێناسەی حیکمەت دەکەن دەڵێن: (قسەی ڕێك لەگەڵ کردەوەی ڕێك)، ئەم دوو فاکتەرەش هەرکامیان لە بواری خۆیدا. ئەگەر یەکێك سیاسەتمەدارێکی سەرکەوتووبێت ئەوە بەشێك لە حیکمەتی دەستکەوتووە، بازرگانێکی سەرکەوتوو بێت بەشێك لە حیکمەتی دەستکەوتووە، مامۆستایەکی سەرکەوتوو بێت بەشێك لە حیکمەتی دەستکەوتووە، لەبەرئەوە توانیویەتی مامۆستایەکی باش بێت، ئەگەر

پەروەردەکارێکی باش بێت مانای وایە بەشێك لە حیکمەتی دەستکەوتووە، پزیشکێکی چاك بێت بەشێك لە حیکمەتی دەستکەوتووە، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً﴾ البقرة٢٦٩. هەروەها خوای پەروەردگار کە باسی عیسا دەکات (سەلامی خوای لەسەر) دەفەرموێت ﴿وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ﴾ آل عمران٤٨. فێری کتابی دەکات واتە شەریعەت، فێری حیکمەتی دەکات واتە چۆنێتی ژیان، کاتێك کە سەیری ژیاننامە (سیرە)ی پێغەمبەران دەکەیت بە تایبەت ژیاننامەی حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لەسەر)، لە شوێنێکدا قسەیەکی نەکردووە ئەو قسە جێگای نەگرتبێت، کارێکی ئەنجام نەداوە ئەو کارە جێی نەگرتبێت و بەجێ نەبووبێت، ئەوە حیکمەتە.

خوای پەروەردگار لە سورەتی (النساء)دا دیسان باسی حیکمەتمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكاً عَظِيماً﴾ النساء٥٤. سەیرکە ﴿الکتاب﴾ هاوڕێیەکی هەبووە، چونکە جێگیر نابێت ئەگەر حیکمەتی لەگەڵ نەبێت، وەك لە سورەتی ﴿نحل﴾ دا خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ النحل١٢٥.

لەسورەتی (الإسراء)یشدا دەفەموێت: ﴿ذَلِكَ مِمَّا أَوْحَى إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَةِ وَلاَ تَجْعَلْ مَعَ اللّهِ إِلَهاً آخَرَ فَتُلْقَى فِي جَهَنَّمَ مَلُوماً مَّدْحُوراً﴾ الإسراء٣٩. ئەمەش دوای کۆمەڵێك ڕووتێکردنی عەمەلی، خوای پەروەردگار ڕوودەکاتە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) باسی ئەوە

دەكات چی بكە و چی مەكە، ڕەفتارت چۆن بێت لەگەڵ خەڵكدا، ئینجا دەفەرموێت ئەم شێوە ڕەفتاركردنە ﴿ذَلِكَ مِمَّا أَوْحَى إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَةِ﴾ الإسراء٣٩، واتە: ئەمەش بەشێكە لەو حیكمەتەی خودا بە سرووش بۆی ناردوویت، واتە ئەو حیكمەتە كە پێشەوا شافعی بە سوننەتی پێغەمبەری خوا (د.خ)ی ڕاڤەدەكات، دیارە ڕەفتاری پێغەمبەری خوا (د.خ) بەشێكی پەیوەندیی هەیە بە وەحیەوە، ئایا بە ڕێگەی ئیلهام بێت خوای پەروەردگار خستویەتییە دڵیەوە یان هەر بە شێوەیەكی وەحی لە پەنای قورئاندا بۆی هاتبێت.

لەسورەتی (لقمان)دا ئەم ئایەتە باس لە حیكمەت دەكات و دەفەرمێت:﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ﴾ لقمان١٢. یەك حیكمەتی سەرەكی هەیە لە داستانی حەزرەتی لوقماندا كە سەردێڕە بۆ هەموو حیكمەتەكانی ژیانی لوقمان، ئەویش ئایەتەكە باسی دەكات دەفەرموێت﴿أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ لقمان١٢. وەك ئەوە وایە بڵێین: حیكمەتی لوقمان ئەوە بووە كە بەرامبەر بە هەموو كەسێك سوپاسگوزار بە، واتە چاكەی خەڵك لەبەرچاوت وون نەبێت، كە چاكەی خەڵكت لەبەرچاو ون نەبوو هەمیشە چاكە لەگەڵ خەڵكدا ناكەیت؟، بێگومان چاكەكردنیش چییە؟ پێویستە لەپێشدا بیربكەیتەوە بزانیت چی خراپە وازی لێبهێنیت و چی چاكە ئەنجامی بدەیت، هەركەسێكیش ژیانی بریتیبێت لە چاكەكردن و

ئەم چاکەیەش لەبەر خوای پەروەردگار بێت، چونکە ئەو کەسەی کە بیەوێت چاکە بکات، ئەگەر لەبەر خوا بێت ئەوە ئەنجامەکەی بە سوودی خۆی تەواودەبێت، وەك ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ﴾ لقمان١٢. دەفەرموێت: ﴿أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ﴾ . واتە: سوپاس بکە لەبەر خوا، سوپاسی خوا بکە کە دروستی کردوویت، ئەویش لەبەر خوا، سوپاسی خەڵك بکە کە چاکەی لەگەڵ کردوویت، دیسانەوە سوپاسی خەڵك بکە کە خراپەیان لەگەڵ نەکردوویت بڵێ بۆ ئەوەی کە خراپەیان لەگەڵ نەکردوویت﴿أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ﴾ لقمان١٢. ئەگەر مرۆڤـ لە ژیاندا ئەوە ڕێبازی بوو کە وەڵامی چاکە بە چاکە بداتەوە و تەنانەت وەڵامی خراپەش بدەیتەوە بە چاکە، لە ئەنجامدا خۆت قازانج دەکەیت، بەڵام ﴿وَمَن كَفَرَ﴾ بەڵام ئەگەر کەسێك وازی لە بنەمای سوپاس هێناو لە ژیاندا سوپاسی خوای نەکرد، سوپاسی دروستکراوەکانی خوای پێناکرێت ﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ لقمان١٢، جا کەواتە تەماشای ئەم ئایەتانە بکە بە شێوەیەکی زنجیرەدار لە سورەتی (البقرة)دا کۆمەڵێك ئایەتمان هەیە باسی حیکمەت دەکات، لە (ال عمران)دا چەند ئایەتێکمان هەیە، لە سورەتی (النساء، المائدة، النحل، الإسراء)دا کە قورئانی پیرۆز باسی حیکمەت دەکات، حیکمەت شتێکە لە قورئاندا کە دەتوانین ئەو دەرهاویشتەی لێ وەرگرین کە مەبەست لە حیکمەت هـزرە، هـزر لە چیدا؟ چی پێویستەو

چی پێویست نییە؟ بیر بکەمەوە لەوەی چی هەیەو چی نییە، ئەمە لە بواری هـزری تیۆریدا، کە دەکۆڵێتەوە لەوەی چی هەیەو چی نییە، هـزری عەمەلییش دەکۆڵێتەوە لەوەی کە چی باشەو چی خراپە، پێویستە چی بکەمو چی نەکەم، ئەمە حیکمەتە، کەواتە حیکمەت هاوتای بیرکردنەوەی فەلسەفییە، بەڵام بە مانا قورئانییەکەی، بەو فەلسەفەیەی کە پەیوەستە بە ژیانی خەڵکەوە، پەیوەستە بە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکەوە، پەیوەستە بەوەی کە خەڵك بزانن چی هەیەو چی نییە، چی ڕاستەو چی چەوتە، چی باشە و چی خراپە، چی ڕەوایەو چی ناڕەوایە، چی جوانەو چی جوان نییە، چی خێرەو چی شەڕە، فەلسەفەش هەر ئەمەنییە؟! بەڵام چەمکە قورئانییەکەی کە پێیدەوترێـت حیکمەت، ناونیشانە قورئانییەکەی کە پێیدەوترێت حیکمەت، مانایەکی بەرجەستەترمان پێدەبەخشێت لەوەی کە لە فەلسەفەی یۆنان و ڕۆمان و ئەوانی دیکەدا هەیە.

زاناکان پێشتر وتویانە ئەو حیکمەتەی کە خوای پەروەردگار لە ئایەتەکاندا باسی دەکات، بریتییە لەوەی کە (خوای پەروەردگار بە لوتفی خۆی بە نسیبی هەموو میللەتانی کردووە، بەڵام هەر میللەتەی بە شێوەیەك وەریگرتووە، تەماشا دەکەیت حیکمەتی خوا لەناو عەرەبدا لە ڕەوانبێژییدا دەرکەوتووە و بەرجەستەبووە، ئەو شیعرە جوان و ڕەوانبێژییەی کە لە ناو عەرەبدا هاتووە مشتێکە لەو حیکمەتەی خوای

پەروەردگار بە نسیبی ئەوانی کردووە، لەناو یۆنانییەکاندا لە عەقڵکارییدا دەرکەوتووە، لەناو ڕۆمانییەکاندا لە ئاوەدانی و لە باڵەخانەدا دەرکەوتووە، لەناو چینییەکاندا بە هونەری دەست و دەستڕەنگینییان دەرکەوتووە، لە ناو ئێرانییەکاندا (کوردیش یەکێکە لە نەتەوە ئێرانییەکان، نەتەوە ئێرانییە کۆنەکان ـ ئارییەکان ـ) لە عیرفان و تەصەوفیاندا دەرکەوتووە، لە ناو هیندییەکاندا بە ئارامگرتن دەرکەوتووە، ئێستا لە یابانییەکاندا لە ئیشی زۆرو لە هەوڵداندا دەرکەوتووە. کەواتە حیکمەت چەمکێکی زۆر فراوانی هەیە و لە هەر گەلێکدا بریتییە لەو بەهرەیەی خوداوەند پێیبەخشیون، لە هەر گەلێکدا بە جۆرێك خۆی نواندووە و هەموویان بە یەکەوە خزمەت بە کۆی مرۆڤایەتی دەکەن، ئەمە هـزرە، حیکمەتە، ئەمە ئەو فەلسەفەیە کە ئێمە باسی دەکەین.

# بنەماکانی هزری ئیسلامی

لەم بەشەدا باسی ئەو بنەمایانە دەکەین کە هـزری ئیسلامی لە سەر دادەمەزرێت، واتە ئەگەر هـزری ئیسلامی بە باڵەخانەیەك بچوێنین، با بزانین پایەکانی ئەم باڵەخانەیە بریتیین لە چی؟ چەند یاسایەکی گشتی لە لایەن بیرمەندە مسوڵمانەکانەوە ڕەچاوکراوە کە لە ڕاستیدا هـزری ئیسلامی لەسەر ئەوانە دادەمەزرێت، ئەوانیش بریتیین لە:

**بنەمای یەکەم:** گێڕانەوە (نەقڵ)و عەقڵ، پشتیوانی یەکترن و بە هەردووکیانەوە یەکتری تەواودەکەن، مەبەستمان لەم دووانە چییە؟ لە ڕاستیدا دوو هێزی سەرەکی ڕۆڵدەبینن لە مرۆڤدا بۆ ئەوەی خاوەنی فیکرو خاوەنی عەقڵو خاوەنی هۆش بێت، ئەوانیش:

هێزی یەکەم: هێزی (سمع) هێزی بیستنە، بیستنی ڕاستییەکان.

هێزی دووەم: هێزی عەقڵو بیرکردنەوەیە لەو داتایانەی کە بە دەستیان دەهێنێت.

ئەمە هەر لە کۆنەوە لە ناو بیرمەنداندا جێگەی پرسیار بووە، ئایا مرۆڤـ بۆ وەرگرتنی زانیاری تەنها پشت بە بیستن ببەستێت یان پشت بە عەقڵ و زانیاری ببەستێت، هەندێك پێیانوابووە مرۆڤـ دەبێت پشت بە عەقڵی ببەستێت، وەك فەیلەسوفەکان کە دەڵێن هەموو شتێك

دەبێت لە ڕێگەی عەقڵەوە بۆی بچیت، ئەوانەشی کە لایەنگری ئاین بوون وتویانە: ئێمە پشت بە عەقڵ نابەستین، پشت بەو گێڕانەوانە دەبەستین کە لە پێغەمبەران و پێشەوایانی ئاینەوە وەریدەگرین، لێرەدا دوو جەمسەر لە بابەتەکەدا دروستدەبێت:

جەمسەرێکیان دەڵێن ئەوەی کە لە پێشەوایانی ئاینەوە دەیبیستین، ئەو زانیارییانەی کە لە ڕێگەی پێشەوایانی ئاینەوە لە ڕێگەی دەقە ئاینییەکانەوە پێماندەگات وەریبگرین و گوێنەدەین بە بابەتە عەقڵییەکان، عەقڵی خۆمان نەخەینەکار یان پشت نەبەستین بە مەنهەجی عەقڵیی، هەندێك کەس ئەو ڕێگەیان گرتۆتەبەر کە پێیاندەوترێت لایەنگرانی مەنهەجی گێڕانەوە.

جەمسەری عەقڵی: لە بەرامبەر ئەوانەدا کەسانێکی تر هەبوون وتویانە ئێمە دەبێت پشتی تەواو بە عەقڵ ببەستین. ئەمان لە ژێر کاریگەری فەیلەسوفەکاندا بڕوایەکی تەواویان بە عەقڵی ئینسانی هەبووە کە عەقڵ هەموو شتێکی پێ کەشف دەکرێت، عەقڵ دەتوانێت هەموو ڕاستییەکان لێکبداتەوە، بەڵام بیری ئیسلامی نە بە تەواوی ئەمەیانی قبوڵە و نە ئەوەی یەکەمیان، باوەڕی بەوە هەیە کە نەقڵ و عەقڵ دەبێت پێکەوەبن، واتە دەبێت مرۆڤ لە لایەکەوە پشت بەو زانیاری و دەستورە ببەستێت کە لە پێشەوایانی ئاینەوە پێیدەگات و بگەڕێتەوە بۆ دەقە شەرعییەکان، لە هەمانکاتدا دەبێت پشت بە عەقڵیش ببەستێت، چونکە دەبینین بە درێژایی مێژووی ئیسلام ڕەوگەی فەیلەسوفە ئیسلامییەکان و بیرمەندان لەسەر ئەوە بووە کە نابێت

حساب بۆ یەکێکیان بکەین و حساب بۆ ئەویتریان نەکەین، نابێت لە پێناوی عەقڵکارییدا واز لە نەقلْ بهێنین،و نابێت لە پێناوی نەقلْکارییشدا واز لە عەقلْ بهێنین، بۆ نمونە لە مبارەیەوە پێشەوا (غەزالی) لە کتێبی (احیاء علوم الدین، معارج القدس)دا باسی دەکات لێرەدا تەنها بە کورتی باسی دەکەین نەك هەموو دەقی قسەکەی، دەڵێت: (خوای پەروەردگار دوو ڕێنمایی پێبەخشیوە، ڕێنماییەکی پێبەخشیوە لە دەرەوەی مرۆڤەکە کە پێغەمبەرانن، ڕێنماییەکیشی پێبەخشیوە لە ناو خودی مرۆڤەکەدا کە عەقڵی مرۆڤەکە خۆیەتی، کەواتە عەقلْ پێغەمبەرێکی نێو ناخی مرۆڤە، پێغەمبەریش عەقڵێکی دەرەکییە بۆ ئەوەی ئەم کەسە تووشی هەڵە نەبێت، پێویستە هەمیشە لەم دوو هێزە بەهرەمەندبێت، لەم دوو ڕێنماییە بەهرەمەند بێت، کە یەکێکیان ڕێنمایی پێغەمبەرانە یەکێکیشیان ڕێمایی عەقلْو دانشی خۆیەتی، کەواتە مرۆڤ بە خواپەرستن و بە ئەنجامدانی ئەرکە ئاینییەکان لایەنێکیان بەهێز دەکات، بە بیرکردنەوەش لایەنەکەی تریان بەهێز دەکات، بە پەیڕەویکردن لە پێغەمبەران پاکی و ئامادەییەکی بۆ دروستدەبێت، بە بەکارهێنانی عەقلْو زانستەکان ئامادەییەکی تری بۆ دروستدەبێت، بەم دوو باڵە مرۆڤ دەتوانێت لە ئاسۆکانی زانست و خواپەرستی و گەیشتن بە ڕاستیدا پەرواز بکات)، کەواتە ئەمە یەکەم یاسایە کە (النقل والعقل متعاضدان و متکاملان) واتە: نەقلْو عەقلْ قۆڵی یەکتریان گرتووە و پشتیوانی یەکترن و یەکتری تەواودەکەن،

کەواتە پێشەوا غەزالی یەکێك بووە لەوانەی کە پێشتر ئاماژەی بەم کارە کردووە و باسیکردووە.

دوای ئیمامی غەزالی (ئیبن حەزم[1]) دەڵێت: (سەرچاوەکانی بیرکردنەوە بریتیین لە چوارشت: کتاب، سوننە، کۆدەنگ (اجماع)ی هاوەڵان، بەڵگەی عەقڵ)، واتە بیرکردنەوە هۆشمەندیی ئەو سروشتەی کە لە ناخی ئیسناندا هەیە و خوای پەروەردگار ئەم مرۆڤەی وادروستکردووە کە بتوانێت ڕاست و چەوت لە یەکتر جیابکاتەوە، باشەو خراپە لە یەکجیابکاتەوە، جوانی و ناشرینی لە یەکجیابکاتەوە.

دوای (ئیبن حەزم) کەسێکی وەك (ئیبن روشد[2])مان هەیە، پەرتووکێکی نووسی، هەرچەند بە قەبارە بچووکە بەڵام لە ڕاستیدا بە پێی ماناو ناوەڕۆك زۆر گەورەیە و زۆر بە نرخە، ئێستاش بایی ئەوەیە کە لە زانکۆکاندا خوێندکاران ئاوڕی لێبدەنەوە، کتێبەکەی بە ناوی (فصل المقال في ما بين الحكمة والشريعة من اتصال) واتە (قسەی کۆتایی لە بارەی ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان حیکمەت و شەریعەتدا هەیە)، حیکمەت واتە شەرحی دەستکەوتی مرۆڤ، چ بواری فەلسەفە

---

[1] ئیبن حەزم(٩٩٤ ـ ١٠٦٤ز) شەرعناس و فەیلەسوف و ئەدیب و شاعیر و زانای بواری ئاین و مەزهەبە جیاوازەکان، گەلێك لە زانایانی جیهانی ئیسلام دژ بە راکانی وەستاون و بە کەسێکی لادەریان داناوە، پشتی بە رووکەشی ئایەت و فەرموودە بەستووە لە فتواکانیدا و پەیڕەوی مەزهەبی زاهیری بووە. لۆجیکی بە گرنگترین زانست داناوە.

[2] - ئیبن روشد(١١٢٦ ـ ١١٩٨ ز) فەیلەسوف و شەرعناس، لە ئەندەلوس(ئیسپانیا) لەدایکبووە و لە پەرتووکی (تهافت التهافت)دا وەڵامی ئەو رەخنانەی داوەتەوە کە ئیمامی غەزالی لە فەیلەسووفەکانی گرتووە.

بێت چ بواری یاسا بێت، یان هەر بوارێکی دیکە، شەریعەتیش واتە ئەوەی کە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە هاتووە، بە تایبەت شەریعەتی ئیسلام کە لە لایەن دواهەمین پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر) گەیشتووە بە مرۆڤایەتی، ئەم دووانە واتە (حیکمەت و شەریعە) لە ڕاستیدا زۆر پەیوەندییان بە یەکەوە هەیە، لە بەشی یەکەمدا باسی حیکمەتمان کرد، ئێستا پێویست ناکات دووبارەی بکەینەوە، کەواتە حیکمەت گرنگییەکی زۆری هەیە لەگەڵ شەریعەتدا، ئەم دووانە لە ڕاستیدا یارمەتی یەکتردەدەن بۆ ئەوەی کەسەکان بگەن بە ڕاستی، کەواتە یاسای یەکەم ئەوەیە لە هـزری ئیسلامییدا بیرمەندان تەنها لایەنی عەقڵی ناگرن یان تەنها لایەنی نەقڵی ناگرن، بەڵکو هەوڵدەدەن بە یەکگەیشتنێك لە نێوان ئەم دوو ڕوانگەدا پەیدابکەن، هەوڵدەدەن پێکەوەیان بگونجێنن.

دوای (ئیبن روشد) کەسێکی وەك شێخ (ئیبن تەیمییە[1])مان هەیە کە کتێبێکی زۆر بە نرخی هەیە بە ناوی (موافقة صريح المعقول لصحيح المنقول) لەم پەرتووکەدا دەڵێت: ئەوەی کە ڕاشکاویی مەعقولانەو عەقڵی ڕاستەوخۆ بە مرۆڤی دەگەیەنێت هەمان شتە کە صەحیحی نەقڵ پێیدەگەیەنێت، واتە عەقڵی تەواو لەگەڵ نەقڵی ساغدا هیچ دژایەتییان نییە، ئەگەر تۆ ڕاستییە ئاینییەکان بهێنیت ڕیزیان بکەیت ئەوەی کە

[1] - ئیبن تەیمییە (١٢٦٣ ـ ١٣٢٨ز) ناسراو بە شیخ الاسلام، زانای فیقهـ و فەرموودە و تەفسیر و عەقیدە، ڕۆڵی کارای هەبووە لە دژایەتیکردنی داگیرکەرانی مەغۆلدا، دامەزرێنەری ڕێبازی ناسراو بە (سەلەفیەت)ـە. چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی گرنگییەکی زۆری پێدەدرێت لەم سەرەمەدا.

ڕاستییەو وەك حەقیقەتێكی ئاینی پێماندەوترێت بەراوردی بكەین لەگەڵ ئەوەی زانستی ئەمڕۆ باسی لێوە دەكات هیچ دژایەتییەك نابینیت، بەڵكو زانستی ئەمڕۆ جەخت لەوە دەكاتەوە كە لە قورئان و سونەنتدا هاتووە و پێمانگەیشتووە، پەرتووكێكی گەورەی لەوبارەوە نوسیوە، كەواتە یەكەمین یاسا كە فیكری ئیسلامی لەسەری دادەمەزرێت بریتییە لە پێكەوەبوون و هاوڕێبوون و پێكەوەگونجان و تەواوكاری نێوان عەقڵو نەقڵ، كە ئەمەش یەكێكە لە تایبەتمەندییەكانی هـزری ئیسلامی.

**بنەمای دووەم:** سروشتی مرۆڤـ لە بنەڕەتدا فیترەتێكی پاكە، واتە ئەگەر مرۆڤ دووربخەیتەوە لە كاریگەریی فاكتەرەكانی دەوروبەر، فاكتەرەكانی بیروباوەڕی پڕو پووچ، هەنگاو بە هەنگاو بەرەو چاكە دەڕوات، لەبەر ئەوەی ئەم سروشتە لە بنەڕەتدا لەسەر یەكتاپەرستی بنیاتنراوە، لەبەر ئەوە ئەگەر مرۆڤێك وازیـلێـبهێنیت هەر لە باوەشی سروشتیشدا گەورە ببێت و تەنانەت كەسێكیش نەبێت بەخێوی بكات، دایكی نەبێت و باوكێكی نەبێت لە باوەشی سروشتدا، لە ئەنجامدا ئەو سروشتە بەرەو خواناسی دەیبات، بەرەو خواپەرستی دەیبات، بەرەو دۆزینەوەی ڕاستی دەیبات، لەم بارەیەوە ئێمە لەناو زانا مسوڵمانەكان و بیرمەندانی ئیسلامییدا كەسێكی وەك (ئیبن توفەیل[1])مان هەیە كە

---

[1] - ئەبوبەكر محەممەدی كوڕی عەبدولمەلیكی كوڕی محەممەدی كوڕی توفەیلی قەیسیی ئەندەلوسی **(ابن طفیل القیسي الأندلسي)**١١٠٠ –١١٨٥م، فەیلەسوف و پزیشك و ماتماتیكزان و شاعیر و ئەدیب و

فەیلەسوفێکی گەورە بووە و مامۆستای (ئیبن روشد) بووە، داستانێکی فەلسەفی جوانی نوسیووە بە ناوی (حی ابن یقظان)[1] واتە زیندوی کوڕی بێدار، ئەم داستانە باس لەوەدەکات کە منداڵێك لە کەشتییەکدا دەبێت، کەشتییەکە دەشکێت لە نزیك دوورگەیەك، ئەم منداڵەش بە زیندوویی لە دوورگەکەدا دەگیرسێتەوە، لەوێ ئاسکێك بەخێوی کردووە شیری پێداوە و بووە بە دایکی، لە مردن ڕزگاری کردووە، ئەم منداڵە هێدی هێدی بە بێئەوەی کە لە ناو کۆمەڵگادا بێت، بەبێ ئەوەی فێری زمان ببێت ئەم منداڵە وایـلێـدێت بە بیرکردنەوە ئەگات بە یەکتاپەرستیو فێری چەمکە فەلسەفییەکان و چەمکە عەقڵییەکان دەبێت. لە ڕاستیدا داستانێکی زۆر سەرنجڕاکێشە، هیوادارم ئەم کتێبە لە ئایندەدا وەربگێڕدرێتە سەر زمانی کوردی (ئێستا بە فلیمیش هەیە)، خوێندەوارانی کورد کەمترینیان شارەزاییو ئاگاداری ئەو بەرهەمەن. کاتێك ئەم شاکارە دەخوێنیتەوە خەیاڵو بیرفراوانی ئەو فەیلەسوفەمان بۆ دەردەکەوێت، ئەمە لەسەر ئەو یاسایەی کە سروشتی پاکی ئینسانی لە سەرەتادا پاکە و ئەم سروشتە ئەگەر وازی لێـبهێنیت دوور لە

---

بیرمەندی ئەندەلوس. ماوەیەکیش وەزیری دەوڵەتی (موەححیدین)ـەکان بووە، بە چیرۆکی فەلسەفیی(حي بن يقظان) بەناوبانگە.

[1] ـ چیرۆکی (حي بن يقظان): چیرۆکێکی فەلسەفییە، باسی چۆنێتی گەیشتنی مرۆڤ دەکات لەڕێگەی عەقڵو سروشتو ویستەمەنییەکانیو جوڵەی بونەوەرانەوە بە حەقیقەتو خوداپەرستی، دواتریش گەیشتنی بە ناسینی خوداو یەکتاپەرستیو بەختەوەری هەمیشەیی، ئەم چیرۆکە بەسێ جۆر دەربارەی نوسراوە: ناودارترینیان چیرۆکی ئیبن توفەیلە، لەهەمانکاتدا ئیبن ماجەو سوهرەوەدیش هەمان دەقیان هەیە.

کاریگەری بیروباوەڕە جیاوازەکان و دوور لە کاریگەری ئەو تەپوتۆزەی کە ڕووبەڕووی هەموو خەڵك دەبێتەوە و دوور لە کاریگەری ئەو کۆسپانەی کە کەسە خراپەکان دروستیدەکەن، مرۆڤ بە سروش دەچێتەوە بۆ لای خواو ڕاستییەکان دەدۆزێتەوە، پێش هەموو شتێك مرۆڤ جیاوازی دەکات لە نێوان شتێك کە بەرجەستەیە و شتێکیش کە نادیارەو لەودیو شتەکانەوەیە، جیاوازی دەکات لە نێوان (فیزیكو میتافیزیك)دا، جیاوازی دەکات لە نێوان سنوری تواناو ئیدراکاتی خۆی لەگەڵ ئەو جیهانە بێسنوورەی کە دەوروبەری ئەویان گرتووە.

**بنەمای سێهەم:** ئەوەیە کە لە ڕاستیدا دەقەکان پیرۆزن، دەقە قورئانییەکان و دەقەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) پیرۆزن، بیرکردنەوەی مرۆڤەکان پیرۆز نییە، لە ڕاستیدا دین پیرۆزە بەڵام هـزرو بیری مرۆڤ پیرۆز نییە و بەڕێزە، ئەگەر ئێمە ئەمەمان لەبەرچاو بێت هیچ کاتێك هـزری ئیسلامی بەوە مانا ناکەین کە دەقاودەق ئەوەبێت کە ئیسلام هێناویەتی، بەڵکو هـزری ئیسلامی بریتییە لە تێگەیشتنی مسوڵمانان لە ڕووی دەقە ئاینییەکانەوە، ئەو وەڵامانەی کە مسوڵمانان دەیدۆزنەوە بۆ پرسیارەکانی ڕۆژانەی خۆیان، بۆ ئەو پرسیارە گرنگانەی خۆیان، ئەم وەڵامانە لە ڕووی دەقەکانەوە دەستپێدەکات، واتە لەو دەقانەوە دەجووڵێن کە ئێمە بە پیرۆزیان دەزانین، بۆ نموونە، یەکێك لەو کێشانەی کە ڕوبەڕووی هەموو کۆمەڵگا دەبێتەوە ئەوەیە کە کێ فەرمانڕەوایی بکات؟ کێ دەستەڵاتی هەبێت؟ ئایا گروپێکی تایبەت فەرمانڕەوا بن؟ چینێکی تایبەت؟ ڕەگەزێکی تایبەت؟ ئایا

فەرمانڕەوایەتیی تایبەتمەندییەکی خوایە بۆ کۆمەڵێكو هەتاهەتایە بۆ ئەوان بێت؟ زانا مسوڵمانەکان دێن لە ڕوانگەی دەقەکانەوە سەیردەکەن بزانن وەڵام بۆ ئەم پرسیارە چییە کە کێ فەرمانڕەوا بێت؟ کێ مافی دەستەڵاتی هەیە؟ کێ مافی ئەوەی هەیە کە جڵەوی دەستەڵاتی هەبێت؟ کە ئەم ئایەتە دەبینیت کە دەفەرموێت: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ الشوری:٣٨ ﴿امر﴾ واتە دەستەڵات ﴿امرهم﴾ واتە دەستەڵاتیان، چونکە ئەو کەسەی کە دەستەڵاتی هەبێت ئەمردەکات، فەرمان لەناو ئەواندا بە ڕاوێژە واتە بە نۆرەیە، ئەوەنییە کە یەکێك ببێتە فەرمانڕەوا بە سەرشانی ئەو خەڵکەوە، کە سەیری ژیانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەکەین ئەوەندەی ئەو پێغەمبەرایەتی کردووە و خەڵکی ڕێنمایی کردووە بەرەو ڕاستییەکان ئەوەندە تەرکیزی لەسەر ئەمرو نەهی نەکردووە، بەڵکو کاتێك خۆی وەفات دەکات بابەتەکان جێدەهێڵێت بۆ ئوممەت، گەل بەرژەوەندیی لەچییدا دەبینێت، دەستەڵاتدار هەڵدەبژێرن خۆیان لێپێچینەوە لە دەستەڵاتدار بکەن، کەواتە یاسای سێهەم بریتییە لە: جیاکردنەوە لە نێوان دەقە پیرۆزەکان و دەستکەوتە فیکریی‌و عەقڵییەکاندا، ئەوەی کە مسوڵمانان بەدەستیدەهێنن، ئەوەی کە مسوڵمانان بۆ خۆیان هەڵیدەبژێرن.

**بنەمای چوارەم:** لە هەموو بوارەکانی هـزرو بیروبۆچوون و بیرکردنەوەدا هەمیشە لایەنی میانڕەویی باشە، نە توندڕەویی نە خاوڕەویی، نە چەقبەستن نە بێباریی، نە ئەوەی کە بڵێین تەنها رای من

ڕاستە و نە پەسەندکردنی قسەی کەسانی تریش بە ڕەهایی، چونکە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی هـزری ئیسلامی بریتییە لە میانڕەوییـبوون (الوسطية)، یان میانەبوون، بۆ نموونە ئیسلام ڕاڤەی ماددیی بۆ ژیان ناکات، تەفسیرێکی ماددیی ڕووت، ڕاڤەیەکی ڕوحیی ڕووتیش ناکات، بەڵام پێیوایە کە ئەم ژیانە ماددەیشەو ڕوحیشە، لایەنی ماددیشی هەیەو لایەنی ڕوحیشی هەیە، لایەنی دونیایی و دوارۆژیشی هەیە، لایەنی دینی و مەدەنیی هەیە، لایەنی تاکی هەیەو لایەنی کۆمەڵایەتی هەیە، لایەنی نەگۆڕو گۆڕاوی هەیە، لایەنی میسالی و نمونەییشی هەیە، لایەنی واقیعیشی هەیە، لایەنی ڕەسەن و گرنگیدانی هەیە بە ڕابردوو، لە لایەکیـتـریشەوە کرانەوەشی تیایە بە ڕووی هاوچەرخبووندا، ئەم هـزرە ئیسلامییە هـزرێك نییە کە تاکڕەو بێت یاخود بە یەك چاو سەیری ژیان بکات، ئەم بابەتی میانڕەوییە لە هەموو ئەو شتانەدا دەبینرێتەوە کە ئێستا لە ڕاستیدا باسی لێوەدەکرێت، بۆ نموونە ئەو فەلسەفانەی کە پێشتر هەبوون زۆربەی فەلسەفەکان یان تەنها گرنگییان بە لایەنی ماددیی داوە لە کەسەکانداو لایەنی ڕوحیو مەعنەوییەکەیان پشتگوێ خستووە وەك فەلسەفەی مارکسی، یان تەنها گرنگییان بە لایەنی ڕوحی و مەعنەوی و لایەنی ئاینی داوە لایەنە ماددییەکەیان پشتگوێ خستووە وەك فەلسەفەی میسالی لە (ئەفلاتۆن)ـەوە هەتا (هیگل).

ئەی هـزری ئیسلامی؟، هـزری ئیسلامی یەکەمجار فێرماندەکات کە ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ التوبه:٩٤. واتە: دوو جیهان هەیە: جیهانێکی

نادیار (الغیب)، کە جیهانە بەڵام ئێمە نایبینین، جهانێکیتـر کە جیهانی (الشهادە)یە ئەو دونیایەی کە ئێستا لەبەرچاوماندایە.

ئەمانە بریتیین لە یاسا بنەڕەتییەکانی فیکری ئیسلامی، بە شێوەیەك کە فیکری ئیسلامی لەسەر ئەم یاسایانە ئەو دەرچوونە گرنگەی کردووە، فیکری ئیسلامی مێژوویەکی هەیە کە لە سەرهەڵدانی هاتنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەستپێدەکات و هەتا ژیانی مرۆڤـ بەردەوام بێت ئەویش بەردەوامە، خاڵی دەستپێکردنی هەیە بەڵام خاڵی کۆتایی تا ئەوکاتەیە کە خوای پەروەردگار بڕیاریداوە ئەم سەرزەوییە خەڵکی بەسەرەوەبێت، لەم مێژووە دوورودرێژەدا ئێمە هەزاران بیرمەندمان هەبووە، بێگومان ئەم بیرمەندانە هەموویان لە یەك ئاستدا نین، هەبووە بیرمەندێکی زۆر گشتگیری پانۆرامی بووە و لەسەر هەموو بابەتە ئەساسییەکان قسەی کردووە وەك (ئیبن روشد).

-(ئیبن روشد) (فەقیهـ) بووە، چاکترین کتێبی لە فیقهدا نوسیوە.

-ئوصولی بووە، چاکترین پەرتووکی لە ئوصولی فیقهدا نوسیوە.

-فەیلەسوف بووە، چاکترین پەرتووکی لە فەلسەفەدا نوسیوە.

-پزیشکیش بووە، چاکترین پەرتووکی لە پزیشکییدا نوسیوە.

-زمانپاراویش بووە، چاکترین پەرتووکی لە ووتاربێژیدا نوسیوە.

-ڕەخنەگربووە، چاکترین پەرتووکی لە ڕەخنەی شیعردا نوسیوە.

-گەورەترین لێکۆڵەری پەرتووکی ئەرستۆ بووە.

ئەمە نمونەی زانایەکی مەوسوعییە، بیرمەندێکی مسوڵمان تەمەنیشی زۆرنەبووە (٧٠)ساڵ یان (٧٥)ساڵ ژیاوە کە لە (٥٢٠ك) لەدایکبووە و

له(٥٩٥)دا وەفاتیکردووە، (١٥)ساڵ دوای ئیمامی غەزالی لەدایکبووە، تا(٥٩٥ك) ژیاوە لەم پێناوەشدا دیارە تووشی مەینەتی زۆربووە تەنانەت هاوبیرەکانی خۆی ئازاریان داوە.

**بنەمای پێنجەم:** ئەم هـزرەیە کە هەمیشە ئامادەی نوێبوونەوەیە و هەمیشە لەسەر دوو گوتەدا بونیاتنراوە، لە بواری بیرو لە بواری بابەتی تیۆرییدا هـزری ئیسلامی دەیەوێت بگات بە ڕاستی، لە بواری کردەوەشدا هـزری ئیسلامی دەیەوێت بگات بە بەژەوەندیی، کە بەرژەوەندیی تاك و کۆمەڵی تیایە، کەواتە لە بوارە تیۆرییەکاندا هـزری ئیسلامی ڕاستی تەواویی تێدایە، لە دەرەوەی مرۆڤەکان حەقیقەت هەیە، بە پێچەوانەی ئەو ئایدیۆلۆژیاو فەلسەفانەی کە پێیانوایە حەقیقەتێك لە دەرەوەی مرۆڤ بوونی نییە، ئەمانە لەسەردەمانی زوودا پێیانوتراوە (سوفستاییەکان یان سوفیست[1])ـەکان، ئەمانە کەسانێك بوون وتوویانە راستییە بابەتییەکان، یان حەقیقەت، لە دەرەوەی مرۆڤـ بوونی نییە، بەڵام هەر لە کۆنەوە بیرمەندە ڕاستەقینەکان وتوویانە (نکووڵیکردن لە واقیعێکی حەقیقی نکووڵیکردنە لە هەموو زانست و زانیارییەك)، واتە ئەگەر ئێمە بڕوامان نەبێت کە لە دەرەوەی ئێمە، لە دەرەوەی بیرکردنەوەی ئێمە جیهانێك هەیەو خاوەنی یاساو ڕێسای تایبەتە،و ئێمە پێویستە ئەو یاساو ڕێسایانە بدۆزینەوە، کەواتە دەبێت زانکۆکان دابخەین، دەبێت زاناکان واز لە زانست بهێنن و خوێندکاران

[1]- کۆمەڵێك بیرمەند و فەیلەسوف بوون کە لە یۆناندا پێش سۆکرات و زۆرتر لە سەدەی چوارەمی پێش زایندا سەریانهەڵدا و سۆکرات دژیان وەستایەوە.

دوای زانست نەکەون! کەواتە تەنها بە بوونی زانکۆو زانست و بیرمەندو بیرمەندان و بە بوونی کەسانێك کە بە دوای ڕاستیدا بگەڕێن، ئیسپاتی ڕاستییەك دەکرێت لە دەرەوەی مرۆڤ، کە بریتییە لە حەقیقەتی بوون (حەقیقەتی وجود)، بەڵام ئەوانەی کە دەڵێن لە دەرەوەی ئینسان بوون نییە کەواتە ئینکاریی ئەوەدەکەن کە لە دەرەوەی ئینسانەکان بوونێك هەبێت، ڕاستییەك هەبێت. بیری ئیسلامی لە بواری تیۆرییدا دان بە حەقیقەتی بووندا دەنێت، دەڵێت: بوون بوونێکی ڕاستەقینەیە، بوونێکی وەهمی و خەیاڵی نییە، لە بواری کردەوە و کارەکانیشدا هـزری ئیسلامی بە دوای بەرژەوەندییدا دەچێت، واتە هەر شتێك بەرژەوەندیی تاکی تیادابێت هـزری ئیسلامی دەڵێت دەبێت بکرێت، هەر شتێك بەرژەوەندیی کۆمەڵگای تیادابێت هـزری ئیسلامی دەڵێت دەبێت ئەو بەرژەوەندییە دەستەبەربکرێـت، دواتر باسی دەکەین کە چی دەبێت بە بەرژەوەندیی، هەمووشتێك کە مرۆڤ حەزی پێدەکات مەرج نییە بەرژەوەندیی بێت، چونکە جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان (خۆش‌و باش) (خۆش‌و چاك)، چونکە ئێمە ئەو فەلسەفەیەمان قبوڵە لەسەر دین کە گەورەیی و شکۆو فەزیلەت ئامانج بێت نەك چێژو خۆشی، لەبەرئەوە یاسایەکی تری هـزری ئیسلامی بریتییە لەوەی کە لە کاتی تیۆرییدا بە دوای حەقیقەتدا دەچێت، کە بە دوای حەقیقەتدا دەچێت مانای وایە کە زانستمان خۆشدەوێت و بە دوای زانستدا دەچین، کە بە دوای حەقیقەتدا دەچین باوەڕمان بە بوونی حەقیقەت هەیە، کە بە دوای حەقیقەتدا دەچین بڕوامان وایە کە حەقیقەت درك دەکرێت، حەقیقەت

باڵندەیەکی مەحاڵ نییە کە نەتوانین بیگرین، حەقیقەت لوتکەیەك نییە کە نەتوانین پێیـبگەین، کە توانیشمان بگەین بە حەقیقەت یان بە ئەندازەی توانای خۆمان توانیمان بگەین بە حەقیقەت، چونکە حەقیقەت دوو ڕووی هەیە ڕوویەکی ڕەهای هەیە کەسمان ناتوانین بەدیی بکەین، بەڵام ڕوویەکی ڕێژەیی هەیە و ڕێژەیی دەتوانین بیدۆزینەوە، کە گەیشتین بەو حەقیقەتە نیسبییە دەتوانین بە خەڵکی دیکەیشی ڕابگەیەنین، کەواتە لە بورای فیکریی و تیۆرییدا ئێمە خاوەنی سێ بیردۆزین کە بوون بە یاسا:

**بیردۆزی یەکەم:** حەقیقەت بوونی هەیە.

**بیردۆزی دووەم:** کە حەقیقەت بوونی هەبوو، ئێمە دەتوانین بگەین بە حەقیقەت.

**بیردۆزی سێهەم:** کە توانیمان بگەین بە حەقیقەت، دەتوانین باسی ئەو حەقیقەتە بۆ خەڵکی دیکە بکەین.

ئەمە لە چیرۆکی میعراجدا بە جوانی پەرەی پێدەبەین، لە چیرۆکی میعراجدا پێغەمبەری خوا ئەو گەشتەی کە کردی لە مەککەوە بۆ قودس‌و لە قودسەوە بۆ ئاسمان، گەڕانێك بوو بەدوای حەقیقەتدا، چونکە حەقیقەتێك هەیە لەبەرئەوە چوو بە دوایدا، کە گەیشت بەو حەقیقەتە ئەوکاتە لەوسەرەوە هاتەوە بۆ ئەوەی بۆمانی بگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی گوزارشت لەو شتانە بکات کە بۆ یـڕوونـبووەتەوە و بۆیـدەرکەوتووە، کەواتە لە بواری تیۆریدا باوەڕمان بەم سێ بیردۆزە هەیە.

لەبواری کردەیی‌و پراکتیکییدا، لە بواری کاروباری ڕۆژانەی خۆماندا بۆ تاك بۆ خێزان بۆ کۆمەڵگا بۆ دەوڵەت چ قازانج و بەرژەوەندیی تیادابوو چ شتێك دووری دەخستینەوە لە فەسادو دووری دەخستینەوە لە پشێوی و دووری دەخستینەوە لە ئاڵۆزی و دووری دەخستینەوە لە کێشەکان، دەبێت پەیڕەویی لێـبکەین، بۆ نمونە ڕێکخستنی ژیان و بوونی ژیانێکی ئارام‌و ژیانێك کە هەموو کەسێك ڕێزو بایەخی پێـبدرێت، هەموو مرۆڤێك مافی پارێزراو بێت، هەموو کەسێك سنوری ئازادییەکانی خۆی بزانێت، هەمووکەسێك سنووری ئەرك و فەرمانەکانی سەرشانی بزانێت، ئەمە لە ڕاستیدا بەرژەوەندیی ئینسانی تیادایە یان نا؟، تاك: ئەوەی کە تاکێکی نمونەییمان بۆ دروستدەکات لە بواری فێرکردندا، لە بواری پەروەردە و وەزشدا، لە بوارەکانی تریشدا دەبینیت فیکری ئیسلامی خەڵکی هاندەدات بۆ ئەنجامدانیان، هـزری ئیسلامی دژی هیچ بەهرەیەکی مرۆڤایەتی نییە گەر ئەو چالاکییە خزمەتی مرۆڤەکانی تیادابێت، بەڵام هەر دەبێت خزمەتی تیادابێت، بەوە نییە کاتێك تەماشای لیستی حەڵاڵەکان و حەرامەکان دەکەین لە فیقهـ و یاسای ئیسلامییدا کەسانێك لێمانـدێنەپێش‌و دەڵێن: باشە ئیسلام بۆ ئەم شتە خۆشانەی حەرامکردووە، یان ئەم شتە ناڕەحەتانەی بۆ حەڵاڵکردووە؟. ئەم مەسەلەیە وابەسەرپێیی لێکدانەوەی بۆ ناکرێت، بیرمەندانی مسوڵمان دەڵێن ئەوشتەی کە تۆ بە خۆشی دەزانی و بەڵاتەوە حەرامە و دەڵێیت ئیسلام حەرامی کردووە وەرە بابزانین بەرژەوەندیی تیادایە؟، کاتێك بەرژەوەندیی تیادایە بەرژەوەندییەکە بۆ تاکێکی

دیاریکراو نەبێت، کەسێك کە دزی دەکات ئەو کەسە سوودی زۆری کردووە و بەبێ ماندووبوون دەچێت پارەیەکی زۆری دەستدەکەوێت بە کاتێکی کەم، بەڵام ئەمە بەرژەوەندیی نییە؟ ئایا ئەگەر دژایەتیی دزیی بکرێت، دژایەتیی بەرژەوەندیی ئەو تاکەمان کردووە یان نا؟! بەڵام لە پێناویدا بەرژەوەندییەکی گەورەمان بەدیهێنا، بەرژەوەندییەکی گەورەمان بۆ خەڵك دەستەبەرکردووە یان نا! کە دڵنیابن لە سەروەت و سامانی خۆیان، جا لەبەرئەوەیە فیکری ئیسلامی بانگەوازدەکات بۆ حەقیقەت لە پێناوی فیکردا، بانگەواز دەکات بۆ بەرژەوەندیی لە بواری کرداریی تاك و لە بواری کرداریی دەوڵەتاندا، ئێستا لە پەیماننامە نێودەوڵەتییەکاندا هەر پەیماننامەیەك هەر تەکەتتولێکی ئابوری یان سیاسی سوودی مرۆڤی تیادابێت فیکری ئیسلامی پشتگیریی لێدەکات و مسوڵمانان پشتگیریی لێدەکەن، بەڵام هەمیشە بانگەوازی ئەوەش دەکات: ئەی خەڵکینە! برۆن وردببنەوە، ئەوەی کە پێیدەوترێت قازانج لەو پەیماننامەو تەکەتتولەدا ئایا بە ڕاستی قازانجە؟ قازانجی کۆمەڵە یان قازانجی گروپێکی تایبەتە؟ ئەگەر قازانجی گشتییە ئایا قازانجێکی کاتییە یان قازانجێکی هەمیشەییە؟ کەواتە خۆشمان لەم وردەکارییانەدا زۆر شت دەخوێنینەوە، زۆر ڕاستی و وردەکاریی دەخوێنینەوە، بۆ نموونە ئەو شتانەی کە بە ناوی ئاشتییەوە باسدەکرێن لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ئایا بە کردەیی مەبەست لێی، ئاشتییە؟! ئایا مەبەست لەوەیە کە میللەتانی ئەم ناوچەیە بەبێ هەراو شەڕو دەمارگیریی پێکەوەبژین؟ ئایا مەبەست ئەوەیە کە وڵاتانی ئەم

ناوچەیە لە ڕووی ئابوری‌و لە ڕووی زانستی و فەرهەنگییەوە بەرەوپێش بڕۆن و سەقامگیریی پەیدابکەن؟ ئەگەر مەبەستییان ئەوەبێت ئەی بۆ ڕێکناکەون؟ ئاخر لەوەتەی کە ئێمە هەین باس لەوە دەکرێت هەوڵێکی نێودەوڵەتی هەیە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەم ئاشتییە بۆ دروست نەبوو؟ بۆ دەبێت دوژمنانی ئاشتی ئەوەندە بەهێزترین لە لایەنگرانی ئاشتی؟ کەواتە ئەگەر ئێمە بێین لە ڕووی فیکری ئیسلامییەوە سەیرێکی بابەتەکە بکەین لە ڕووی بنەماوە ئیسلام دژایەتی نییە لەگەڵ هیچ ئاشتی و ئاشتیخوازێکدا، لەگەڵ هیچ کردارو بیروباوەڕێکدا کە مرۆڤایەتی بن، بەڵام با بێین ئەو فیکرەیە دیاری بکەین، ئایا بۆ خزمەت بە مرۆڤایەتییە؟. ئەمڕۆ باسی بابەتی پەروەردە دەکرێت، ئایا ئەو چارەسەرانەی کە دانراون بۆ چارەسەرکردنی پەروەردە بە کردەیی بۆ چارەسەری کێشەکانی پەروەردەن؟ ئەگەر نیەتەکە ئەوەیە، ئایا ڕێگاکەش ئەوەیە؟ لەبەرئەوە یاسایەك هەیە لە هزری ئیسلامییدا دەڵێت: بۆ هەموو مەبەستێك لە ڕێگەی خۆیەوە بڕۆ، کە بە زمانی زانستی ئەمڕۆ دەوترێت هەموو زانستێك مەنهەجیەتی خۆی هەیە، بۆ نموونە لە زانستە پزیشکییەکاندا مەنهەجیەتێکی تایبەتی هەیە، دیراسەی حاڵەت دەکەن، نەخۆشێك دێتە بەردەستی، ئەو نەخۆشە هەندێك زانیاری گشتی بەسەردا جێبەجێ دەکەن، بەڵام ئەوەشتان لە بیرە کە ئەمە حاڵەتێکی تایبەتە، ڕەنگە وەڵامی بۆ ئەو دەرمانانە نەبێت کە بۆ خەڵکیتر باشە، لەبەرئەوە دەبێت هەمیشە لە ژێر چاودێریی پزیشکییدا بێت، هەموو نەخۆشێك لە ژێر چاودێریی پزیشکی پسپۆڕو

تایبەتدا بێت ئەوە میتۆدی خۆی هەیە، کەواتە پزیشکیی بۆ خۆی میتۆدێکی هەیە، زمان بۆ خۆی میتۆدێکی هەیە، ئەگەر لەو میتۆدە لاتدا ناگەیتە مەبەست، فیکری ئیسلامی بانگەواز بۆ مەنهەجیەت دەکات لەبەرئەوە دەبینین لە باوەشی شارستانێتی ئیسلامییدا ئەو هەموو میتۆدە ڕێكوپێكو وردانەمان هەیەو تا ئێستاش هاتووە، هەر لە مەنهەجی زمانەوانەکانەوە دەستپێبکە، تەماشا دەکەیت دوو خوێندنگەی گرنگ لە بواری زمانی عەرەبییدا دروست بوو، وەك هەردوو قوتابخانەی (کوفەو بەصرە)، هەردووکیان بە کۆمەڵێك زاناو کەڵەزاناوە، ئەم دوو قوتابخانەیە شانبەشانی یەکتری بەرهەمیان هەبووە و هەوڵیانداوە بۆ ئەوەی لە قوڵایی زمانی عەرەبی شارەزابن، لە بواری تەفسیردا ئێمە چەندین قوتابخانەی تەفسیرمان هەیە، تەفسیرمان هەیە بە ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)و فەرموودەی یاران و قوتابییەکانیان (التفسير بالمأثور)، تەفسیرمان هەیە لە بواری فیقهدا, تەفسیری فەلسەفییمان هەیە، تەفسیری ئاماژەیی (إشاري)و صوفییمان هەیە، هەروەها تەفسیری ڕەوانبێژی، هەموویان پێکەوە پشتیوانیی یەکتردەکەن و هەموویان بە یەکەوە یارمەتیدەری یەکترن بۆ ئەوەی زیاتر لە پەرتووکی خوای گەورە تێبگەن، بەڵام هەر کۆمەڵێك بە میتۆدی خۆی.

لە بواری ڕیوایەتکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر) جۆرەها قوتابخانە و زانامان تیادا هەڵکەوتووە.

له بواری فیقهـو یاسادانانـدا، چ یاسای عیبادات بێت یان یاسای موعامەلات، قوتابخانەی حیجازمان هەبووه که پێیـدەوترێت قوتابخانەی (ئەهلی حدیث)، لەگەڵ قوتابخانەی عێراق که پێیدەوترێت (ئەهلی ڕەئی)، له ئەنجامی گفتوگۆی نێوان ئەمانه قوتابخانەیـتـر دروستبوون، بەڵام به مەنهەجیەتی تایبەت و هەرکام مەنهەجیەتێکی خۆی هەبووه، تۆ به پێی مەنهەجیەتیان دەتوانیت مەدرەسەکان له یەکتر جیابکەیتەوه، مانای وایه له بنەمادا هـزری ئیسلامی بڕوای به مەنهەجیەت هەیه به شێوەیەك که چوویته هەرماڵێك دەبێت له دەرگاوه بۆی بچیت، له پەنجەرەوه بۆی نەچیت (ادخلوا البیوت من أبوابها).

له بواری زانستەکانی بنەماکانی ئاین (أصول الدین)دا ئێمه سێ قوتابخانەی سەرەکییمان هەیه:

١- قوتابخانەی (متكلمین)مان هەیه وەك ئەشعەرییەکان[١] و موعتەزیلەکان[٢] و ماتوریدییەکان[٣].

٢- قوتابخانەی ئەهلی حەدیسمان هەیه.

٣-قوتابخانەیەکی تازەشمان هەیه پێیـدەوترێت قوتابخانەی نوێ، ئەم قوتابخانه نوێیه سوود له دەستکەوتەکانی هەردوولا وەردەگرێت.

---

[١] - پەیڕەوانی ئەبوحەسەنی ئەشعەری (٨٧٤ ـ ٩٣٦ز ) و زانایانیتری ئەو قوتابخانەیه.

[٢] - پەیرەوانی (واصلی کوڕی عەطاء و عەمری کوڕی عوبەید)ن که هەردووکیان له کۆتایی سەدەی یەکەم و سەرەتای سەدەی دووەمی کۆچیدا ژیاون، هەروەها هەندێك زانایتری ئەو قوتابخانەیه.

[٣] - پەیرەوانی ئەبو مةنصوري ماتوريدي ( ٣٣٣ کۆچی وەفاتی کردووه) و زانایانیتری ئەو قوتابخانەیه.

**لە بواری فەلسەفەدا ئەوەی کە زانا مسوڵمانەکان پێشکەشی مرۆڤایەتییان کردووە هەتا هەتایە لە مێژوودا دەمێنێتەوە، چونکە ئێمە (فارابی، ئیبن سینا، ئیبن روشد،[١] ئیبن توفەیل،[٢] ئیبن باجە[٣]، غەزالی[٤]،**

---

[١]- ئیبن روشد: محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی روشد (٥٢٠-٥٩٥ك) ژیاوە، دەستیکردووە بەخوێندنو زمانو فیقهـ و زانستی فەرمودەو زانستی کەلامو پزیشکیو فەلسەفەی خوێندوە، لەسەردەمی ئیبن طوفیلدا ژیاوە لەکاتی دەستەڵاتدارێتی (دوله الموحدین) لە مراکشو هاوکاری کردووە، هەروەها بووە بەقازی لەقورتوبە، بەهۆی سەرقاڵبوونی بەزانستی یۆنانیەوە ئیبن روشد توشی گێچەڵو کێشەی زۆر بووەتەوە، چەندین دانراوی هەیە لەوانە (**الكليات في الطب**) و(**مناهج الأدلة في الكشف عن عقائد الـملة**) و(**فصل الـمقال فيما بين الشريعة والحكمة من الاتصال**) چەندین لێکدانەوەشی بۆ پەرتوکە فەلسەفییە یۆنانییەکان کردووە، لەخۆرئاوا هێندە کاریگەربوون بەفەلسەفەکەی هەتا شوێنکەوتەی بەرچاوی هەبووەو ڕێبازێکی تایەتی بەخۆی هەیە بەناوی قوتابخانەی (روشدییە) لەئەوروپا. (د.عبدالرحمن بدوي، موسوعة الفلسفة، ب١،لا ١٩، دواتر، بيروت: المؤسسة العربية للدراسات والنشر، ١٩٨٤.

[٢]- لەپەراوێزی ژمارە (١٣) ئاماژەی بۆکراوە.

[٣]- ئیبن باجە : ئەبوبەکر محەممەد کوڕی یەحیای کوڕی الصائغ (١١٣٨م) ژیاوە, لەکەسە سەرەتاییەکان بوو کە لەمەغریب سەرقاڵبوو بە فەلسفەوە، هەندێك لەمێژوونوسان بەکەسێکی زیرو خاوەن بیرو بڕوایەکی باش باسیان کردووە، هەندێکیشیان تانەیان لێداوە، عبدالرحمن بدوي موسوعة الفلسفة , بيروت: المؤسسة العربية، ١٩٨٤) لا ١٣ دواتر.

[٤]- ئەبو حامد محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی ئەحمەدی توسی، شافعی، (٤٥٠-٥٠٥ك) لە ***طبران*** لە گوندی (غزالة) ، لە نزيك شاری ***طوس***, لەدایکبووە، سەرەتا لەشارەکەی خۆی ژیاوە دواتر کۆچی کردووە بۆ جرجان بۆخوێندن لای ئەبو نەصر ئیسماعیلو زۆر هۆگری بووە، بەهۆی شارەزاییو توانای خۆی، بە بەرگریکاری ئیسلام دانراوە لەسەدەی پێنجی کۆچیدا دژی باتنیو فەلاسیفەو کەلامییەکان، هەر لەو سەردەمەدابوو کە توانی بڕواتە ناو فەلسفەو پەرتوکی(تهافت الفلاسفة) دابنێت، لەم پەرتوکەدا توانی شیکردنەوەیەکی نوێ بۆفەلسفەبە بکات نەك بەکوێرانە لەدوورەوە هێرش بکاتە سەر فەلسەفە بەڵکو هات سەرەتا خۆی فەلەسفەی خوێندو فەلسەفەی کرد بە چەند بەشێکەوە ئەم تەنها لەسەر (الالهیاتو کلام) قسەی خۆی کردو تێکیشکاندن، غەزالی بەوە ناسراوە کە خۆی تەقلید نەکردووە بەهیچ کام لەگەورە فەیلەسوفەکانەوە بەڵکو بۆخۆی ڕێبازێکی نوێی دیاریکرد دوای ئەم شیکردنەوەیە ئیتر توانی دژی باتنیو فەلاسیفە بجەنگێتو سەرکەوتوبێت لەوەڵامدانەوەیان،

**سوهرەوەردی[1]،،، هتد)و ئەو هەموو زانا گەورەمان هەیە کە خۆی بۆ خۆی چەندین نامەی دکتۆراو ماجستێری دەوێت کە باسی بەرهەمەکانیان بکەین، کۆرسێکی خوێندنی دەوێت کە تەنها باسی کتێبی یەکێکیان بکەین، جیاوازی ئەم قوتابخانانە و جیاوازی ئەم لافیتانە لە چیدایە؟ لە میتۆدەکانیدایە، کەواتە هـزری ئیسلامی دەڵێت هـزر مومکین نییە بە بێ میتۆد، لەدایکبوونی هەر قوتابخانەیەکی فیکریی لە هەر بوارێك لە بوارەکانی فیکردا پێویستیی بە بوونی میتۆدێکی تایبەتە، ئەو میتۆدەش ئێستا لە زانکۆکاندا زۆر گرنگی پێـدەدرێت، تەماشا دەکەین لە زانکۆدا وانەیەکی تایبەتی هەیە پێیـدەوترێت میتۆدی توێژینەوە، لەوێدا لێکۆڵینەوە هەرئەوەنییە کە چۆن بتوانیت لێکۆڵینەوەیەك بنووسیت، فێری ئەوەت دەکات میتۆدی**

---

ساڵی٤٨٤ك بووە بە سەرۆکی نیزامییە، چەندین دانراوی هەیە گرنگترین دانراوەکانی: (المستصفى في أصول الفقه، معارج القدس, المنقذ من الضلال, مقاصد الفلاسفة, إحياء علوم الدين, تهافت الفلاسفة, ميزان العمل، كيمياء السعادة، أيها الولد...هتد) چەندین پەرتوکیتر کەهەندێکیان دراونەتە پاڵیو هەندێکیشیان خۆی نوسیویەتی. سەرچاوە: على محمد صلابي، الإمام الغزالي وجهوده في حركة الإصلاح والتجديد، دار المعرفة، بيروت، لبنان، ٢٠٠٦م، الطبعة الأولى، لا١٧.

[1]– سهرەوەردی: یەحیای کوڕی حبش کوڕی ئەمیرك، ئەبولفتوح شەهابەددین سهرەوەردی ناسراوە بە (سهرەوەردیی کوژراو) (٥٤٩–٥٨٧ك) ژیاوە, لەسهرەوەرد لەدایکبووە، لە مراغە گەورە بووە، لە حەلەب نیشتەجێ بووەو هەر لەوێش کوژراوە، واناسراو بووە کەلەسەر بیری تەصەوفی باتینی بووە، بە فەرمانی فەرمانڕەوای زاهیری ئەیوبی کوژراوە، هەرچەند لەناو ئیسلامدا هیچ کەس لەسەر بیروباوەڕ نەکوژراوە مەگەر بووبێتە پاساو بۆی بۆئەوەی کە ئەم کەسە دەستێك هەبێت لەپشت تەکفیرکردنیو بەشێوەیەکی سیاسیو بەفەرمانی فەرمانڕەواکانی ئەوکاتەوە کوژرابن، لەدانراوەکانی: هياكل النور، المطارحات، التلويحات... ئیبن خەلەکان دەربارەی دەڵێت: زانستی زۆرتربووە لەعەقڵی، خير الدين الزركلى، الأعلام، ب٨، لا١٤٠.

جیاوازی لێکۆڵینەوە هەیە، گەلێك میتۆد هەیە، میتۆدی لێکۆڵینەوەی وەصفیو مێژوویی، توێژینەوەی حاڵەتمان هەیە، میتۆدی بەراوردکارییمان هەیە لە نێوان هەموو ڕێبازەکاندا، کەواتە گەلێك زۆرن، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە هـزری بێ میتۆد بوونی نییە و بوونی نابێت.

**بنەمای حەوتەم:** هـزری ئیسلامی زۆر بڕوای بە بەڵگەهێنانەوە هەیە وەك ئەوەی کە وتمان لە درێژەی بوونی میتۆددا ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤـ لەخۆوە قسەی خەڵك وەرنەگرێت، وەك خوای پەروەردگار بە کافران دەفەرموێت:﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ البقرة:١١١، ئەی محەممەد پێیانـبڵێ کە بەڵگەکەیان پێشکەش بکەن ئەگەر ڕاستدەکەن، چونکە مرۆڤی ڕاستگۆ بەڵگەی پێیە، هەر لە ژیانی ڕۆژانەی خۆماندا دەبینین مرۆڤی ڕاستگۆ هەموو گیانی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕاستگۆیە، ئەوەشی کە درۆزنە لە هەرساتێکدا بەڵگەیەك دەدات بە دەستەوە لەسەر درۆکەی خۆی، بەناوچاویداو بە جوڵەیدا، تەنانەت سەیری جوڵەی دەمی بکە دەزانیت کە درۆدەکات، سەیری هەڵسوکەوت و ڕەفتاری بکە، سەیری قسەکانی دوای درۆکەی بکە. کەواتە مرۆڤی ڕاستگۆ لە کاتی خۆیدا قسەکەی بۆنی ڕاستگۆییەکەی لێدێت، لەبەرئەوە لە داستانی یوسفـدا خودی نیشانەکانی ڕاستگۆیی بە حەزرەتی یوسفەوە دیاربوو، یەکەم: کراسەکەی لە دواوە دڕابوو، دووەم: دەرگای لەسەر داخرابوو، چونکە ئەگەر یەکێك بە تەمای تاوان بێت دەرگا لەسەر خۆی داناخات، کەواتە هـزری ئیسلامی زۆر بە دوای

بەڵگەدا دەچێت و هـزرێکی بێ بەڵگە نییە، سەرپێیی نییە و لەگەڵ گرنگیدان بە پێناسەی چەمکەکان زۆر گرنگی دەدات بەوەی کە بەڵگە بهێنێتەوە، بەڵگەهێنانەوەکانیشی فرەچەشنن، لە لایەکەوە بەڵگە دەهێنێتەوە لە یاسای گشتییەوە دێت بۆ حاڵەتی تایبەت، لە لایەکی دیکەوە لە حاڵەتە تایبەتەکانەوە دێت بۆ حاڵەتە گشتییەکان. ئەمانە کۆمەڵێك یاساو بنەمابوون کە هـزری ئیسلامی لەسەری دادەمەزرێت، بەڵام دەکرێت یاسای دیکەش هەبن.

## هزری ئیسلامی

هـزری ئیسلامی چەمکێکی زۆر فراوان و گشتگیری هەیە، هەموو بوارەکانی لایەنی تاکی مرۆڤـ دەگرێتەوە و کورتنەکراوەتەوە لە تەنها بوارێکدا، لەو کاتەوەی کە بیرمەندانی مسوڵمانان بیریان لەوەکردووەتەوە کە بابەتەکانی خۆیان بنووسنەوە و کۆیـبکەنەوە، لەناو خۆیاندا دانیشتن و دیدارو گفتوگۆی زۆریشیان کردووە، ڕەنگە جیاوازیشیان هەبووبێت لە پێشکەشکردنی مەسەلەکاندا، ڕەنگە جیاوازییان هەبووبێت لەو ئەنجامانەی کە پێیـگەیشتوون، بەم پێیە مێژوویەك لە هـزر لە جیهانی ئیسلامدا دروستبووە کە لە ڕاستیدا ئەڵقەیەکی زێڕینە لە زنجیرەکانی هـزری مرۆڤایەتی، ئێمە بە چەندین شێوە و ڕێگا دەتوانین لێکۆڵینەوەی هـزری ئیسلامی بکەین، لێرەدا هەوڵدەدەین بە شێوەیەکی کورت و چڕوپڕ ئاماژە بەو ڕێگایانە بدەین کە بریتیین لە:

**ڕێگەی یەکەم:** بریتییە لە شیکارکردنی مێژوویی، واتە لە ڕووی مێژووییەوە لێکۆڵینەوە لە هـزری ئیسلامی بکەین، باس لەوەبکەین کە هـزری ئیسلامی چۆن دروستبوو؟ بە چ قۆناغێکدا تێپەڕی؟ قۆناغەکانی دەستەبەندیی بکەین،و پەیوەندیی قۆناغی دواتر بە قۆناغی پێشترەوە دیاری بکەین، پەیوەندیی ئەو ڕوداوانەی کە بە سەر تاکی مسوڵمان و کۆمەڵگەی مسوڵماندا هاتووە دیاری بکەین، تادەگەینە ئەمڕۆ بزانین واقیعی هـزری ئیسلامی لە چیدایە؟ لە چ قۆناغێکدا هـزری ئیسلامی توانیویەتی بەرهەمی هەبێت و توانیویەتی کاریگەری هەبێت، هەروەها بزانین لە چ شوێنانێکدا هـزری ئیسلامی وەستاوە و لە چ قۆناغێکدا هـزری ئیسلامی نەیتوانیوە وەڵام بداتەوە، هـزروانە ئیسلامییەکان کەمتەرخەمییان کردووە لەوەدا پێشووی خۆیان پێـتەواو بووە و هیتریان نەخستووەتە سەری، ئەمەش پێیدەوترێت شیکاری مێژوویی، کە پتر لەو پەرتووکانەدا ئاماژەیان پێدراوە کە باسی فیکری ئیسلامی دەکات، یان باسی مێژووی فەلسەفەی ئیسلامی یان مێژووی ئاینزای ئیسلامی یان گروپە ئیسلامییەکان یان باسی بوونی هـزری جیاواز لە فیکری ئیسلامییدا دەکات.

**ڕێگەی دووەم:** پێیدەوترێت ڕێگەی شیکارکردنی بابەتیانە (منهج التحليل الموضوعي)، ئێمە دێین ئەو بابەتانەی کە ئەمڕۆ پرسیارمان لەسەری هەیە دەیانهێنین جیایان دەکەینەوە، ئینجا بێین یەکەی ئەو بابەتانە بێنینە ژێر باسو لێکۆڵینەوە بزانین زانا مسوڵمانەکان چییان لەسەر وتووە؟ بۆ نمونە بزانین زانا مسوڵمانەکان سەبارەت بە

گۆڕانگارییە مێژووییەکان چ بۆچونێکیان هەبووە لەم بابەتەدا، تەنها لە ئاستی گۆڕانی مێژوویدا بوون، ئێمە دەتوانین لە کوێوە دەستپێبکەین، لە یەکەمین بیرمەندی مسوڵمانەوە، لە پێشەوا (ئەبوحەنیفە)وە دەستپێبکەین، بیکەینە خاڵی دەستپێکردن، پاشان لەوێوە بە پێشەواکانی تردا بێینە خوارەوە هەتا دوا کەس کە لە گۆڕانکارییە مێژووییەکانەوە باسیکردووە کۆمەڵگاکان چۆن گۆڕانیان بەسەردادێت؟ چ فاکتەرێك کاریگەری یەکەمی هەیە لە کۆمەڵگایەك بۆ کۆمەڵگایەکیتر، لە بازنە مێژووییەکاندا ئەمە پێیدەوترێت (**منهج التحليل الموضوعي**)، بۆ نموونە بابەتی مێژوو لە ڕوانگەی مسوڵمانانەوە، بۆ نموونە بابەتی گۆڕانکاری لە ڕوانگەی مسوڵمانانەوە، بۆچوونی مسوڵمانان لە سەر فەرمانڕەواییکردن چییە؟ ئەمەش لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیانەی دەوێت تا بزانین چەند تیۆر هەیە لە ناو زانا مسوڵمانەکاندا سەبارەت بە جۆری چۆنیەتی فەرمانڕەواییکردن، تیۆرێکمان هەیە پێیدەوترێت تیۆری شەرعی، تیۆرێکمان هەیە پێیدەوترێت تیۆری دیفاکتۆ (الارض الواقع) کە لە ناو زانا مسوڵمانەکاندا باسکراوە، تیۆرێکی ترمان هەیە پێیدەوترێت تیۆری ڕاوێژ (الشورى)، تیۆرێکی ترمان هەیە پێیدەوترێت تیۆری دیاریکردن (التعيين)، هەموو ئەم تیۆرانەی کە لە ئاسۆکانی ئیسلامەوە سەریانهەڵداوە ئێمە دەتوانین بابەتیانە باسیان لێوەبکەین.

**ڕێگەی سێهەم:** لەسەر بنەمای بیرمەندەکان یان کەسایەتییەکان باسدەکات، کە بە پلەبەندییەکی مێژوویی ئەوانەی کە لە هـزری

ئیسلامییدا بەرهەمیان هەبووە یەك بە یەك باسیان بکەین، وەك ئێستا لە زانکۆکاندا بەشێك لە تێزو ماستەرنامەکان لەسەر ئەو کەسانەن، وەك: پێشەوا غەزالی، ئیبن روشد، ئەبوعەلی سینا، فارابی...هتد، ئێمە ئێستا ئەگەر تەنها ئەم مەنهەجە وەر بگرین تەنها لە هـزری سیاسیی ئیسلامییدا نزیکەی (٣٠٠) بیرمەندمان هەیە کە بیهێنین بۆ هەرکامێکیان چەندین لێکۆڵینەوە تەرخانبکەین لە زانکۆکاندا بخوێنرێن، لە پەیمانگاکاندا بخوێنرێن، کتێبەکانیان بهێنین لێکۆڵینەوەی لەسەربکەین، تەنها کەسێکی وەك (ئەبوحەسەنی ماوردی[١]) بێنینە پێش چاوی خۆمان باسی بیروبۆچوونەکانی بکەین لە بەڕێوەبردنی وولاتدا، لە بواری دادوەریکردندا، لە بواری پەیوەندیی نێوان دەستەلاتدارو پەیوەندیی لەگەڵ جەماوەردا، تەنها (ئەبوحەسەنی ماوردی) بەسە بۆ ئەوەی ئێمە کۆرسێکی خوێندنمان هەبێت لەسەری، ئیتر باسی (فارابی، کندی،[٢] ئیبن خەلدون[١]، کەواکیبی[٢]، محەممەد عەبدە[٣]، جەمالەددینی

---

[١] - ئەبوحەسەن عەلی کوڕی محەممەد کوڕی حەبیبی بەصری ماوەردی (٣٦٤ - ٤٥٠ك)، ( ٩٧٤ - ١٠٥٨ز)، پێشەوای گەورە و گەورەدادوەری دەوڵەتی عەبباسی و خاوەنی گەلێك پەرتووکی بەنرخ و کاریگەرە، وەك (أدب الدنيا والدين) و (الاحكام السلطانية).

[٢] - ئەلکیندی: ئەبو یوسف یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کیندی (١٨٥–٢٦٠ك) ژیاوە، لەهۆزی (کندە)ی عەرەبیە، لەکوفە لەدایکبووە، لەبەغدا کۆچی دوایی کردووە، نازناوی فەیلەسوفی عەرەبی لێنراوە، لەسەردەمی خەلافەتی مەئمون وموعتەصیمدا ژیاوە، سەرقاڵبووە بەوەرگێرانی کتێبی یۆنانی بۆ عەرەبی، گرنگی داوە بە زانستو سروشتو پزیشکیو بەتایبەتی بیرکاری, ئەو پێیوابووە کە مرۆڤ نابێتە فەیلەسوف ئەگەر بیرکاری نەخوێنێت، پەیوەندییەکی پتەوی بە موعتەزیلەوە هەبوو، بەڵام ئەهلی کەلام نەبوو، زۆر بڕوای بە پەیوەندیی نێوان فەلسفەو سروشتەوە هەبوو.

ئەفغانی[٤]،،،، هتد) ناکەین، ئێستاش زانکۆکان و ئەکادیمییەکانی جیهان ئیش لەسەر ئەم بوارە دەکەن و بەمزوانەش تەواونابێت، ئەمە خۆی میتۆدێکی سوودبەخشە کە بیری زانایەك بگریت، فیکری سیاسیی لای غەزالی فیکری کۆمەڵایەتی لای غەزالی، فیکری تەربەویی لای غەزالی، لێکۆڵینەوەی دەروونیی لای غەزالی، ئەمانە هەمووی پەرتووکی لەسەر نوسراوە نامەی ماستەرو دکتۆرای لەسەر هاتووە، مانای وایە ئەمەش بۆ

---

[١]– ئیبن خەلدون: عەبدولڕەحمان کوڕی محەممەد کوڕی محەممەد کوڕی حەسەن وەلیەدین، ئەبوزەید الحضرمي، ناسراو بە ئیبن خەلدون (٧٣٣– ٨٠٨ك )ژیاوە، خەڵکی ئەندەلوس بووە، لەتونس پەروەردە بووە دواتر کۆچی کردووە بۆ ئەندەلوس، زۆر وولاّتی ئیسلامی گەڕاوە، لەهەمانکاتدا پلەو پایەی زانستیو سیاسیو دادی گرتووەتە دەست لەشارە جیاجیاکاندا زۆر شارەزای ژیانو خەڵك بووە، چەندین دانراوی بەپێزی داناوە، وەك(لباب المحصل في أصول الدين، والمقدمة، وتاريخ ابن خلدون) ، لەمیسر کۆچی دوایی کردووە، خيرالدين الزركلي، الأعلام، ب٣، لا٣٣٠.

[٢]- عەبدولڕەحمان کەواکیبی(١٨٥٥ ـ ١٩٠٢). لە سوریا لەدایکبووە. زانا و رۆژنامەوان بووە و بە یەکێك لە پێشەوایانی رێنیسانسی عەرەبی دادەنرێت، خاوەنی پەرتووکی( طبائع الاستبداد و مصارع الاستعباد)ە کە بە باشترین پەرتووکەعەرەبییەکانی سەدەی ١٩ دادەنرێت. کەواکیبی بە گەورە پێشەوای هـزری نەتەوایەتی عەرەبی دادەنرێت. سەردانی وولاّتانی هیند و چین و کەنارەکانی ئاسیا و ئەفریقیا و میسری کردووە.

[٣]- محەممەد عەبدە(١٨٤٩ ـ ١٩٠٥) زاناو موفتی و سیاسەتوان و رۆژنامەوان و دادوەر و بیرمەندی گەورەی عەرەبی کە لە وولاّتی میسر لەدایکبووە و رۆڵی کاریگەری هەبووە لە هـزری هاوچەرخی سەدەی ١٩ و ٢٠ ی عەرەبی و ئیسلامییدا، هاوکار و هاوبیری جەمالەددینی ئەفغانی بووەو هەر لە میسر کۆچی دوایی کردووە.

[٤]جەمالەددینی ئەفغانی(١٨٣٨ـ ١٨٩٧)، زانا و رۆژنامەوان و هـزروان، رۆڵی کارای هەبووە لە رێنیسانسی میسر و جیهانی ئیسلامییدا. هەڵگری ئالاّی دژایەتیکردنی ستەم و دیکتاتۆری بووە و رەخنەی لە دەستەڵاتی قاجاری و عوسمانییەکان بووە.

خۆی میتۆدێکە پێشکەشکراوە و بایی ئەوەیە کە درێژەی پێبدرێت و پەرەی پێبدرێت.

**ڕێگەی چوارەم:** ڕێگەی بەراوردی بابەتییانە، کە بابەتێکی دیاریکراو دەهێنین هەوڵدەدەین هەموو ئەو بیروبۆچوونانە کۆبکەینەوە کە لە سەر ئەو بابەتە پێشکەشکراوە، ئەم بابەتە دەمانکات بە خاوەنی (دائیرەتولمەعاریف ـ ئەنسکلوپیدیا)، دەمانکاتە خاوەنی ئەوەی کە ئەنسکلۆپیدیایەکی گەردونییمان هەبێت لەسەر هـزری ئیسلامی، ئێستا تەنها لە بابەتی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری کۆمەڵێك لێکۆڵەر کۆبوونەتەوە پێنج بەرگ پەرتووکیان نووسیوە تەنها لەسەر ئەو ئایەتانەی کە پەیوەندییان بە(سیاسەت و ئابوری و کۆمەڵگا)وە هەیە، (١٤٧٠٠) فەرموودەیان کۆکردووەتەوە، ئەمەش کەلەپورێکی گەورەیە، وەك چۆن لە ئەمەریکا لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ویلیام جیمس کە فەیلەسوفێکی ئەمەریکییە هات کۆمەڵەیەکی دامەزراند بە ناوی (**جمعية المباحث الروحية**)، ئەمانە (٩٠) بەرگیان لەسەر ڕۆح نووسی، ئەمە خزمەتێکی گەورەبوو بۆ مرۆڤایەتی، یان (ویل دیورانت) کتێبێکی نوسی بە ناوی (**قصة الحضارة**)، کە کۆمەڵێك لێکۆڵەر وەریانگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و (٢٢) بەرگە، دواتر وەرگێڕدراوە بۆ سەر زمانی فارسی، یەك دوو بەرگی کراوە بە کوردی، لە بواری هـزری ئیسلامییدا ئێمە لەوە گرنگترمان کردووە، کە چەندین ناوەند ئێستا لە جیهاندا خەریکی گرنگیدانن بەم بابەتە، بۆ نموونە پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی لە(واشنتن) کە چەندین لقی لە میسرو ئەردەن و بەیروت و لەندەن هەیە،

تائێستا نزیکەی (٣٠٠–٤٠٠) کتێبو نامیلکەی لە بواری هـزری ئیسلامییدا بڵاوکردووەتەوە،جگە لەم ڕێگەیانە ڕەنگە ڕێگای دیکەش هەبن، بەڵام دیارترینیان ئەو ڕێگایانەن کە خستمانەڕوو.

دوای ئەوەی کە باسی ڕێگەکانمان کرد حەزدەکەم ئاماژە بکەم بەچەند سەرنجێکی گرنگ لە بواری هـزری ئیسلامییدا، یەکەمین شت کە سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت ئەوەیە کە فیکری ئیسلامیی لە دایکبووی ساتەوەختە قەیراناوییەکانی ئوممەتە، واتە لەو ساتەوەختانەدا کە قەیران ڕوو لە ئوممەت دەکات لەوکاتەدا هـزری ئیسلامی دەردەکەوێت و بەرجەستە دەبێت و کاریگەریی دەنوێنێت، کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا دادەنێت. بە ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی ئەم ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت، ئاوڕبدەینەوە بزانین کە پێشەوا شافعی کە لە (١٥٠ک) هاتەدونیاو لە(٢٠٤ک) وەفاتی کرد، لە ساتەوەختێکدا پەیدابوو کە خیلافێکی میتۆدی لە نێوان (قوتابخانەی حیجازو قوتابخانەی عێراق)دا هەبوو، خیلافێکی میتۆدی بوو، لە چۆنێتی یاسادەرهێنان لە دەقەکان مەدرەسەی حیجاز پشت تەنها بە گێڕانەوە دەبەستێت و کەمتر گرنگی بە قیاس و بەراورد دەدات، قوتابخانەی عێراقییش پشتی یەکەمی لە سەر عەقڵ بوو، لەو ساتەوەختە مێژووییەدا هەوڵی ئاشتکردنەوەی ئەم دوو مەنهەجە دەدات و لێکیان نزیکدەکاتەوە و مەنهەجێکی نوێ لە چۆنێتی تێگەیشتن لە سەرچاوەکانی ئیسلام پێشکەشدەکات،پاشان زاڵ دەبێت بەسەر

مەحافیلی هـزری فیقهیدا، شافعی[١] بوو بەو شافعییەی کە ناوی لێنرا نوێگەری سەدەی سێهەم، ناوی نرا "ناصر السنة"، ئەو عەقڵە مەوسووعییە و هـزرە فراوانەی کە شافعی هەیبوو ئێستاش کاریگەریی هەیە لەسەر کۆمەڵگا، ئێستاش ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی دابمەزرێت لەسەر بنەمای ئەو قسەیەی ئیمامی شافعی دادەمەزرێت کەلەپەرتووکی (الرسالة)دا فەرموویەتی: (فليس تنزل بأهل دين الله نازلة إلا وفي كتاب الله دليل على سبيل هدايتها) واتە: (هیچ ڕوداوێك ڕوو لە شوێنکەوتوانی ئاینی خواناکات ئیللا دەبێت لە کتێبی خوادا ڕێگایەك هەبێت بۆ ڕێنمایی خەڵك کە چۆن بیدۆزنەوە)، ئەمە بنەمای دروستکردنی دەوڵەتی شەرعییە، واتە تۆ کە لە ڕووی سیاسییەوە هەوڵدەدەیت بۆ دەوڵەتێکی شەرعی، ئەوەی کە ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە لە گیرو گرفت، ئەوەی کە ڕووبەڕووی مێشکی مرۆڤ دەبێتەوە لە پرسیار، ئەگەر وریابیت زانابیت لە قورئانەکەی خوادا وەڵامەکەی دەدۆزیتەوە، یان کێشەیەکت بۆ دروستدەبێت، دەتوانیت لە قورئان و فەرموودەدا وەڵامەکەی بۆ بدۆزیتەوە، ئەمە یەکەمجار پێشەوا شافیعی رایگەیاند، لەبەرئەوە پەرتووکی (الرسالة)ی

[١]– عەبدوڵای کوڕی محەممەدی کوڕی ئیدریسی قوڕەیشیی شافعی (١٥٠ – ٢٠٤ك) لەغەززە لەدایکبووە، قورئانو زمانی عەرەبی خوێندووە، ڕۆیشتووە بۆ بیابان بۆفێربونی زمانوئەدەب، (موطأ)ی لەبەرکردووە، کاتێك تەمەنی لەپانزەساڵ تێپەڕی نەکردبوو، زاناترین کەس بووە لەقورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر(د.خ)، شارەزابوو لەزانستی فیقهـ و نەسەبو زمانەوانیدا، خاوەنی فەهرەست دەڵێت: ناودارترین پەرتوکەکانی: (الأم) لەفیقهدا (الرسالة ) لەئوصولی فیقهدا، و(مسندالشافعي) لەفەرمودەدا.. تاريخ الأدب العربي، احمد الزيات، دار المعرفة، بيروت، الطبعة التاسعة، ٢٠٠٥، ل٢٨٢.

نووسی. کەواتە هەلومەرجەکە ئەوەی خواست، لە هەلومەرجێکی قەیراناوییدا کەسایەتییەکی وەك شافعی دروستبوو.

سەردەمێکی ترمان هەیە، گەر سەرنجی سەردەمی (عیززی کوڕی عەبدولسەلام) بدەین کە لە ساڵەکانی (٥٧٧-٦٦٠ك)دا ژیاوە، کە سەردەمی کۆتاییەکانی دەوڵەتی عەباسی بوو، (عیززی کوڕی عەبدولسەلام) لە میصر ژیاوە و پەیڕەوی مەزهەبی شافعی بووە، بەڵام خۆی لە پلەی ئیجتیهاددا موجتەهیدێکی ڕەهابووە، ئەم کەسایەتییە کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەناو مسوڵمانانەدا بۆ ئەوەی خەڵك ڕوو لە بەرژەوەندیی شەرعی بکەن، واتە وایلێهاتبوو کە خەڵك بەرژەوەندیی شەرعی لە بیرچووبوویەوە و بەرژەوەندیی تەنها بەرژەوەندیی گروپ و تایەفە بوو، بەڵام ئەم زانایە بە شێوەیەکی تیۆریی و بە شێوەیەکی پراکتیکی سەلماندی کە ئیسلام ئاینی بەرژەوەندیی و دابینکردنی بەرژەوەندییە ڕاستییەکانە، ئاینی بەدیهێنانی بەرژەوەندییە ڕاستییەکانە، ئەو بەرژەوەندییانەی کە ئیسلام باسیدەکات بەرژەوەندییە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بۆ مسوڵمان و نامسوڵمان بۆ ئایندار و بێئاین، کتێبێکی دانا بە ناوی (قواعد الاحکام فی مصالح الانام) تەنها ئەوەندە نەبوو، بەڵکو لە پاڵ ئەمەدا دووکاری گرنگیشی کرد:

**یەکەم:** ڕاستکردنەوە و ڕێنماییکردنی دەستەڵاتداران بۆ ڕێگای ڕاست، هەمیشە وەك ئۆپۆزسیۆنێکی دەستووریی فەرمانی بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەکرد.

**دووەم:** کۆمەڵێك شاگردو زانای باشی پێگەیاند کە بە هەمان ڕێچکەدا بڕۆن، ناودارترینیان زانایەکە وەك قیرافی (شهاب الدین القرافی)، کە تەنها زانایەکی فیقهی نەبووە بەڵکو ئەندازیاریش بووە و شارەزابووە لە زانستی ئەندازیارییدا لە (٦٨٤ك)دا وەفاتیکردووە، ئەم زانایە لەگەڵ ئەوەدا کە مەزهەبەکەی جیابوو لە (عیززی کوڕی عەبدولسەلام)ـی مامۆستایو لەسەر مەزهەبی مالیکی بوو، بەڵام میتۆدەکەی هەمان میتۆدی بەرژەوەندیگەرایی بوو، کەواتە ئەمە خاڵێکی گرنگە کە بزانین لە هەرشوێنێك قەیران هەبێت لەوشوێنانە زیاتر هـزری ئیسلامی ڕۆڵدەبینێت، بەڵام لە شوێنێکدا کە قەیران نەبێت کۆمەڵگەیەکی وەستاو دەبێت، دیارە هـزری ئیسلامییش وەك پزیشك لەو شوێنانە دەوەستێت، دەزانن کە چەند گرنگە کە نەخۆشیی هەبێت، هەرشوێنێك نەخۆشیی تیادانەبێت ڕەنگە خەڵك بڵێن پزیشکمان بۆ چییە، هەرشوێنێك نەزمی تیاداهەبێت خەڵك دەڵێن ئەندازیارمان بۆ چییە، بەڵام کە ڕێکوپێکی نەبوو خەڵك زیاتر هەستدەکەن پێوستییان بە ڕێکخستنە.

هەندێکجار لە بەرامبەر تەحەددای دەرەکییدا ئەو کێشانەی کە لە دەرەوە فەرزدەکرێن بەسەر کۆمەڵگای ئیسلامییدا، هـزری ئیسلامی لە سەرەتاوە لاواز دەبێت، دەسپێشخەرییان لە دەست دەردەچێت، بەڵام فیکری ئیسلامی نامرێت، گەرچی لاواز دەبێت، بەڵێ لە سەرەتای قەیرانەکاندا مسوڵمانان هەندێك سستییان توشدەبێت و ڕەنگە هـزروانەکانیان نەتوانن بە جوانی وەڵامی تەحەددیەکان بدەنەوە، ڕەنگە نەتوانن دەرەقەتی ئەو هەموو گێژەڵووکە وماڵوێرانییە ببنەوە کە لە

دەوروبەرەوە ڕووی تێدەکەن، بەڵام سەرەنجام هـزری ئیسلامی بەهێزدەبێتەوە و بەخۆیدا دێتەوە و دیاردەی نوێبوونەوە لەناو زانا مسوڵمانەکاندا سەرهەڵدەدات، ئەمەش جەختکردنە لەسەر خاڵی پێشوو کە وتمان هـزری ئیسلامی هـزرێکە لە قەیرانەکاندا دەردەکەوێت و بە دڵنیاییەوە لە قەیراندا بوژانەوەی بەسەردا دێت، لە قەیراندا زانا مسوڵمانەکان فێری داهێنان و نوێگەریی دەبن، چونکە ئەم هـزرە ئیسلامییە پشتیوانییەکی بە هێزی هەیە کە پێیدەوترێت شەریعەت و پەیامی پێغەمبەر محەممەدی مصطفى (درودی خوای لەسەر)، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە کە دەڵێن: لە هەندێك حاڵەتدا دەبینین هـزری ئیسلامی کاریگەری پێویستی نییە؟ لەگەڵ ئەوەی کە هـزروانە ئیسلامییەکان (کە پێوستە ڕۆڵی خۆیان هەبێت) بۆچی لێرەدا ئەو ڕۆڵـەیان نەبووە؟ ئەمە قسەیەکی ڕاستە، وەڵامی ئەمە ئەوەیە کە خەتای هـزری ئیسلامو شەریعەتی ئیسلامو بەرنامەکە نییە، تاوانەکە پەیوەندیی هەیە بە چۆنێتی و جۆری خستنەڕووی هـزرەکە، لەو سەردەمو ساتەوەختانەدا کە هـزری ئیسلامی دووردەکەوێتەوە لە واقیعو گرنگیی بە ژیانی کۆمەڵایەتی تاك نادات و گرنگیی بە ژیانی تایبەتی کۆمەڵگا نادات و گۆشەگیر دەبێت و لە کونجێکدا خۆی قەتیسدەکات، لەوکاتانەدا فیکرەکە دەبێت بە هـزرێکی گۆشەگیرو کاریگەریی لەسەر کۆمەڵگا نابێت، لەمڕووەوە هەندێك نموونەمان هەیە لە مێژوودا کە بە زۆر یان بە پیلان یان بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان گۆڕەپانیان بە هـزروانە مسوڵمانەکان چۆڵکردووە، ئیتر بە زەبروزەنگی دیکتاتۆرەکان

بووبێت یان بە ناحاڵیـبوون و بە خەواندن و بە هـزری دەرەکی بووبێت، ئالەو حاڵەتانەدا مادام هـزری ئیسلامی دادەبڕێت لە واقیعی کۆمەڵایەتی و سیاسی و پەروەردەیی خەڵك، هەست بە کاریگەریی هـزری ئیسلامی ناکات، بۆ نموونە لە وولاتی خۆماندا چەندین هەوڵدان هەیە بۆ ئەوەی هـزری ئیسلامی هـزرێکی ئەکتیڤو کارا نەبێت، ئەو هەولانەش هەندێکیان لە دۆستە نەزانەکانەوەیە، (دۆستی نەزان ئەوەیە کە وادەزانێت تۆ هەر دەبێت شتەکانی پێشوو بلێیتەوە)و وتنەوەی شتەکانی پێشوو بە بێ دابەزاندنی لەسەر واقیعی کۆمەڵگە و بە بێ بووژاندنەوە و بە بێ وەرگێڕانیان بۆ سەرزمانی ڕۆژ دەبێت بە هۆکاری ئەوەی کە خەڵك هـزری ئیسلامی نەوێت، وەك ئەوەی ئێمە ئێستا بێین تیروکەوان بگرین بە دەستمانەوە پەلاماری شاخی گۆیژە بدەین.

ـ بۆچی بە تیروکەوانەوە پەلاماری شاخی گۆیژەت داوە؟

ـ کاتی خۆی دوژمنێك هاتووە بۆ شاری سلێمانی لەوکاتەدا کەس نەبوو بە تیروکەوان لە دژی بوەستێت، ئێستا من ئەچم بە تیرو کەوان لە دژی دەوەستم!

واتە هەندێك کێشەو هەرا هەیە تازە تەواوبووە و کاتی بەسەرچووە تۆنابێت بە ناوی هـزری ئیسلامییەوە جارێکیـتر ئەو کێشانە باسبکەیتەوە، ئێستا خەڵك کێشەی تازەی بۆ دروستبووە، ڕەنگە ئەوکێشانە لە پەرتووکی زاناکۆنەکاندا هەر نەخرابنەڕوو تا وەڵامیانی دەستکەوێت، وەك ئەوەی تۆ بڕۆیت لەناو کتێبی (قانون)ی ئیبن سینادا بە دوای ئایدزدا بگەڕێیت، ڕاستە کتێبی قانونی ئیبن سینا چاکترین کتێب

بووه لە کاتی خۆیدا بەڵام ئەو نەخۆشییە کە ئەمڕۆ دۆزراوەتەوە ئەوکاتە بوونی نەبووە، کەواتە ئیبن سینا هەرچەند زانابووە و پێیوتراوە "الشیخ الرئیس"، پێیوتراوە "حجة، حق، شرف الملك"و مامۆستای سێهەمە دوای فارابی کە دوای ئەرەستۆو فارابی، ئیبن سینا مامۆستای سێهەمی مرۆڤایەتییە، ئەمە لە گەورەیی ئەبوعەلی سینا ناهێنێتەوە خوارەوە کە تۆ نەتوانیت باسی ئایدز لە کتێبەکەیدا بدۆزیتەوە، کەواتە کاری پزیشکەکانی ئەمڕۆیە درێژەبدەن بە میتۆدی ئیبن سینا لە پزیشکییدا، ئەوان بۆ خۆیان بێن چارەسەری ئەو نەخۆشیانەی ئەمڕۆ بدۆزنەوە. هـزری ئیسلامییش بە هەمان شێوە ڕەنگە بابەتی تیابێت لە مێژوودا هەبووبن، ئێستا ئەو کێشانە نەماون، ڕەنگە ئێستا ئەو کێشانە هەر نەخرێنە ڕوو، گەر ئێمە خۆمان سەرقاڵ بکەین بەو کێشانەوە لە ڕاستیدا هـزری ئیسلامی دەکوژین و دەیکەین بە هـزرێکی مردوو، لەبەرئەوە پێویستە ئێمە قسە لەو بابەتانە بکەین کە ئێستاکە قسەو باسی لەسەرە و مەحافیلی جیهانی گەرمکردوە، باسی مافی مرۆڤ و پێگەی مرۆڤ بکەین، باسی گرنگیی مرۆڤ و زانیاریی بە گشتی و ڕێگاکانی زانیاری بکەین، ئەمە کاتی خۆی زاناکان باسیان لێوەکردووە بەڵام لەسەر میتۆدی ڕۆژگاری خۆیان.

بەڵام ئێمە خۆشبەختانە سەرچاوەیەکمان هەیە لە سەرووی کات و شوێنەوەیە کە قورئانە. قورئانی پیرۆز سەرچاوەی یەکەم و سەرچاوەی نەمرە و هەمیشەییە بۆ هـزروان کە میتۆدەکانی بیری خۆی دیارییبکات لەسەر بابەتە جیاوازەکان لە بوارە جیاوازەکانیشدا، واتە بواری تەشریع

بۆ خۆی بوارێکی سەربەخۆیە. بەڵام قورئان خاوەنی میتۆدە، لەبەرئەوە بواری پەروەردە بوارێکی سەربەخۆیە بەڵام قورئان خاوەنی میتۆدە بۆی، هـزری ئیسلامی نەك تەنها یەك میتۆد لە باریدا هەیە، بەڵکو توانای هەیە چەندین میتۆد پێشنیازبکات بۆ ناوەندەکانی زانست و مرۆڤایەتی، ئەو میتۆدانەی کە قورئانیش پێشنیازیان دەکات دژ بە یەك نین، میتۆدگەلی جیاواز هەن، بەڵام یەکتر تەواودەکەن و پشتی یەکتری دەگرن، چونکە ئێمە لە قورئاندا دەتوانین "میتۆدەکانی ئەدەب" هەڵاوێنجین و ، "میتۆدەکانی هونەر"یش هەڵاوێنجین، هەروەها تەشریعیش، نەك تەنها قورئانیش هەموو درێژەی ئەو بابەتەی تیابێت، دەبێت بەهەڵەدا نەچیت، دەبێت زانستەکەی ئەمڕۆ فێرببین و چاویلکەی ئەمڕۆ بخەینە سەرچاومان ئینجا بڕۆینە ناو ئاسۆو گەردوونی قوئانی پیرۆزەوە و بڕۆینە ناو ئاسۆو گەردونی سوننەتی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر)، ئینجا بزانین کە شەریعەتی ئیسلامی لە هەناویدا هەیە کە نوێگەریی پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکات یان نا! نمونەیەك باسدەکەین کە هەر لە قورئاندا ئامارەی بۆ کراوە، باسی ئەوەی تیایە کە کەسێك کۆمەڵێك ئاژەڵی دەبێت ئاژەڵەکان دەڕۆنە ناو دەغڵودانی کەسێکیترەوە هەموو دەغڵودانەکە تێکدەدەن بەسەریەکدا، خاوەن دەغڵەکە توشی ناکۆکی (نیزاع ) دەبێت لەگەڵ خاوەن ئاژەڵەکان، دێن بۆ لای حەزرەتی داوود، حەزرەتی داوود دەڵێت: پێویستە خاوەن ئاژەڵەکان دەغڵودانی خاوەن دەغڵەکە ببژێرێت، چونکە ئاژەڵەکانی ئەو زیانیان بەو گەیاندووە، بەڵام سولەیمانی کوڕی داوود پێشنیازێکی دیکە دەخاتەڕوو، هەرچەند

بۆچوونەکەی داوودیش شەرعییە، بەڵام ئەم دەڵێت: خاوەن ئاژەڵەکان ئاژەڵەکانی بداتە خاوەن دەغڵۆدانەکە و خاوەن دەغڵ و دانەکەش دەغڵۆدانەکەی بداتەدەست خاوەن ئاژەڵەکان، هەریەکەیان بۆ ماوەی ساڵێك دەغڵۆدان و ئاژەڵی یەکتر بەخێو بکەن، لە ئەنجامدا دەستکەوتی ئەوساڵەیان بگرنەوە پاشان بیگۆڕنەوە، ئەمە دوو میتۆد بۆ چارەسەرکردنی یەك کێشە، میتۆدەکەی داوود میتۆدێکی ڕاستە بەڵام بۆ ئەوکات و شوێنە مەنهەجەکەی سولەیمان دادپەروەریی زیاتری تیابووە، ئەمە تەنها داستانێك نییە کە قورئانی پیرۆز بۆمانی بگێڕێتەوە، بەڵکو بەرنامەیەکە لە بەردەم فەقیهێکی شەرعزاندا دەبێت تا بزانێت ئەو دوو ڕێگەیە کامیان گونجاوترن لەو کێشانەی کە ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە. لە قورئانداو لە هـزری ئیسلامییدا ئێمە لە جیاتی میتۆدێك دەتوانین چەندین میتۆدمان هەبێت، ئەم مەنهەجانە یەکتر ڕەدناکەنەوە بەڵام یەکتری تەواودەکەن و لە ئەنجامدا دەبنەوە بە یەك.

خاڵێکیتر کە زۆر گرنگە سەرنجی بدەین، هـزری ئیسلامی زۆر جەخت دەکاتەوە لەسەر ڕێگەکانی فێربوون، ئەوەی کە بە زمانی ئەمڕۆ پێیدەوترێت (ابستیمۆلۆجیا) یاخود تیۆری مەعریفە، میتۆدی فێربوون (میتۆدۆلۆجیا) تەماشادەکەیت هـزری ئیسلامی هەنگاوێکی بەرزی ناوە بۆ هەموو ئەمانە، ئەگەر سەیری فەلسەفەکانی پێش ئیسلامو فەلسەفەی ئێستا بکەین، دابەش بوون بۆ: فەلسەفەی ماددیی، فەلسەفەی میسالی، فەلسەفەی باطني،و قوتابخانەی حەقیقەتی ڕێژەیی‌و قوتابخانەی نکووڵیکردن لە حەقیقەت، کە پێیدەوترێت سوفستائییە، بەڵام هـزری

ئیسلامی و مەدرەسەی ئیسلامی لە پێشدا پشت بە عەقڵ دەبەستێت کە سوودوەرگرێت لەوەی لە هەستەوە دەستیدەکەوێت، واتە عەقڵ بانگ دەکات دەیەوێت عەقڵ ڕاپەڕێت، بۆ نموونە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ الأعراف:١٨٥.

**لەم بارەیەوە چەندین ئایەت و فەرمودەمان هەیە.**

﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ﴾ الطارق:٥. بامرۆڤ بیر بکاتەوە و تێفکرێت و بڕوانێت بزانێت لە چی دروست بووە چۆن دروستبووە لە کوێوە هاتووە.

﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاء فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ﴾ ق:٦واتە: ئایا سەیری ئاسمانیان نەکردووە لە سەرووی خۆیانەوە کە چۆن بونیاتمان ناوە و ڕازاندوومانەتەوە و هیچ کەلێنێکیشی تێدانییە، لة شوێنێکیتردا دەفەرموێت:﴿فَانظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ الروم:٥٠. واتە: سەیری بەرهەمەکانی ڕەحمەتی خودا بکە چۆن خاکی زەوی زیندووکردەوە پاش وشکبوون و مردنی، لێرەدا دەبێت زاناکانی کشتوکاڵ باسی پرۆسەی سەوزبوونمان بۆ بکەن چۆن ڕووەك دەڕوێت، دەزانن کە زانستی کشتوکاڵ دەریای کشتوکاڵ چەندین لقوپۆپی لێدەبێتەوە و زەریایەکە و تەواونابێت.

لەشوێنێکیتردا دەفەرموێت:﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاء فَأَحْيَا بِهِ الأرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخِّرِ بَيْنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ البقرة:١٦٤. ئەمە هەمووی وریاکردنەوەی عەقڵی ئینسانە بۆ ئەو شتانەی کە تۆ دەیبینیت لە دەوروبەرت، تۆ ئاوا بە بێباکانە بە سەریدا ڕانەبوریت، هانتـدەدات بۆ ئەوەی کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەیت، لێکۆڵینەوەی ئەمانەش بە زانست دەکرێت، لە بەرئەوە هزی ئیسلامی دۆستی زانستە و هـزرێکی خورافی نییە، هـزرێك نییە کە پشت بە لێکدانەوەی بێ ئەزمون ببەستێت، ئەم بابەتی بیرکردنەوە و سەرنجدانە لە قورئاندا بەوردیی، (٤٩) ئایەتی لەسەرە کە باسی بیرکردنەوە و قووڵبوونەوە و سەرنجدان بەوردیی، دەکات.

خاڵێکیتر کە زۆر گرنگە لە هـزری ئیسلامییدا، پێشتریش ئاماژەمانـپێدا، ئەوەیە: زۆر حساب بۆ کەسی بەرامبەر دەکات، ناڵێت ئەوەی کە هەتە بیڵێ‌و گوێ بە قسەی خەڵك مەدە، بەڵکو پێیاندەڵێت: ﴿وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ النحل:١٢٥ لە گەڵیاندا فێری گۆڕینەوەی بیروبۆچوون ببە، (مجادلە) واتە گۆڕینەوەی بیروبۆچوون و بەڵگە، زانایان لە پێناسەی مجادەلەو مونازەرەدا دەڵێن بریتییە لە (بەیەکدادانی بەڵگەکان لە نێوان دووکەسدا هەتا ڕاستی دەردەکەوێت)،

من بەڵگەیەك دەخەمە ڕوو، تۆش بەڵگەیەك دەخەیتە ڕوو، لە ئەنجامدا دەبێت ڕاستیی دەركەوێت، چونكە ڕاستیی لە نێوان بەڵگەكاندا خۆیمان نیشاندەدات، خۆی پەردە لەسەر خۆی لادەدات، لەبەرئەوە لە هەرشوێنێكدا دوو كەس دانیشتن و بە یەكەوە موناقەشە و موجادەلەیان كردو ئامانجیان دەركەوتنی ڕاستیی بێت، ڕاستیی دەردەكەوێت. بەڵام ئەگەر ئامانجیان تەنها دەمەدەمەكردن و خۆدەرخستن بێت، حەق دەرناكەوێت، حەق ناچێتە ئەو جێگایانەی كەسی خۆبەزلزانی تیادابێت، حەق ڕوو لەو شوێنانە ناكات.

لەشوێنێكیتردا دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ العنكبوت:٤٦. مجادەلە مەكەن لەگەڵ خاوەن پەرتووكەكاندا مەگەر بە چاكە، بە چاكە موناقەشەیان لەگەڵدا بكەن، چونكە پێشینەیەكی فەلسەفیی‌و جەدەلییان هەیە، كەواتە دەبێت ئاگاداری قسەكانیان و ئاگاداری میتۆدەكانیان بن، كەواتە میتۆدەكانی فەلسەفەی ئیسلامی زۆر گرنگی دەدات بە بیروبۆچوون و زانیاری،و داكۆكی دەكات لەسەر بەكارهێنانی زانستی گەردوونی. كەواتە ئێمە وەك مسوڵمان پێویستە زانامان هەبێت لەو زانستە سروشتییانەی كە هەیە، لە پزیشكییەوە بیگرە تا دەگاتە بایۆلۆژی، تا دەگاتە جیۆلۆجی و لەوێوە تا كشتوكاڵ‌و هەموو ئەو زانستانەی كە پێوستن ببن بە چاویلكە بۆ دۆزینەوەی چواردەورمان، تا لە جیهان تێبگەین، كەواتە

یەکەم ڕێگا بانگکردنی عەقڵو ڕاکێشانی عەقڵو ڕاهێنانی عەقڵە لەسەر ئەزمونگەری، دووەم ڕێگا ڕاهێنانی عەقڵە لەسەر ئەوەی لەگەڵ بەرامبەردا ئامانجت ڕاستیی بێت بۆ ئەوەی کە ڕاستیی دەرکەوێت، تەنانەت دەڵێن (ئەبوحەنیفە) هەرکاتێك گفتوگۆی لەگەڵ کەسێکدا دەکرد پێش گفتوگۆکە نزای کردووە وتوویەتی (خوایە! ئەگەر حەق لای کەسی بەرانبەرمە دەمەوێت سەرکەوێت با من شکست بهێنم)، ئەو ڕوحیەتەیان لە خۆیاندا پەروەردەکردووە، خۆیان واداناوە کە تەسلیمی حەق ببن باحەقەکەش لەلای بەرامبەریشەوە بێت، کە ئەمە ڕوحیەتێکە ئێستا دەستناکەوێت، ئێستا سەیری بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان بکەین بەتایبەت ئەو گفتوگۆو دانیشتنانە کە لە تەلەفزیۆندا دەردەکەون، یان ئەو قسەو لێدوانانە کە لە پەرلەمانەکانی دونیادا دەردەکەوێت، هەرکەس دەیەوێت پاڵپشتی بۆچوونەکەی خۆی بکات و بە زۆر دەیەوێت ئەو بۆچوونەی خۆی بسەپێنێت، تەنانەت حەقی لەبەرچاو ڕۆشندەبێت بەڵام لەبەر لوتبەرزیی ئامادەنییە خۆی تەسلیمی حەق بکات، ئیسلام ئەم ڕوحیەتەی ئەبوحەنیفەی تیادا دروستدەکات، بۆچی؟ چونکە ئیسلام دەفەرموێت:﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ﴾ الأنفال: ٤٢. ﴿بَيِّنَةٍ﴾ ئێمە بە دوای ﴿بَيِّنَةٍ﴾ دا دەچین دوای ئەوەی کە فێری ئەوەمان دەکات کە بە دوای حەقدا بڕۆین، مەنهەجی ئیسلامی ڕێگەی لە لێکدانەوەش نەگرتووە، لێکدانەوەی

فیكری و فەلسەفی و عەقڵی، چونكە لە مێژووی ئیسلامییدا ژمارەیەكی زۆر فەیلەسوفو بیرمەند دەبینین كە لەوپەڕی پلەی نوێگەریی عەقڵییدا ژیاون، واتە گەیشتونەتە بەرزترین پلە لە بواری لێكدانەوەی عەقڵییدا، لەم ماوەدا كتێبێكی (ئیبن روشد)م دەوتەوە تەماشام كرد كە عەقڵی ئەم پیاوە چەند گەورەیە، ئەم هێزە عەقڵییەی لە كوێوە هێناوە؟ یان كتێبێكی (ئیمام حەرەمەین ئەبومەعالی عەبدولمەلیك جوینی) باسی بابەتێك دەكات پێچەوانەكانیشی دەهێنێت، پاشان ڕەخنە لەخۆشی دەگرێت، پاشان هەوڵدەدات وەڵامی ئەو ڕەخنەیە بداتەوە كە لە خۆی دەگرێت، قسە دروستدەكات بۆ بەهێزكردنی بۆچوونی بەرامبەرەكە، ئەم مەنهەجە عەقڵییە یەكێكە لە تایبەتمەندییەكانی هـزری ئیسلامی. بە ڕاستی هـزری ئیسلامی داستانێكە كۆتایی نایەت هەربەردەوامەو بەردەوامتر دەبێت.

# ئازادی بیروڕا لە هزری ئیسلامییدا

ئازادی بیروڕا لە ڕوانگەی هـزری ئیسلامییەوە چۆنە؟ کاریگەری ئازادی لەسەر یەکبوونی مسوڵمانان لەسەر بابەتە هـزرییەکان لە بواری هـزرییدا چۆنە؟ کە ئەمە بۆ خۆی بابەتێکی گرنگە. ئێمە کە تەماشای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەگەڵ فەرمودەکان دەکەین سەیردەکەین مرۆڤـ بانگکراوە بۆ یەکتاپەرستی و بڕواهێنان بە خوای پەروەردگارو ملکەچبوون بۆی، داوای لێکراوە کە بە سەرنجەوە باوەڕبهێنێت، بە بیرکردنەوەیەکی ئازاد سەیری جیهانی دەوروبەر بکات، بە بیرکردنەوەیەکی ئازاد وتووێژبکات لەگەڵ ئەوکەسانەی کە بانگەوازی خواپەرستی بەرزدەکەنەوە.

بەو شێوەیەی کە لە قورئانی پیرۆزدا بیروباوەڕی ئیسلامی باسکراوە هیچ بیروباوەڕێك بە بێ ئازادکردنی بیروبڕوا ناگونجێت بە دەستبێت، لەبەرئەوە هەمیشە لەگەڵ بێباوەڕاندا پێیانوتراوە ﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ البقرة:١١١. واتە: ئێوە بەڵگەتان لەسەر بێـبـڕوایی خۆتان چییە؟ فەرموو بیهێنن ئەگەر ڕاستدەکەن!

جا کە پێغەمبەرانیش دێن بۆ ئەوەیە کە خەڵك بڕوا بهێنن بە پەیامەکانیان بە بەڵگەوە و، بە بەڵگەو ڕوونکردنەوەوە دێنە مەیدانەوە.

لەسەر ئەم بنەمایە دەبێت یەکێتی هـزری مسوڵمانان ڕەچاوبکەین، مسوڵمانان وێڕای ئازادی بیروبۆچوون، وێڕای جەختکردنەوە لەو مافە ڕەچاوی هەندێك بنەما بکەن، یاخود هەست بە هەندێك بنەمای سەرەکی بکەن لە بوارە هـزرییەکاندا.

یەکێك لەو پایە گرنگانەی کە ئازادی بیروڕای لەسەر دروستدەبێت و ئەو مافەی پێدەسەلـمێنرێـت بۆ تاك، بریتییە لەوەی ئەو کەسەی کە بیردەکاتەوە ئەهلی قسەکردن و گفتوگۆبێت، دەبێت گفتوگۆیەکی گشتگیری هەبێت، واتە بە دیدگایەکی گشتگیرەوە بێتە مەیدان، ئەوەتا کە یەکێك شتێکی خوێندەوە یان ڕۆژنامەیەك یان گۆڤارێك یان لە خولێکی ڕاهێناندا بەشداری کرد پێویستە بە تەواویی ئامادەبێت بۆ ئەوەی گفتوگۆبکات، چونکە دیالۆگـکردن و وتووێژکردن پێویستی بەکەرەستە هەیە، لەبەرئەوە لەپێشدا وێڕای جەختکردن لەسەر ئازادی بیروڕا جەختدەکرێت کە مرۆڤـ فێری زانست و خوێندەواری بێت، لەبەرئەوە دەبینین یەکەمین ئایەت کە هاتەخوارەوە بۆ پێغەمبەر(د.خ) باسی خوێندەواری و خوێندن بوو، ﴿اقرأ﴾ بوو، ﴿اقرأ﴾ تەنها خوێندنەوە نەبوو، ﴿اقرأ﴾ لەگەڵ ﴿اقرأ﴾ ی ئێمەمانان ئەو جیاوازییەی هەیە کاتێك خوای پەروەردگار بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت ﴿اقرأ﴾ و لە ڕێگەی ئەویشەوە بە ئێمە دەڵێت ﴿اقرأ﴾ ، مەبەستی ئەوەیە کە شت وەك خۆی بخوێنینەوە، واتە ئەوەنییە کە خەڵك بۆمانی بخوێنێتەوە و بۆمانیشی ڕاڤەبکات، ئەوە ئازادی تیادانییە، ئازادی بریتییە لەوەی کە ئێمە بگەینە ئەو ئاستەی کە بتوانین خۆمان شت بخوێنینەوە و خۆمان

جیهان بخوێنینەوە و ژیان بخوێنینەوە، بەبێ ئەوەی کە خۆمان ئەو توانایە پەیدابکەین ڕەنگە خوێندنەوەی خەڵکیتر سوودی نەبێت بۆمان، دەبێت بە لاسایی (تەقلید)، دەبێت بە چاولێکەری، وەك هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن یەکەمین کارێك کە حەزرەتی ئیبراهیم کردی لە بزاڤی هزری خوێندنەوە ئەوەبوو لە کۆتی باووباپیرانی دەرچوو، کۆتی چاولێکەریی پساند، ئەو زنجیرەی پساند کە باووباپیری چۆن بیردەکەنەوە دەبوایە ئەمیش وەها بیری بکردایەتەوە، کە ئەم کۆتەی پچڕاند گەیشت بە یەکتاپەرستی و پاشان خۆشی بوو بە باوك، ئەوەش ڕوونە کە باوکایەتی ئیبراهیم ئێستاش باوکە بۆ باوەڕداران و ئێستاش خەڵك شانازی پێوەدەکەن، باوکە بۆ یەکتاپەرستان، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ﴾ البقرة:١٣٥. بەڵام ئەو خۆی مرۆڤەکانی لە سیستەمی باوکسالاری ڕزگارکرد، مرۆڤەکانی هێنایە قۆناغی بیرکردنەوەی ئازاد، جا یەکەمین پایە بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت ئەو مافەی کە هەیەتی لە ئازادی بیروڕا بۆ ئەوەی کە بە جوانی بیگەیەنێت بە ئامانجو بە جوانی لەخۆیدا بەرجەستەی بکات، بە جوانی بە دەستی بهێنێت، ئەوەیە کە هەوڵبدات خاوەنی بیروبۆچوونێکی گشتگیرانەبێت و بەشێوەیەکی جوزئی سەیری بابەتەکان نەکات، ئێمە زۆرجار ئەو کێشانەی کە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە لە هەموو ئاست و قۆناغەکاندا ئەگەر لێی تێفکرین، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێمە بەشێوەیەکی جوزئی سەیری مەسەلەکانمان کردووە، باشترین نمونە ئەوەیە کە ئێمە لەم ڕۆژانەدا باس لە هەموارکردنی یاسای باری کەسێتی

دەکەین لە هەرێمی کوردستاندا، ئەو کەسانەی کە بە ڕاست و چەپدا بۆ ئەم بابەتە بیروبۆچوونیان پێشکەش کردووە یان بۆچوونیان دەربڕیوە، سەیردەکەین زۆریان سەرنجی جوزئییان لەسەر مەسەلەکە هەیە، بیر لەوە دەکاتەوە مافی ئافرت بپارێزێت، بەڵام مافی چەند ئافرەتێك! مافی ئەو کۆمەڵە ئافرەتەی کە خۆی دەیانناسێت! مافی ئەو ئافرەتانەی کە لەگەڵ خۆیانن و باوەڕیان بەشتێك نییە، بۆ نمونە باوەڕیان بە فرەژنی نییە، باوەڕیان بە مەسەلەی تەڵاقو خولعو نەفەقە و ئەوشتانە نییە، ئەمە بۆچوونی جوزئییە ناتوانیت لە دونیا یاسایەك بدۆزیتەوە کە هەموو خەڵك لەسەدا سەد لێی ڕازی بن و گلەییان لێی نەبێت و داوای هەموارکردنەوەی نەکەن، کەواتە سەرنجی جوزئی ئەوەیە کە چەند کەسێك دێن لە ڕوانگەیەکی تایبەتەوە یان حاڵەتێکی تایبەتەوە لە مەسەلەیەك دەکۆڵنەوە، لەبەرئەوە سەیردەکەین ئەو یاسایانە دەردەچێت کە بەرژەوەندیی کۆمەڵێکی کەم دابیندەکات، بەڵام بەرژەوەندیی چەندین کۆمەڵەی زۆر پێشێڵدەکات، یاخود لەلایەکەوە ئەگەر مافێك بۆ ئافرەت بەدەستبهێنێت چەند مافێکیتر پێشێڵدەکات و هەندێك مافی دیکە لە کیسدەدات، یان ئەگەر مافی ئافرەت بەدەستبهێنێت مافی پیاو پێشێڵدەکات، مافی ئافرەت بەدەستبهێنێت مافی منداڵ پێشێڵدەبێت، دەڵێت مرۆڤ بۆی هەیە قسەبکات و بیروبۆچوون دەربڕێت، بەڵام ئایا مرۆڤ بۆی هەیە هەموو قسەیەك بکات؟

ئەو قسەی کە دەتەوێت بیکەیت، دەبێت بیبێژیت و لای خۆت بیچێژیی و ئینجا بیبێژی و بیدەیت بە خەڵك، کەواتە یەکەمین خاڵ ئەوەیە کە ئەوکەسەی دەیەوێت ئازادی بیروڕای هەبێت (کە هەشیەتی)، دەبێت ئەم مافەی بە جوانترین شێوە پیادەبکات. خەڵك لە مومارەسەکردنی ئەو بۆ مافەکەی سوود وەربگرێت و خۆشی سوودببینێت دەبێت تاپێیدەکرێت خوێندەوارییەکەی خۆی بەهێزتر بکات، ئاستی ڕۆشنبیرییەکەی بەرزتر بکاتەوە، سەرنجی گشتگیرتر بێت بۆ شتەکان، بەشێوەیەکی گشتگیرترو کراوەتر سەیری بابەتەکان بکات، هەرئەوەنییە کە بە سادەیی سەیری شتەکە بکات، وەك چۆن ئەندازیارێك کە خانوویەك دروستدەکات دەبێت لە هەموو ڕوییەکەوە سەیری ڕێکخستنی خانوەکە بکات، سەیری ئەندازەی زەوییەکە بکات، سەیری هەموو ڕووەکانی بکات کە پێوستن لە دروستکردنی خانوودا، پاشان بیر لەوەبکاتەوە کە چ نەخشەیەکی بۆ دابنێت، کە نەخشەکەی دانا بزانێت چ کەرەستەیەکی بۆ دەهێنێت و ڕۆژبەڕۆژیش چاودێریی بکات بزانێت ئەو بینایە بە پێی دیزاین وەك نەخشە دیاریکراوەکەیە یان نا، بە پێی مواصەفات و پێوانە نێودەوڵەتییەکانە یان نا، ئەو زانستە بخاتەکارو دواتر ئەو پڕۆژەیە وەربگرێت و باسی ئەوەبکات کە ئەم پڕۆژەیە وەك خۆی جێبەجێ کراوە و بە پێوەری ئەندازەیی خراپەی تیانییە، کەواتە بەڵێ ئازادی بیروڕا مسۆگەرە بۆ هەمووان، فەلسەفە نوێکان ئەو مافەیان بۆ مرۆڤ سەلماندووە کە ئەو زاتەی هەبێت لە بیروڕادا، بەڵام هەموو کەسێك دەتوانێت ئەو مافە بەوجۆرەی کە

پێویستە جێبەجێ بکات بەوشێوەیەی کە ئەدای دەکات بەسوودبێت بۆ کۆمەڵگا، بەومیتۆدەی کە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر) هاتووە مرۆڤ پەروەردە دەکرێت لەسەرئەوەی کە خوێندەوار بێت، لەسەر ئەوە پەروەردە دەکرێت کە هەمیشە بە دوای ڕاستیدا بگەڕێت، لەبەرئەوە سەرنجدەدەیت لە قورئاندا زۆر باسی حەق هاتووە، لەبەرئەوە باسی حەق دەکات چونکە کە حەق هات دەبێت بەتاڵ جێگە بەجێبهێڵێت وەك مەحوی دەفەرموێت:

**کە باتل بەرامبەر حەق وەستا بەتاڵە ئیشی**

**گەردی بەبادە خاکێ بێ هەڵپژێت لە گەردون**

واتە کە حەق هات ئیشی باتڵ دەڕوات، جا لەبەرئەوەیە لە بیرو باوەڕی ئیسلامییدا عەقڵ نرخو بایەخێکی تەواوی هەیە، ئەو عەقڵە پەروەردە دەکرێت، هـزری ئیسلامی فێری ئەوەمان دەکات مرۆڤـ لەهەر چوار ئاستی بوونی (وجودی)ـەکەدا شارەزابێت، چوار ئاستە بوونییەکە وەك لە کەلتوری ئیسلامییدا هاتووە، ئەمانەن:

یەکەم ئاستی بوون: بوونی واقیعییە.

دووەم: بوونی شت لە خەیاڵدا(ذهن).

سێیەمین: بوونی شت لە نوسیندا.

چوارەمین: بوونی شت لە کاتی قسەکردندا.

هەمووشتێك چوار جۆر بوونی هەیە:

١. بوونی حەقیقی، کە لە واقیعدا هەیە.

٢. بوونێکیتر کە پێیدەوترێت وێنە، ئەو وجودە حەقیقییە، لە زیـهن و عەقڵی مرۆڤدا هەیە، ئەوە پێیدەوترێت (الوجود الذهني).

٣. بوونێکی دیکە هەیە بۆ هەر شتێك کە قسەی لەسەردەکەیت، پێیدەوترێت (الوجود اللفظي) کاتێك کە باسی دەکەیت و ناوی دەبەیت.

بوونێکیتر هەیە پێیدەوترێت (الوجود الصوري یان الوجود الخطي) کاتێك کە دەنوسرێت یان دەبێت بە نوسین.

هەندێك لە بیرمەندان دەڵێن ئاستی پێنجەم هەیە بۆ بوون کە بریتییە لە(الوجود السنني) واتە بوونێك کە لە ڕاستیدا مرۆڤەکان خۆیان بوون دەدەن بە شت، خەیاڵدانی مرۆڤـ دروستیدەکات، کە ئەمەیان بیرمەندە نوێکان باسیان کردووە کە ئیمامی غەزالیش ئاماژەی پێکردووە لە کتێبی (فیصل التفرقة بين الاسلام والزندقة) لەوێدا ئاماژە بۆ ئاستی پێنجەمی بوون دەکات پێیدەوترێت (الوجود الخيالي) یان (الوجود الوهمي) کاتێك کە خەیاڵی مرۆڤـ دەستکاری زانیارییەکانی خۆی دەکات و بوون دەدات بە هەندێك شت کە تەنها لە وەهم و خەیاڵدا هەن، وەك ئێستا لە زانستی نوێدا ئاشکرابووە، زۆر شت هەیە کە شەپۆلە بەڵام چاوی ئێمە دەستکارییان دەکات، وەك پرسیاری: ڕەنگ چییە؟ یان: دەنگ چییە؟ ئەمە ئەگەر مرۆڤەکان نەبن نەدەنگو ڕەنگ مانای هەیە نەخەیاڵی مرۆڤـ تەصەروف دەکات لە ڕەنگو دەنگەکاندا، لەبەرئەوە بیرمەندی مسوڵمان بۆی هەیە لەسەر ئەم ئاستە بونیادییە قسەبکات، چ ئاستی وجودی حەقیقی بێت چ وجودی زیهنی یان وجودی لەفزی بێت، چ نووسین چی بوونی خەیاڵی بێت، مەبەست ئەوەیە کە تۆ

باسی بوونی شتێك دەكەیت دەبێت ئاگات لەوەبێت كە بوونەكانت لێ تێكنەچێت، بوونی زیهنیت لێ تێكنەچێت لە بوونی واقیعی، بوونی خەیاڵكارییت لێ تێكنەچێت لەگەڵ بوونی نووسین و بوونی نووسراویی، بۆ نموونە ئێستا مەسەلەی یەكسانیی ژن و پیاو تائاستی وجوودی نووسراویی‌و وجودی خەیاڵی هیچ مانیعێكی نییە، بەڵام كە دێیتەسەر ئەو واقیعەی كە تیایدا دەژیت، ئایا ئەو یەكسانییە مومكینە؟ ئایا هیچ دووشتێك لەم سەرزەوییەدا هەیە یەكسان بن؟ هیچ دووبایەخێك هەیە لەم بونەوەرەدا یەكسان بن؟ كەواتە یەكسانی وجودێكی ئیعتبارییە، بوونی یەكسانی ڕەنگە لە بۆچوونێكەوە بۆ بۆچونێكی دیكە بگۆڕێت.

پایەیەكی دیكە بۆ سەلماندنی ئازادی بیروڕا بەستنەوەی ئەو ئازادییەیە بە یەكتاپەرستییەوە، واتە ئێمە كە ڕێگەمان دا بە تاكێك یان مافێكمان هەبوو هەموومان وەك تاكێك لە بیروبۆچووندا، دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین جاروبار سنورێكمان هەیە پێیدەوترێت سنوری ئاگاداربوون لە یەكتاپەرستی، واتە هەرچەند تۆ ئازادی بدەیت بە كەسێك لە فەلسەفە و لۆژیكداو لە زانستی كۆمەڵایەتییداو لە زانستی (نەحو، صەرف، ئەندازیاری، یاسا.. هتد)، ناتوانیت ئازادی ئەوەی بدەیتێ كە بنەماكانی ئەو زانستانە هەڵوەشێنێتەوە، واتە یەكێك بڵێت من باوەڕم بە ئازادیی بیروڕا هەیە با هەموو تیۆرییە یاساییەكان هەڵوەشێنینەوە، لەبەرئەوەی من باوەڕم بە ئازادیی بیروڕا هەیە باهەموو بۆچونە فیقهییەكان هەڵوەشێنینەوە، چونكە ئەمەش ئازادییە كە من هیچ پەیوەست نەبم بە هیچ تیۆرو بیروبۆچوون و كەلتورێكەوە،

بەڵام هیچ کەسێك قبوڵی ئەو ئازادییە ناکات کە بڵێت وەرە تۆ بە ناوی ئازادیی بیروڕاوە لە بنەمای ئاینەکان بدە، لە بنەمای قوتابخانە زمانەوانییەکان بدە، لە بنەمای مەدرەسە فیکرییەکان بدە، چونکە ئەوکاتە بابەتەکە لەوە دەردەچێت کە نایانەوێت ناوی ئازادیی بیروڕا بێت. کاتێك کە ئازادی دەخرێتەڕوو،و باسدەکرێت، گوتەزایەکی دیکە دەخرێتەڕوو کە پێیدەوترێت پابەندبوون (التزام)و بەرپرسیارێتی، ئەگەر ئێمە ڕێگەبدەین کەسێك بە ناوی ئازادییەوە هەرچییەکی ویست بیکات و بیڵێت، ئەوکات دەبێت دان بەوەدابنێیت کە لەگەڵ ڕێگەدان بەو ئازادییە ڕێگە لە ئازادییەکانی دیکە دەگرین، لەبەرئەوە هەمیشە ئازادیی بیروڕاش لە سنورێکدا دەوەستێت کە پێیدەوترێت سنوری بنەما سەرەکییەکانی هزر. لە ئیسلامیشدا ئازادیی بیروڕا هەیە هەتا کاتێك شتەکە دەگاتە باسی یەکتاپەرستی، کەواتە هەر شتێك ناتەبایی هەبوو لەگەڵ ناوەڕۆکی یەکتاپەرستی، کە باسیدەکەین، ئەوکاتە مانای ئازادی پەیدادەکات کە هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ یەکتاپەرستیی و یەکخواناسیدا نەبێت، ئەگەر بەهۆی ئازادیی بیروڕاوە شتێك بهێنیت پێچەوانەی یەکتاپەرستی بێت، ئەوکاتە هەر یەکتاپەرستی ڕێگەت پێنادات، چونکە ئەو ئازادییەی ڕێی لێدەگیرێت لەگەڵ گریمانەی یەکتاپەرستییدا وەك نموونەی کۆمەڵێك مرۆڤ وایە کە سواری کەشتییەك دەبن لەسەر سەکۆی کەشتییەکەو لەناوکەشتییەکە ئازادن بۆ هەرکوێیەك دەچن، بەڵام ئەم ئازادییە مەحکومە بەوەی کە لە چوارچێوەی کەشتییەکە دەرنەچن، جا لەبەرئەوەیە ئازادی لە هزری ئیسلامییدا بریتییە لەوەی کە دەبێت لە

چوارچێوەی پابەندبوون بەیەکتاپەرستییدا بێت، جائەگەر ئێمە بڵێین ئازادیی بیروڕا بەبێ قەیدوشەرتەو هیچ چاودێرێکی بەسەرەوەنییە، وەك ئەوەمان لێدێت کە بە هۆی ئازادیی بیروڕاوە بانگەوازبکەین بۆ نەمانی پابەندبوون و یاساکان و دروستبوونی پشێوی و ئاڵۆزی لەسەر هەموو ئاستەکاندا، چ ئاستی خێزان و کۆمەڵگا بێت چی ئاستی دەوڵەتان و ئاستی هەموو مرۆڤایەتی بێت، ئەم گونجانە لەگەڵ بنەمای یەکتاپەرستییدا بەهایەکی گەورەی هەیە، چونکە زۆرجار ئەو دژایەتییەی لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا دروستدەبێت لە نێوان بیروبۆچوونە جیاوازەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئاگادارنەبوون لەم ئاستی یەکتاپەرستییە، بەهایەك کە ئیسلام بانگەوازی بۆ دەکات و خەڵکی لەسەر پەروەردە دەکات و جیاوازن لەو بەهاو نرخانەی کە فەلسفەیەکی ماددیی یان فەلسەفەیەکی پراگماتی یان فەلسەفەیەکی وجودی بانگەوازی خەڵکی بۆ دەکەن، هەر بۆ نموونە هونەر کە بریتییە لە بوارێکی زۆرفراوان بۆ داهێنان و ئەفراندنی پارچەی شیعری و پەخشان و شانۆو دەرهێنانی فیلمو دەرهێنانی گۆرانی و سروودو ئاهەنگ و...هتد، ئەم بوارە فراوانە ئەگەر لەسەر بنەمای فەلسەفەیەکی ماددیی دابڕێژیت و بەڕێوەیببەیت، دیارە شتێك دروستدەبێت کە ئەمرۆ هەموولایەك دەبیبینن، کە جیهانێك لە بێمانایی و جیهانێك لە پوچگەرایی و جیهانێك لە غەریزەپەرستی بەناوی هونەرەوە بڵاودەبێتەوە کاریگەری دادەنێت لەسەر ئاستی خوێندن و ڕۆشنبیری و پابەندبوون و پەیوەندییە خێزانییەکان و پەیوەندییە

کۆمەڵایەتییەکان،و دەبێت بەدەرگایەکیش بۆ نەمانی گەورەیی و بەهاو بایەخەکان، بەڵام هەر ئەو هونەرە ئەگەر لەسەر بنەمایەکی هزی ئیسلامی و هـزری یەکتاپەرستی دابمەزرێت، دەبێتە مایەی پەروەردەکردن و بارهێنانی خەڵك لەسەر بایەخە بەرزەکان، دەبێت بەهۆی پتەوکردنی خێزان، دەبێت بەهۆی بەهێزکردنی پەروەردە ئینسانییەکان، دەبێت بەهۆی ڕووناکیبەخشین بەدەروونەکان، کەواتە ئەم پابەندبوونە بەبنەمای یەکتاپەرستییەوە لە بواری ئازادی بیروڕاو نوسین و قسەکردن و کارکردن و هەموو بوارە زیندووەکاندا، کاریگەرییەکی یەکلاکەرەوەی هەیە لە مەسەلەکاندا.

پایەیەکی دیکەی گرنگ لە ئازادیی بیروڕاو یەکبوونی فیکری لەناو مسوڵماناندا: بریتییە لەوەی کە هـزری ئیسلامی بانگی خەڵك دەکات بۆ ئەوەی کە واقیعی بن و لە خەیاڵدا نەژین. ئەگەر لە بارودۆخێکی خەمناکدا بوویت هەستتدەکرد نەخوێندەواریی زۆر بڵاوبووەتەوە لە وڵاتدا، هەستتدەکرد نادادگەری زۆر بڵاوبووەتەوە و دیکتاتۆرییەت هەیە، هەستت دەکرد دەنگەکان گیراون و زارەکان بەستراون، لەوکاتەدا تۆ دەبێت واقیعی بیت و بڵێیت: ئێمە ئەمە بارودۆخمانە، ئەمە لە لایەکەوە بۆ چارەسەرکردن، لە لایەکیتریشەوە دەبێت واقیعی بیت بزانیت چی پێویستە، سەیردەکەیت ئەو بەڵگەو ئایەتانەی کە مسوڵمان دەیهێنێتەوە بۆ قسەکانی خۆی پێویستە هەمووی بەڵگەی واقیعو بەرجەستە بن. خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ﴾ فصلت: ٥٣. واتە ئەگەر یەکێك بەدوای بەڵگەدا بگەرێت

تۆ له ئاسۆكانی سروشتدا دەیبنیت، ئەگەر نەشتوانیت له ئاسۆكانی سروشتدا بیدۆزیتەوه ئەوه دەتوانیت سەرنجێكی بوونی خۆت بدەیت كه ئێستا خۆت جیهانێكی گەورەیت، بەڵام ئاگاداری خۆت نیت.

﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلُ﴾ الروم:٤٢ واته: بگەڕێن بەزانستی مێژوو و شوێنەواردا، بەجوگرافیاو هەر زانستێكدا، بڕۆن بەدونیادا بگەڕێن، بەشێوەكی ستوونی بگەڕێن، بەشێوەیەكی ئاسۆییش بگەڕێن، بگەڕێنەوه بۆ پێش مێژوو، بگەڕێنەوه بۆ هاوچەرخەكانی خۆتان و بەكۆمەڵگه جیاوازەكاندا، ئینجا بەراوردی خۆتان بكەن بەخەڵكانیترەوه، ئەمه ئەوپەڕی واقیعیەته كه مرۆڤ بەراوردی خۆی بكات بەگەلانی دیكه، له هەموو لایەنەكاندا، بەراوردی ئاستی پەروەردەیی و زانستی و ئەخلاقی و پێكەوەبوونی كۆمەڵایەتی، باخۆمان بەراوردبكەین، ئێستا له كوردستاندا ئێمه زۆر پێویستمان بەبەراورد هەیه، كەواته ئازادیی بیروڕا لەوەدایه كه پەیوەستت ناكات بەوەی كه تۆ خۆت بەراوردبكەیت بەیەك شێوازو جۆر، ئیسلام ناڵێت تۆ تەنها خۆت بەراوردبكەیت بەیەك میللەت و یەك قۆناغی مێژوویی، هەموو قۆناغه مێژووییەكانت لەبەرچاو دەكاتەوه و هانتدەدات بۆ ئەوەی بڕۆیت دیراسەی هەموویان بكەیت دەرگای هەموو میللەتانت لێدەكاتەوه و هانتدەدات بۆ ئەوەی بچیت دیراسەی هەموویان بكەیت، واقیعییەت ئەمەیه وەك ئەوەی كه چۆن تەماشای سەرەوەی خۆت دەكەیت تەماشای خوارەوەی خۆشت بكه، لەسەر ئەم بناغەیەشه كه له ئیسلامدا گرنگی بەمیتۆدی ئەزمونگەرایی دەدرێت، واته شتێك هەتا

ئەزمونی لەسەر نەکرابێت تۆبڕیاری لەسەرمەدە، یان ئەگەر ئەزمونیش کرا لە شوێنێك، مەرج نییە ئەگەر لەوێ سەرکەوتووبوو لێرەش سەرکەوتووبێت، ئێستا ئێمە لە زۆرشتدا دەکەوینەهەڵەوە لەوبوارانەدا، وادەزانین فلان ئەزمون لە فلان شوێن سەرکەوتووبووە لای ئێمەش سەرکەوتوودەبێت، تەنها تەماشای ئەنجامەکان دەکەین، ئەگەر لە وولاتێکیتر کارێکی چاك کرابێت وادەزانین هەرئەنجامەکەی باشە ئێمەش دەتوانین ئەگەر بەشێوەش لەوان بچین هەمان ئەنجاممان دەستدەکەوێت، ئەمە مەرج نییە وابێت، دەبێت پێشەکییەکان و ڕێخۆشکەرەکانیش ڕەچاوبکەین و دیراسەی بکەین، بەمشێوەیە ئەگەر هەموو مسوڵمانان واقیعی بن هەنگاوێکی زۆرگەورە دەنێن بۆ ئەوەی کە یەك پارچە بن، بەڵام تەماشادەکەیت ئێمە زۆربەی ئیشەکانمان ئەوەیە کە ئێمە واقیعی نین، بەشێکمان واقیعی بین بەشەکانی ترمان ناواقیعین، زۆر لە مسوڵمانان ئێستا لە دووتوێی کتێبەکاندا دەژین، واتە ئیسلامەکەیان ئیسلامێکی تیۆرییە، فەرموودەو ئایەتی زۆری لەبەرە، ئەفکاری زۆری پێیە، بەڵام کە بیەوێت لە واقیعدا تەرجەمەی بکات تووشی کێشەدەبێت، لەبەرئەوە هەمیشە دونیا فیکریی و تیۆرییەکەی زۆر جوانترە لە دونیا واقیعییەکەی، خولیاو خەونەکانی زۆر جوانترن لەوەی کە خۆی هەیە، ئێمە دەمانەوێت هەمیشە خەونەکانیشمان لە ئاستی واقیعماندا بێت، ئەو خەونانەی کە بۆ ئەم جیهانە دەیبینین، ئەو خۆشییانەی کە پێشبینیی دەکەین لەم دونیایەدا دەستمانبکەوێت، دەبێت لە ئاستی خۆماندا بێت، نەزۆر زیاتربێت بۆ ئەوەی کە دەستمان

نەکەوت تووشی نائومێدیی نەبین، نەکەمتریش بێت چونکە ئەوکاتەی کە ئێمە ئەو چاوەڕوانییانەی خەڵك کەمتر لە واقیعی ئێستا بەدیبهێنین خەڵك ڕووناکاتە ئیسلام. ئەوشارە جوانەی کە هـزروانە ئیسلامییەکان پێشکەشی خەڵکیان کردووە دەبێت کارێکی واقیعی بێت، یۆتۆپیایەك نەبێت کە هەرگیز بەدی نەیەت.

زۆرجار، تەنانەت لە زانکۆش باسمدەکرد بۆ خوێندکارەکان، ئێوە کە وێنەی مەدینە دەکەن وامەزانن کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دانیشتبێت و هاوەڵەکانیش ئیشیان نەبووبێت هەمیشە بەلای پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر) دانیشتبن و قسە و بەسەرهاتی بۆ باسکردبێتـن و بەزۆر دایناین قورئانی پێخوێندبنەوە و بەزۆر ڕۆژووی پێگرتبن، نەخێر هەرگیز وانەبوون، خەڵك ئاسایی خەریکی ژیانی خۆیان بوون، هەرکەس چووە بەلای کاری خۆیەوە. ئەرکە ئاینییەکان ئەوەندە زۆرنین کەس نەتوانێت کارەکانیتری ئەنجامبدات، ئەوەی کە جوتیار بووە چووە بەلای جوتیاریی خۆیەوە، ئەوەی کە بازرگان بووە، چووە بەلای بازرگانیی خۆیەوە، ئەوەی کە ئیشی بازاڕی کردووە ئیشی خۆی هەبووە، هەبووە خەریکی وەستایی بووە، هەندێك خەریکی ئاودێران بوون و هەندێکیش خەریکی ئاژەڵبەخێوکردن بوون، هەمووشیان هاوەڵی پێغەمبەر بوون (درودی خوای لەسەر)، لەبەرئەوە تەماشادەکەیت فەرموودەکانی پێغەمبەر ژمارەیەکیان فەرموودەی (ئَحاد)ن، واتە تاكوتەرا هاوەڵان دەیگێڕنەوە، ئەو فەرموودانە کە من کە موتەواتەرن کە بە جارێك سەد هاوەڵ گێڕابێتیانەوە لەچاو فەرموودەی (احاد) دا، ئەمە

نیشانەی ئەوەیە کە ژیانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر)و هاوەڵانی ژیانێکی واقیعی بووە، ژیانی کۆمەڵێك فریشتە نەبووە، بەڵام ژیانی کۆمەڵێك مسوڵمانی حەقیقی بووە لەسەر زەویدا، لەبەرئەوە لە ژیانی پێغەمبەرو ژیانی هاوەڵانیشدا کاتی ناخۆشی و دڵتەنگی هەبووە، حاڵەتی هەژاریی و دەوڵەمەندیی هەبووە، حاڵەتی پێکەوەبوون و لێکجیابوونەوە هەبووە لەناو خێزانەکاندا، کێشەی واهەبووە چارەسەرکراوە، کێشەی وەهاش هەبووە چارەسەرنەکراوە، ژن و پیاو لەیەك جیابوونەتەوە، قەیران هەبووە، گرانی هەبووە، جاری وەهاش هەبووە باران و خێروخۆشی ڕووی کردووەتە ووڵات، وەك چۆن ئێستا کۆمەڵگە هەموو حاڵەت و گۆڕانێکی بەسەردادێت، ئەو گۆڕان و حاڵەتانەش هەر هەبوون لەوسەردەمەدا، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە مرۆڤ دەبێت واقیعی بێت، لەگەڵ ئەو واقیعیبوونەدا تۆ ممارەسەی ئازادیی بیروڕای خۆت دەکەیت، ئەمەیە نیشانەی مسوڵمانێتی.

پایەیەکی دیکە لە پایەکان، ئازادیی بیروڕا بۆ ئەوە نییە کە هەموو خەڵك دەستبکەن بەسەناخوانی و پیاهەڵدان و دەستخۆشیکردن، بەڵام کۆمەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵگەی فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپەیە، بنەمای حیکمەتی دانی ئازادیی بیروڕا بەتاکەکان بەتایبەت بۆ مسوڵمانەکان بۆ ئەوەیە کە مافی ئەوەیان هەبێت ئەگەر چاکەیەکیان بینی خەڵك وازی لێهێناوە فەرمانی پێبکات، خراپەیەکیان بینی دەبێت ڕێگری لێبکەن، ئەمە بەزمانی ئەمڕۆ پێیدەڵێن ڕەخنەگرتن، واتە بوونی ئۆپۆزسیۆن، واتە بوونی دیدێکی ڕەخنەگرانە لەپاڵ سەلماندنی مافی

ئازادیی بیروڕا، ئەوکەسەی کە ڕێگەی پێدەدەیت قسەبکات و قسەیەك دەکات کە بە دڵی دەستەڵات نییە و بەدڵی منی نەوعی نییە، کەواتە ئەو دیدە ڕەخنەگرانەیە زۆرگرنگە، تەنانەت پێغەمبەران (دروودی خوایان لەسەر) کە چوونەتە ناو کۆمەڵگاکان ڕەخنەیانگرتووە، بەڵام نەك ئەو ڕەخنەی کە بە تەواوی بیەوێت ئەو کۆمەڵگایانە بڕوخێنێت، ڕەخنەی بنیاتنەرو چارەنوسسازو دروستکەر، بۆ نمونە: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللّهِ وَقَالَتْ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللّهِ ذَلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ يُضَاهِؤُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبْلُ قَاتَلَهُمُ اللّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ }التوبة:٣٠.

یان لە شوێنێکیتردا دەفەرموێت ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ﴾ لقمان:٢١.

کەواتە، کاتێك یەکێك قسەیەکی کرد بەرامبەرت، تۆ یەکسەر خۆت تەسلیمی مەکە، یەکسەر قسەکە وەرمەگرە، تەنانەت ئەگەر هاوبیری خۆشتبێت، قسەیەکی کرد بەشێك لە قسەکەی ڕاستبوو بەشێکی هەڵەبوو پێیبڵێ بەشێك لە قسەکەت ڕاستە و بەشێك لە قسەکەت هەڵەیە، ئەگەر بۆچوونێك یان هەڵەیەکی هەبوو هەموو قسەکانی ڕەتـمەکەرەوە، دەستنیشانی هەڵەکە بکە، لەبەرئەوە زۆرجار بە(ئیمامی عەلی)ـیان دەگوت ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ﴾ الأنعام:٥٧. بۆت نییە کەس بکەیت بەناوبژیوان لە مەسەلەی شەڕوئاشتیدا، ئەوەبوو کە ئیمامی عەلی ڕازی بوو بەمەسەلەی تەحکیم، دروشمی﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ﴾ ـیان بەرزدەکردەوە، ئیمامی عەلی فەرمووی(كلمة حق) وتەکە ڕاستە

بەڵام (یراد بها باطل) مەبەست و ئامانجێکی بەتاڵ لە پشتیەوەیەتی، جاری وا هەیە یەکێك قسەیەك دەکات ڕاستە، بەڵام دەبینیت مەبەستەکە هەڵەیە، بەپێی مەبەستەکان ئێمە دەتوانین هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەییمان بۆ قسەکان و هەڵوێستەکان هەبێت، جا لەبەرئەوەیە بەپێی ئەم ڕێنموونییە قورئانییانەی کە ئێمە نمونەیەکیمان باسکرد مسوڵمانان هەستێکیان بۆ دروستدەبێت کە ئازادە لە بیروڕایدا، بەڵام هەستدەکات ئەرکێك هەیە لەم بابەتەدا ئەوەیە بەراوردبکات لە نێوان بیروبۆچوونەکاندا، ڕەخنەگربێت، ڕەخنەگریش هەر تەنها ئەوەنییە کە عەیبەکان دەربخات، ووشەی (نقد) کە لە زمانی کوردییدا وەرگێڕدراوە بە (ڕەخنە)، تێبینی ئەوەی لەسەرە، کە ڕەخنە ئەو مانایە ناگەیەنێت، ڕەخنە بەمانای شتێکە واتە کونتێکردن، ووشەکە لە بناغەدا فارسییە بەمانای کونتێکردن و بەمانای عەیبدارکردنە، بەڵام ووشەی (نقد) لە زمانی عەرەبییدا واتە: ساغکردنەوە، واتە زێڕێکت بۆ دەهێنن بەڵام هەندێك شتی تێکەڵبووە، هەندێك عەیبداربووە، تۆ دێیت نەقدی دەکەیتەوە، واتە ساغیدەکەیتەوە، ئەسڵەکە دەهێڵیتەوە وەکخۆی، بەڵام ژەنگو پوشوپەڵاشەکەی لادەبەیت، کەواتە ئێمە کە بمانەوێت نەقدی واقیعێك بکەین بەناوی ئازادیی بیروبڕواوە لەژێر باڵی ئەو مافە پیرۆزەدا، دەبێت زۆر بەویژدان بین، لایەنە باشەکانی لەگەڵ لایەنە خراپەکانی دەستنیشان بکەین.

**پایەیەکی تر لە پایەکان، بابەتیبوونە:** بابەتیبوون ئەوەیە کاتێك دەکەویتە قسەو مومارەسەی مافی ئازادیی بیروڕا دەکەیت، تەرکیزبکەرە

سەر ئەو حاڵەتەی کە دەتەوێت قسەی لەسەربکەیت، سەرمەشێوێنە لە بەرامبەر لە کاتی دیالۆگدا، تەسلیمی حەقیقەتی بابەتییانە ببەو دەمارگیریی نەتگرێت، فیزودەمار نەتگرێت، بەتەمای ئەوە بە کە بڵێیت حەقیقەت لەکوێیە من دوای دەکەوم، سەیربکەن ئەم ئایەتانە هەمووی بانگکردنی مرۆڤە - بەتایبەتی پێغەمبەران - بۆ بابەتیبوون:

دەفەرموێت ﴿فَلاَ تَتَّبِعُواْ الْهَوَى أَن تَعْدِلُواْ﴾ النساء:١٣٥.

هەموو ئیمانداران نەهییان لێکراوە کە دوای هەواوئارەزوو بکەون، واتە بابەتی بن، واتە لە قورئاندا تەنها شتێك دەرمەهێنە کە پێویستت پێیەتی، وەك ئەوانەی کە دەیانەوێت دژایەتی ئاین بکەن دەچن شتێك دەردەهێنن لە ئایەتێکدا یان لە دەقێکی پەرتووکێکی ئاینییداو دەیکەنە بەڵگە و ئاگایان لە بەشەکانی دیکە نییە، تەنها ئەمە بەکاریان دێت.

خوای گەورە بەداوود پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر) دەفەرموێت ﴿فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلاَ تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾ ص٢٦.

ئەی داوود بابەتی بە، کەواتە بابەتیبوون بەنیسبەت ئەو کەسانەوە کە باس لە ئازادی بیروڕا ئەکەن پایەیەکی سەرەکییە، ئەگەر لەسەر ئەم پێنج بابەتە مسوڵمانان کۆکبوون،و ئەوانەی کە مومارەسەی ئازادیی بیروڕا دەکەن وەکو مافێك ئەم پێنج پایەیان لە خۆیاندا بەدیهێنا، ئەوکاتە ئێمە دڵخۆشین بەوەی کە یەکبوونێکی تەواو لەناو مسوڵماناندا دروستدەبێت و لە گۆڕەپانی کاری ئیسلامییدا یەکبوونێکی تەواو دێتەکایەوە.

# هزری ئیسلامی و یەکتا پەرستی

بابەتێکیتر و بابەتێکی بنەڕەتی لە بابەتەکانی هـزر، بابەتی یەکتاپەرستی (التوحید)ە، کە لە هـزری ئیسلامییدا پێگەیەکی یەکجار گەورەو مەزنی هەیە، نەك تەنها لە بواری فیکردا، بەڵکو لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، پرسی یەکتاپەرستی بووەتە پرسێکی خولگەیی بەپێی قورئان و سوننەت، بەپێی تێگەیشتنی زانایانی مسوڵمان یەکتاپەرستی دەبێتە سەرچاوە بۆ بیروبۆچوون، دەبێت بەسەرچاوە بۆ پێشینیەکان و بۆ هەڵسوکەوت و تێگەیشتن لە جیهان و مرۆڤ، بەشێوەیەك لە شێوەکان لە هەموو ئاینەکاندا ڕەنگە باسی یەکتاپەرستی کرابێت، ڕەنگە هەرئاینێك کە بگەڕێیتەوە بۆ ڕەگو ڕیشەکەی، دەبینیت تەوحیدی یەکتاپەرستییە و باوەڕبوونە بەیەك خوداو یەك هێز، کە هەموو جیهان بەڕێوەدەبات، ئەوەبابەتێکە کە گفتوگۆ هەڵناگرێت، بەڵام ئەوەی کە لە ئاینەکانیتردا ڕوویداوە ئەوەیە کە ئەم یەکتاپەرستییە بەتێپەڕبونی کات و بەگۆڕانکاریی هەلومەرجی ژیاریی و بەگۆڕانکاریی هەلومەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتی، گۆڕانی بەسەرداهاتووە، تێگەیشتنی خەڵك لەسەری تێکچووە و تەمومژاویی بووە، لە ئاین و لە کۆمەڵگادا سەبارەت بەیەکتاپەرستی هەندێك گەل،

وەك یۆنانییەكان، لەگەڵ ئەوەدا كە بڕوایان بە (زیۆس)[1] هەبووە وەك خوای هەموو خواكان، تەماشادەكەیت وێنەكردنیان بۆ خودای خوداكان وێنەكردنێكی خراپە، كە ئەم خودایە بۆ بەهانە دەگەڕێت بۆ ئەوەی پەلاماری مرۆڤ بدات تا ئەم مرۆڤە بەمرۆڤی بمێنێتەوە و توانای نەبێت لەسەر زەویدا چالاك بێت و زاڵبێت بەسەر كێشەكانیدا، زاڵبێت بەسەر تەنگوچەڵەمەكانی ژیاندا، ئەمە وێنایەكی هەڵەیە، لەبەرئەوە فەیلەسوفەكانی یۆنان ئەگەر نەشیانتوانیبێت یان نەشیانویستبێت بەشێوەیەكی ئاشكرا ئەو بتپەرستییە لە تێگەیشتنی ئەواندا ڕەتبكەنەوە و بەشێوەیەكی ئاشكراو ڕاستەوخۆ دژی بن، ئەوا لە ڕێگەی نوسینەكانیانەوە كەسانی وەك سوكرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ هەوڵیانداوە تێگەیشتنێكی تەجریدی لەخودا نیشانی خەڵك بدەن، تێگەیشتنێك كە خودا لەلای ئەوان ببێت بەخودایەكی داهێنەر، خودایەك بێت كە بە هیچ شێوەیەك لە خەیاڵی ئەواندا نەبێتە خودایەكی داپڵۆسێنەرو تێكدەر، بەڵكو خودایەكی خەیر خودایەكی چاكەخواز و بەرنامەكانی دانایانە و ڕێكوپێك كراوە.

لە ئیسلامدا بابەتی یەكتاپەرستی دەگاتە ئەوپەڕی پاكێتی و تەجرید، واتە ئەو خودایەی كە مسوڵمان بڕوای پێیەتی خودایەكی پاكە

---

[1]– زئوس: لەئەفسانەی دێرینی یۆنانی زئۆس خودای باڵادەست بوو، ئەم پەیكەرە لەساڵی ٤٣٢پ.ز پەیكەرتاشی بەناوبانگی یۆنانی (فیدیاس) ئەم پەیكەرەی تاشی، پەیكەری زئۆس لە خشڵی گرانبەهاو عاجی فیلو ئاڵتون دروستكراوە، ئەم پەیكەرە بەپێوە وەستاوەو دەستی ڕاستی كۆچانی پێیە و دەستی چەپی عەباكەی سەرشانی گرتووە. اطلاعات عمومی پیام، ل٧٢٩.

له هەموو کەموکوڕییەك، که به هیچ شێوەیەك له ئەفرێنراوو دروستکراوەکانی خۆی ناچێت، که باسی خوای پەروەردگار له قورئاندا دەخوێنینەوە ئەو بابەتەت دێتەبەرچاو که خوای پەروەردگاریش له ئایەتێکدا دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾ الشورى:١١. ئەم ئایەتە ئایەتێکی (موحکەم)ـە، واتە ئایەتێکە بەهیچ شێوەیەك قبوڵی لێکدانەوەی خراپو نەگونجاو ناکات و قبووڵی هیچ نەسخو تەئویلێك ناکات﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾ الشورى١١. چونکه خودا خودایەو، دروستکراو دروستکراوە، داهێنەر داهێنەرەو، داهێنراو داهێنراوە، هیچ شتێك له خودای پەروەردگار ناچێت، خودا وێنەو شێوە و مانەندی نییە، شتێك نییە که له خوای پەروەردگار بچێت، لەبەرئەوە مەولەوی[1] تاوگۆزی له کتێبی بەناوبانگی (الفضيلة)دا دەڵێت:

**وكل خاطر جرى ببالك          فربنا على خلاف ذلك**

واتە هەر خەیاڵێك بێت بەمێشکتدا لەسەر خوداو بڵێیت ڕەنگە خودا بەمشێوەیەبێت، هەڵەیە، بۆ نمونە بێت بەخەیاڵتدا: چۆن خەڵك هەڵچون

---

[1]– سەیید عەبدولڕەحیمی کوڕی مەلاسەعیدی تاوگۆزییە(١٨٠٦– ١٨٨٢ز)ژیاوە، لەناو خەڵکدا بەناوبانگ بووە بە(مەولەوی)، لەجیهانی شیعریشدا ناسراوبووە بە (مەعدوومی)، دەستیکردووە بە خوێندنی ئەو سەردەمە که حوجرەو مزگەوت بووە، زۆر شوێنی عێراقو ئێران گەڕاوەو بۆ خوێندن کۆچی زۆری کردووە خوێندنی مەلایەتی لای عەبدولرەحمان نۆتشەیی لەسلێمانی تەواوکردووە، لەسەرەتای مەلایەتییەوە ڕێگای سۆفیەتی گرتوەتەبەرو بەرەو تەریقەتی نەقشبەندی ڕۆیشتووەو لای شێخ عوسمان سیراجەددین تەریقەتی وەرگرتووە، چەندین دانراوی هەیە لەوانە: (العقيدة المرضية، الفوائح، الفضيلة، زبدة العقيدة، دیوانی مەولەوی)، محمد ملاكريم، میهرەجانی مەولەی (ژیانو بەرهەمەکانی مەولەوی)چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ساڵ٢٠١٠،لا١٢ دواتر.

و هەندێك هەڵسوكەوتی هەیە ڕەنگە خوداش وابێـت یان وەك چۆن مرۆڤـ کاریگەرییەکانی دەوروبەری کاری تێدەکات خواش بەهەمان شێوە، مەولەوی دەڵێت: هەرچییەك لەو جۆرە شتانە هات بەخەیاڵتدا لەبارەی خواوە و دەستی خەیاڵی تۆبوو، ئەوە خوای پەروەردگار بەوشێوەیە نییە. لە سورەی (الاخلاص)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ۝اللَّهُ الصَّمَدُ۝لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُواً أَحَدٌ﴾ الإخلاص:١–٤.

هیچ شتێك نابێت بەهاوشانی خوداو هیچ دەستەڵاتدارێكو هیچ توانایەكو هیچ هێزێك ناتوانێت هاوشانی خودابێت، واتە خودا بێنێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە یان موتەوازی بێت لەگەڵ خوادا، یان هاوشان بێت لەگەڵ خوادا، ئەم یەکتاپەرستییە لە ئیسلامدا گەیشتووەتە ئەوپەڕی یەکتاپەرستی و پاکێتی. پێشەوایانی ئیسلامو زانا گەورەکانمان وتویانە عەقڵی مرۆڤـ سنورێکی تایبەتی هەیە، بیرمەکەرەوە لە زاتی خوا کە چۆنەو چییە، لەبەرئەوەی کە مرۆڤـ هێشتا بەتەواوی خۆی نەناسیوە، دەوروبەری نەناسیوە. کە دەچیتە سەر ژیانی فەیلەسوفان دەڵێیت فەیلەسوفان لەسەر هەمووشتێك پێناسەیان هەیە، بەڵام پێناسەکەیان کورتی هێناوە، لەبەرئەوە دەڵێن جارێك باسی (ئیمامی ڕازی) دەکەن بۆ پیاوێکی پیری دینداری ئاساییو دەڵێن: (ئەوە ئیمامی ڕازییە کە هەزار بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر بوونی خوا)، ئەویش دەڵێت: (دەی ئەوە هەزار گومانی هەبووە لەبەرئەوە هەزار بەڵگەی هێناوەتەوە، من کە هیچ گومانم نییە لەبوونی خوادا، هیچ بەڵگەیەك ناهێنمەوە). یەکێك لە

عاریفان وتی من چۆن ئەم بونەوەرە بکەم بەبەڵگە لەسەر بوونی خوا لە کاتێکدا ئەم بونەوەرە بوونی خۆی لە خواوە وەرگرتووە، لە ڕاستیدا خوای پەروەردگار پێویستی بەبەڵگە نییە، چونکە لە دەوروبەرماندا ئەوەندە بەڵگە هەیە و نیشانە هەیە لەسەر بوونی خوا کە ڕەنگە هەر نەتوانین لە بەڵگەکانیش بەتەواوی تێبگەین، ئێمە نوقمی لوتفی خوابووین کە ئەو هەموو بەڵگەیەی بەدەورمانداو لە ناخی خۆمانداو لە دەوروبەرماندا دروستکردووە. لە ئاسۆکانی ئاسمانەکانداو لەو یاساو ڕێكوپێکییەی کە ئەم جیهانەی لەسەردەڕوات، هەمووی بەڵگەیە لەسەر بوونی خوا، دەبینین کە خوای پەروەردگار تاكوتەنهایە، یەکتاپەرستی بەم مانا قورئانییە لە لایەکەوە بەڵگەیەکی تەواومان لەسەر بوون بۆ دروستدەکات، ڕاڤەی بوونمان بۆ دەکات، واتە ئەو بوونە چۆن بوو بەعەقڵی فەلسەفی؟ ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەو بوونە ئەسڵە، چونکە نەبوون دەبێت لە بوونەوە پەیداببێت، ئەم جیهانە پێش ئەوەی کە بووبێت لە حاڵەتی نەبووندابووە، بەڵام بوونی چۆن پەیداکرد؟ دەبێت لە دەرەوەی ئەم جیهانە بوونێکی هەبووبێت کە ئەو بوونە بووبێت بەنسیبی ئەم جیهانە، لەبەرئەوە هەموو فەیلەسوفە گەورەکان بەتایبەت ئەو فەیلەسووفانەی کە پێیاندەوترێت فەیلەسووفی مەشائی وەك (فارابی، ئیبن سینا، ئیبن روشد) ئەمانە هەموویان باوەڕیان وایە کە بوون ئەسڵەو نەبوونی گەردوونیش بوون بەسەریدا رژاوە و بوونی بەدەستهێناوە، یەکتاپەرستی لە لایەکەوە تێگەیشتنمان لەسەر جیهان بۆ چارەسەردەکات و مەسەلەی بوون لە نەبوونمان بۆ چارەسەر

دەكات، لە لایەكی دیكەشەوە لە ژیانی ڕۆژانەداو لە ژیانی كردەییدا فێری ئەوەمان دەكات مل بۆ هیچ دەستەڵات و هێزێكی ماددیی كەچنەكەین، دڵمان نەبەستین بەغەیری خوداوە، دڵمان نەبەستین بەو شتانەی تێدەپەڕن، بەوشتانەوە كە بوونەكەیان ناتەواوە، چونكە ئێستا ئەو شارستانیەتەی كە ئێمەی تیادادەژین شارستانیەتێكی ماددییە، ئەو شارستانیەتە نییە كە ژیران و بیرمەندانی مرۆڤایەتی هەوڵی بۆ دەدەن یان هەوڵیان بۆ داوە، بەدرێژایی مێژوو بیرمەندانی مرۆڤایەتی هەمیشە بیریان لەوە كردووەتەوە ئێمە باكارێك بكەین ئەم مرۆڤە فێری گەورەیی و سەروەری و دڵسۆزی و پەروەردەكردنی روحو هەناوو دەرونی بێت، هەموو وانە ئەخلاقییەكانی زاناكانی مێژوو لە دەوری ئەمە سوڕاونەتەوە چۆن ئەم مرۆڤە مرۆڤێكی ساغ بێت، دەڵێن یەكێك لەو فەیلەسوفانە ڕۆژێكیان بەڕۆژی نیوەڕۆ چرایەكی گرتبوو بەدەستەوە، وتیان بۆچی بەم ڕۆژی نیوەڕۆیە ئەو چرایەت گرتووە بەدەستەوە؟ وتی: بەدوای مرۆڤدا دەگەڕێم دەستمناكەوێت! خۆ بەڕواڵەت مرۆڤـ زۆرە، بەڵام مرۆڤێك یەكتاپەرست بێت كەسێكی حەقیقییە، چونكە كەسێك یەكتاپەرست بێـت خوای بەتەواوی پەرست و خۆپەرست و دونیاپەرست و ماددەپەرست نەبوو، ئەوە مرۆڤی ڕاستەقینەیە، ئەو مرۆڤەی كە توانیبێتی هەموو گورگەكانی ناخی یەكبەیەك سەركوت كردبێت و حەزو ئارەزووەكانی ناخی هەموو خستبێتە ژێر ڕكێفی عەقڵو ژیریی خۆیەوە، ئەوە مرۆڤی ڕاستەقینەیە، هەر ئەم بابەتە مەولانای ڕۆمی لە یەكێك لە غەزەلەكاندا باسیان دەكات و دەڵێت (من لە دێو و دڕندە بێزاربووم

ئارەزووم ئەوەیە کە مرۆڤـ پەیدابکەم). جا مرۆڤـ لە یەکتاپەرستییدا پەیدادەبێت، چونکە لە دەرەوەی یەکتاپەرستی مرۆڤەکان یەکتر دەچەوسێننەوە، خەڵك کە بەندایەتی بۆ غەیری خوا بکەن مانای وایە کە بەندایەتی بۆ یەکتری دەکەن، بەندایەتی بۆ ئەو ئیعتیبارە دەکەن کە بۆیاندروستکراوە، پێیانتەڵقینکراوە ئەمە لەتۆ بەرزترە، ئەم گەلە لە فلان گەل بەرزترە، ئەم کەسە لە فلان کەس بەرزترە، ئەم چین و توێژە لە فلان چین و توێژ بەرزترە، بەڕاستی هەموو کێشەکان لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە خەڵك یەکتاپەرست نەبێت، کە خەڵك خۆی نەبەستێتەوە بەخوای تاكوتەنهاوە. کە خەڵك لە ڕووی مەعریفەوە باوەڕی بەوەنەبێت کە ئەم جیهانە بەم ڕێکخستن و ڕێکییەی کە هەیەتی لە خوای پەروەردگارەوە سەرچاوەی گرتووە، بوونەکەی لە خواوە وەرگرتووە، ئەگەر چەند خوایەكو چەند هێزێکی کاریگەریتر هەبووایە لەم جیهانەدا جگە لە خوای پەروەردگار، ئەم جیهانە بەم شێوەیە ڕێكوپێك نەدەبوو.

لەتەوحیدایە کە مرۆڤ ڕزگاری دەبێت لە ئەفسانە و خورافات و ئەفکاری پڕوپووچو، لە خۆتەسلیمکردن بەبەڵگە نازانستییەکان و گومان. لە ڕێگەی یەکتاپەرستییەوە ڕزگاری دەبێت لە گومان، چونکە ئەم یەکتاپەرستییە وەك ئیکسیرێك وایە قەلبی مرۆڤەکان دەکات بەزێڕ، ئەم بوونە دەگۆڕێت، ئەوەی کە (محمد ئیقبال) پێیدەڵێت ئیکسیری گەڕانەوە بۆخۆ، ئەوەی کە (شەریعەتی) باسی گەڕانەوە دەکات بۆخۆ، لە ڕاستیدا، لە یەکتاپەرستییدا خۆی بەرجەستە دەکات. هەموو گرووپە

ئیسلامییەکان ناچارن لە تەوحیدەوە دەستپێبکەن، چونکە هەرکەسێك ئەهلی تەوحید نەبێت واتە ئەهلی (لاالەالا اللە) نییە و ئەهلی ووشەی شەهادە نییە.

هەروەها یەکتاپەرستی واتە ئازادو ڕەهاکردنی مرۆڤ بەتەواوی و پچڕانی کۆت و بەندەکانی بیروبۆچوون، چونکە هەموو بیروبۆچوونێك لە ڕاستیدا ئەگەری ئەوەی هەیە تووشی گرفت و گومان ببێت، ئەگەر گومان نەبێت ڕەنگە تۆ نەتوانیت بگەیت بەیەقین، بەڵام ئەوگومانە دەبێت گومانێکی مەنهەجی بێت، گومانێك بێت کە هەوڵبدەیت لە ڕووی ئەو زانست و زانیارییەوە بتگەیەنێت بەیەقین و بەدڵنیایی، جابێگومان خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا هەمیشە ئەو وانەیەمان بۆ دووبارەدەکاتەوە کە خۆی تاكوتەنهایەو جگە خۆشی سیفەتی دووانەییان هەیە، سیفەتی جوتبوونیان هەیە، سیفەتی دوالیزمەیان هەیە، وەك خوای پەروەردگار لە سورەتی (یاسین)دا دەفەرموێت:﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لاَ يَعْلَمُونَ﴾ یس٣٦.

ئەم ئایەتە بە ژمارەی ووشە کەمە، بەڵام یەکسەر تەفسیرێکی واقیعی بۆ وجود دەکات بۆمان. لە لایەکەوە ﴿سُبْحَانَ الَّذِي﴾ ئەو کەسەی کە هەموو جیهانی دروستکردووە لەسەر بنەمای دوالیزم، هەموو شتێك ئەگەر سەرنج بدەیت دەبێت دوودووبن بەیەکەوە، تەماشادەکەیت ژیان بەچی دروستدەبێت؟ بەدووانەبوون دروست دەبێت، بەدوالیزمە دروست دەبێت، زانست دەبێت لە نێوان دووکەسدا

كه زانيارييەكانی يەكتر تێكەڵدەكەن و موتوربەی دەكەن لە ئەنجامی موتوربەكردنی زانيارييەكانی دووكەس زانست دروست دەبێت، لە بەڵگەهێنانەوەدا ئەگەر بڕۆینەوە بۆ زانستی لۆجيك بەدوو سەرەتا ئەگەر تەماشا بكەيت زانست درووست دەبێت بەرهەمێكی زانستی دێتە مەيدان، لە ياسادا ئەگەر تەماشا بكەيت دەبينين لە ئەنجامی جێبەجێكردنی ڕێسايەكی ياسايی لەگەڵ واقيعێكی ياسايی حوكمێكی ياسايی پەيدادەبێت، لە هەموو شتەكان ئەوەی كە مرۆڤـ پەی پێبـردووە ئەوەی كە مرۆڤـ پەی پێنەبردووە باسی ياسای دووانە لە بووندا سەرهەڵدەدات و هەرگيز ئەم ياسايە گۆڕانی بەسەردانايەت، بەڵام خوا خۆی تاكوتەنهايە كەواتە تەماشابكە لە شريتی (D.N.A)دا كە بنەمای ژيانی مرۆڤەو هەموو ترشەكان بەيەكەوە دوودوو يەكتر تەواودەكەن، ئەوانەی كە شارەزان لە زيندەوەرزانييدا بەوردیی لەم ڕاستييە ئاگادارن. بەم يەكتاپەرستييە هـزری ئيسلامی لە ميتۆدو لە ياساو لە ڕێبازەكانی ديكە جيادەبێتەوە، چونكە دوو ڕێبازی ترمان هەيە:

**يەكيان زيادەڕۆيی دەكات لە ميسالييەتدا وەك فەلسەفە ميسالييەكان. دووەميش: هەموو شتێكی ماددیی ڕەتدەكاتەوە و** هەمووی دەكات بەخەياڵو وەهم، ئەو فەلسەفانەی بەڕاستی فەلسەفەی عەدەميين يان ئەو فەلسەفانەی كە زيادەڕۆيی دەكەن لە ماددييدا، لە نێوان ڕوحو ماددەداو لە نێوان ناماددەو ماددەدا دوو ڕەوتی پەڕگير هەيە:

ڕەوتێکیان دەڵێت: هەموو شتێك ڕوحەو ئەو ماددەیەی کە دەیبنین بەوەهمی دەزانن.

ڕەوتە پەڕگیرەکەی دیکەیان دەڵێت هەموو شتێك ماددەیە و هەموو شتێك دەبێت ماددەبێت.

کەواتە هەردوو ڕەوتەکە سەری لە (وحدة الوجود)ەوە دەردەچێت، واتە ئەم وجودە یان ڕۆحە بەتەنهاو ماددەی لەگەڵ نییە، یان ماددەیە بەتەنها و رۆحی لەگەڵ نییە، ئیسلام جیاوازە لەم دوو ڕەوتە یەکتاپەرستییە، دەڵێت دروستکراو دروستنەکراوە و ئەوەی کە هەیە یان دروستکەرە یان دروستکراو، دروستکەر ماددە لەبونیدا نییە، بەڵام دروستکراوەکە لەسەر بنەمای دوالیزمی ڕوحو ماددە دامەزراوە و بەڕێوەدەچێت، لە ئیسلامدا میتۆدێکی ناوازەو جوان بۆ سەلماندنی حەقانیەتی یەکتاپەرستی هەیە جیاواز لە میتۆدەکانیتر، چونکە میتۆدەکانی تر وەك وتمان کە باوەڕیان بە(وحدە الوجود) هەیە بوون بەوە دەزانن کە تەنها ماددە بێت یان تەنها ڕۆح بێت، بەڵام خوای پەروەردگار لە قورئاندا فێری ئەوەمان دەکات بوونی دروستکەرو دروستکراو هەیە، بوونی بەدیهێنەر بەهەموو شێوەیەك جیاوازە لە بەدیهێنراو، ئەوەی کە پێیدەوترێت روحو ماددە سەر بەجیهانی دروستکراوە، سەر بەجیهانی دروستکراوانی خودایە، بەم تێگەیشتنە تەمومژ لادەچێت لەسەر بیرکردنەوەی مرۆڤ لە پێناوی ئازادی مرۆڤدا، لە پێناو ئەوەدا کە مرۆڤەکان سنوری تێگەیشتنی خۆیان بۆ یەکتاپەرستی و لە یەکتاپەرستییەوە بۆ دیمەنەکانی دیکەی ژیان

دەگۆڕن، هەموو ئاینەکان باسی یەکتاپەرستییان کردووە و پێغەمبەران جەختیان لەسەر یەکتاپەرستی کردووەتەوە، تەنانەت لە ئاینی عیسای کوڕی مەریەمدا (سەلامی خوای لەسەر) بابەتی یەکتاپەرستی بابەتێکی بنەڕەتی بووە، کۆمەڵێکی زۆر لە شوێنکەوتوانی عیسا هەتا ساڵی (٣٨١ز) لەسەر مەسەلەی تەوحید بوون، لەسەر بیروبڕوای یەکتاپەرستی بوون و باوەڕیان بەوەبوو کە خوای تاكوتەنهای ئەزەلی مرۆڤی دروستکردووە بە(عیسا)شەوە، بەڵام لە ساڵی (٣٨١)ـەوە ئەم ڕەوتە بەزەبروزەنگو بە گوشارو بە دەستـتێوەردانی دەستەڵاتی ڕۆم (قستەنتین) سەرکوتکراو ئەوەی کە بڕوای بەوە هەبوو لەناوبران، پێشەوای ئەم ڕەوتە لەناو ئیمانداراندا زانایەکی خواناس بوو بەناوی (ئاریۆس) (٣٢٦ز) وەفاتی کردووە، وەك لە (دائرة المعارف)ی بوستانیدا ئاماژەی پێکراوە دەڵێت (لەساڵی ٣٢٥دا ئیمپراتۆری رۆم بەناوی (قستەنتین) هات کۆڕێکی بۆ هەموو زانا مەسیحییەکان دروستکرد کە پێیدەوترێت کۆڕی (نیقیە)، لەم کۆڕەدا داوایلێکردن کە باوەڕیان بە(سێ خوایەتی) (تثلیث) هەبێت و باوەڕیان بەوەهەبێت کە عیسا کوڕی خوایە، واتە لادان لە یەکتاپەرستی، چونکە ئیمپراتۆر پێویستی بەدینێکی نوێ بوو، ئەو دینەی هێنا لە بیروباوەڕی مەسیحی و لە بیروباوەڕی ئەوروپییانەی خۆیان، ویستی دینێکی نوێ دروست بکات کە بوو بەو بیروبڕوایەی کە ئێستا کەنیسەی لەسەردەڕوات، ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی مەسیحی بەسەرکردایەتی (ئاریۆس) دژی ئەو بیروبۆچوونەی ئیمپراتۆر بوون، لەو کۆڕەدا ئەوانە هەموویان

سەرکوتکران، (ئاریۆس) لە (٣٢٦ز) کۆچی دوایی کرد، دوای دەساڵ کۆڕێکی زانایانی مەسیحی لە (قودس) گیرا پشتگریی بۆچونەکەی (ئاریۆس)یان کردو وتیان خوا تاکوتەنهایە و بیروباوەڕی (سێخوایی) لە بیروباوەڕی مەسیحدا نیە، بەڵام بۆ دواجار پەیڕەوانی (ئاریۆس) لەسەر گۆڕەپانی فیکری و سیاسی دونیای مەسیحییەتدا نەمان، کە پێغەمبەری خواش (د.خ) نامەکەی نووسی بۆ (هرقل)ی ڕۆم ئاماژە بەم مەسەلەیە دەدات و دەفەرموێت (اسلم تسلم)، مسوڵمان ببە بۆ ئەوەی سەلامەت بیت، (وإن أبیت) بەڵام ئەگەر ئامادەنەبیت باوەڕبهێنیت بەم دینە کە دینی یەکتاپەرستییە (فإنما علیك إثم الاریسیین) ئەو تاوانەی کە کاتی خۆی یەخەی پاشاکانی گرت بەسەرکوتکردنی ئاریۆسییەکان، یەخەی تۆش دەگرێت. (ئاریۆسییەکان) ئاماژەیە بۆ (ئاریۆس)و گرووپەکەی کە لە ڕاستیدا پەیڕەوی ڕاستەقینەی عیسامەسیحن (سەلامی خوای لەسەر)، ئەوەش پەیڕەوی ڕاستەقینەی هەموو ئاینێکە، لە ڕاستیدا هەموو ئایینێکی ئاسمانییە، ئاینی ئەوانەی کە یەکتاپەرستی دەکەن بەدەستپێکو لە ڕوانگەی یەکتاپەرستییەوە سەیری جیهان دەکەن.

زانایەکی فیزیا کە دەچێت توێژینەوەیەك دەکات لە بوارەکەی خۆیدا باوەڕی بەوەهەیە کە یەك یاسا هەیە لەم جیهانەدا حاکمە لەو مەسەلەیەدا، ئەویش بەشێوەیەکی کرداری باوەڕی بەیەکتاپەرستی هەیە، تۆ کە هەوڵبدەیت هەموو مەسەلەکان لە یاسایەکدا کۆبکەیتەوە یان هەموو بوارەکان لە یاسایەکدا کۆبکەیتەوە ئەوە باوەڕە

بەیەکتاپەرستی، چونکە وەك (د.ئەحمەد زەکی) کە زانایەکی میسریی خواناسە دەڵێت (وحدة الخالق تستمد من وحدة خلقه)، کە تەماشادەکەین ئەم بونەوەرە یەك پارچەیە، گەرچی دیمەنەکانی شتەکانی جیاوازن، بەڵام لە بنەڕەتدا یەك پارچەن و ئەندامەکانی یەکتر تەواودەکەن، ئەگینا لە بنەڕەتدا خزمەت بەیەك ڕاستی دەکەن، ئێمەش لە ڕوانگەی بونەوەرەوە تەماشادەکەین یەك پارچەیە، بیـرمان پێماندەڵێت: کە خوای پەروەردگار تاقە خوایەکە ئەم جیهانەی دروستکردووە، ئەم جیهانە بەڕێوەدەبات و ئەو تاقەخوایە کە بڕیاریداوە ڕێنماییمان بکات و نیشانەمان بۆ دابنێت، بۆ هەموو گەلێك پێغەمبەرێك بنێرێت، گەرچی پێغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لەسەر) بەپێی هەلومەرجی مێژوویی‌و جوگرافی ڕەنگە بەرنامەی ژیان بۆ خەڵك بەجیاواز دابڕێژن، بەڵام لە بنەڕەتدا هەمووی لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی دادەمەزرێت، بەرنامەکان هەموویان لە یەکتاپەرستییەوە سەرچاوەدەگرن.

کەیەکێك بڕوای بەیەکتاپەرستی هەبوو بڕوای بەئەفسانەو بەخورافە نامێنێت، واتە باوەڕی بەوە هەیە کە هەمووشتێك دەبێت بەرنامەدار بێت و خاوەنی بەرنامە بێت، هیچ شتێك لەخۆوە نابێت، لەبەرئەوە ئەگەر نەخۆش بوو دەچێت هەوڵی نەخۆشییەکەی دەدات بزانێت چ نەخۆشییەکی هەیەو دەچێت بۆ لای پزیشکێکی شارەزا بۆ ئەوەی دەرمانی بۆ بنوێنێت، یەکتاپەرستی ئەوەیە کە پەنا ناباتەبەر شتی

سەیروسەمەرە و خۆی ناداتە دەستی خۆی، یان هەندێك لەو شتانەی کە ئێستا لەناو خەڵکێکی سادەدا باوە و کاری پێدەکرێت.

باشە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) کە ئەو هەموو هەوڵەی دەداو کاری بەئەسباب دەکرد، ئەی نەیدەزانی بپارێتەوە! بۆچ خەلیفەکانی ڕاشدین نەیاندەزانی دۆعا بکەن؟! دۆعاکانیشیان لە ئێمە باشتر نەبوو؟ بەڵام وانابێت، تۆ کە باوەڕت بەیەکتاپەرستی هەیە واتە ئەم ژیانە بەبێ بەرنامەڕێژی نابێت، خوا بەرنامەیەکی بۆ داناویت ئەو بەرنامە کەفیلە بۆ ئەوەی کە تۆ تووشی هەڵەولادان نەبیت، لەبەرئەوە یەکتاپەرستی هانتدەدات کە ووزەکانی خۆت بوروژێنیت و ووزەکەی خۆت بەکاربهێنیت بۆ ئەوەی لە بەرامبەر دوژمنانی دەرەکی و لە بەرامبەر دوژمنانی ناوەوەدا بتوانیت خاوەنی هەڵوێست بیت و بجولێیت، جا لەبەرئەوە لە ڕاستیدا یەکتاپەرستی تەنها وتارو دروشمێك نییە کە ئێمە بەرزی بکەینەوە، بەڵکو هەڵوێستوەرگرتنێکە لە جیهان و ژیان، تۆ کە باوەڕت بەوە هەیە هەمووشتێك تەسلیمی خوا دەکەیت، کەواتە جگە لە خوا تەسلیمی کەسیتر نابیت، بڕوات بەوەنییە کە هێزێك هەبێت لە سەروو هێزی خواوە کە بتوانێت خۆی بنوێنێت لە بەرامبەر خوای پەروەردگاردا، جاخوای پەروەردگار لەو داستانانەی کە لە قورئاندا بۆمانی دەگێڕێتەوە ـ بۆ نمونە داستانی (ذوالقرنین) ـ دەفەرموێت ﴿فَأَتْبَعَ سَبَباً﴾ الكهف٨٥. (ذو القرنین) بەو هەموو دەستەڵاتەوە کە هەیبوو، بەڕەچاوکردنی یاسای سەبەبیەت دەیتوانی گرفتەکانی خەڵك چارەسەر بکات.

ئەی ئەگەر مرۆڤـ یەکتاپەرست نەبێت؟

(عەبباس مەحمود عەقاد[1]) دەڵێت (هەرکەس بڕوای بەتەوحید نەبێت یان مولحیدبێت، دەتوانیت پێیبڵێیت کەسێکی ناسروشتییە)، کەسێکە بەدەر لە یاساکانی سروشت قسەدەکات و هەڵسوکەوت دەکات، لەبەرئەوە یەکتاپەرستی هەڵوێستوەرگرتنە لە ژیان و تێگەیشتنە بۆ ژیان و بۆ بوونەوەر، ئەگەر تەوحید نەبێت مرۆڤ وەك (بەنی ئیسرائیل)ی لێدێت کاتێك حەزرەتی موسا ماوەی چل ڕۆژ بەجێیهێشتن و چوو بۆ حزووری خوای پەروەردگار، دەستیانکرد بەپەرستنی گوێرەکەکەی (سامری).

یان ئەگەر مرۆڤـ یەکتاپەرست نەبوو، دەبێت ڕووبکاتە پەرستنی ئارەزووو چێژ، وەك ئێستا لە شارستانیەتی خۆرئاوادا دەیبینین، نکوولی لەوەناکەین کەسانێك هەن ئێستاش لە خۆرئاوادا بەدوای مەعنەوییەت و پەروەردەکردنی رۆحدا دەگەڕێن و بەدوای حەقیقەتدا دەچن و حەقیقەتخوازو حەقیقەتـدۆستن، بەڵام زۆرێك لەو خەڵکە بەدوای سەروەت و سامان و ئارەزووو ناووناوبانگدا دەڕۆن، تەمەنێکی بەنرخی گرانبەها لە پێناوی شتی سوكو ساناو شتی وەهادا سەرف دەکەن کە مایەی سەرنجو مایەی تێڕامانە بەڕاستی.

خاڵێکی دیکەی یەکتاپەرستی: هەموو گەلێك پێویستیی بەشوناس هەیە، شوناسی ئێمە لە یەکتاپەرستییدایە، ئێمە بەیەکتاپەرستی

---

[1] ـ عەبباس مەحمود عەقاد(١٨٨٩ ـ ١٩٦٤ز ) ئەدیب و بیرمەند و رۆژنامەنووس و شاعیری میسریی، بەرەچەڵەك کورد.

دەتوانین گەلی مسوڵمان و نەتەوە جیاوازەکان لە دەوری یەك بەرنامە کۆبکەینەوە، چونکە مسوڵمانەکان چەند مەزهەبی جیاجیابن و چەند نەتەوەی جیاجیابن و چەند ڕەوتی فیکری جیاجیابن، بەڵام هەرهەموویان لەسەر ووشەی (لا اله الا الله محمد رسول الله) کۆدەبنەوە، ڕەنگە ئەگەر یەکێك بچێتە ناو ووشەی (لا اله الا الله محمد رسول الله)، ڕەنگە بۆچوونی جیا دروستببێت وەك لە مێژوودا دروستبووە، بەڵام ئەگەر بچینە ڕەهەندی ووشەیی و ڕەهەندی مانای ئەم ووشەیەوە بەڕاستی دەتوانین هەموو میللەت بەیەك شوناس بناسینەوە کە ئەویش شوناسی یەکتاپەرستییە، ئێستا تەماشادەکەیت دونیا ململانێیەکی گەورەی تیادایە، ئەم ململانێیە لە هەموو ئاستەکاندا بەرجەستەبووە، لە ئاستی مەعریفە و فیکر و سیاسەت و ئابورییدا، لە ئاستی پەروەردەو فێرکردندا بەرجەستەبووە، ئێمە بە یەکتاپەرستی دەتوانین خۆمان بدۆزینەوە و هاوسەنگی خۆمان نیشانبدەین، چونکە هەر لە کاتی دەرکەوتنی ئیسلامەوە هەتا ئێستا ئاینی ئیسلام بەئاینی یەکتاپەرستی ناسراوە، لەهەر قۆناغێکی مێژووییدا مسوڵمانان پابەند بووبێت بە یەکتاپەرستی تەماشا دەکەیت داهێنانیان کردووە و پێشکەوتوون، بەڵام هەرکاتێك لەو تەرازووی یەکتاپەرستییە لایاندابێت و بەلای ڕاست و چەپدا چووبن و هاوسەنگییان لە دەستدابێت، تەماشادەکەیت کەوتوونەتە خۆخەڵەتاندنەوە، کەواتە دەبێت ئەم یەکتاپەرستییە ڕەنگبداتەوە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆمانداو لە بیرو بۆچوونمانداو لە هەڵسوکەوتمانداو لە ڕەوشتماندا.

له مێژوودا دیاره كه یەكتاپەرستی له مێژووی پێغەمبەران و خواناساندا دەردەكەوێت، له هەڵوێستی (نوح)دا دەردەكەوێت كه(٩٥٠) ساڵ بانگەوازی كرد بۆیەكتاپەرستی و خەڵكێكی كەمیش بڕوایان پێهێنا، بەڵام ئەو ماندووو پەشیمان نەبوو له كارەكەی خۆی، چونكه پەیوەندییەكی زۆربەهێزی هەبوو لەگەڵ خوای پەروەردگاردا.

لەهەڵوێستی ئیبراهیمدا (سەلامی خوای لەسەر) خۆی دەبینێتەوه و بەرجەسته دەبێت، مەسەلەی یەكتاپەرستی زۆرگرنگه، تۆ له پێناوی یەكتاپەرستییدا واز له نیشتیمان بهێنیت و واز له عەشیرەت بهێنیت و ڕێگەی كۆچ بگریتەبەر، ناڕەحەتی بچێژیت و كەس‌وكارت له شوێنێكی وشك‌و برینگی وەك مەككه بەجێبهێڵیت ئەمه گرنگه، كەواته یەكتاپەرستی له ژیانی ئیبراهیمدا بەرجەسته دەبێت، له ژیانی ئیسماعیلدا بەرجەسته دەبێت، له ژیانی هەموو پێغەمبەراندا بەرجەسته دەبێت، له ژیانی (هاوەڵانی ئەشكەوت)دا بەرجەسته دەبێت، كه كۆمەڵه گەنجێكن تازەپێگەشتوون و شتی زۆریان لەبەردەمدایه لەڕووی مادديی و دونیاو بەدەستهێنانی پلەوپایەوه، بەڵام واز له هەموو ئەوشتانه دەهێنن و تەنهاش لەبەر یەكتاپەرستی، دەیانتوانی موجامەلەی دەستەڵاتەكه بكەن، دەیانتوانی هێڵێكی ناوەڕاست دروستبكەن لەنێوان خۆیان و ئەواندا، له هەندێك خاڵدا بەیەكبگەن، لانی كەم باسی بتپەرستی ئەوان بەخراپه نەكەن و هەر له ماڵی خۆیاندا بەندایەتی خۆیان بكەن و یەكتاپەرستی ئەنجامبدەن، بەڵام تەماشادەكەیت یەكتاپەرستی پاڵیان پێوەدەنێت بۆ ئەوەی كه بانگەواز بكەن و خەڵك

بانگ بکەن و وێنەکردنی خەڵك لە بارەی خواناسییەوە ڕاستبکەنەوە و وازیان پێبهێنن لە بتپەرستی و لە ئیمپراتۆرپەرستی، دیسانەوە ئەم یەکتاپەرستییە لە هەڵوێستە جیاجیاکانی پێغەمبەری ئیسلامدا (درودی خوای لەسەر) بەرجەستە دەبێت، هەموو بنەمانی کارەکەی لەسەر بنەمای (لا اله الا الله محمد رسول الله) بنیاتدەنێت، هەروەها لە هەڵوێستی پێشەوایانی ئوممەت، لە هەڵوێستی هاوەڵانی بەڕێز، لە هەڵوێستی زانایانی ئیسلامدا یەکتاپەرستی دەردەکەوێت کە ئامادە نەبوون موویەك لەسەر شاڕێگەی یەکتاپەرستی لابدەن یان تەنازولی لێبکەن، لەم بوارەشدا چەندین بەرهەمیان بۆ بەجێهێشتووین چ تیۆری و چ کردەیی.

# پەیوەندیی نێوان
# ئازادیی مرۆڤ و پێغەمبەران لە هزری ئیسلامییدا

لەم بەشەدا باسی پەیوەندیی نێوان ئازادیی مرۆڤ و پێغەمبەران دەکەین، پرسیارەکە لەوێوە دەستپێدەکات ئەگەر مرۆڤ خاوەنی ڕێزو بایەخ بێت و خوای پەروەردگار ئەوەندە نرخی دانابێت بۆ مرۆڤ کە بیربکاتەوە لە ئاسۆکانی ژیان و بونەوەرو خۆی، بیربکاتەوە لە دەوروبەری، ئەگەر ئەو عەقڵو بیروهۆشەی پێدابێت و ئەم جیهانەی بۆت ەرخانکردبێت، چ پێویستدەکات ئەم مرۆڤە پێغەمبەری بۆبێت؟ زانیاری بۆبێت و دەستوری بۆبێت؟

لە ڕاستیدا ئێمە لەم بەشەدا باسی ئەو دوو چەمکە دەکەین و وەڵامی ئەو پرسیارە سەرەکییە دەدەینەوە کە چ پەیوەندییەك هەیە لە نێوان ئازادیی مرۆڤ و ناردنی پێغەمبەراندا؟ دوو چەمکەکەش یەکێکیان بابەتی ئازادییە، ئەویتریشیان بابەتی پێغەمبەرایەتییە.

بابەتی ئازادی، یەکێکە لە بابەتە گرنگەکانی فیکرو فەلسەفەی مرۆڤ، لە کۆنەوە مرۆڤ بیری لەوەکردووەتەوە کە تاچەندە دەستەڵاتی هەیە لەم ژیانەداو تاچەندێك دەتوانێت کاربکات لەسەر ئەم بونەوەرەو

چارەنوسی خۆی دیاری بکات، کاتێك کە مرۆڤـ ڕووبەڕووی ژیان بووەتەوە و هەستیکردووە زۆرشت لە ژیاندا بەدڵی ئەو نین، لە ژیانی ڕۆژانەیدا زۆر شت ڕوودەدەن، تەنانەت لە ژیانی تایبەتی خۆشیدا هەموو شتێك بەدڵی ئەونییە، زۆرجار مرۆڤ حەزی دەکرد لە کۆمەڵگایەکیتر لە دایکببوایەو شێوە و ڕوخساری شێوەیەکیتر بووایە، مرۆڤـ لەم ژینە هەموو شتێکی بەدڵی خۆی نییە، ڕەنگە تەنها هەندێك شتی بەدڵی خۆی بێت، بەڵام زۆرشت کە حەزی لێدەکرد بەدڵی ئەو نەبووە، تەنانەت ئەوکارانەی کە دەیانکات و دوایی کە پێیاندادەچێتەوە دەڵێت خۆزگە ئەمکارەم بەشێوەیەکیتر بکردایە، یان بزانم چ شتێك وایلێکردم ئەمکارە بەشێوەیەکیتر ئەنجامبدەم. بۆخۆی مرۆڤ ویستێکیتری هەیە لەسەر خواست و ویستەکانی خۆی، کێشەیەکی هەیە لەگەڵ ئەوەی کە چەندێك لێهاتووە و چەندێك دەیەوێت بەویست و خواستەکانی بگات، لەبەرئەوە بەدرێژایی مێژوو مرۆڤ ویستوویەتی بزانێت چەند ئازادە: ئایا لە١٠٠٪ ئازادە، یان لە١٠٠٪ کۆیلەیە. سنوری ئازادییەکانی ئەو چەندە، هەندێك هاتون زۆر پەڕگیرانە بابەتەکەیان شیکردووەتەوە و زۆر ڕەشبینانەش وەڵامی شتەکانیان داوەتەوە و وتویانە مرۆڤ هیچی بەدەست نییە، (قەڵەم چی نووسی تێپەڕی تازە) قەڵەمێکی تەقدیر هەیە بەسەرمانەوە ئەو قەڵەمە هەمووشتەکانی بۆئێمە نوسیوە و ئێمە دەبێت جێبەجێی بکەین، خۆمان بزانین یان نەزانین خەریکی جێبەجێکردنی ئەوەین، کەواتە مرۆڤ لە کۆنەوە ئەو پرسیارەی لەخۆی کردووە، هەندێکیان وتوویانە ئێمە هیچمان بەدەست نییە، هەندێکیتر وتوویانە ئێمە

زۆرشتمان بەدەستە، سەیریش ئەوەیە کە ئەوکەسانەی وتویانە ئێمە هیچمان بەدەستنییە هەموویان ئاینی بوون و ، زۆربەی زۆری ئەو کەسانەش کەوتوویانە هەمووشتێکمان بەدەستە هەر لە ناخی ئاینەوە سەریانهەڵداوە، واتە ئەم بیرە هەر لە بنەڕەتدا کەسانی ئاینپەروەر خستویانەتەڕوو، چونکە بەڕاستی کەسانی ئاینپەروەر بیریان لەوەکردووەتەوە کە چارەسەری کێشەکانی مرۆڤ بکەن، ئەو ئاینە هەرچۆنێك بووبێت. لەو ڕووداوانەی کە مرۆڤ لە ژیاندا ڕوبەڕووی دەبێتەوە دەبینی زۆربەی دەستەڵاتی مرۆڤی تیانییە، باران کەی دەبارێت؟ (با) کەی هەڵدەکات؟ زەمینلەرزە بۆ ڕوودەدات؟ بورکانەکان، وشکەساڵی و گرانی و کارەساتە سروشتییەکان، هەموو ئەمانە مرۆڤ لە بەرامبەریاندا دەستەوەستان وەستاوە و داندەنێت بەوەی کە من هیچم پێناکرێت، هەندێك شت هەیە کە تەماشادەکەین مرۆڤ زۆر بەڕاشکاوی بوونی خۆی تیاداسەلماندووە، شاری دروستکردووە و تەلاری جوان و نەخشاوی تیادا بەرزکردووەتەوە، ڕێگەوبانی دروستکردووە، تەکنەلۆجیای داهێناوە، کە سەیری ئەم لایەنەی ژیان دەکەیت دەبینیت بەڕاستی مرۆڤ نەك تەنها دەستەوەستان نییە بەڵکو داهێنانیشی کردووە، لە هەموو بوارەکاندا مرۆڤ توانیویەتی داهێنان بکات، داهێنانی لە ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی ئاسانکردنی ژیانی کردووە، تەنانەت توانیویەتی بڕواتە سەرمانگو گەشتی ئاسمانی بکات، توانیویەتی پێشبینی هەندێك لە دیاردە سروشتییەکان بکات، پێشبینی ڕۆژگیران و مانگگیران، لە بواری

پیشەسازییدا زۆر کاری گرنگی کردووە، لە بواری هونەرو ئەدەبدا کاری کردووە، ئەوەی کە ئێستا ئێمە دەیبینین پێیدەوترێت دەستاوەردەکان و بەدەستهێنراوەکانی تەکنەلۆژیای مرۆڤ، کە لە ڕاستیدا ئیسپاتی ئازادی و عەقڵی داهێنەرانەی مرۆڤ دەکەن، وایلێهاتووە مرۆڤ زۆر شەیدای خۆی بووە، کاتێك کە لە ئاوێنەدا سەیری خۆی دەکات بەڕاستی سەرسامە بەخۆیو پرسیار لە خۆی دەکات و دەڵێت: ئەوە منم کە کاتەکانم نزیککردووەتەوە، هەموو دونیام کردووە بە یەك گوند یان شارەدێ، کەواتە مرۆڤ هۆشو ژیریو توانایەکی عەقڵیی سەرسوڕهێنەری هەیە، مرۆڤ بەم عەقڵو ژیرییەی دیارە کە ئازادە، خودا بۆ پێغەمبەری بۆ دەنێرێت ئەوەی کە عەقڵی بەشەری بەدەستیدەهێنێت لە هەموو بوارەکانی پیشەسازی و کشتوکاڵو بازرگانی و هەموو بوارەکانی بەڕێوەبردنی وولات، ئابوری وولات و پەروەردەیی و دەستوری وولات، ئایا مرۆڤ بەو عەقڵەی ناتوانێت هەموو ئەم شتانە ڕێکبخات؟ ئێستا ئەو شوێنانە چی عەیبێکیان هەیە کە هەر دینیشیان نییە؟ ژیانی خۆیانیان ڕێکخستووە؟ کەس نکوڵی لەم قسەناکات، بەڵام شتێك هەیە دیارە کە عەقڵی بەشەریی هێشتا پێینەگەیشتووە، ئالێرەدا گرنگیی ناردنی پێغەمبەران خۆی دەنوێنێت، مرۆڤ هەرچەند پێگەیشتبێت و هەرچەند توانیبێتی گۆشەنادیارەکانی جیهان کەشفبکات و لە مەتەڵەکانی ژیان تێگەیشتبێت، بەڵام هێشتاکە نەیتوانیوە زاڵببێت بەسەر ئەو نەفسو دەروونەیدا کە لە هەناویدایە،و وای لێدەکات هەموو ئەو دەستاوەردو بەرهەمە زانستییە جوانانەی

بەکاربهێنێت بۆ کەسێکیتر، ئایا ئەو هەموو یاسایانەی کە مرۆڤایەتی شانازییان پێوەدەکات و بەشان و باڵیدا هەڵدەدەن توانیویەتی زاڵبێت بەسەر دەستەڵاتێکی داگیرکەردا کە گەلێکی ستەملێکراو نەچەوسێنێتەوە؟ توانیویەتی ڕێگربێت لە بەرامبەر دەستەڵاتدارێکی چاوچنۆکدا کە بەرهەمو سامانی میلـلـەتێك بەتاڵان نەبات؟ توانیویەتی ڕێگابگرێت لە بازرگانانی چەك لە جیهاندا کە بەوشێوەیە یاری بەچارەنوسی مرۆڤایەتی نەکەن؟! ئالێرەدا گرنگیی ئاین خۆی دەبینێتەوە، ئالێرەدایە کە مرۆڤ هەرچەند عاقڵو داهێنەرو لە هەموو بوارەکانیتری ژیاندا سەرکەوتوو بێت، دەبینیت لەمبارەیەوە کورتیهێناوە لەوەی مرۆڤـ لە مرۆڤایەتی خۆی بخرێت، حسابی مرۆڤایەتی خۆی بۆ نەکرێت و ببن بەکۆمەڵێك ئەکتەری بێـدڵوگیان، بۆ زیادکردنی بەرهەمی ئابوری و زیادکردنی ڕێژەی دەنگ لە هەڵبژاردنەکاندا، بۆ ئەوەی هەرکاتێك پێویست بێت سیاسییەکان بیخەنە سەرجادەو هەرکاتێك پێویست بێت بیانهێننە سەرجادە، هەرکاتێك پێویستیان پێیهەبێت قسەبکەن و هەرکاتێك پێویستیان نەبێت قسەنەکەن، کەواتە لەوکاتانەدایە، کە ئاین خۆی دەنوێنێت و بەرنامە و یاسای پێیە کە چۆن مرۆڤ بکەین بەمرۆڤـ، چۆن مرۆڤ ئازاد بێت؟ ئێستا ئەوەی کە پێیدەوترێت ئازادیی لە ژیاندا، لە ڕاستیدا ناوێکی بێناوەڕۆکە، کێ بەخۆی دەڵێت ئازاد! ڕەنگە ئەو مرۆڤەی کە لە ڕۆژنامەیەکدا دەنووسێت خۆی بەئازاد بزانێت، بەڵام لە (نەست)یدا ئەگەر بگەڕێیت دونیایەك هێز هەیە کە سەرکوتی دەکەن و پاڵی

پێوەدەنێن بۆ ئەوەی جۆرەشتێك بنووسێت، لەلایەك هەندێك گرێی دەرونی هەیە كە بە دڵی خۆی نییە كە دەیەوێت ئەو گرێیانەی خۆی بكاتەوە، لەلایەكەوە دەستەڵاتێك هەیە ئەم دەیەوێت ڕازی بكات، لەلایەكەوە مەبەستێكی ماددیی هەیە دەیەوێت پێیبگات، لەلایەكەوە مەبەستێكی سیاسی و ئایدۆلۆژی هەیە دەیەوێت بەرگری لێبكات، لەلایەكی دیكەوە لایەنێك هەیە كە ئەم پێیناڕازییەو دەیەوێت سەركوتی بكات، لەلایەكەوە گوشارێكی كۆمەڵایەتی و ئابوری لەسەرە بەشێوەیەك لە شێوەكان پاڵی پێوەدەنێت بۆ ئەوەی ئەو شتە بنووسێت، كێ توانیویەتی بەتەواوی ڕەهاببێت و بەشێوەیەكی زانستییانە لە بابەتەكان بكۆڵێتەوە، ئەو نووسەرێكە ڕەنگە خۆی وابزانێت ئازادە، پارێزەرێكە دەیەوێت چارەسەری كێشەیەك بكات چەندێك دەربازی دەبێت لەو گوشارانەی كە لەسەریەتی، چ گوشاری بڕوایی بێت یان سیاسی یان چینایەتی و كۆمەڵایەتی و دەرونی و سایكۆلۆژی، ئایا ئەو پارێزەرە دەتوانێت ڕۆڵی خۆی ببینێت؟

ئێستا جیهان جیهانی ڕووبەڕووبوونەوە گەورەكانە، چەندێك سیاسەتمەدارێكی ئەمەریكی كە دێت بۆ چارەسەری كێشەكانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەتوانێت خۆی داماڵێت لەو تەوجیهاتەی كە ئیدارەكەی بۆی نووسیوە؟! كە دێتە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بتوانێت بەویژدانەوە دادوەریی بەرەی زایۆنی و بەرەی فەلەستینی بكات.

كاتێك وەزیرێك دەچێتە وولاتێك چەند دەتوانێت بەویژدانەوە بڵێت ڕاستی لای بەرامبەرەكەیەتی و لای ئەونییە، چەندێك دەتوانێت دانبنێت

بەحەقدا، کەواتە مرۆڤ بەڕواڵەت ئازادە، بەڵام ئایا توانیویەتی بەڕاستی ئازادبێت؟

ئافرەتێکی فیمینیست کە دێتە سەر تەلەفزیۆن باسی ئازادیی ئافرەت دەکات، چەندێك لە ژێر کاریگەریی عەقڵ‌و ویستدایە؟ یان چەند لە ژێر ئارەزووو چێژدایە؟

کەواتە ئەم سەدەیە کە پێیدەوترێت سەردەمی ئازادیی مرۆڤ، لە هەموو کاتێکیتر زیاتر لە ژێر گوشاردایە، ئێستا لە هەموو کاتێك زیاتر مرۆڤایەتی پێویستیی بەئاین هەیە، پێویستیی بەوەهەیە بڕوای پێغەمبەرایەتی هەبێت، پێویستە بڕوای بەپێغەمبەران هەبێت، بەهێزێك کە فێری یەکسانیو دادگەریی دەکات، فێری ئەوەی دەکات کە لە ڕاستیدا لە ژێر ئەو گوشارانە بێتەدەرەوە، لە ژێر ئەو زەبروزەنگانە دەربازی ببێت و لە ڕوانگەی گرێ دەروونییەکانیەوە بۆ بابەتەکان نەڕوانێت، لە ڕوانگەی دەمارگیری و نەتەوەپەرستی و ناسیۆنالیستی بۆ کێشە سیاسییەکان نەڕوانێت، لە ڕوانگەی تەنگی مەزهەبییەوە بۆ چارەسەی کێشەی وولاتەکەی نەڕوانێت، تەنانەت لە ڕوانگەی ئاینییەوە بۆ دادگەری لە نێوان مرۆڤەکان نەڕوانێت، وەك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) جاری وا هەبووە کە دادوەریی کردووە لە نێوان مسوڵمانێك‌و یەهودییەکدا تەماشای کردووە حەق لای یەهودییەکەیە و حەقەکەی پێداوە و نەیفەرمووە مسوڵمانەکە سەر بەئاینەکەی منە و لایەنگری منە و شایەتومان بەمن دێنێت و ئیتر لایەنی بگرێت، بەڵکو حەقەکەی بەیەهودییەکە داوە، تەنانەت جاری وا هەبووە کابرا

ڕازینەبووە و وایلێهاتووە بچێت ئیمانەکەی خۆی بدۆڕێنێت لەوپێناوەدا، لێرەدا پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) مەبەستی چەسپاندنی یەکسانی بووە، نەك مەبەستی ئەوەبووبێت کە مەسەلەکە بکێشێت بەلای هاودینەکەی خۆیدا، لە سەردەمی خەلیفەکانیشدا ئەم دادپەروەرییە جێبەجێ کراوە. یاسایەکی ئیسلامییە کاتێك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ﴾ النساء:٥٨. دەفەرموێت ئەگەر حوکمتان کرد لە نێوان خەڵکدا، نافەرموێت ئەگەر حوکمتان کرد لە نێوان ئیمانداراندا، پاشان دەفەرموێت: ﴿أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ﴾ ، نەیفەرموو (ان تحكموا لمن كان على دينكم) نەیفەرمووە (ان تحكموا للمسلمين، للمؤمنين)، لە شوێنێکیتردا دەفەرموێت ﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ﴾ المائدة:٨، واتە: ڕقبوونەوەتان لە کۆمەڵێك، واتان لێنەکات کە بە نادادپەروەرییانە بەرانبەریان بوەستنەوە، هەر بەدادپەروەریی ڕەفتار بکەن، ئەوە تاوانە، ئەمڕۆ بەشەریەت لەو ڕوانگەوە داوای ئاین دەکات، بێگومان ئەوکەسانەش کە دژی ئاین دەوەستن ڕەنگە لە فەحوای زۆرانبازیو ململانێکە باش تێگەیشتبێتن، لەبەرئەوە دەیانەوێت گومان لەسەر بنەمای ئاینداری دروستبکەن، بەگەلێك شێوە گومان لەسەر ئاینداری دروستدەکرێت، یەکێك لەو شێوانە ئەوەیە کە ئینکاری ئەسڵی پێغەمبەرایەتی دەکەن و دەڵێن کە عەقڵ هەبوو پێغەمبەرایەتی پێویست نییە! دیارە قسەکە بەڕواڵەت قسەیەکی جوانە و بوونی عەقڵ مرۆڤ دەگەیەنێت بەزۆر مەبەست، عاقڵبوون زۆر خێرو بەرەکەتی لێکەوتووەتەوە و زۆرجار بەدرێژایی

مێژوو لەناو هەموو کۆمەڵگاکاندا کەسانی عاقڵ توانیویانە خزمەتی زۆر بەگەلەکەیان و کۆمەڵگەکەیان بکەن، دەتوانین نموونەی زۆر بهێنینەوە، بۆ نموونە لە چیندا لە سەدەی (پێنجەمو شەشەمی پێش زاین)دا حەکیمێکی وەك (کۆنفۆشیۆس) دەرکەوتووە، کەسێکی شارەزاو ژیرو وریا بووە و توانیویەتی خزمەتێکی گەورە بەباری کۆمەڵایەتی و باری پەروەردەیی و دەرونیی خەڵکی چین بکات، بەهەمانشێوە لە هیندستاندا کەسێکی وەك (بودا) دەرکەوت کە خەڵکی هیندستانی ڕێنمایی کرد بەرەو زۆر کاری باش، لە یۆنان و ڕۆمای کۆنداو لە هەموو کۆمەڵگاکاندا کەسانی ژیرو وریا توانیویانە کلیلی زۆر گرێکوێرەی پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و زانستی بن، لە وڵاتی خۆشماندا بوونی عەقڵ ئەوەی زانیوە کە زۆر کێشەی پێچارەسەردەکرێت، لە گوندێکداو لە شارێکدا بوونی چەند کەسێکی عاقڵ خێروخۆشی و بەرەکەتی زۆری پێوەیە بۆ ئەوخەڵکە، بەڵام ئێمە کە سەیری ئەوەدەکەین کە ئەڵێین ئێمە چی زەمانەتێکمان هەیە کە لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەمیشە ئاوا کۆمەڵە کەسانێکی عاقڵ هەبن، یان ئەگەر هەبن بەچ زەمانەتێك خەڵك بە گوێیاندەکات؟ بۆچی لەناو چینییەکان دوای (کۆنفۆشیۆس[1]) کەسیتری وەك خۆی بەدوادا نەهات؟

---

[1] ـ کۆنفۆشیۆس(٥٥١ ـ ٤٧٩ پێش زاین) فەیلەسوف و دامەزرێنەری ئاینی کۆنفۆشیۆسی، هـزری ئەو بۆ ماوەی ٢٠ سەدە کاریگەری لەسەر وڵاتی چین هەبووە. پاش کرانەوەی چین بەرووی جیهاندا ئامۆژگاری و پەندەکانی لە جیهاندا بڵاوبووەتەوە و جێگای بایەخی مرۆڤایەتییە.

یان (بودا[1]) کەسیتری بەدوادا نەهات؟، پاش ئەو هەر ئەوەندە عەقڵیان گرتی دەستیانکرد بەبتپەرستی و دەستیانکرد بەهەندێك لادان و لاڕێکەوتن لە بنەمای بیروبڕواکەی، یاخود لە یۆنان و لە ئەوروپا لە سەردەمە تاریکەکاندا ئەو عەقڵەی هەبووو کەڵەکەش بووبوو، بۆچی نەیتوانی ڕێگەبگرێت لەو لادان و لاڕێکەوتنەی کە بە ڕاستی دەوروبەری لێتەنیبوون؟ لە ڕاستیدا دەرکەوتنی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر) دژ بەبوون و کاریگەریی عەقڵ نییە، ئێمە کە دەڵێین پێغەمبەران هەبن، لە ڕاستیدا بۆ ئەوەنییە کە پێغەمبەران هاتن عەقڵ وولآتەکە بەجێبهێڵێت، خەڵك کاریان بەعەقڵو مرۆڤی ژیرو زانا نەمێنێت، بەپێچەوانەوە گەر عەقڵ لە هەر کۆمەڵگایەکدا بوو و پێغەمبەریش هاتە ناو ئەو کۆمەڵگایە، ئەوکاتە دووچرا بەدەستی ئەو خەڵکەوە دەبێت، هەمووومان دەزانین گەر لە شوێنێکدا چرایەك هەبوو چرایەکیتر بێت، ناوچەکە زیاتر ڕوناکدەبێتەوە، ئێمە لە هیچ لۆژیکێکی دروستدا نابینین کە ئەگەر عەقڵەکەشت عەقڵێکی تەواو بوو ئەگەر ڕێنماییەکت دەستکەوت دەستبنێین بەڕووی ئەو ڕێنماییەوە! بەپێچەوانەوە بوونی پێغەمبەران بۆ جەختکردنەوەی ئەو دەستەواژەو بیردۆزە عەقڵییانەیە کە عەقڵی ساغ پێیدەگات، واتە بوونی عەقڵ هچ دژایەتییەکی نییە لەگەڵ بوونی پێغەمبەراندا، چونکە پێغەمبەران داوای شتێك ناکەن کە عەقڵ داوای ناکات، عەقڵ داوای شتێك ناکات کە

---

[1] ـ بوودا: لە نێوان سەدەی چوارەم و شەشەمدا لە باشووری هیندستاندا ژیاوە، دامەزرێنەری ئاین و فەلسەفەی بوودابیە.

پێغەمبەران داوای نەکەن، لەبەرئەوە بەڕاستی زانا مسوڵمانەکان لە حەقیقەتی ئەم بیردۆزە تێگەیشتوون و بەشێوەی جیاواز بەگوزارشتی جیاواز باسیان لێوەکردووە:

یەکێك لەو زانایانە (ئیبن روشد)بوو، پەرتووکێکی قەبارە بچووکی نووسی، بەڵام بەماناو ناوەڕۆك زۆرو لە ڕاستیشدا جوانترین وەڵامە بۆ ئەو پرسیارەی کە پێشکەشمان کرد، کتێبەکەی ناوی (فصل المقال فی مابین الحکمة واالشریعة من اتصال)، واتە پەیوەندییەکی زۆر تۆکمە لە نێوان عەقڵو شەریعەت و عەقڵو پێغەمبەرایەتییدا هەیە، چونکە دیارە مرۆڤەکان هەموویان هەڵبژاردەنین لە ئاستی مەعریفی و زانستییەوە، تۆ ڕەنگە لە کۆمەڵگایەکی یەك ملیۆنییدا سەدکەس یان دووسەد کەست دەستبکەوێت کە ڕایانبهێنیت و پەروەردەیان بکەیت لەسەر فەلسەفەو بەڵگەی یەکلاکەرەوە، لەسەر حیکمەت و زانست و ئەدەبی باڵا، بەڵام هەموو خەڵکەکە ئەوەندە کاتیان نییە کە ژیانی خۆیان تەرخانبکەن بۆ فێربوونی زانست و پسپۆڕبوون لە بوارە پسپۆڕییە جیاوازەکاندا، لە بواری تەشریعدا ئێستا ئێمە لە کوردستاندا نزیکەی حەوت کۆلێژی یاسامان هەیە، بەڵام بەڕاستیی چەندێکیان دەبن بەپسپۆڕ لە یاسادا؟! چەندیان بەڕاستی دەبن بەخاوەنی بۆچوونی تایبەت لە بواری یاسادا، کەواتە عەقڵ کاریگەردەبێت و ڕۆڵی دەبێت، بەڵام سەبارەت بەکەمینەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، ئەی زۆرینەی مرۆڤایەتی؟ ئەی زۆرینەی ئەو خەڵکانەی کە لە ڕاستیدا باری قورسی شارستانیەتی و دروستکردن و ئاوەدانکردنەوەی سەرزەوی لەسەرشانی ئەوانە دەڕوات، ئەوانە پێویستییان بەڕێنما نییە،

کەواتە هەندێك کەس کە وادەزانن عەقڵ هەبوو پێویستمان بەئاین نییە لە کۆمەڵگەی بەشەری باش تێنەگەیشتوون، ئەم کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە هەمووی ناتوانێت خەریکی حیکمەتی فەلسەفی و گوتەزاکان (مقولات)و شتی لەم بابەتانە بێت، بەڵکو دەبێت خەڵکێك هەبن بچنەناو قووڵایی زانستەکانەوە، دیسان ئەوانیش هەر پێویستییان بەڕێنمایی هەیە پێویستییان بەلایەنی ڕوحیش هەیە، پێویستییان بەوەهەیە کە نموونەیەکی باڵا لەبەرچاویاندابێت، ئەو نموونە باڵایانە بریتیین لە پێغەمبەران، هەر ئەم کێشەیە بۆ یەکێك لە شاگردەکانی (ئەبوعەلی سینا) دروستبووبوو کە پێیوابوو گەر لەناو مرۆڤدا کەسێکی وەك (ئەبوعەلی سینا) دروستبوو ئەوەندە شارەزاو فەیلەسوفو حەکیمو قسەزان، ئیتر خوا پێغەمبەران بۆ دەنێرێت؟ دیارە کە (ئەبوعەلی سینا) هەولێدا کە بە فەلسەفەو بەبەڵگە پێیبسەلمێنێت لە هەڵەدایە، بەڵام شاگردەکە هەر ڕازی نەدەبوو، هەتا ڕۆژێك (ئەبوعەلی سینا) بڕیاریدا بەشێوەیەکی کردەیی پێیبسەلمێنێت پێغەمبەر زۆرزۆر بەرزترە لە فەیلەسوفو حەکیم، شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاوی پڕ لە ڕەشەبای - وەك ڕەشەبای شاری سلێمانی - لە نیوەشەودا (ئەبوعەلی سینا) خوێندکارەکەی هەڵساند وتی تینوومە بڕۆ ئاوم بۆ بهێنە، خوێندکارەکەش خەوەکەی زۆرزۆر خۆشبوو تۆزێك خۆی گێلکردو وتی بەڵکو (ئەبوعەلی سینا) خەوی لێبکەوێتەوە، ئەویش خۆی کردەوە بەخەوتوو، ئینجا خوێندکارەکە نەچوو بۆ ئاوەکەو خەوتەوە، پاش ماوەیەك جارێکیتر پێیوتەوە، بەهەمانشێوەی جاری پێشوو خۆی خەڵەتاند تا (ئەبوعەلی سینا) خەوی لێکەوتەوە و هەر بۆینەهێنا هەتا سێ

جار، ئەم شاگردە دڵسۆزە کە پێیوابوو کاتێك (ئەبوعەلی سینا) هەبوو پێویست بە پێغەمبەر ناکات، ئامادەنەبوو بڕوات قومێك ئاو بهێنێت بۆ مامۆستاکەی، هێندەی پێنەچوو کابرایەك بانگی (الله اکبر)ی بەرزکردەوە بانگی بەیانی دا، (ئەبوعەلی سینا) وتی وەرە جیاوازی من و پێغەمبەر ئالەم خاڵەدا خۆی دەبینێتەوە، تۆ چەندێك دڵسۆزی منیت چەندساڵە لەگەڵ من دەژیت و دڵسۆزی منیت، ئامادەنەبوویت ئیسراحەتی خۆت تێکبدەیت و بڕۆیت تۆزێك ئاوم بۆ بهێنیت کە ڕەنگە کاتێکی کەمی تۆی بگرتایە، بەڵام ئەم پیاوە بانگبێژە چەند سەد ساڵ لەمەوپێش محەممەدێك هەبووە لە مەککەو لە مەدینە دەرکەوتووە ئەم لێرەوە بەبێئەوەی بینیبێتی بڕوای پێهیناوە، بێ ئەوەی لەگەڵی ژیابێت ئەوەندە عاشقی ئەوە بەم بەرەبەیانە ئامادەیە بچێتەسەر ئەو منارەیەو ئەو بانگە بچڕێت.

لەڕاستیدا بوونی پێغەمبەر بریتییە لە بوونی نموونە، بوونی پێشەواو پێشەنگ لە ژیانی مرۆڤەکاندا، لەبەرئەوە بەکردەیی ئێمە بۆ ماندەرکەوتووە کاریگەریی پێغەمبەران لە مێژووی مرۆڤایەتییدا زۆرزۆر زیاتر بووە لە کاریگەریی فەیلەسوفان و زانایان و کاریگەریی ئەندازیاران و کاریگەریی ئەوانەی ئەندازیاری بیناو تەلاری مرۆڤایەتین، لەلایەکەوە پێغەمبەران دەبن بەپێشەواو سەرمەشقو ئەوەی دەیهێنن لە زانیاری و بەرنامەو یاساوڕێسا، لە خۆیاندا بەرجەستەی دەکەن و دەبن بەخۆشەویستی خەڵکەکە، خەڵك ئەزموونی ئاینیی خۆیان بەلاساییکردنەوەی ئەو دەستپێدەکەن، هەریەکەیان بگریت

شوێنکەوتەی کەسێتی پێغەمبەرەکەیان دەبن، دەیانەوێت کەسێتی و بۆچوون و ڕەفتاری ئەو پێغەمبەرە جارێکیتر دووپاتبکەنەوە و جارێکیتر زیندووی بکەنەوە، ئێمەش لە هەموو بوارە زیندووەکانی شارستانیەتییدا لە بواری یاساوە بیگرە هەتا بواری ئابوری و پەروەردەو شارسازی و شاردروستکردن و هەربوارێك کە ئێمە لە بیر و هۆشماندایە، پێویستمان بەمەنهەجیەتی مۆدێلسازییە، کەسێك دەیەوێت لە بواری پەروەردەدا ئیشبکات لە وولاتێکدایە دەبێت یاسایەکی پەروەردەیی دابنێت، لە وولاتێکدایە کە خوێندکارەکانی دەچنە خوێندنگەو زانستگا پێویستە پێیانبلێت من دەمەوێت کەسێکی وەهاتان بۆ دروستبکەم، دەمەوێت ئێوە بەمشێوەیەبن، لە بواری پەروەردەدا ئێمە پێویستمان بەبوونی چەند نموونە هەیە، بەڵام نموونەی هەرەبەرز بریتییە لە پێغەمبەران، چونکە زۆرگرنگە بۆ کەسێك وازی لە خۆی هێنابێت و لە خۆشەویستی خوداو دڵسۆزییدا ئەوەندە توابێتەوە کە خۆی لە بیرچووبێتەوە، ئەوە تەنها پێغەمبەرانن.

لە بواری یاسادا ئێمە دەبێت بزانین ئایا پێویستە یاسایەك لە وولاتدا هەبێـت و جێبەجێبکرێت کە ئەو یاسایە نەك تەنها لەسەر بنەمایتر خەڵك بەگوێی بکات، بەڵکو لەسەر بنەمای خۆشەویستیی بەئەرکی سەرشانی خۆیانی بزانن کە گوێڕایەڵی بن، ئەمە لە ڕێگەی ژیان و سیرەی پێغەمبەرانەوە بۆ ئێمە دەگونجێت.

لە بواری سیاسییماندا دەبێت کەسێك بێت بۆمانی بسەلمێنێت کە تەنها گەل خاوەنی بڕیارو چارەنوسی خۆی بێت و گەل دیارییبکات لەگەڵ

کێدا شەڕبکات و لەگەڵ کێدا ئاشتی بکات،و چۆن کاروباری خۆی بەڕێوەببات، لە ژیانی پێغەمبەراندا ئەمە دەبینیت، لە ژیانی پێغەمبەراندا دەبینیت کە بە ڕاستی گەل خاوەنی بوون و مرۆڤایەتین، چونکە ئەو سیستەمە سیاسییەی کە لەسەر بنەمای پێغەمبەرایەتی بنیاتدەنرێت سیستەمی سیاسیی گروپێکی حیزبی و چینایەتی نییە، بۆ ئەوەنییە کرێکاران فەرمانڕەوابن بەسەر خەڵکداو بۆ ئەوەنییە کە نەتەوەیەك فەرمانڕەوابێت بەسەر نەتەوەکانیترداو کۆمەڵێك یان دووگروپ بەرژەوەندییەکەیان بەیەکەوە نووسابێت و هەتاهەتایە فەرمانڕەوابن بەسەر ئەو خەڵکەدا، ئەمە لە ژیانی پێغەمبەراندا دەیبینین، چونکە پێغەمبەران ئامانجیان دونیانەبووە، حوکمی جیهانیشیان کردبێت، مەبەستیان دونیا نەبووە و لە ناو خەڵکدابوون و بەدڵ پەیوەستبوون بەخوای پەروەردگارەوە، ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە بەڕاستی، کە تەنها بەعەقڵ‌و هەستی رووت بەڕێوەناچێت، شتێکی لەوانە زیاتری دەوێت، دەبێت ئەوکەسەی کە ڕێبەرایەتی ئەوخەڵکە دەکات کەسێك بێت زۆر نزیکبێت لێیانەوە، لە نێوان خۆی‌و ئەواندا دیوار نەبێت، باوك‌و دۆستی هەموویان بێت، دڵسۆزی هەموویان بێت کار بۆ گروپێك یان کۆمەڵێك، لە ژێر هەرناوێکدا بێت، نەکات. بۆ نمونە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) هەمیشە لایەنی پێغەمبەرایەتییەکەی زاڵبووە بەسەر فەرمانڕەواییەکەیدا، چونکە ئەگەر فەرمانڕەوایی بکردایە دەبوایە حەشەم و کۆشك و تەلار و وەزیرو گزیر و ئەوشتانەی هەبوایە، بەو شێوەیەی کە ئێستا لە دەوڵەتە نوێکاندا دەیبینین، لەو سەردەمانەدا خەڵك بەتەواوی

غافڵ نەبووە لە دروستکردنی دەوڵەت، لەو سەردەمەشدا قابیلیەتی ئەوە هەبووە کە ئیمپراتۆریەت دروستبکرێت و وەزارەت دروستبکرێت، دەبینین لە سەردەمی ئەمەوی و عەباسییدا مسوڵمانان گەورەترین ئیمپراتۆریەت دروستدەکەن، بەڵام سەردەمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)و سەردەمی خولەفای ڕاشیدین کە بە ڕاستی درێژەی سەردەمی نورانی پێغەمبەرە، حکومەتکردن و دەستەڵاتپەیداکردن مانایەکی تایبەتی هەیە، کەواتە پێغەمبەرایەتی نەك هەر پێویستە لە پەنای عەقڵدا بەڵکو هەمیشە پێویستە بۆ ئەوەی یارمەتیدەری عەقڵ بێت، مرۆڤ کە ئازادە مانای ئەوەنییە کە بە تەواوەتی ئازاد بووە لە خۆپەرستی و کورسیپەرستی و ئارەزووپەرستی، کەواتە لەو شوێنەدا کە عەقڵی مرۆڤایەتی کورتدەهێنێت و دەستی عەقڵی ناگاتیێ، لەو گۆشەوکەنارانەدا کە ئیتر عەقڵ ڕۆڵنابینێت، رۆڵی پێغەمبەر دەستپێدەکات، ئا لەو ساتەوەختانەدا پێغەمبەر لە سیمای مورشیدی نوورانییدا خۆی نیشانی مرۆڤایەتی دەدات، لە سیمای ڕێنوێنی ئامۆژگاری و پلەوپایەبەرزەکانی ئیماندا خۆی نیشانی مرۆڤایەتی دەدات، بۆ ئەوەی کە بوویت بەدەستەڵاتدار لەخۆبایی نەبیت، بۆ ئەوەی کە بوویت بەژێردەست تەسلیمی حاکمی ستەمکاری دیکتاتۆر نەبیت، بەڵکو هەتا دەستەڵات لەسەر حەق بوو لەگەڵی بیت و لەسەر ناحەق بوو لێی جیابیتەوە و لێی تەبەڕابیت، لەسەر بنەمای بوونی پێغەمبەرایەتییە کە عەقڵ دەتوانێت فێری دۆستایەتی بێت و فێری دوژمنایەتیش ببێت، بتوانێت دۆستایەتی بکات بۆ چاکەخوازان و بێزاری دەرببڕێت لە ستەمکەران و داگیرکەران.

# هزری ئیسلامی لە وەڵامی هەندێك ڕەخنەدا

پێش دەستپێکردنی ئەم باسە پێویستە ئاماژە بەوەبدەم کە ئەم باسانە هەرچەندە لە شێوەی زنجیرەئامێزدا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام لە هەمانکاتدا هەریەکەیان باسی سەربەخۆیە.

لەهەندێك لە سایتەکان و ڕووپەڕی ڕۆژنامەکانی هەرێمی کوردستان و کوردستانی خۆرهەڵاتدا هەندێك نوسەر (کەبەڕاستی کەوتوونەتە ژێر کاریگەری نوسین و بیروبۆچوونی هەندێك لە خۆرهەڵاتناسەکانەوە) دەیانەوێت قورئان تەنها وەك دەقێکی مێژوویی یان تەنها وەك دەرهاویشەی مێشکی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) باسبکەن، ئەمە شتێکی تازە نییە، یان وەك لەلای هەندێك گەنجو خوێندکارانی زانکۆ بەحوکمی ئەوەی کە هەرکامیان بەدوای پسپۆڕییەکدا چووە و نەگەڕاوەتەوە بۆ قوڵایی مێژووی هـزری ئیسلامی و بۆ مێژووی ئیسلام بەگشتی و مێژووی بیرو ڕێبازە تازەکان کە لە جیهانی ئیسلامییدا سەریانهەڵداوە، ڕەنگە ئەوان بەلایانەوە تازەبێت، لەبەرئەوە بەچەند خاڵێك ئەو بابەتە دەخەینەڕوو:

یەکەم: نکۆڵیکردن یان سەربادان لە بڕواهێنان بەقورئان و سوننەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) شتێکی تازە نییە و شتێك نییە کە

ئێمە بیشارینەوە، قورئانی پیرۆز چەندین ئایەتی تیادایە کە نەك تەنها پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) تەنانەت پێغەمبەرانی پێشووش ڕووبەڕوی ئەوە بوونەتەوە کە گەلەکانیان و خەڵکی جۆراوجۆر ئەوانیان بەدرۆخستووەتەوە و بەهەموو شێوەیەك ویستویانە ئەوسیفەتەیان لێبستێنن کە ئەمانە پێغەمبەرو نێردراوی خودان. ئەم بانگەوازە بەڕاستی بانگەوازێکە ئەگەر جاران بێبڕوایان بەڕاشکاوی کردبێتیان، ئێستا ڕەنگە بیپێچن لە لەفافەی زانست و زانیاری و بیرەوە، بەڕاستی ئەمە جۆرێکە لە چەواشەکردن کە دەبینیت لە گۆڤارێکدا یان لە ڕۆژنامەیەکدا کەسێك هەر بەو حوکمەی کە شەهادەیەکی بەرزی پێدراوە یان هەندێك نوسین و پەرتووکی هەیە دێت بەئارەزووی خۆی پێناسە بۆ قورئان دەکات و دەیەوێت وەهای نیشانبدات کە ئەم قورئانە تەنها دەقێکی مێژوویی کەلتورو هـزری عەرەبییە، ئەمەش شتێکی تازە نییە، چونکە ئێمە مێژوویەکی دێرینمان هەیە لە بێبڕوایی، مێژوویەکی دێرینمان هەیە لە خراپتێگەیشتن، لێرەدا با وەها تێنەگەین کە یەکێك قسەیەکی کرد لەوبارەیەوە بەبێبڕوای لە قەڵەمبدەین، ڕەنگە کەسێك زۆر ووشە دێت بەسەر زاریداو هەندێك دەستەواژە بەکاردەهێنێت و لە دەستەواژەکانی خۆی ناکۆڵێتەوە، ڕەنگە بیریش لە وەنەکاتەوە کە ئەم قسە بۆ کوێ سەردەکێشێت، قسەکان مەترسیدارن و دژی بنەماکانی ئیسلامن و بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ بنەمای ئیسلامییدا یەکناگرنەوە، مەبەستمان ئەوەنییە کە ئەم قسە بێبڕواییانەی دەیکات کافردەبێت پێی، هەندێك کەس ڕەنگە لە ڕووی ناحاڵیبوونەوە بێت، بەڵام هەندێك

کەس هەیە لە ڕووی بەرنامەیەکی داڕێژراوەوە ئەو قسانە دەخاتە ناو لاپەڕەی گۆڤارو ڕۆژنامەکان، وە لە ڕاستیدا ئێمە نامانەوێت نرخی پێبدەین و ناشمانەوێت بیشارینەوە، چونکە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)و سەرچاوەکانیتر باسی ئەو بابەتەیان کردووە، زۆر سروشتییە لەناو کۆمەڵگادا لە هەموو دەوروزەمانێکدا کەسانێك بڕوایان بەئاینی ئیسلام نەبێت، یان بڕوایان بەئەسڵی ئایینداری نەبێت، لە کۆنەوە مسوڵمانان پەنجەیان لەگەڵ ئەم بابەتە نەرمکردووە، زانا مسوڵمانەکان زۆر ئازایانەو ئازادانەو بەبیری تیژەوە هاتوون لە بەرامبەر ئەو جۆرە بانگەوازانەوە قسەیان کردووە و کتێبیان داناوە، بۆ نمونە یەکێك لە زاناکانی ئیسلام کە لەسەر مەزهەبی (موعتەزیلە)ش بووە، بەڵام بەرگری لە ئیسلام کردووە بەناوی (ئەبوعەلی ئەلـجبائی[1]) کاتێك کە بیستی زانایەك بەناوی (ئیبن راوندی)[2] کتێبێکی دژی قورئان

---

[1] - ئەبوعەلی ئەلجبائی(٨٤٩ ـ ٩١٦ز) دامەزرێنەری قوتابخانەی (الجبائیە)یە و پێشەوایەکی گەورەی موعتەزیلەکانە. لە خوزستان لەدایکبووە و لە بەسرە کۆچی دوایی کردووە.

[2] – ئەحمەد کوڕی ئەلروانی، لەخێزانێکی جولەکە لەدایکبووە، ساڵی لەدایکبونی نەزانراوە( ٢٥٠ یان ٢٩٧ ك) مردووە، وا خۆی دەرخستووە کەمسوڵمان بووە، موعتەزیلی بووە، پەرتوکێکی نوسیوە بەناوی (فضیلة المعتزلة) لەوەڵامی پەرکوتی (فضیلة المعتزلة)ی جاحیزدا، دانراوی زۆر دراوەتەپاڵی وەك (الزمردە)، (التاج) و (البصیرە) و (الدامغ) وەك ڕەخنە بۆ قورئانو ئیسلام، زۆربەی ئەم پەرتوکانە لەناوچوون تابەتەواوی بۆچونی بزانرێت جگە لەوەی کەلە پەرتوکی (الاتصار) ئەبی حسەین عەبدولرەحیم کوڕی محەممەد کوڕی عوسمان خەییاتی موعتەزیلەوە نەبێت کە وەڵامی کتێبی (فضیلة المعتزلة)ی داوەتەوە کەلەناو ئەم پەرتوکەدا بۆچونەکانی باسکردووە، لێکۆڵەری پەرتوکی (الانتصار) خۆرهەڵاتناس (د.نیبرج) مامۆستا لەزانکۆی (ئۆپبسالا) لەسوید دەڵێت: ئیبن راوندی لەسەر بیروباوەڕی خۆی ماوەتەوەو ئامانجەکانی پێکاوە، ئەم پەرتوکانە هەموو دانراوی ئەم نییە، بەڵکو لەبەر ناوبانگی لەسەر ئیلحادی خۆی هەندێك لەزەنادیقە ئەمانەیان داناوە کردویانە بەناوی ئەوەوە, د.عبدە فراج، معالم

داناوه ناوی ناوه (الدامغ)، ئەم هات ڕەددێکی لێ نووسییەوە و بانگیشی کرد بۆ شاری بەغداو دیدارێکی لەگەڵدا کرد لە سەر پردی بەغدا. کتێبە مێژووییەکان، بەتایبەت کتێبی (معاهد التنصیص)، باسی ئەو بابەتە دەکەن کە(ئەبوعەلی ئەلـجبائی) لەگەڵ (ئیبن راوندی) دیدارێکی سازکرد لەسەر پردی بەغداو (ئیبن راوندی) نەیتوانی لەبەرامبەر بەڵگەکانی (ئەبو عەلی ئەلـجبائی)دا بوەستێت.

جگە لە (ئیبن راوندی) کەسانیتری وەك (ئەبو عیسای وراق)کە دەکرێت بڵێین مامۆستای (ئیبن راوندی)بووە، یان (ئیبن موقەففەع)[1] کە ئەدیبێکی زۆر گەورە بووە و شارەزای هەردوو زمانی عەرەبی و زمانی فارسی بووە، ویستویەتی بەهەمووشێوەیەك سیفەتی ئیعجاز لە قورئان بسەنێتەوە و خەڵك بگەیەنێتە ئەو باوەڕەی کە قورئان وتەی خودانییە، (ئیبن موقەففەع ـ ابن مقفع) جاری واهەبووە هەوڵیداوە شتێك دابنێت وەك قورئان، بەڵام ئەویش لە ئەنجامدا نەیتوانیوە و بۆی دەرکەوتووە کە دانانی شتێکی وەك ئەم قورئانە لە توانای مرۆڤدانییە.

---

الفکر الفلسفي في العصور الوسطى الفلسفة الإسلامية والمسيحية (القاهرة : مكتبة الانجلو المصرية، ١٩٦٩، لا ٨٧.

[1]– عەبدوڵای کوڕی موقەففەع (١٠٦ – ١٤٢) ژیاوە، نوسەرێکی فارسە لەناو عەرەبدا گەورەبووە، باوکی بەندەیەکی ئاگرپەرست بووە پێشکەش بە حەجاجی کوڕی یوسف کراوە، هێندەی لێداوە هەتا دەستێکی لەدەستداوە، نازناوی (ئیبن موقەففەع)ی لێنراوە، عەبدوڵا بەپەروەردەیەکی ئیسلامی پەروەردەکراوەو گەورەبووە، کەسێکی زیرەكو ڕەوانبێژبووە، دەربارەی وتراوە کە: لەعەجەمدا هیچ کەس هێندەی (ئیبن موقەففەع) زیرەك نەبووە، سێ پەرتوکی ئەرستۆی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی، پەرتوکی (إيساغوجي ) وەرگێڕاوە، پەرتوکی (التاج)ی لەسەر ژياننامەی (ئەنەوشیروان) وەرگێڕاوە.أحمد زيات: تاريخ الأدب العربي، سەرچاوەی پێشو، لا١٦٤.

یەکێکیتریان فەیلەسوفێکە بەناوی (محەمـمەدی کوڕی زەکەریای رازی)[1] ئەمەش لەوان بەبڕشتر ویستویەتی بڵێت کە پێغەمبەرایەتی بنەمایەکی نییە، لەوبارەیەوە دوو بەڵگە دەهێنێتەوە:

**بەڵگەی یەکەمیان:** بۆ دەبێت خوای پەروەردگار کۆمەڵێك هەڵبژێرێت بیانکات بەپێغەمبەرو خەڵکەکەیتر نەکات بەپێغەمبەر؟

بەڵگەی دوومیان: کاتێك خوا کەسێك دەنێرێت و دەیکات بەپێغەمبەر، کۆمەڵە خەڵکانێك شوێنی دەکەون کۆمەڵێکیتر دژی دەوەستن، دەبێت بەشەڕو خوێنڕشتن و نابێت خوا کارێکی لەو بابەتە بکات.

وەڵامدانەوەی ئەم دوو گومانە (نابێت پێیبڵێین بەڵگە) کە ئەو دروستیکردووە زۆرئاسانە، چونکە ئەگەر تەنانەت خوای پەروەردگار کەسانێکیش نەکات بەپێغەمبەر، جیاوازی لە نێوان مرۆڤەکاندا هەردەمێنێت، مرۆڤەکان بەسروشت جیاوازن و هەموویان یەك ئاستیان نییە لە ڕووی تواناو لێوەشاوەییەوە، تەنانەت لەناو نوسەراندا هەموویان یەك ئاستیان نییە، شاعیرانیش هەموویان یەك ئاست نین، زانایان و ئەدیبان و بوێژانیش وەك یەك نین، کەواتە ئەو قسەیە بێبنەمایە کە بۆچی خوای پەروەردگار کۆمەڵێك هەڵبژێرێت و کۆمەڵێك

---

[1] - ئەبوبەکر محەممەد کوڕی زەکەریای ڕازی، ساڵی لەدایکبوونی نەزانراوە(۳۲۰ك)مردووە پزیشك و فەیلەسوفی ناسراو لەڕوانگەی پەرتوکەکانیەوە: (كتاب في أن للإنسان خالقاً حكيماً، وفيه دلائل التشريح، ومنافع الأعضاء على أن خلق الإنسان لايمكن أن يقع بالاتفاق). **عيون الأنباء في طبقات الأطباء**، بيروت: دار مكتبة الحياة، ١٩٦٥، لا٤٢١.

هەڵنەبژێرێت، بەڵێ کە سەیردەکەیت هەموو مرۆڤەکان بایی ئەوەیان تیادایە کە ئەگەر هەوڵبدەن بتوانن کاری گەورەیان لێبوەشێتەوە لە ژیان و لە ژیاری مرۆڤایەتییدا.

وەڵامی گومانی دووەمیش کە دروستیکردوە و دەڵێت: ئەم جیاکردنەوەیە دەبێت بەهۆی جەنگوهەرا لەناو خەڵکیدا، لە ڕاستیدا ئەگەر پێغەمبەرانیش نەبن جەنگوهەرا لەناو خەڵکدا هەر هەیە، ئایا ئەگەر پێغەمبەرانیش نەهاتنایە مرۆڤەکان وازیان لە هەراو ململانێی سیاسی خۆیان دەهێنا، وازیان لە زۆرانبازی و ململانێی کۆمەڵایەتی و کەلتوری و ئابوریی خۆیان دەهێنا؟ کەواتە بەپێچەوانەوە مادام ئەم دوو مەسەلەیە هەیە و جیاوازی هەیە لە نێوان مرۆڤەکانداو زۆرانبازی و ململانێ هەیە لەناو مرۆڤەکاندا، بوونی پێغەمبەران زیاتر گرنگە چونکە لە هەر ژینگەیەکدا کە هەراو فیتنەو شەڕو کێشە زۆربێت، چاکسازو کەسی چاکەخواز زۆر بێت، دەبێت کەسانێکیش بێنەناو خەڵکەوە کە جیاوازبن و سەر بەهیچ لایەك نەبن لەو لایەنانەی کە خەریکی ململانێو شەڕوهەران. کێ لە پێغەمبەران باشتر ئامادەن بۆئەوەی ئەم ڕۆڵە ببینن، کەواتە هەر ئەو بەڵگانەی کەسێکی وەك (ڕازی) دەیهێنایەوە زانایان زۆر بەجوانی و زۆر بەوردی وەڵامیانداوەتەوە، لەو سەردەمانەدا کە کۆمەڵێك لە زەنادیقەو مولحیدەکان پەیدابوون دژ بەئیسلامو قورئان و سوننەت قسەیاندەکرد وکتێبیان دەنوسی، خوای پەروەردگار لەناو ئیسلامدا کۆمەڵێك زانای هێنایەمەیدان بەپێی سوننەتی خۆی و بەپێی ئەوەی کە زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، کۆمەڵێك زانا هاتن

**بەرگرییەکی زۆرجوان و هـزرمەندانەیان لە قورئان کرد، بەرگرییەکی زۆرجوان و هـزرمەندانەیان کرد لە پەیامو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)، ئەوانەش تایبەتنەبوون بەگروپێك لە گروپەکانی ئیسلامەوە، بەڵام دوو گروپ لە هەموویان زیاتر بەرگرییان لە قورئان و وەحی و پێغەمبەرایەتی کرد، ئەوانیش گروپی (موعتەزیلەو ئەهلی سوننەو جەماعەت) بوون، ئەهلی سوننە و جەماعەت بەهەر سێ ڕێبازی (ماتوریدی[1]، ئەشعەری[2]، سەلەفی)، ئەم ڕێبازانە پێکەوە گەنجینەیەکیان لە فیکری ئاینی پێکهێناوە بۆ بەرپەرچدانەوەی هەموو ئەو گومانانەی کە کەسانی بێبڕواو زندیق دروستیاندەکرد، کەواتە ئەو ئاڕاستەی کە ئێستاش هەیە بەناوی عەقڵگەراییەوە و بەناوی لۆژیکی عەقڵەوە دەیەوێت بڵێت ئەم قورئانە وتەی خوانییەو تەنها وتارێکە لە نیمچەدوورگەی عەرەبدا بەرهەمهاتووە و پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) بۆ خۆی هێناویەتی، ئەم ڕەوتە کە ئێستا دروستبووە بەپێیئەوەی کە لە هەندێك ڕۆژنامەو گۆڤاردا نوسینیان هەیە ڕەنگە دروستکراو بن، بەشێوەیەك لە شێوەکان خەڵکی وولاتی ئێمە هەندێکیان بەنیەتی باش نازانن چی لە پشتی ئەو قسانەوە هەیەو**

---

[1]– ماتوریدی: شوێنکەوتەی (ئەبومەنصوری ماتریدیی)ن کە لە(٣٣٥ك) کۆچی دوایی کردووە، قوتابخانەیەکی کەلامی سوننی بوون زۆر جیاواز نەبوون لەقوتابخانەی ئەشعەری.

[2]– ئەشعەری: شوێنکەوتەی (ئەبوحەسەنی ئەشعەریی)ن کە لەبەسرە لەدایکبووە( ١٦٠ك) لەساڵی (٣٢٤) لەبەغدا کۆچی دوایی کردووە، لەسەردەستی ئەبوعەلی الجبائی المعتزلی پەروەردەبووەو کاریگەری لەسەرداناوە، بەڵام لەکۆتادا وازیهێناوە لەمەزهەبەکەیو مەزهەبێکی بۆخۆی داناوە دوور لەمەزهەبی موعتەزیلە.

وەریدەگێڕن بۆزمانی کوردی و دەرخواردی چینی خوێندەوارو چینی ڕۆشنبیری وولأتەکەمانی دەدەن، ئەمە لە ڕاستیدا ئاڕاستەیەکی مەترسیدارەو پەیوەندیی بەئیسلامەوە نییە، بەڵکو دەلاقەیەکە بەرنامەیەکی نائیسلامی لە پشتیەوەیەتی بۆ ئەوەی پیرۆزیی قورئان و ئیسلام نەمێنێت.

هەموو ئەوئایەتانەی کە جەختدەکاتەوە لەسەرئەوەی کە ئەم قورئانە سەرچاوەکەی تەنها خوای پەروەردگار خۆیەتی، تەنانەت کەسێتی پێغەمبەر نییە (درودی خوای لەسەر)، ئەو ئاڕاستەیە هەموو ئەو ئایەتانە دەخاتە ژێر پرسیارەوە. هەندێك کەس - بەنەزانیی - ئەم ڕەوتە ناودەنێت ڕەوتی موعتەزیلە نوێکان، نەخێر ئەمانە هیچ پەیوەندییان بەموعتەزیلەوە نییە، چونکە ڕەوتی موعتەزیلە ڕەوتێك بوو بەرگریی لە ئیسلامو قورئان دەکرد لەبەرامبەر بێبڕواکان و ئەوکەسانەی کە گومانیان بۆ مسوڵمانان دروستدەکرد، ڕەوتی زانایانی موعتەزیلە وەك (ئەبوعەلی ئەلجبائی، ئەبولقاسم ئەلبەلخی ئەلکەعبی[1]، ئەلخەیات[2]، جاحظ[3])، ئەمەی دواییان، واتە (جاحظ)، کتێبێکی نووسی بەناوی (فضیلة المعتزلة)، هەموو کتێبەکانیتری وەك (البیان والتبیین)،

---

[1] - ئەبوقاسمی کەعبی(٨٨٦ ـ٩٣١ز).

[2] - ئەبولحسەین کوڕی ئەبوعومەری الخیاط(٣٠٠ك وەفاتی کردووە).

[3] -الجاحظ: ابوعثمان عمری کوڕِی بحر بن محبوب الکناني بالولاء، اللیثي، ناسراو بووە بە (جاحظ)، (١٦٣ — ٢٥٥ ك)ژیاوە، سەرۆکی گروپی جاحضییە ی موعتەزیلەیە، بەهۆی ئەوەی کە کتێبخانەکەی ڕوخاوە بەسەریدا مردووە، دانراوی زۆری داناوە لەوانە: (الحیوان) و (البیان والتبیین) (مجموعة رسائل)... هتد، (خیرالدین الزرکلي ,الأعلام، ب٥، لت٧٤).

باسی ئیعجازی قورئان دەکات، باسی گەورەیی لایەنی ئیعجازی قورئان دەکات، ئەم موعتەزیلانە بەرگرییان لە ئیسلام کردووە، بەڵام ئەمەی کە ئێستا دەیەوێت بەناوی عەقڵەوە گومان لەسەر قورئان دروستبکات پەیوەندی بەڕەوتی ئیعتیزالەوە نییە، ڕەنگە ئەو ناوە بۆ خۆیان دروستبکەن لەبەرئەوەی کە لە کەلتوری نووسەرانی نوێداو لە کەلتووری ڕۆشنبیرییدا موعتەزیلە بەخاوەنی بیری ئازادو بیری کراوە ناوزەدکراون، دەیانەوێت ئەمانەش بڵێن ئێمەش ئازادین و بیرمان کراوەیەو لە هیچ پرسیارو گومانێك ناترسین، دەیانەوێت خۆیان وەك موعتەزیلە نیشانبدەن، نەخێر موعتەزیلە ڕەوتێك بوو لە خزمەتی گەورەیی ئیسلامداو لە خزمەتی پێغەمبەرایەتیو لە خزمەتی پەیامەکەیدا، ڕەنگە لە هەندێك مەسەلەدا بەڕاستی بەهەڵەداچووبن، ئەوەی کە زانایانی گەورەی وەك پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)و گەورە زاناکانیتر کە لە بەرامبەریان وەستاون بەومانایە نییە کە موعتەزیلە لە هەموو هەنگاوەکانیاندا لەسەر هەڵەبووبێتن، لە هەندێك بابەتدا کە تووشی هەڵەبووبن زانایان وەڵامیان داونەتەوە، بەڵام ئەوانەی کە ئێستا دێن بەو ناونیشانەوە گومان لەسەر قورئان دروستدەکەن ـ کە ئاماژە بەهەندێك لەو گومان و بیروبۆچوونانەیان دەکەین ـ لە ڕاستیدا موعتەزیلە نین و عەقڵگەرا نین، بەڵکو ئەو قسانەی دەیکەن لە تەرازوی عەقڵو لۆژیکدا جێگەی نابێتەوە و سەنگێکی وای نییە:

**یەکەم:** دەڵێن قورئان گوتارێکە دەرهاویشتەی کەلتوری عەرەبییە، واتە ئەگەر قورئان لەوسەردەمەو لەو کۆمەڵگایە نەبوایە ڕەنگە قورئان

لەوەزیاتر یان کەمتربوایە، ڕەنگە ئایەتەکانی بەشێوەیەکیتر بوونایە! بەڵام ئێمە دەڵێین ئایا ئەم گومانە چی لە مەسەلەکە دەگۆڕێت؟ خۆ هیچ زانایەکی مسوڵمان نەیگوتووە کاتێك قورئان هاتووەتەخوارەوە ڕەچاوی هەلومەرجی کۆمەڵگەکەی نەکردووە، بەدڵنیاییەوە ڕەچاوی هەلومەرجی کۆمەڵگەکەی کردووە، ئەوکێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و پەروەردەییانەی کە لەو کۆمەڵگایەدا هەبوون قورئان چارەسەری بۆ داناون و توانیویەتی لەو کۆمەڵگە نەخوێندەوارە دواکەوتووە نـمونەی مرۆڤی پێشکەوتوو پێشکەش بەمرۆڤایەتی بکات، ئەم گوماندروستکردنە کە (قورئان ئەگەر لەوێ نەبوایە بەشێوەیەکیتر دەبوو) هیچ لە حەقیقەتی قورئان دەگۆڕێت؟، هیچ لەوە دەگۆڕێت ئەم قورئانەی کە ئێستا هەیە ئێمە وەرینەگرین؟، کەواتە مرۆڤ پێویستە مامەڵە لەگەڵ واقیعدا بکات نەك لەسەر گریـمانەیەك کە لە مێشکی خۆیدا دروستیدەکات، کەواتە ئێمەش دەتوانین بڵێین ئەگەر ئەم دونیایەش ئەگەر بەمشێوەیە نەبوایە ئەگەر زەوی بەدەوری خۆردا نەسوڕایەتەوە و لە ماوەی (٣٦٥) ڕۆژدا بەدەوری خۆردا نەسوڕایەتەوە و چوار وەرزە دروستنەبوایە ڕەنگە ژیان جۆرێکیتر بوایە، بەڵام ئێستا ژیان چۆنە تۆدەبێت مامەڵە لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا بکەیت کە ئێستا هەیە، ئەو مامەڵەی کە ئێستا دەیکەین هەر ئەوەیە کە دەبینرێت، کەواتە ئەو قسەیە هیچ زانیارییەك بۆ مرۆڤ زیاد ناکات کە ئێمە بڵێین قورئان دەرهاویشتەی هەلومەرجی عەرەبییە، ڕەنگە ئەم قسەیە بۆ

ئەوە بکرێت کە بە کەڵکی کۆمەڵگای ئەم سەردەمە نایەت و هی ئەو سەردەمە بووە.

ئێمەش دەپرسین ئەو ئایەتەی کە پێتوایە بەکاری ئەم سەردەمە نایەت پێمانبڵێ؟

کەئایەتەکە دەهێنێتە پێشەوە تەماشادەکەم ئایەتەکە ماناکانی بۆ هەموو سەردەمێك دەشێت، تەشریعات و بەرنامەو یاساکانی ئەم قورئانە بۆ مرۆڤە و مرۆڤ لە هەرکوێیەك بێت مرۆڤە و کاریگەری کەش‌وهەوا لەسەر مرۆڤەکان هەن، بەڵام ئەم کاریگەرییە گۆڕانکاری لە جەوهەری مرۆڤدا دروستناکەن، مرۆڤ ناکەن بەبوونەوەرێکیتر، ڕەنگە شێوەی هەڵسوکەوت و جل‌وبەرگو هەڵسان و دانیشتن و خەوتن و هەستانی بگۆڕێت بەپێی هەل‌ومەرجی جوگرافی، بەڵام جەوهەری مرۆڤبوونەکە گۆڕانی بەسەردانایەت، پاشان کە باسی کۆمەڵگا دەکرێت دەڵێت کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو، ئێستا کۆمەڵگاکە پێشکەوتووە؟! من دەڵێم: ئەو پێشەکەوتنانەی کە مرۆڤێکی ئاسایی هەیەتی لەڕووی مرۆڤـ و ڕەگەزو جۆرەوە چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ ئەو پێویستییانەی کە مرۆڤێك لە کۆمەڵگایەکی زووتردا هەیبووە؟ لە هەموو کات و شوێنێکدا مرۆڤ پێویستی بەشتە سەرەکییەکان هەبووە، پێویستی بەخواردن و بەخواردنەوە و بەجلوبەرگو بەشوێنی نیشتەجێبوون هەبووە، ئێستاش بەهەمان شێوە نییە؟

دیارە ئەوکەسانەی کە دەیانەوێت بڵێن ئەم قورئانە دەرهاویشتەی کۆمەڵگەی عەرەبییە و دەرهاویشتەی ئەو هەلومەرجە تایبەتییەی خۆیەتی، ڕەنگە هەندێکیان مەبەستیان ئەوەبێت کە:

**یەکەم:** سیفەتی بەئاسمانیبوون لە قورئان بسەننەوە.

**دووەم:** مەبەستیان ئەوەبێت کە ئەم قورئانە بەکاری کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆ نایەت.

ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: ئەوەی کە سەیری قورئان بکات دەبینێت پڕە لە یاسای گشتی و داماڵراو لە هەلومەرجی کات و شوێن، بەوتەی یاسازان و یاساناسەکان، شەریعەتی ئیسلام پڕە لە یاسای گشتی و هەمەگیر، ئەو یاسایانە ژیانی کۆمەڵگا ڕێکدەخەن، ئیسلام تەنها ژیانی تاك ڕێکناخات واتە تەنها باسی سوودو سروشت و خەڵوەتکێشانی نییە لەگەڵ خۆی، بەڵکو پەیوەندیی هەیە بەژیانی خێزان و کۆمەڵگەو ژیانی نێوان کۆمەڵگەکانی دیکەیشەوە، واتە قورئان بۆ خۆی سیستەمێکی تەواوکارە، لەبەرئەوە ئەو قسەیە هەر لە سەرەتاوە هەڵدەوەشێتەوە و زۆر بەئاسانی وەڵامدەدرێتەوە کە بڵێت قورئان بەکەڵکی ئەم سەردەمە نایەت، ئەی ئەو یاسایانەیتر کە بە کاری کۆمەڵگەکانیتر دێت و گوایە بەکاری کۆمەڵگەی ئەمڕۆ دێت، لە کوێوە هاتوون؟ ئێوە هەتا ئێستا ئەو پرسیارەتان کردووە لە خەڵك کە ئەم یاسایانەی دیکەی وەك یاسادانراوەکانی فەڕەنسی یان ئەڵمانی یان ساکسۆنی یان ڕووسی، ئەو یاسایانەی کە ئێستا مرۆڤایەتی شانازی پێوەدەکات، لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ ئایا ئەوانیش هی سەردەمانی پێشوو نین؟

ناگەڕێنەوە بۆ یاساکانی تەنانەت پێش لە دایکبوونی مەسیحو بۆ سەردەمی ڕۆمانی؟ بنەماکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتانەو قسەشی لەسەرناکەن!.

مەبەستێکیتریان ئەوەیە کە بڵێن ئەم قورئانە گوتەی محەممەد خۆیەتی، وەك لە یەکێك لە چاوپێکەوتنەکانی یەکێك لەو نوسەرانەدا کە لە ماڵپەڕێکدا بڵاوبووەتەوە، (ناوی نوسەرەکە نابەم لەبەرئەوەی هیوادارم خوای پەروەردگار بیخاتە سەر ڕێی ڕاست و ڕۆژێك لە ڕۆژان بگەڕێتەوە بۆسەر ئەو شارێگەیەی کە ئیسلام لەسەریەتی)، پرسیارێکیان لێکردووە:

- وەحی چیە؟

- دەڵێت وەحی جۆرێکە لە ئیلهام!

بەڵام پەیامنێرەکە لێی نەپرسیوە ئەی باشە ئیلهام چییە، ئەگەر لێی بپرسێت ئیلهام چییە؟ دەڵێت ئیلهام جۆرێکە لە شیعر، ئەی شیعر چییە؟ جۆرێکە لە ئیلهام، ئەم قسانە چی دەگەیەنێت؟، ئەم قسانە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە دەیەوێت تەفسیری وەحی بکات بەشتێك بەحسابی خۆی ڕوونتربێت لە وەحی، بەڵام کە دەچینە بنجوبناوانی وەڵامەکەی، مەسەلەکە ڕووننکاتەوە، وەك عەرەبەکان دەڵێن: (فسر الماو بالماو) تەفسیری ئاو دەکات بەوشەی ئاو، لە کاتێکدا تۆ ئەگەر بتەوێت تەفسیری هەر شتێك بکەیت پێویستە بەپێناسێك بیکەیت کە ڕۆشنتر بێت، بێگومان ئەم قسەیەش قسەیەکی تازە نییە، ئەم قسەیە هەر لە زەمانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر) هەبووە وەك قورئان

له چەندین شوێندا بۆمان دەگێڕێتەوە، قورئانی پیرۆز ئاماژە بۆ ئەم گومانە دەکات کە لە سەردەمی پێغەمبەریشدا (درودی خوای لەسەر) هەبووە و بەبێ پەردە خراوەتەڕووو لە قورئاندا هەیە، بۆ نموونە لە سورەتی (یونس)دا خوای پەروەردگار بۆمان باسدەکات و دەفەرمێت : ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ﴾ یونس:٣٨. یان دەڵێن ئەم قورئانە محەممەد خۆی دروستیکردووە و قسەی خۆیەتی و ناوی خودای لێناوە، ئینجا خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿قُلْ فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ یونس:٣٨ ئەی باشە ئەگەر ئەم قسەیە قسەی مرۆڤە، یەك کەس بتوانێت ئەم قورئانە دابنێت، ئەم ڕێسای قورئانییە دابنێت، ئەو بەتەنها توانیویەتی ئەم سورەتانە بهێنێت، ئەی ئێوە بۆ هەمووتان کۆنابنەوە و یەك سورەت بهێنن! ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ یونس:٣٨. ئێوە هەمووتان کۆببنەوە سورەتێکی وەك قورئان بهێنن، نەك هەرخۆشتان ﴿وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ یونس:٣٨، کامتان بەلاوە زۆر زاناو بەتوانایە لە بواری ووشە ڕیزکردن و ووشەئارایی و داڕشتنی زمانەوانیدا با یارمەتیتان بدەن ئەگەر پێتانوایە مرۆڤێك دەتوانێت ئەم قورئانە دروستبکات و قسەیەك بهێنێت و ناوی خوای لێبنێت، قسەی خۆی بێت و بڵێت ئەمە هی خوایە، هەمووتان کۆببنەوە یەك سورەت بهێنن وەك ئەم قورئانە ﴿إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ، دیارە کە ناتوانن. ئێمە لە مێژوودا بینیمان لە سەردەمی نەفامییدا کە سەردەمی لوتکەی زمانپاراوی و ڕەوانبێژیی

بووه لەناو عەرەبدا، گەورەترین شاعیرانی عەرەب لەوسەردەمانەدا دەرکەوتوون، گەورەترین قسەزانی عەرەب لەو سەردەمانەدا دەرکەوتوون، نەمانبینی یەكێك بێت یان كۆمەڵێك بێت كۆببنەوە، بەپێچەوانەوە (لەبیدی کوڕی ڕەبیعە)[١] كە یەكێك بووە لە شاعیرانی خاوەن حەوت هۆنراوە هەڵواسراوەكە (المعلقات السبع)، لە پێش ئیسلامدا ئەو حەوت پارچە هۆنراوەیە كە هەڵواسرابوو چوارەم هۆنراوەی هەڵواسراو هی ئەوە، كە گوێی لە قورئان بوو وتی ئیتر من شیعر ناڵێم من مافی شیعروتنم نییە و زمانم دەشكێت، چونكە دەقم بینی لە دەقەكەی خۆم پاراوترو ڕەوانتر. ئەی باشە نهێنییەكەی چییە ئەگەر یەكێك سەیری قورئانی كردو تێنەگەشت لە قورئان و نەیزانی ئەم قورئانە لە كوێوە هاتووە، ڕێك ناوی دەنێت (افتراء)، دەڵێت قسەی محەممەد خۆیەتی و دروستیكردوە، بەڵام لە ڕاستیدا نهێنی ڕاڤەكردنی بەم شێوەیە چییە؟ هەرخوای پەروەردگار لە درێژەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿بَلْ كَذَّبُواْ بِمَا لَمْ يُحِيطُواْ بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ﴾ یونس:٣٩. واتە ئەوان لە ڕاستیدا زانستیان بەشتێك ناشكێت، زانست پەیدا ناكەن و تەئویلەكەشی نازانن، پێویستە ئاوا مانای بكەن﴿كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ﴾ یونس:٣٩. ئینجا هەر قورئانە پێیاندەڵێت كە ئەم قسانە تازە نین و پێش

---

[١]– ئەبوعقیل لەبید کوڕی ڕەبیعە عامری (١٠٤ پ، ك– ٤١ ك) یەكێك بووە لە حەوت بوێژەكەی كەهۆنراوەكانیان بەكەعبەدا هەڵوسرابوو، هۆنراوەكەی ئەم لەسەر خۆنەویستیو جوامێریو ژیانی بیابانئشینو ڕەوشتی بادیە باسكردووە. أحمد زیات، تاریخ الادب العربی، سەرچاوەی پێشوو، لا٥٤.

قورەیشەکانیش بەسەردەمانێکی زووش کە پێغەمبەران هاتوون وەحییان لەلایەن خوداوە بۆ هاتووە و بەخەڵکیان گەیاندووە، دیسان بەو شێوەیە بەدرۆخراونەتەوە و وتراوە ئەوە وتەی خودانییە و وتەی مرۆڤە، جالێرەدا وانەیەکی زۆر گەورەمان لە ژیاندا فێردەکات، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمِنهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِ وَمِنْهُم مَّن لاَّ يُؤْمِنُ بِهِ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِالْمُفْسِدِينَ﴾ یونس:٤٠. کەواتە ئێوە هەر لە سەرەتاوە ئاگاتان لەم ڕاستییە بێت کە خەڵك لە موقابیلی قورئانەوە دەبن بەدووبەش: بەشێك باوەڕی پێدەهێنن، بەشێکیش باوەڕی پێناهێنن، بنەمای تاقیکردنەوەکە لەمەدایە، لە ڕاستیدا کاتێك لە دامەزراوەی خوێندندا تاقیکردنەوە دەکرێت، ئەگەر بڕیارە هەمووی دەربچێت کەواتە تاقیکردنەوە بۆ بکرێت؟ ئەگەر مەبەست لە تاقیکردنەوەکە ئەوەیە کە هەموویان دەربچن کەواتە تاقیکردنەوەکە بۆ بکرێت؟ بەڵام مادام بڕیاروایە کۆمەڵێك باوەڕی پێبهێنن چونکە عەقڵ بەکاردەهێنن، بەو بنەما لۆژیکییە مامەڵە لەگەڵ عەقڵدا دەکەن و ئیمانی پێدەهێنن، بەو شێوازە لۆژیکییەش مامەڵە لەگەڵ دەقدا نەکەن باوەڕی پێناهێنن. دیسانەوە لە سورەتی (هود)دا تەماشادەکەین لە دەقێکیتردا دەفەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ هود:١٣. ئەم ئایەتە زووتر هاتووەتەخوارەوە لەوەی سورەتی (یونس)، دیسان هەر هەمان قسەیان کردووە و جارو دووجار نەبووە، وتویانە محەممەد (درودی خوای لەسەر) ئەمە قسەی خۆیەتی و بەناوی خواوە هەڵیدەبەستێت،

ئایەتەکە دەفەرموێت﴿قُلْ فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ﴾ ، ئێوەش دە سورەت بهێننەوە، بائێوەش دە سورەت هەڵببەستن، بۆ هەڵینابەستن، خۆهەر بەزمانی عەرەبییە؟ پاڵنەرێکیش هەیە هێنانی دە سورەت، چونکە دەتانەوێت قورئان بەدرۆبخەنەوە و خوازیاریش هەیەو کەس رێی لێنەگرتوون، ﴿وَادْعُواْ مَنِ اسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ اللّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ، دیسانەوە کێتان بەلاوە بەهێزەو بەتوانایە لە بواری زانستدا بیهێنن و کۆببنەوە، باشە ئەو نوسەرانەی کە دەڵێن ئەمە ئەزمونێکە محەممەد (درودی خوای لەسەر) خۆی دەریبڕیوە و ماناکەی لە هی خوداوە نزیکبووەتەوە، وەك شیعر چۆن شاعیرێك دێت شیعرێك دەردەبڕێت، پێغەمبەریش هاتووە ئەم قورئانەی دەربڕیوە و ووشەکەی هی خۆیەتی، قورئانیش دەفەرموێت دەی باشە ئەی ئێوە بۆ ئەم ئەزمونە ناکەن؟ ئەی ئێوە بۆ نایەن دە سورەت دروستبکەن؟ لە کاتێکدا کەسێکی وەك محەممەد بتوانێت قورئان بنوسێت و قورئانی هەڵبەستبێت، ئەی ئێوە هەمووتان بەیەکەوە بۆچی ناتوانن قورئان هەڵبەستن؟ ئەی هەر لەو ژینگەی ئێوەدا پەروەردە نەبووە؟ ڕەنگە هەندێك کەس بڵێن ئەوە نابێت چونکە ئەوە جیاوازە! ئێمەش دەڵێین قسەکەی ئێمەش هەر لەسەر ئەو جیاوازییەیە، ئێمەش قسەمان لەسەرئەوەیە کە بڵێین محەممەد جیاوازە، کە ئێوە قبوڵتان بێت محەممەد جیاوازبێت، ئێمەشە هەر ئەوەماندەوێت (ذاك هو المطلوب) ئەوە داوای ئێمەیە، ئینجا دیسان دەفەرموێت:﴿فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا أُنزِلِ بِعِلْمِ اللّهِ وَأَن لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ هود:١٤، ئەی ئەگەر نەهاتن و

ئامادەنەبوون بۆ ئەوکارە، ئیتر بزانن کە ئەم قورئانە لە سەرچاوەی زانستی خوداوە هاتووەتەخوارەوە و هیچ خودایەکیتر لە ئارادانییە، ئایا ئیتر ملکەچی راستییەکان نابن؟ ﴿فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا أُنزِلِ بِعِلْمِ اللّهِ﴾ هود:١٤. بزانن ئەمە بەزانستی خوا نێردراوەتە خوارەوە، ئەمە شتێکە کە لە سنوری زانستی خوایە، دیارە ئەم تەحەددایانە زۆر گرنگ بووە لەو سەردەمانەدا، واتە زۆر لۆژیکیشە ئەگەر کەسێك بێت بڵێت:

- من شاعیرم شیعرەکانی منیش زۆر تایبەتن و کەس وەك من شیعر ناڵێت؟

- یەکێکیش بڵێت تۆ هیچ تایبەت نیت!

- بڵێت فەرموو وەرن کۆمەڵێك شیعر دابنێن وەك ئەوانەی من؟

ئەگەر توانییان وەك ئەو شیعر دابنێن قسەکەی هەڵدەوەشێتەوە، بێبڕواکان زۆرمەبەستیان بووە کە سیفەتی ئاسمانیبوون لەم قورئانەو لەم ئاینە داماڵن، وەك ئەوەی بڵێن ئەم قورئانە ئاسمانی نییەو نێردراوی خودانییەو پەیامی خودانییە، ئامادەبوون هەرچییەکیان هەبێت لەو پێناوەدا سەرفی بکەن، قورئان تەحەددایان دەکات لە پێشدا دەفەرموێت فەرموون دە سورەت بهێنن، داواکە کورتتر دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿قُلْ فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِ﴾ یونس:٣٨. یەك سورەت هاووێنەی ئەو بهێنن، لە شوێنێکیتردا دەفەرموێت ئەگەر هەموو مرۆڤـ و جنۆکە کۆببنەوە ناتوانن پەرتووکێکی وەك ئەم قورئانە بهێنن، ئەگەر پشتیوانی یەکتر بگرن ئەم تەحەددایانەی کە قورئان دەیکات بەتەواوی بێبڕواکان دەمکوت دەکات، بەڵام هەرواز ناهێنن، ئەمجارەیان

قورئان بەشێوەیەکیتر لەگەڵیاندا دەجولێتەوە و دەفەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ﴾ هود:٣٥، ئینجا لێرەدا پێغەمبەر دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَعَلَيَّ إِجْرَامِي﴾ هود:٣٥، خۆ من تاوانم بۆخۆم کردووە ئێوە تاوانتان ناگات، وەرن سەیری ناوەڕۆکەکەی بکەن ﴿وَأَنَاْ بَرِيءٌ مِّمَّا تُجْرَمُونَ﴾ هود:٣٥. من ئەگەر تاوانێکم کردبێت تاوانێکم بەرامبەر بەخواکردووە خوا سزام دەدات، بەڵام کە ئێوە تاوانتان بەرامبەر بەمن کردووە بەبێ بەڵگە، من بە بوختان و قسەبۆدروستکردنی دەزانم.

دیسان لە سورەی (الأنبیاء)دا ئایەتێکی تێدایە زۆر نزیکە لەم سەردەمەی خۆمان، هەردەڵێی ئەمڕۆ هاتووەتە خوارەوە لە بەرپەرچدانەوەی ئەو گوتەو گوتەزایانەی کە هەندێك بەناو بیرمەند دەیخەنەڕوو، خەڵکی مسوڵمانی پێچەواشە دەکەن، دەفەرموێت: ﴿بَلْ قَالُواْ أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ﴾ الأنبیاو:٥. ئەمەی کە محەممەد دەیلێت کۆمەڵە خەوێکی تێکەڵوپێکەڵە ﴿بَلِ افْتَرَاهُ﴾ الأنبیاو٥. خۆی دروستیکردووە، ﴿بَلْ هُوَ شَاعِرٌ﴾ الأنبیاء:٥. نەخێر شیعرە، وەك یەکێك لەو نوسەرانەی وتویەتی قورئان شیعرێکی بەرزە (عالیة)، ئەی ئەم شیعرە بەرزە بۆچی یەکێکیتر نەیگوت؟!، بۆچی کەسێکیتر نەیتوانی؟، شاعیری حاڵەتێك نییە کە دووبارەنەبێتەوە، ئەگەر سەیری مێژووی شاعیران بکەیت لەناو هەموو میللەتاندا لە هەموو سەردەمانێکدا شاعیرانێك پەیدادەبن کە ڕەنگە ئەوانەی پێشوو بشارنەوە، بەڵکو ئەوانەی پێشوو بشۆرنەوە،

ئێمە لە ئەدەبی کوردیداو لە ئەدەبی فارسیو عەرەبییشدا هەمانە کەڵە شاعیری گەورە لە قۆناغە جیاوازەکاندا پەیدابوون و داهێنانی جوانیان کردووە لە بواری شیعرو ئەدەبدا، لەبەرئەوە زۆرکەس بەپێغەمبەریان وتووە ﴿بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الأَوَّلُونَ﴾ الٲنبیاو٥. ئەمان ئینجا بەهانەیەکیتریان پێگرتووە وتویانە ئەم ئەگەر پێغەمبەرە با موعجیزەیەکی ماددییمان نیشانبدات، وەك چۆن موسا موعجیزەی هەبوو، عیساو صالحو پێغەمبەرانی پێشوو (سەلامی خوایان لەسەر) هەرکامێکیان بەپێی کات و شوێنی گونجاوی خۆی موعجیزەیان هەبووە، ئەمانیش داوای موعجیزەی ماددیی لێدەکەن، ئیسلام گەورەییەکەی لەوەدایە کە بە شەریەت بەرزدەکاتەوە، چونکە هەمیشە تۆ بەڵگەی ماددیی بۆ کەسانێك دەهێنیتەوە کە ئاستی زانستییان دیاریکراوبێت، ئێستا بۆ نمونە ئەگەر بۆ منالێك باسبکەیت کە ئازادی خۆشە یاخود شیرینی خۆشە، چۆن نمونەی بۆ دەهێنیتەوە؟ بەمنالێکی چوار ـ پێنج ساڵە دەڵێیت ئازادی خۆشە لە شیرینی دەچێت، ئەو دەزانێت کە تامی خۆشی شیرینی بکات، بەڵام ئەگەر ئاستی چووەسەرەوە باسی ئازادی لێبپرسیت نمونەی شیرینی بۆ بهێنیتەوە وادەزانێت گاڵتەی پێدەکەیت، لەبەرئەوە لەم بابەتانەشدا پێغەمبەران دەهاتن موعجیزەی ماددییان بۆ گەلانی پێشوو دەهێنایەوە، چونکە دەرکو ناسین و هەستپێکردنیان لە ئاستی ئەوەدابووە کە لە مەسەلە

ماددییەکان حاڵی ببن، بەڵام ئیسلام مرۆڤایەتی بەرزکردەوە، ئەو بەڵگانەی کە دەیهێنێتەوە بەڵگەی عەقڵیین، سەیری تەشریعاتەکە بکەن سەیری ئەو یاسایانە بکەن کە بۆ مرۆڤایەتی دەیهێنێت، لەبەرئەوە ئەوانە دەیانوت ﴿فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الأَوَّلُونَ﴾ الۤنبیاو:٥. موعجیزەیەکی ماددییمان بۆ بهێنێت وەك پێغەمبەرانی پێشوو، ئەوان منالانە بیریاندەکردەوە و داوای شتی ماددییان دەکرد، ئینجا خوای پەروەردگار وەڵامیاندەداتەوە و دەفەرموێت:﴿مَا آمَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ﴾ الۤنبیاو:٦، گەلانی پێشووش کە داوای شتی ماددییان دەکرد پێغەمبەرەکەیان موعجیزەی ماددیی بۆ دەهێنان دیسان هەر بڕوایان نەدەهێنا، ﴿أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ﴾ الۤنبیاو:٦. ئایا ئەمان باوەڕدەهێنن؟ کەواتە شێوازی پرسیارکردنەکە بۆ پەسەندنەکردنی بۆچوونەکەیانە (استفهام إنکاری)، کەواتە ئەمانیش بڕواناهێنن ئەگەر شتی ماددییشیان بۆ بهێنێتەوە، کەواتە دەبێت خەڵکەکە بەدوای مەنتیقو عەقڵدا بچن، بەدوای شتێکدا بچن کە لێی تێبگەن، دیسان لە سورەتی (سجدة)شدا باسیدەکات و دەفەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْماً مَّا أَتَاهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ السجدة:٣.

ئەنجا لە سورەی (الاحقاف)یشدا دیسان ئاماژە هەیە بۆ ئەم مەسەلە کە هەر ئەمەیان وتووە، زۆریان وتووەتەوە وەك چۆن ڕاگەیاندن زۆر

جار شتێك دەڵێتەوە و بەدرۆ دووبارەی دەكاتەوە و چەواشەكاریی دەكات و بەردەوامە لەسەری، دەفەرموێت:﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَلاَ تَمْلِكُونَ لِي مِنَ اللَّهِ شَيْئاً﴾ الأحقاف:٨، ئەگەر دروستمكردبێت خوا سزام دەدات خەمتان نەبێت، ﴿أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَلاَ تَمْلِكُونَ لِي مِنَ اللَّهِ شَيْئاً هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ كَفَى بِهِ شَهِيداً بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ۞﴾ الأحقاف:٨، خوای پەروەردگار دەزانێت ئێوە مەبەستتان چییە ئەم قسەكردنەتان لەسەر چییە، ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعاً مِّنْ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلاَ بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ وَمَا أَنَا إِلاَّ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ الأحقاف٩—١٠. بەم لۆژیكە تەماشابكە قورئانی پیرۆز چۆن بۆمانی نیشاندەدات كە ئەو قسانە قسەی نوێ نین، كاتی خۆیشی كراوە و بەو لۆژیكو بەو شێوازە حەكیمانەو نەرمونیانییە وەڵامیان دەداتەوە گومانەكانیان دەڕەوێنێتەوە.

# هزری ئیسلامی ئیعجازی قورئان ڕووندەکاتەوە

لەبەشی پێشوودا باسی قورئانمان کرد، بەڕاستی قورئان ئەو دەریایەیە کە کۆتاییینایەت و هەموو مرۆڤێك بەپێی زانست و بیرو تێگەیشتنەکانی ڕۆژانەی خۆی دەتوانێت لێی بەهرەمەندبێت، وەك کانیاوێك کە دەچیتەسەری بەپێی تینوێتی خۆت ئاوی لێهەڵدەگری و تینوێتی خۆتی پێدەشکێنیت، بوونی تۆ لەسەر کانیاوەکە ڕەفزی بوونی کەسانیتر ناکات کە لەوکانیاوە بخۆنەوە، بوونی مرۆڤی مسوڵمانیش لەسەر کە ناراوەکانی دەریاو ئۆقیانوسی قورئان بەمانای ئەوەیە کە هەرکەسێك بەپێی تواناو بەپێی بوونی خۆی بۆی هەیە بەهرەمەند بێت لە زانست و ئاسۆکانی قورئان. باسی قورئانمان کردو وتمان قورئان هەرخۆی کە باسی خۆی دەکات گەورەترین موعجیزەو گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەلایەن خواوەیەو لەلایەن مرۆڤەوە نییە، چونکە ئەگەر لەلایەن مرۆڤەوە بووایە، دەبوا دوای قورئان نمونەیەکیترمان بەردەستبکەوتایە، ئەوانەی کە دژ بەقورئانن هەوڵیانداوە شتێکی وەك قورئان بهێنن، بۆیان نەچووەتەسەرو نەیانتوانیوە وەڵامی ئەو تەحەداو داخوازییانەی قورئان بدەنەوە، بەڵام نەبیستراوە و نەبینراوە کەسێك بتوانێت سورەتێکی وەك قورئان یاخود

ئایەتێکی وەك قورئان بهێنێت، ئەوەی کە وتراوە خراوەتەڕووو لە گومان بەدەر شتێکیتر نییە. دیارە گوماندروستکردن ئاسانە، تۆ دەتوانیت لەگەڵ یەکێك وتووێژ بکەیت گومانی بۆ دروستبکەیت لە بارەی خۆی و لە بارەی ئەو شتانەی کە زۆر یەکلاکەرەوەن، لە بارەی ئەو بیردۆزانەی کە یەکلابوونەتەوە، تۆ دەتوانیت گومانی بۆ دروستبکەیت، بەڕاستی گوماندروستکردن لەسەر هەر شتێك تەنانەت لەسەر ڕاستییەکان ئاسانە، بەڵام ئەم گومانە تاماوەیەك دەتوانرێت بخرێتەڕوو، پاشان گومانەکان دەڕەوێنەوە، زانا مسوڵمانەکان ئەوەیان سەلماندوە کە قورئان لە چەند ڕوویەکەوە موعجیزەیە نەك تەنها لە رویەکی تایبەتییەوە، ئەگەر زووتر تەنها لە ڕووی ڕێکخستن و شێوازو لە ڕێکی و شێوەی دەربڕینی هاوئاهەنگی نێوان ئایەت و بڕگەو ووشەکانی باسی ئیعجازی قورئان کرابێت، ئێستا لە ڕوانگەی ماناوە زۆر باسی قورئان دەکرێت، کە ئەم قورئانە نەك تەنها ووشەکانی بەڵکو ماناکەشی زۆر جێگەی سەرسوڕمانە، مرۆڤ لە بەرامبەر ماناکەیەوە ڕادەمێنێت، هەرچی شێوازی قورئانە پەیوەندیی بەدەربڕین و شێوازی ووشەکان و چۆنیەتی داڕشتنی ڕستە هەواڵییەکان و داڕشتنی ڕستە ئینشائییەکان و داڕشتنی هەر ووشەیەك لە جێگەی خۆیدا، هەیە، ئەمانەش بۆ ئەوانەی لە بواری زانستی بەڵگەیی‌و زانستی ڕەوانبێژییدا کاردەکەن زۆربەجوانی ڕوون و دیارە، بەڵام ئەگەر ئیعجازە زاراوەییەکەی بریتیبێت لە توێکڵی قورئان، ئەوا لایەنە ماناییەکەی بریتییە لە جەوهەرو ناوەڕۆکی قورئان، کە سەرنجدەدەیت لە جەوهەرو ناوەرۆکی قورئان، دەبینیت

ئیعجازەکەی زیاتر لەوەدایەو مرۆڤـ لەوەزیاتر سەری سوڕدەمێنێت، ئەو مەبەستانەی کە قورئان باسیکردون یان ئاماژەی بۆ کردون چ بەدەق باسیکردبن چ ئاماژەی بۆ کردبن، وەرگر راستەوخۆ وەریانبگرێت یاخود لەودیوی دەقەکانەوە لە تێگەیشتنەکەی وەرییبگرێت، لە بەڵگەو لە ئاماژەکانی وەرییبگرێت، ئەوە زۆر سەرسوڕهێنەرە.

بوارێکی زۆرفراوان بواری لایەنی زانستییە کە لە قورئاندا ڕۆژبەڕۆژ شتی نوێ دەدۆزرێتەوە، پسپۆڕانی بواری دەروونناسی و بواری زەویناسی و جوگرافیاو زانستی فەلەك‌و زانستی شێوەپزیشکی و زانستەجۆراوجۆرەکان، ئەمانە ئینیسکلۆپیدیاو پەرتووکی زۆر بەنرخیان لە وبوارانەدا نوسیوە، ئەم بابەتەش لە زنجیرە باسەکانیتردا باسیان لێوەدەکەین کە تایبەتە بەو بوارەوە، بەڕاستی ئیعجازی قورئانیان زۆر بەجوانی ڕوونکردووەتەوە.

لایەنی مێژوویی، کە سەیری قورئان دەکەین دەبینین زۆر بەدرێژی باسی ڕوداوە مێژووییەکان دەکات، باسی ژیانی نوح و ئیبراهیم (سەلامی خوایان لەسەر) دەکات، کە باسی حەزرەتی یوسف دەکات (سەلامی خوای لەسەر) ئێستا لێکۆڵینەوەی مێژوویی هەموو ئەو ڕاستییانەی قورئان بەو شێوەیەی کە باسیکردووە، دەسەلمێنێت، باسی ژیانی حەزرەتی موسا کە لە قورئاندا هاتووە، باسی فیرعەونەکان، کە ماوەیەکی زۆر خەڵك نەیدەزانی جەستەی فیرعەون ماوە و لە لایەن میسرییەکانەوە پارێزراوە، خوای پەروەردگار

ئاماژەدەکات بەوەی کە جەستەی فیرعەون پارێزراوە، ئەمەش بۆخۆی لایەنە مێژووییەکەیەتی کە نامانەوێت ئەمڕۆ لەسەر ئەوبابەتە بدوێین.

ئیعجازی ژمارەیی، کە ئەوە لایەنێکیترە کە بە ڕاستی وردەکارییەکی ژمارەیی زۆر لە قورئان و لە ژمارەی ئایەتەکان و ئەو وشانەی قورئاندا بەرچاودەکەوێت، ئەوەی کە ئەمڕۆ ئێمە باسی لێوەدەکەین بەشێکە لە لایەنی تەشریعی، واتە هەرچینێك کە دێتە گۆڕەپان دەیەوێت خۆی نیشانبدات و ڕاست و دروستیی خۆی نیشانبدات لەسەر زەوی واقیعدا، بەیاسادانان خۆی دەسەلمێنێت کە پێیدەوترێت لایەنی تەشریعو جێبەجێکردنی یاسادانان، چ جۆرە یاسایەك پێشنیازدەکات بۆ مرۆڤایەتی؟ چ یاسای گشتی بێت یان یاسای تایبەتی بێت، یاسای شارستانی بێت یان سزادان، یاسای بەڕێوەبردنی وولات بێت یان کاروکارکردن بێت، تەماشادەکەیت هەموو سیستەمێکی شارستانیەتی بۆخۆی بونیاتناوە لەسەر ئەو گۆشەنیگایانەی هەیەتی بۆ مرۆڤ و ژیان و ئەنجامو داهاتووی مرۆڤ، لەسەر ئەو بنەمایانە یاسای وولات دادەڕێژێت، لەبەرئەوە یاسادانەر پێویستی بەوەیە کە ئەو مرۆڤە باش بناسێت، ویست و خواست و ئامانجو هەموو ئەو خولیاو دیدگایانەی کە مرۆڤێك یان هەموو مرۆڤەکان هەیانە سەبارەت بەژیان، ئەو سیستەمە شارستانیەتییە ڕەچاوی بکات.

کەدێینە سەر قورئان، دەڵێین بۆ ئەوە هاتووە ئێمە بەخوێندنەوەی خەریکی عیبادەت بین، یادی خودای پێبکەین و پاداشتی لێوەربگرین، یان بەبۆنەی قورئانەوە دونیایەکی رۆحانی بۆ خۆمان دروستبکەین و لە

ڕووی دەروونیەوە ئارامیی پێپەیدابکەین و بۆنە ئاینییەکانی پێبڕازێنینەوە و هەموو ئەم سوودو جوانییانەی لێدەوەشێتەوە، بەڵام گرنگترین رۆڵی قورئان بریتییە لەو بەرنامەو یاسایانەی کە بۆ تاكو بۆ کۆمەڵگە دایناوە، گرنگی ئەم یاسا قورئانییانە لەوەدایە کە هەرکامێکیان بگریت بۆ چارەسەری کێشەیەك لە کێشە قوڵەکان یان لە گرفتە قوڵەکان، بۆ دەرمانکردنی چەندین زامی قووڵە لە جەستەی مرۆڤایەتییدا، کاتێك ئێمە زیاتر پەی دەبەین بەگرنگی قورئان کە درکی کێشەو گیروگرفتەکانی مرۆڤی ئەمرۆ بکەین، کە بزانین مرۆڤی ئەمڕۆ بەدەست چییەوە دەناڵێنێت؟ لە ڕوانگەی کێشەکانەوە تەماشای یاسا قورئانییەکان دەکەین، بزانین کە ئەم یاسایە لە سەرچاوەیەکەوە هاتووە کە سەرچاوەیەکی ماددیی نییەو بەدەستی مرۆڤ نەنوسراوە و دەرهاویشتەی کۆنگرەو کۆنفرانسو سیمینارو فیتیسڤاڵی کۆمەڵێك خەڵکی ووریاو شارەزانییە، ئەم قورئانە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە هاتووە.

یەکێك لە کێشە گرنگەگان کە هەموو مرۆڤایەتی هەوڵدەدەن چارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوە کێشەی زمانە، ئەو ڕاستییانەی کە مرۆڤێك درکی پێدەکات و دەیەوێت لە ڕێگەی زمانەوە بیگەیەنێت بەخەڵك، زۆرجار ئەوانەی کە یەك زمانیان هەیە باش لە یەك تێناگەن، کاتی وا هەیە کە لە گەڵ یەکێکدا قسەدەکەین کە بیروبۆچوونی جیاوازە لە بۆچوونی ئێمە، دەبینین کە گفتوگۆکەمان بێئەنجامە، لەبەرئەوەی ئەو وشانەی کە من بەکاریدەهێنم لای ئەو پێناسەکانی منی نییە، لەبەرئەوە

ئەو پێناسانەی کە ئەو دەیکات و ئەو چەمکانەی کە ئەو دەیەوێت، جیاوازە لەو چەمکانەی کە من دەمەوێت، زۆرجار کە دووکەس ئەگەر بەیەکەوە گفتوگۆبکەن دەبێت لەپێشدا بە دەستەواژەو عیبارەتی خۆیان ڕێكو یەکبخەن، ئەگەر وانەبێت ئەم خەڵکە هەرگیز لە گفتوگۆدا ناگەنە ئەنجام، کەواتە دەبێت بزانین کە قورئان بۆ چارەسەری کێشەی زمانە. قورئان بۆ کێشەی زمان چ پرۆژەیەکی هەیە:

یەکەم: هەموو زمانەکان لە ڕوانگەی قورئانەوە ئایەتی خودان﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ﴾ الروم:٢٢. واتە: دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی‌و جیاوازی زمانەکانتان و ڕەنگەکانتان بەشێکن لە بەڵگەکانی خودا، کەواتە بێگومان شتێك هەیە پێیدەوترێت جیاوازی زمان، ئەوەمان پێڕادەگەینێت کە زمانتان جیاوازبێت، لە نێو زمانەکانیشدا جیاوازی هەیە، تەنانەت لە زاراوەدا جیاوازییان هەیە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلاَّ بِلِسَانِ قَوْمِهِ﴾ إبراهيم:٤.

واتە هەموو پێغەمبەرێك بەزمانی گەلەکەی خۆی پەیامەکەی گەیاندووە، بێگومان زمانەکانیش جیاوازن، لە بەرئەوە تەماشادەکەیت ئەگەر جیاوازی هەبێت لە نێوان تەعبیری پێغەمبەراندا جیاوازییەکی سروشتییە، واتە ئەم جیاوازییە شایستەی چارەسەرە بەوەی کە دەفەرموێت ﴿وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً﴾ البقرة:٢٦٩. واتە: ئەو کەسەی حیکمەتی پێدرابێت، زۆرێك خێری دەستکەوتووە،

ئێوە بەدوای حیکمەتدا بڕۆن بەدوای زماندا مەڕۆن، واتە ئێوە شوێنکەوتەی مانا بن وەك (مەلاخدری نالی) دەفەرموێت :

**کەس بە ئەلفازم نەڵێت خۆکوردییە، خۆکردییە**

**هەرکەسێك نادان نەبێت خۆی تابعی مەعنا دەکات**

واتە تۆ دەبێت شوێنکەوتەی مەعنا بیت زیاتر، بەدوای لەفزدا نەگەڕێیت، گفتوگۆو چەلەحانێ لەسەر زمانی زاراوەکان ناکرێت، ئەگەر وانەبێت ئێمە هەر یەکەم هەنگاو لە کێشەی زماندا گیردەخۆین.

## کێشەی دەستەڵات

کێ خاوەنی دەستەڵات بێت لەناو کۆمەڵگادا؟

دەستەڵات بەدرێژایی مێژوو کێشەی زۆری ناوەتەوە، هەموو ئەو شەڕو هەرایانەی کە لە جیهاندا ڕوویانداوە و لەمەولاش ڕوودەدەن، ئەو هەموو جەنگو کوشتارو پەلامارانەی کە مێژووی مرۆڤایەتی داگیرکردوە، هەمووی لەسەر دەستەڵات بووە، بزانین قورئان چۆن چارەسەری بۆ دۆزیوەتەوە؟

قورئان دەفەرموێت:﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ الشورى:٣٨. واتە: کاروباری نێوانیان بەڕاوێژ جێبەجێدەکەن. ئەوەی کە ئێستا مرۆڤایەتی شانازی پێوەدەکات کە خەڵك لەسەر بنەمای دیموکراتی ژیانی خۆیان بەرن بەڕێوە، ئەوەی کە پێیدەوترێت دیموکراتی و هەوڵێك بۆ یەکسانی لە سیاسەت و دەستەڵاتدا، قورئان پێش ئەوان کەوتووە و دەفەرموێت: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ ،(أمر) واتە دەستەڵات و فەرمان، ئەو کەسەی کە

فەرمان دەدات ئەوە خاوەنی دەستەڵاتە لە وولاتدا، بەڵام ئەم ئەمرە دەبێت بە(شورا) بێت، واتە دەبێت گۆڕانکاری بکرێت، ئەمڕۆ کەسێك‌و سبەی یەکێکیتر، ئالیەتەکانیتریشی بەجێهێشتووە بۆ مرۆڤایەتی، کەواتە بابەتی ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ کە پتر لە (١٤٢٠) ساڵ لەمەوپێش باس کراوە بابەتێکی زۆرگرنگە، باوەڕداران هاندەدات کاروبارو فەرمان و دەستەڵاتیان بەشورا بێت، تاکڕەوی نەبێت، ئەو دیکتاتۆرییە نەبێت کە کەس نەتوانێت داوای وردبوونەوە و پێداچوونەوەی لێبکات.

## کێشەی سەرمایە

سەروەت و سامان بەدەست کێ بێت؟ هەموو دەزانن ئەوەی کە دەستەڵاتی ئابووری بەدەستبێت لە وولاتدا، دەستەڵاتی سیاسیشی بەدەستدەبێت، بەو ئەندازەی کە دەستەڵاتی ئابووری لە دەست گروپێکدا بێت بەو ئەندازەیەش دەستەڵاتی سیاسیش لە دەست ئەو گروپە تایبەتەدایە، ئەوەی کە لە ڕوانگەی قورئانەوە پێیدەوترێت (مَلأ) یان ئەوانەی کە پێیاندەوترێت ﴿مترف﴾ ، ئەوانەی کە خۆشگوزەرانن. هەمیشە قورئان باسی ئەوەدەکات کە کۆمەڵگایەك بەرەو تیاچوون بڕوات ئەوکات ئەو کۆمەڵەی کە خۆشگوزەرانە دەبن بەخاوەندەستەڵات، ئەوە وەك یاسایەکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی لێهاتووە و قورئان باسیدەکات.

چارەسەری ئەم کێشەی سەرمایەیە بەچی دەکرێت؟ چارەسەر لەوەدایە کە خوای پەروەردگار فەرماندەکات بەبەخشین لە پێناو خوادا

﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ الشورى:٣٨. جاكەواتە بابەتی سەرمایەش لە ڕوانگەی قورئانەوە چارەسەرکراوە کە ﴿كَيْ لاَ يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ﴾ الحشر:٧. با سەرمایە تەنها لە دەستی خاوەندەستەڵات و دەوڵەمەندەکاندا نەبێت، دەوڵەمەندەکان سامانی خەڵکیان بەشێوەیەك بەدەستەوە نەبێت کە نەهێڵن ئەو سەروەت و سامانە بگەڕێت و بگاتە دەستی خەڵکیتر، تەنانەت بنەمای هـزری زەکات بۆ ئەوەیە دووچین لە کۆمەڵگادا بەو شێوەیە نەبێت کە ئێستا خەڵك دەیبینێت و بۆ داهاتووش پێشبینیدەکات، واتە چینێك هەتا هەتایە دەوڵەمەندو سەرمایەداربن و چینێکیتریش هەتاهەتایە چینی خوارەوە و زەحمەتکێش‌و بێدەرەتان، چینێك کە ئاستی بژێوییان لە ژێر سفرەوە بێت، زەکات بۆ ئەوەیە کەسێك ئەگەر دەغڵ‌ودانێکی زۆری هەبێت بەشێك لە دەغڵ‌ودانەکەی دەدات بەهەژاران، هەژارەکەش ئەو بەشەی کە وەریدەگرێت بەشێکی دەکات بەخواردن و بژێوی خۆی و بەشێکیتری دەچێنێت و دووبارە ئەویش هەلێکی دەدرێتەدەست بۆ ئەوەی ببێت بەسەرمایەدارو ببێت بەخاوەنی دەغڵ‌ودان، ئەوەی ئاژەڵێکی زۆری هەیە دەبێت بەشێك لە ئاژەڵەکانی بدات بەزەکات بۆ ئەوەی ئەو کەسەی کە هەژارە ئەویش ببێت بەخاوەنی ئاژەڵ‌و ئەویش بەرەکەت بکەوێتە ئیش‌وکاری، دیسان ئەویش ببێتە خاوەنی سەرمایە، ئەم کارە بۆ ئەوەیە کە هەلەکان لەبەردەستی هەموو مرۆڤەکاندا کراوەبێت بۆ ئەوەی سەرمایە لە دەستی گروپێکی تایبەتدا نەبێت، چونکە ئەوسەرمایەیە هێز بەمرۆڤەکان دەبەخشێت.

## کێشەی لایەنگیری

کەئەمە قوڵترین کێشەی سەدەی بیست و یەکە، مرۆڤەکان نازانن بۆ کوێ دەگەڕێنەوە و سەربەکوێن و سەربەچین، چونکە شارستانییەتە ماددییەکە فشارێکی وەهای دروستکردووە کە خەڵك تەنها بیر لە پارەو سەروەت و سامان بکاتەوە، ئەو شارستانییەتە ماددییە کە پێیدەوترێت شارستانییەتێکی کوێرو شارستانییەتێکی ماددیی یەکلایەنەو یەکڕەهەندی، کە دەیەوێت چارەسەری کێشەکان بکات...

نەبوونی ئینتیماو نەبوونی ئەوەی کە مرۆڤ خۆی بەدامەزراوەیەك بزانێت، ئەوەی کە خاوەنی سەرچاوەبێت، ئەمەش وامان لێدەکات بڕۆینەوە بۆ قورئان کە فێری ئەوەمان دەکات هەمیشە خۆمان بەلایەنگر بزانین بۆ خودا، خودایەك کە لەسەر زمانی خۆمان دەفەرموێت:﴿إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ﴾ البقرە:١٥٦. واتە بیری ئەوەمان دەخاتەوە کە ئێمە هی خوداین و هەر بۆ لای خوداش دەگەڕێینەوە، ئینتیمامان هەبێت بۆ قورئان﴿إِنَّ هَـذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْراً كَبِيراً﴾ الإسراء:٩. چونکە مرۆڤ هەمیشە پێویستی بەوەیە کە ڕێنمایی بکرێت، ئەم مرۆڤە هەرچەند زانابێت و شارەزابێت هەمیشە پێویستی بەمورشید و ئینتیمایەك هەیە، هیچ ڕێنماییەکیش بەئەندازەی قورئان ناتوانێت ئامۆژگاری بکات، ئەم کێشەی ئینتیمایە بووەتە هۆی ئەوەی کە خوای

پەروەردگار پێغەمبەران بنێرێت بەموعجیزەو بەحیکمەتێکی زۆریشەوە، چونکە ئەو کەسانەی سەرچاوە و پێوەریان نەبوو لە ژیاندا تووشی گێروگرفت دەبن، بۆ نموونە خوای پەروەردگار لە یەکێك لەو ئایەتانەی کە باسی ئینتیمامان بۆ دەکات دەفەرموێت:﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ﴾ الكهف٢٩. بڵێ حەق لای پەروەردگاری ئێوەوە سەچاوەیگرتووە و لەوێوە هاتووە، واتە کەسێك کە بە دوای حەقیقەتدا بگەڕێت دەبێت بەدوای پەروەردگاردا بگەرێت بزانێت پەروەرێنی ئەو کێیە؟ هەروەها دەفەرمێت ﴿فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ﴾ الكهف٢٩. واتە: ئەوەی ویستی با باوەڕدار بێت و ئەو کەسەش نایەوێت با باوەڕدار نەبێت. کەواتە مادام حەق لە لایەن خواوەیەو خواش سەرچاوەیە بۆ هەموو مافێك کەواتە ئەو خەڵکە ئازادە، کێ باوەڕدەهێنێت با بیهێنێت کێش باوەڕناهێنێت با نەیهێنێت، چونکە ئینتیماکە بریتییە لەوەی کە بگەڕێیتەوە بۆ لای خودای پەروەردگار، ئێمە لەم دونیایەدا کێشەمان نابێت کە بە دوای حەقیقەتدا دەگەڕێین، حەقیقەتیش شتێکی مەحاڵو خەیاڵی و ئەفسانەیی نییە بەڵکو﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ﴾ حەقیقەت لای پەروەردگارە. دیسان کە ئێمە سەیری مرۆڤی ئەمڕۆ دەکەین دەبینین ئەو کێشەی ئینتیمایە پەیوەندی بەخاکەوە نامێنێت، پەیوەندی بەگەلەوە نامێنێت و هەروەك خۆی دەژی، بەڵام قورئاندا شتێکمان تێدەگەیەنێت کە پێیدەوترێت ڕێگەی خودا (سبيل الله)، ڕێگەی خودا

واته ئینتیما، تۆ له بیابانێکدانیت که نەزانی بۆ کوێ دەچیت، بنەماو مەبەستت دیارنەبێت، سەرەتاو کۆتاییت دیارنەبێت، دەستپێكو ئامانجت دیارنەبێت، چونکه ووشەی (سبیل) که مانای ڕێگایه ئەومانایەمان تێدەگەیەنێت، که باسی ڕێگا دەکرێت ئەو ڕێگایه حەتمەن دەبێت سەرەتایەكو کۆتاییەکی هەبێت، کەواته ئێمه سەربەڕێگایەکین ئەو ڕێگایه کۆتاییەکەی لای خوای پەروەردگاره، کەواته دەبێت هەمیشه دوورو نزیکیمان له حەق بەپێی دوورو نزیکیمان لەو ڕێگەیه دیاریبکەین.

## کێشەی نامۆیی

هەندێکجار سەیردەکەین مرۆڤ له خۆیەوه نامۆ دەبێت له دەوروبەر، بێزاردەبێت، یان یاخی دەبێت، هەر بۆ خۆی ئەم مرۆڤه شوێنه حەقیقییەکەی ئەم جیهانه نییه، ئەم جیهانه وێستگەیەکه بۆ ئەوەی ئەم مرۆڤه بەخۆیدا بێتەوه، ئەگینا (الدنیا مزرعة الآخرة) واته: ئەم ژیانه کێڵگەی دواڕۆژه، یان (الدنیا قنطرة الآخرة)، وەك پردێك وایه، یەکەم: کێڵگەیەکه بۆ ئاخیرەت، دووەم: پردێکه دەبێت لێیبپەڕیتەوه، هیچ کەسێك که پردێك بێته ڕێی ناتوانێت لەسەر پردەکه خێوەت دروستبکات، یان خانوو دروستبکات و بڵێت من هەر لەسەر ئەم پرده دەمێنمەوه، ئەرکی پرد ئەوەیه که پیایدا تێپەڕیت، که مرۆڤ بیر له نامۆیی دەکاتەوه ئەم قورئانه بیریدەخاتەوه کەتۆ شوێنێکت هەیه

دەبێت بۆی بگەڕێیتەوە﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحاً فَمُلَاقِيهِ﴾ الانشقاق:٦. واتە مرۆڤ لەم ژیانەدا کە تووشی ناڕەحەتی و زەحمەت و گێروگرف دەبێت و زۆرجۆر کێشە دێتەڕێی و ئەم موژدەیە دەبیستێت کە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ﴾ الذاريات:٥٠. بگەڕێنەوە بۆ لای خودا﴿إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ الذاريات:.٥٠. ئەمە بابەتێکە کە چارەسەری کێشەی نامۆیی دەکات، کێشەیەکە مرۆڤ تووشی هەمووشتێك دەکات، بەڵام بیر لەوەبکەرەوە کە چاودێریی تۆ دەکات، لە داستانی پێغەمبەرانەوە فێردەبین، لە داستانی نوحو ئیبراهیمو موساو عیساوە (سەلامی خوایان لەسەر) فێردەبین، کاتێك عیسای کوڕی مەریەم فەرمووی بەحەوارییەکان ﴿مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللّهِ﴾ آل عمران٥٢. کێ پشتیوانی و هاوکاری منە بۆ ئەوەی بڕۆینەوە بۆ لای خودا؟ واتە ئێمە نامۆین لەم دونیایەدا، چونکە ئێمە کێشەیەکمان نییە لەم بارەیەوە، بیری مسوڵمان و باوەڕدارو پابەندبوو بەرزترە لەو گرنگییانەی کە ئێستا لەناو زۆرینەی خەڵکدا هەیە، چونکە ئەگەرمرۆڤ باوەڕەکەی لێبکەیتەوە دەبینیت هەموو خەمێکی بریتییە لە بژێوی ژیانی، لە حاڵێکدا گەرچی بژێوییەکە گرنگە، بەڵام ئەو سەقفە بەرزە نییە کە مرۆڤی باوەڕدار هەوڵی بۆ دەدات، مەولانای ڕۆمی لەم بارەیەوە شیعرێکی جوانی هەیە کە پوختەکەی ئەمەیە (ئەو دڵەی کە خۆشەویستیی سەروەت و سامانی تیابێت بیری زێڕوزیوی تیابێت، حەق نییە پێیبوترێت دڵ، ئەوە کەلاوەیەو کەلاوەش ڕێدەکەوێت ئەوشتانەی تێکەوێت، ئەو دڵەی کە خۆشەویستی ئاژەڵو خۆشەویستی ئاژەڵی

تیابێت (چونكه لەوسەردەمە دەستەڵات و توانا بەوە دەركەوتووە كە چەند سەرئاژەڵی هەیە) ئەو دڵە وەك تەویلە وایە، واتە ئەوە هەر تەویلەیەكە لە تەویلەی دێهاتەكان، بەڵام دڵێك خۆشەویستی خوای تیابێت ئەو دڵە حەقە پێیبڵێیت دڵ). دڵ چونكە لە ڕاستیدا (ماسمي القلب الا من تقلبه) ئەوە گۆڕانی مرۆڤە، ئەو دڵەی كە دەگەڕێت و گۆڕانی بەسەردادێت خۆشەویستی و ترسی بۆ دروستدەبێت بۆ خوای پەروەردگار، ئەوە، حەقە پێیبڵێیت دڵ، كەواتە ئێمە لە ڕێگەی قورئانەوە فێری ئەوەدەبین كێشەی نامۆییمان بۆ دروستنەبێت ﴿أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ الرعد:٢٨.

﴿وَمَن يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى الْقُلُوبِ﴾ الحج:٣٢.

﴿فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ۝ الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾ قریش٣–٤، ﴿خوف﴾ ئەوترسە نامێنێت، چونكە هەموو نامۆییەك ترسێكی لەگەڵدایە.

## كێشەی شوێن

ئێستا زۆربەی كەسەكان ئارەزوی شوێنێكی دیاریكراو دەكەن، سەیری هـزری هاووڵاتیبوون بكە، بێگومان ئەم بیرە لە ئاستی ووڵاتێكدا باشە، بۆ ئەوەی جیاوازی نێوان مرۆڤەكانی ناو ئەو ووڵاتە نەمێنێت و هەموو كەسێك حورمەت و ڕێزی پارێزراوبێت، بەڵام ئەم بیری هاوڵاتیبوونە چەندێك قازانجی هەیە بۆ خەڵكی ووڵاتێك بەو ئەندازەیەش زیانی هەیە، چونكە جیاوازی هەیە لە نێوان هـزری مرۆڤەكاندا، كاتێك

تۆ دەتەوێت بڕۆیت بۆ وولاتێك، کەسێکی بەڕێزو ناوداریت لە وولاتەکەی خۆت، هیچ تاوانێکت لەسەر تۆمارنەکراوە، بەڵام تا پاسپۆرتت نەبێت بۆت نییە بچیتە وولاتەکەیترەوە، لە وولاتەکەیتردا پاسپۆرتەکە لە خۆت گرنگترە، بوونی کاغەزێك گرنگترە لە تۆ، کەواتە لە ڕاستیدا مرۆڤ کێشەی شوێنی هەیە، کێشەی ئەوەی هەیە لە شوێنێکدا بەڕێزە، بەڵام لە شوێنێکیتردا مەرج نییە بەڕێزبێت، لە شوێنێکدا مافی هەیە بەڵام لە شوێنێکیتردا مەرج نییە مافی هەبێت، لە شوێنێکدا بۆی هەیە بچێتە زانکۆو خاوەنی دەستەڵات بێت، بەڵام لە شوێنێکیتردا بۆی نییە، عێراقییەك لە عێراقدا بۆی هەیە، بەڵام لە ئێراندا بۆی نییە، بەپێچەوانەوەش، کەواتە ئەمە کێشەی شوێنە. بەڵام قورئان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ﴾ العنکبوت٥٦، زەویی خوا فراوانە و ئەمە زەویی خوایە، کەواتە ئێمە یەك نیشتیمانمان هەیە ئەویش سەرزەوییە، کەواتە ئیسلام چارەسەری ئەوەش دەکات.

## وەڵامی پرسیاری ئامادەبووان

**خوێندكارێك:** ئەو هۆكارانە چین كەوا لە مرۆڤ دەكات ئینتیمای نەمێنێت بۆ ئاین و نیشتیمان و نەتەوە؟

د.صەباح: هۆكارەكان زۆرن، بەڵام گرنگترینیان ئەوەیە كاتێك كەسێك مامەڵە دەكات لەگەڵ دەوڵەتداو ئەو دەوڵەتە كۆمەڵە یاساوڕێسایەكی دانەنابێت كە ووزەو تواناكانی ئەم كەسە بەهێزبكات، ئیتر ئەم كەسە خۆی بەخاوەنی ئەو ووڵاتە نازانێت، هەر دەزگایەك نرخو بایەخ نەدات بەئەندامەكانی خۆی، ئەو دەزگایە ئەو نەخۆشییە لە ناو ئەندامەكان دروستدەكات كە هەست بەئینتیما نەكەن، دڵسۆزییان بۆی نامێنێت، هۆگرییان بۆی نامێنێت، كەواتە كێشەكە لەوەدایە، لە نەبوونی كۆمەڵە یاساوڕێسایەك كە ئەم تاكە لە چوارچێوەی ئەو دزگایەدا (ئەو دەزگایە چ دەوڵەت، حیزب، یان دامەزراوە بێت) ئەو تاكە هەست بەگەورەبوون دەكات تیایدا. كاتێك تۆ خوێندكارێكیت لە زانكۆ دەردەچیت و دەبیت بەمامۆستا، گەر هەستبكەیت ئەو قوتابخانەیە خزمەت بەبەهرەو تواناكانی تۆ ناكات و كۆمەڵە یاسایەكی نییە كە تۆ بخاتە ناویەوە و كاریگەرییان لەسەر تۆدابنێ و تۆش باڵا بیت تیایدا، هەست بەئینتیما ناكەیت بۆی، واتە پێویستە پەیوەندییەكی ئۆرگانیك لە نێوان مرۆڤ و دەوروبەریدا دروستببێت، ئەو پەیوەندییە وادەكات

لەوەی کە ئەو مرۆڤە هەست بەئینتیما بکات، واتە لە سەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر) هاوەڵان هەستیان بەئینتیما دەکرد بۆ ئیسلام، لەبەرئەوە ئامادەبوون لە پێناو ئیسلامدا خۆ بەختبکەن، ئامادەبوون لە پێناوی پێغەمبەرو ئەو ئامانجە بەرزانەدا ژیانی خۆیان بەختبکەن.

دووهەمینیان: ئەوەیە کە مرۆڤەکان، هەموو مەبەستەکانیان بەبەمەبەستی بەرجەستەبوون بووە، بەمەبەستی ماددیی، ئیتر ئامانجی باڵا نامێنێت.

هەروەها، نەبوونی دادپەروەرییە لە ناو دەزگایەکدا، لە ناو حیزبێکدا، لە ناو وواڵتدا، کە وادەکات هەمیشە مرۆڤـی مەراییکارو ماستاوچی نزیکبێتەوە لە سەرچاوەکانی دەستەڵات، ئەوکات خەڵکی دڵسۆز هەست بەئینتیما ناکات، چونکە پێیانوانییە ئەو دەزگایە پارێزەری مەبەست و ئامانجەکانیان بێت.

خوشکێك: کاتێك ئێمە ئینتیمامان هەبێت بۆ لای خودا، ئایا پێویستدەکات ئینتیمای حیزبییمان هەبێت؟ یان مەرجە هەموو مرۆڤێك ئینتیمای حیزبیی بۆ دروستببێت؟

د.صەباح: ئێمە کە باسی ئەوە دەکەین کە مرۆڤ ئینتیمای هەبێت بۆ گەل، مەبەستمان هەموو مرۆڤێکە، جا مرۆڤەکان دەگونجێت مرۆڤی سیاسی بن یان مرۆڤی سیاسی نەبن، داوانەکراوە بۆ هەموو مرۆڤێك کە خەریکی سیاسەت بن، چونکە ئەرك‌و پسپۆڕییەکان لە ناو کۆمەڵگەدا جیاوازن، لەگەڵ ئەوەدا کە هەموو کەسێك پێویستە ئینتیمای هەبێت بۆ

ئاینێك و گەلێك و نەتەوە و وولاتێك، بۆ ئەوەی هەموو مرۆڤایەتی هەست بەدڵسۆزی بكات، بەڵام پێویستناكات هەموو مرۆڤێك خەریكی سیاسەت و كاری سیاسی بێت، چونكە كاری سیاسی كارێكی پسپۆڕییە و كارێكی گرنگە، كارێكی جومگەییە، ئەرك‌و مەرجی خۆی هەیە، ئەگەر بمانەوێت مسوڵمانێتیش بكەین مەرج نییە مسوڵمانێتییەكەمان لە چوارچێوەی حیزبێكی سیاسییدابێت، بەڵكو ئەگەر ویستت كاری سیاسەت بكەیت لە دیدگایەكی ئیسلامییەوە ئینتیمات دەبێت بۆ حیزبێكی ئیسلامی، ئەگەر ویستت كاری سیاسی بكەیت لە ڕوانگەیەكی نائیسلامییەوە دەچیتە حیزبێك كە ئیسلامی نەبێت، كەواتە ئەوكەسەی كە دەچێتە ناو حیزبێكی ئیسلامییەوە ئەوە دەیەوێت خەریكی سیاسەت بێت و سیاسەت بكات بەیەكێك لە پیشەكانی ژیانی، وەمەوقیفی سیاسی و هەڵوێستی سیاسی هەبێت، بەڵام مەرج نییە هەمووكەسێك خەریكی ئەو چالاكییە سیاسییە بێت.

هەمان خوشك: ئەی باشە بۆچی وەك كێشەیەك لە ناوگەنجاندا باسدەكرێت كە نەبونی ئینتیمای حیزبیی كێشەیەكە گەنجان توشی دەبن؟، وەك كێشەیەك باسی لێوەدەكرێت؟

د.صەباح: لەو ڕوانگەوە كێشەیە كە ئەگەر یەكێك بیەوێت سیاسەت بكات، سیاسەتی ئەمڕۆ لە چوارچێوەی حیزبی سیاسییدا ئەنجامدەدرێت، واتە ئەوانەی كە سیاسەتوانی سەربەخۆن لە ڕاستیدا كاریگەرییان كەمە لەسەر گۆڕەپانی سیاسی، بەڵام یەكێك بیەوێت هەر سیاسەت نەكات گەلێك بوار هەیە لەبەردەمیدا كراوەتەوە، كە دەتوانێت

خەریکی کاری ڕوناکبیری یان ئابوری یان پەروەردەیی بێت، دەبێت ئێمە ئەم کارانە وەك یەك سەیر بکەین، بەڵام کاری سیاسەت گرنگی لەوەدایە کە ڕەوت دەدات بەکارەکانیتر، هەرکەسێك کە توانای سەرکردەیی تیابووو توانای ئەوەی هەبوو کە ڕێنوێنی خەڵك بکات بۆ ئەوەی ژیانی چۆن بێت و چۆن نەبێت، ئامانجی سیاسی و ئامانجی فیکری چۆن بێت و چۆن نەبێت، ئەوە شایەنە کە سیاسەت بکات، بەڵام ئەگەر کەسێك توانای ئەوەی نەبوو گوناهە خەریکی سیاسەت بێت.

خوێندکارێك٢: زۆرجار لە سیرەدا ئەوە هاتووە کە هۆزی جوولەکە هەبوون لە مەدینەدا، وەك(بەنوقەینوقاعو بەنونەضیرو بەنوقورەیظە)، ئەمانە لە ژێر دەستەڵاتی مسوڵمانانندا دەژیان، ئایا تاچەند ئیسلام ڕێگە بەوەدەدات کە ئەم هۆزانە لە ژێر دەستەڵاتیدا بمێننەوە؟ ئایا ئەمە وەك کەسێتی پێغەمبەر خۆی (درودی خوای لەسەر) یاخود ئەمە هـزری ئیسلامییە ڕێگەیداوە؟

د.صەباح: بێگومان بیری ئیسلامییە کە باسی هەبوونی پەیمان دەکات لە نێوان مسوڵمانان و نامسوڵماناندا، ئەگەر سەیری سەرەتای سورەتی (التوبة) بکەین باسی ئەوەدەکات ئەگەر بەرامبەرەکەت پەیمانەکەی شکاند تۆش پێیڕابگەیەنە کە پەیمانەکەش لای من ڕۆڵی نەماوە و منیش هەڵیدەوەشێنمەوە، هەرگیز دەستپێشخەری مەکە لە پەیمانشکاندندا، چونکە هەڕەشەکراوە لە قورئاندا لەو کەسەی ناپاکی دەکات لە پەیمان، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِي أُوفِ بِعَهْدِكُمْ﴾ البقره٤٠. ئینجا پێغەمبەری خوا(د.خ) قورئانی

پێیـڕاگەیاندووین، گەیەنەری پەیامە، ئەو پەیامەکەی ناردووە نەك لەسەر ئیعتیباراتی کەسێتی کە خۆی مەبەستی بووبێت، بەڵکو واقیعی کۆمەڵگە ئەوەدەخوازێت کە مسوڵمان دان بەبوونی نامسوڵماندا بنێت، جائەگەر نامسوڵمان لە کۆمەڵگەی مسوڵماندا لەسەر بنمای مەرجو پەیماننامەیەك دەژیا، مسوڵمانان واجبە لە سەریان کە بەرگرییان لێبکەن، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) هەر لەسەر ئەم بنەمایە پەیمانی لەگەڵ ئەو جولەکانەدا هەبوو، ئەوان پەیمانەکەیان دەشکاندو لە وەڵامدا پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) لێپرسینەوەی یاسایی‌و شەرعی لەگەڵدەکردن، یان دەریدەکردن، یان گەر هیچ چاری نەبوایە، بەشەڕ بابەتەکەی لەگەڵ یەکلادەکردنەوە.

بنەمایەکی ئیسلامییە کە قورئان باسی خاوەن پەرتووکمان بۆ دەکات، لە ڕاستیدا لەوبارەیەوە کە مادام دونیا خاوەن کتێبەکانی تێدایە، دەبێت ئاوا ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێت، جا لە قورئاندا دەفەموێت: ﴿وَلاَ تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ العنكبوت٤٦. تەنانەت کە گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکەین دەبێت بەڕەوشتێکی جوان گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەین، جائەگەر لە کۆمەڵگەی ئێمەدا نەژیین، چۆن موناقەشەیان لەگەڵدا بکەین، مانای وایە ئەمە مافێکی تایبەتە بەنامسوڵمانان کە لە ناوماندا بژیین، کەواتە (**لهم مالنا وعليهم ماعلينا**) واتە: ئەوەی بۆ ئێمە مافە، مافی ئەوانیشە، ئەوەی لەسەر ئێمەیە لەسەر ئەوانیشە، وەك یاساو بنەمایەکی ئیسلامیی، ڕاستەقینە.

# مافی مرۆڤ و دیدی ئیسلامی

ناتوانین بڵێین ئەوەی کە لێرەدا پێشکەش دەکرێت دەقاودەق ئەوەیە کە لە ئیسلامدا هاتووە، ئەمە ڕوانگەیەکە لەو ڕوانگانەی کە دەگونجێت لە سەرچاوەکانی ئیسلامەوە وەربگیرێن. ئەم باسەمان لە چەند تەوەرێك پێکدێت، سەرەتا بەپێشەکییەك دەستپێدەکەین سەبارەت بەوەی لەوێوە بچینە ناوباسەکەوە کە بۆچی باسی مافی مرۆڤ دەکەین؟ مرۆڤ لە بەرچی؟ ئینجا دێینە سەر پێناسەکردنی مافو پۆلێنکردنی مافەکان و بەراوردکردنی ئەو مافانەی کە لە شەریعەتی ئیسلامو هزری ئیسلامییدا جەختیان لەسەر دەکرێت، ئینجا دێینەسەر تایبەتمەندییەکانی مافی مرۆڤ لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە، واتە لە ڕوانگەی ئایەت و فەرمودەو گوتەزا ئیسلامییەکانەوە چ ئایەتی قورئانی پیرۆز یان فەرموودەکانی پێغەمبەر بێت (درودی خوای لەسەر)، سەرەتا باس لەوەدەکەین بۆچی مافی مرۆڤ ئەوەندە گرنگیی پێدەدرێت، لەبەرئەوەی مرۆڤ بەڕاستی خۆی جێگەی بایەخو گرنگیپێدانە، لە ڕوانگەی هزری ئیسلامییەوە خوای پەروەردگار مرۆڤی بەتایبەت دروستکردووە، تایبەتمەندیی لەلایەن خواوە پێدراوە، ئەوەتا دەبینین هەموو فریشتەکان فەرمانیان پێدرا سوجدەی ڕێز ببەن بۆ

ئادەم کە بناغەو بنەڕەت و باوکی هەموو مرۆڤایەتییە، قورئان دەفەرموێـت: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِّن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ۞فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُ سَاجِدِينَ﴾ الحجر:٢٨-٢٩. واتە لەو ڕوانگەیەوە کە خوای پەروەردگار لە بنەمای دروستکردن و ئەفراندندا گرنگییەکی زۆری داوە بەمرۆڤ، مرۆڤی تایبەت دروستکردووە، لە ناو هەموو تایبەتمەندییەکاندا مرۆڤی تایبەت کردووە بەزانست و بەزانین، دەبینین خوای پەروەردگار لە مەقامی مەدحو باسکردنی بەهرەکانی خۆیدا دەفەرموێت ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا﴾ البقرة:٣١. ئەم تایبەتمەندییە وایکردووە لەوەی کە مرۆڤ کەسێکی زانا بێت، هەبوویەکی زاناو بیرمەندبێت، وەك فەیلەسوفانیش دەڵێن تاکە زیندەوەرێکە بیردەکاتەوە و توانای بەرهەمهێنانی زانست و زانیاری هەیە، لە هەمانکاتدا خوای پەروەردگار ڕێزێکیتری ناوە لە مرۆڤ کە پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانەکردووە، لە ناو خۆیاندا پێغەمبەرانی هەڵبژاردووە و فەرمانی پێکردووە بچێت پەیامی خوایان پێبگەیەنێت، هەر لە سەرتاوە ئەم بابەتە ڕوونبووە، هەر لە بەرەبەیانی دروستبوونی مرۆڤەوە خوای پەروەردگار کە فەرمووی بەئادەموحەوا ئێوە، یاخود نەوەی ئێوە، هەرکات هیدایەتێکتان بۆ هات بەگوێی بکەن و فەرمانبەرداریی لێبکەن و وەریبگرن و گوێڕایەڵیی بکەن، ئەوا نە لەم جیهانەدا گومڕادەبێت و نە لە کۆتاییشدا بەدبەخت دەبێت، وەك خوای پەروەردگار بۆمان باسدەکات لە سورەتی(گه)دا لە ئایەتی (١٢٣)دا دەفەرموێت: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلاَ يَضِلُّ وَلاَ

يَشْقَى﴾ طه:١٢٣ واته ئەگەر مرۆڤەكان لەلايەن خواوە هيدايەتيان پێگەيشت، ئەوكاتە هەركەسێك پەيڕەويى لەوهيدايەت و بەرنامەيە دەكات، ئەوە ﴿فَلاَ يَضِلُّ وَلاَ يَشْقَى﴾ زانايانى تەفسيرى قورئان دەڵێن ﴿فَلاَ يَضِلُّ﴾ بەنيسبەت دونياوە سەرگەردان نابێت، ﴿وَلاَ يَشْقَى﴾ بەنيسبەت ڕۆژى كۆتاييشەوە بەختـسووتاو نابێت، لەبەرخاترى ئەم ڕێزو پايەيە كە خواى پەروەردگار بەرنامەى بۆ داناوە و پشتگوێى نەخستووە بۆ شوێنكەوتنى ئارەزووەكانى خۆى، چونكە ناخ‌و دەرەوەى مرۆڤـ دەيانەوێت وەسوەسەى پێبكەن و لە ڕێگەى ڕاست لاى بدەن تا نەتوانێت بگات بەئامانجەكانى خۆى، لەبەرئەوە خواى پەروەردگار لە ڕێگەى نامەو پەيامەكەى خۆيەوە مرۆڤى فێرى واجبات و فێرى ماف كردووە، فێرى هەندێك واجباتى كردووە، هەندێك مافى داوە بەسەريدا لە پێناوى ئەوەدا كە هەندێك مافى بنەڕەتى ياخود مافەكانى ژيانى خۆى بەدەستبهێنێت و بيچەسپێنێت، ئەمە لە ڕووى مێژووييەوە هەروابووە، بەڵام كە دێينە سەر قورئانى پيرۆز وەك دواهەمين دەستورو پەيامى مرۆڤايەتى لەلايەن خواى پەروەردگارەوە، زاناكان كە بەراوردى دەكەن بەياساكانى مافى مرۆڤ بەو بەندانەى كە ناوەندە جيهانييەكان ياخود ڕێكخراوە جيهانييەكان باسيدەكەن، كە بەراوردى قورئان دەكەين بەجاڕنامەى جيهانيى مافى مرۆڤ ياخود بەهەموو ئەو پەيماننامانەى كە مۆركراوە و مۆردەكرێت، دەبينيت قورئان پێش هەموويان كەوتووە و توانيويەتى لە بوارەكانى چەسپاندنى ئاشتى جيهانى و ئاشتى مرۆڤايەتى و ئاشتى كۆمەڵايەتى،و لە بوارەكانى مافى

مرۆڤـدا، له کۆت و بەندی کۆیلایەتی و پاشایەتی، گەورەترین یاسا دابڕێژێت و گەورەترین بانگەواز بڵاوبکاتەوە، لەناو مرۆڤەکاندا لەم ڕوانگەیەوە ئاینی پیرۆزی ئیسلامو مسوڵمانان دەتوانن ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان هەبێت لە ئاستی جیهانییدا، بۆ ئەوەی بتوانن لە مەینەتییەکانی مرۆڤایەتی کەمبکەنەوە، چونکە هەموولایەك دەزانن مرۆڤایەتی هەمیشەو بەدەستی زوڵمو ستەمو بەدەستی کەسانی دەستەڵاتداری بێویژدانەوە ناڵاندوویەتی. ئەم ڕاگەیاندنە قورئانییە ئەوەندە پرانسیپو بنەمای بەهێزو گەورە و گرانی تێدایە، کە دەتوانێت بەدادی مرۆڤایەتی بگات و ڕزگاری بکات لە چنگاڵی هەموو پێشێلکردن و هەموو نەهامەتییەك، کەواتە ئەگەر لێمانبپرسن ئێوە بۆچی ئەوەندە گرنگی بەمافی مرۆڤ دەدەن؟، دەڵێین ئەمە پەیامێکی جومگەییو خولگەییە لە پەیامەکەی قورئانی پیرۆز، ئەم قورئانە لە ڕێگەی ئایەت و پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) لە ڕێگەی فەرمودەکانییەوە، زۆر گرنگییان داوە بەم مەسەلەیە.

پێش ئەوەی بچینە سەر باسەکە، جێگای خۆیەتی ئێمە پێناسەیەکی ماف بکەین، ماف چییە؟

ماف پێناسەی زۆری بۆ کراوە لە ڕوی زمانەوانی و وتەی زانایانەوە، بەڵام گەر بگەڕێینەوە بۆ فەرهەنگی قورئانی، قورئان ووشەی حەق بەچەند مانایەك بەکاردەهێنێت، یەکێك لە ماناکان بریتییە لە (ڕاستی)، مانایەکیتری بریتییە لە (ڕەوایی)، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَلْبِسُواْ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُواْ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ البقرة:٤٢، واتە

شتی ڕەواو ناڕەوا پێکەوە تێکەڵ مەکەن. خوای پەروەردگار مرۆڤی باش ناسیوە، مرۆڤ بۆ گەیشتن بەئامانجو ویستەکانی خۆی (مرۆڤی ناتەواو) زۆرجار دەیەوێت جلوبەرگی حەق بکاتە بەربەتاڵ وبەتاڵ وانیشان بدات کە ڕەوایە، ئەوکاتە خەڵك سەریان لێدەشێوێت، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت حەقو بەتاڵ تێکەڵ مەکەن، ئینجا حەقیش مەشارنەوە، چونکە ئەگەر ئێوە ئاگاداربن لە حەقو بیشارنەوە، ئەوە تاوانی زۆر ئەنجامدەدەن، ئەوکەسەی کە حەق دەناسێت و حەق دەزانێت، دەبێت بڵاوییبکاتەوە، نەك بێت ئەو حەقەی دەیزانێت بڵاوی نەکاتەوە و بەپێچەوانەوە بەتاڵ بڵاوبکاتەوە و بەناوی حەقەوە نیشانی خەڵکی بدات، کەواتە یەکەمین مانای حەق ڕاستەقینەبوون و جێگیرە، کە بە مانای شتێکی جێگیردێت، لە شوێنێکیتردا خوای پەروەردگار لە سورەتی (القصص)دا لە ئایەتی (٦٣)دا کە ئەویش ئایەتێکی مەککییە دەفەرموێت: ﴿قَالَ الَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ﴾ القصص:٦٣. (**حق عليهم**)، واتە جێگیربوونی قسە، کەواتە حەق لێرەدا بەمانای جێگیربوونە، لێرەدا ماف بۆچی دەبێت حسابی جێگیربوونی بۆ بکرێت؟ مەبەست ئەوەیە ماف شتێکی جێگیرو ئەسڵە بەنیسبەت هەموو مرۆڤێکەوە، ئەو شتەی کە دەڵێن ئەوە مافی ئەوە، واتە نابێت لێی لابدرێت و نابێت لە ژێر مەترسیدابێت، تەنانەت بەو مانایەی کە ئێستا حەق هەیەو بەو مانایە دێت کە ئێستا بیری سیاسی لە سەری جێگیربووە کە هـزری شەرعی لە سەری جێگیربووە، لە فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت (**ان الله قد اعطى لكل ذى**

حق حقه)، هەموو خاوەنبەشێك بەشی خۆی پێدراوە، هەموو خاوەنـمافێك مافی خۆی پێدراوە، هەموو خاوەنبەهرەیەك بەهرەی خۆی پێدراوە، هەموو خاوەنپشكێك پشكی خۆی پێدراوە، (فلا وصية لوارث)، كەواتە نابێت وەسیەت بكرێت بۆ میراتگر، واتە ئەوكەسەی كە میراتگرە لە ڕێگەی میراتییەوە بەش دەبات لە میراتی كەس‌وكاری مردووی، كەواتە پێوست ناكات لەو تەریكەیە شتێكی پێبدرێت بەناوی وەسیەت.

لە زاراوەی یاساییداو لەناو یاساناساندا چەندین ڕەوت هەیە بۆ پێناسەكردنی حەق یان ماف، كە كورتدەكرێنەوە لە سێ ڕەوتدا:

**ڕەوتی یەكەم: پێیدەوترێت ڕەوتی كەسێتی.**

**ڕەوتی دووەم: پێیدەوترێت ڕەوتی بابەتی.**

**ڕەوتی سییەم: پێیدەوترێت ڕەوتی ئاوێتە**، كە دەیەوێت هەردوو ڕەوتەكە لەناو یەك پێناسەدا كورتبكاتەوە.

هەرچەند دەڵێت ڕەوتێكی نوێش هەیە كە حەق بەوە پێناسەدەكات كە دەڵێت: یەكێك خاوەنی بنكەیەكی یاسایی بێت و لە ڕێگەی ئەو بنكە یاساییەوە بتوانێت مومارەسەی ژیانی یاسایی خۆی بكات دوور لە زەبروزەنگ‌و گوشارو دوور لە موجامەلەو تەكلیف، دوور لەوەی زۆری بۆ بێت.

بێگومان زانا مسوڵمانەكان لە كۆندا غافڵ نەبوون لە بابەتی حەق، بەڵام ئەوان پێناسەیان كردووە بەوەی (بریتییە لەو سوودو بەهرەی لە جێبەجێكردنی بڕیارو یاسا شەرعییەكاندا بەنسیبی مرۆڤەكان بێت)،

کەواتە حەق بریتییە لەو بەرژەوەندییەی لە ئەنجامی جێبەجێکردنی واجبێکدا بۆ کات یان بۆ کۆمەڵ، پەراوەردە دەبێت، جا ئەگەر ئەو بەرژەوەندییە بەرژەوەندیی گشتی بێت و بۆ هەموو کۆمەڵ بێت، پێیدەوترێت (**حق العام**) یان پێیدەوترێت (حق الله)، ئەگەر بەرژەوەندییەکە بەرژەوەندیی تاکەکەس بێت پێیدەوترێت مافی بەندەکان (حق العباد)، بەڵام ڕەنگە باشترین پێناسە بۆ ماف ئەوەبێت کە هەندێك لە زانا هاوچەرخەکانمان گوتوویانە کە ماف بریتییە لە تایبەتمەندییەکی یاسایی کە دەدرێت بەکەسێك، بەو تایبەتمەندییە دەبێت بەخاوەنی دەستەڵاتێك یان خاوەنی بەرپرسایەتییەك، واتە (اختصاص ثابت في الشرع يقتظي سلطتة أو تكليفا)، بەپێی ئەمەبێت زۆرشت دەچێتە بواری مافەوە، بۆ نمونە خوێندکار مافی خۆیەتی بگات بەزانیاری، کەواتە مافی خۆتە ئەو زانکۆیەی کە تیایدا دەخوێنیت، ئەو پەیمانگایەی کە تیایدا دەخوێنیت، هەموو سەرچاوەکانی زانیاریت بۆ فەراهەمبکات، مامۆستات بۆ دابینبکات، ئەمە مافە و واجبی سەرشانی ئەوە، بەڵام مافی تۆیە لە بەرامبەرداو واجبە لەسەر تۆش کە خوێندکاریت، خەریکی وانەخوێندن بیت، ئەمە مافی کۆمەڵگەکەیە بەسەر تۆوە و دەبێت بەمافێکی گشتی، کەواتە ئەگەر زانکۆو پەیمانگاکەت کەمتەرخەمیی کرد لە ئەرکی سەرشانی بەرامبەر بەتۆ، لە مافەکەی تۆ کەمدەبێتەوە و تۆش ئەگەر کەمتەرخەمییت کرد لە خوێندن و لە هەوڵدان و لە توێژینەوە و لە لێکۆڵینەوە لە مافی کۆمەڵگە کەمدەبێتەوە، ئەمە تایبەتمەندییەکە، ماف بریتییە لەو تایبەتمەندییە

کە کەسێك یان لایەنێك کەسێکی سروشتی یان کەسێکی مەعنەوی (ئیعتیباری) بۆی جێگیردەکرێت لە یاسادا بۆئەوەی خاوەنی دەسەتەڵات بێت یان خاوەنی بەرپرسیارێتیەك بێت.

دیارە کە حەق پایەی هەیە، وەك هەموو چەمکە ئاساییەکان ماف پایەی هەیە، کە ئەوانیش چواردانەیە:

**یەکەم:** خاوەن ماف، کە هەر لە پێناسەکەوە وەردەگیرێت.

**دووەم:** جێگەی ماف.

**سێیەم:** ئەوکەسەی کە داوای مافەکەی لێدەکەیت.

**چوارەم:** بوونی دەقێکی یاسایی لەسەر چەسپاندنی ئەومافە، واتە ئەگەر دەقێکی یاسایی نەبێت دەقێکی قورئان یان سوننە یان یاسایی نەبێت بۆ کەسێك یان گروپێك، چ لە جیهانی سروشتی و لە ئۆنلایندا بێت، کە ئەو مافە جێگیربکات، دیارە ئەو مافە خولیایەکە واقیعییەت پەیداناکات.

کەواتە پایەکانی ماف بریتیین لەم چوارە، ئەوکەسەی مافەکەی بۆ دابیندەکرێت لەگەڵ جێگەی مافەکە، ئیتر ئەو جێگەیە لەوانەیە ماڵ بێت، یان سوودو بەهرەبێت، لەوانەیە کار بێت یان دەستەڵاتێك بێت.

سێهەمینیان، ئەو کەسەی مافەکەی لێ داوادەکرێت، واتە ئەوکەسەی مافەکەی لەسەر واجبە، لەوانەیە کەسێك بێت یان کۆمەڵگەبێت یان دەوڵەت بێت، چوارەمینیان، بوونی دەقێکی یاسایی، کە بە زاراوەی یاساناسەکان دەبێتە: (صاحب الحق، محل الحق، المكلف بالحق، مشروعيه الحق).

سەرچاوەکانی ماف لە ڕووی هـزری ئیسلامییەوە بریتیین لە:

**یەکەم: (کیتابو سوننەت) الکتاب والسنە.**

**دووەم: ئیجتیهاد.**

**سییەم: واقیع، واتە هەندێك شت واقیع دەیسەپێنێت.**

**چوارەم: عورفی سیاسی و کۆمەڵایەتی فەرزی دەکات.** ئێمەش لە دەقە شەرعییەکانەوە داوامانلێکراوە کە ئاگاداری عورفو کۆمەڵگەبین، ئاگاداری باروزروفی سیاسی بین، ئاگاداری باری ژیاری و باری فەرهەنگی بین.

**جۆرەکانی ماف:**

لەهـزری ئیسلامییدا سێ جۆر مافمان هەیە:

**یەکەم: مافی گشتی.**

**دووەم: مافی تایبەتی.**

**سێیەم: مافی تێکەڵ.**

یەکەم مافی گشتی، بریتییە لەو مافانەی کە بۆ مرۆڤەکان سەلمێنراوە بەمەبەستی پاراستنی یەکپارچەیی کۆمەڵایەتییانە، واتە هەر شتێك زیانبدات لەو یەکپارچەییو بایەخانە و لەو بەهاکۆمەڵایەتییانە، سزایەکی قورسی لەسەر دانراوە، ئەمە لە دەستەواژەی فیقهی ئیسلامییدا پێیدەوترێت (حقوق الله تعالی) بەدەستەواژەی نوێ دەوترێت (حقوق العام).

مافی گشتی، ئەومافانەن کە "وەلی ئەمر" یان حاکمو خاوەن دەستەڵاتی سیاسی یەکەم لە وولاتدا هەڵدەستێت بەجێبەجێکردنی و بریتییە لە: (پاراستنی ئاین و عەقڵو هۆشو نەوە و سامان و کەرامەت)، ئەوەی کە لە شەریعەتی ئیسلامییدا پێیدەوترێت (مقاصد الشريعة)، بەرژەوەندیی کۆی خەڵك، بۆ نموونە بەرگریکردن لە ئاین و بەرگریکردن لە پیرۆزییەکانی، بەرگریکردن لە قەوارەی مرۆڤەکان و لە ناموسو کەسایەتیی مرۆڤەکان، هەرکەسێك دەستدرێژی بکات بۆ ئەم مافانە، پێویستە دەستەڵاتی سیاسی لەبەردەمیدا بوەستێت و بەرگری لەو بەرژەوەندییانە بکات، چاوپۆشی ناکرێت لەوکەسەی کە دەستدرێژیی دەکاتەسەریان، واتە بابەتێکی قابیلی گفتوگۆو دەستکاریکردن نییە، لەبەرئەوە تاوانەگەورەکانی وەك تاوانی ڕەوشتیی، یان بەدناوکردن، یان دزیکردن، ئەو تاوانانە لە کتێبەکاندا بەدرێژی باسکراون، چونکە هەڕەشەیەکە لە بەرژەوەندییە گشتییەکان، دەستەڵاتدار بۆی نییە دەستکاری سزاکانیان و شێوەی مافەکانی ئەو هاوولاتییانە بکات.

دووەم مافی تایبەتی: کەسێك پارەی لای کەسێکیترە، یان کەسێك کەسێکیتری بەکرێ گرتووە و ئەو هەڵدەستێت بەکارەکانی، ئەوەی کە پێیدەوترێت مامەڵەی تاکەکەسی، هەمووکەسێك دەتوانێت بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی خۆی بکات، ئەمە مافی تایبەتییە کەسێك لە کوێ دادەنیشێت یان ماڵی لە کوێیە (الحقوق الشخصية).

جۆری سێهەم: هەندێك مافی دیکەمان هەیە هەردوو لایەنەکەی تێدایە، وەك پاراستنی گیانی خەڵك، ئەگەر کەسێك یەکێك بکوژێت، لەلایەکەوە دەستدرێژیی کردووەتەسەر تاکەکەسێكو کۆتایی بەژیانی هێناوە، لە لایەکی دیکەوە دەستدرێژی کردووەتە سەرکۆمەڵگە، کە ئاسایشی کۆمەڵگەی شێواندووە، لە بەرئەوە مافی تۆڵەسەندنەوە (القصاص) دوو ڕووی هەیە:

لەلایەکەوە پاراستنی گیانی تاکەکەس، لە لایەکی دیکەوە پاراستنی ئاسایشی کۆمەڵگە.

بەم مافە دەوترێت مافی هاوبەش، واتە هەم تاکەکەس بۆی هەیە داوابکات گیانی و ژیانی پارێزراوبێت، هەم کۆمەڵگەش بەگشتی دەتوانن داوابکەن ئەوانەی ئازاری خەڵك دەدەن و خەڵك دەکوژن و ئاسایشی کۆمەڵگە تێکدەدەن سزابدرێن، لەبەرئەوە باسکردن و پۆلێنکردنی مافەکان بەمشێوەیە لە کتێبە فقهییەکان و ئوصولییەکاندا زۆر بەجوانی باسکراوە. ئەوەی کە لێرەدا مەبەستمانە تەنها ئاماژەیەکی خێرایە بۆ دابەشکردن و پۆلێنکردنی ئەو مافانە.

مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ، مافگەلێکی بنەڕەتیین و بۆی جێگیرکراوە و داکۆکی لەسەرکراوە، کە ئێستا باسی دەکەین، بەگەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی ماف کە بە پلەی یەکەم قورئانی پیرۆزە، ئینجا فەرمودەکانی پێغەمبەر(د.خ):

یەکەمین‌ماف: مافی ژیانە، ئەمە مافێکی بنەڕەتییە نەك ژیانێکی کولەمەرگی! ژیانێکی شایستە بەمرۆڤ، ژیانێك کە لە ڕاستیدا پێیبوترێت ژیان، نەك ئەو ژیانەی کە (هەژاری موکریانی) دەڵێت:

ئەی مردن لە کوێی ... ژیان کوشتمی

جۆرە ژیانێك هەیە بەڕاستی مەرگە، وەك خوای پەروەردگار لە سورەتی (المائدة)دا بەدەق دەفەرموێت: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً﴾ المائدة:٣٢. هەرکەسێك، کەسێك بکوژێت بەناحەق - واتە تەماشای شوناس‌و ناسنامەکەی نەکراوە و نەوتراوە ئەگەر فلان دینی هەبێت یان ئەو دینەی هەبێت یان ئەو مەزهەبەی هەبێت، نەخێر -، هەرکەس کەسێك بکوژێت وەك ئەوەوایە هەموو مرۆڤایەتی کوشتبێت، هەرکەسێکیش مرۆڤێك بژیەنێت وەك ئەوەوایە هەموو مرۆڤایەتی ژیاندبێتەوە، تەماشابکە خوای پەروەردگار لە ڕوانگەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە هەموو مرۆڤایەتی لە یەککەسدا کۆدەکاتەوە، بەکوشتنی ئەوکەسە هەموو مرۆڤایەتی دەکوژرێت، واتە بایەخەکانی مرۆڤایەتی دەکوژرێت، هەموو مرۆڤەکان دەکەونە ژێرپرسیارەوە: چۆن ڕێگەتاندا کەسێك بکوژرێت، لەبەرئەوە زۆر تەعەجوب دەکەین کە زۆربەئاسانی دەبینین لە تەلەفزیۆندا خەڵکێکی زۆر دەکوژرێت، مانای وایە هەموو مرۆڤایەتی دەکوژرێت، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (د.خ) هاتووە کە دەفەرموێت

کوشتنی هیچ کەسێك دروست نییە، مەگەر لە سێ حاڵەتدا: یەکێك کەسێکی کوشتبێت بەناحەق دەبێت بکوژرێتەوە، یەکێك هاوسەرگیری کردبێت و هەستێت بەکاری داوێنپیسی، یەکێك هەڵگەڕابێتەوە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامو وازی لە کۆمەڵ هێنابێت و دوژمنکاری بکات لەگەڵ مسوڵمانانندا، ئەوەش تاوانێکی گەورەیە. کەواتە مافی ژیان ـ بەپێی ئەم دەقانە ـ مافێکی بنەڕەتییە و لەسەر بناغەی ئەومافی ژیانەیە کە مافەکانیتر جێگیردەبن.

دووەم: مافی یەکسانبوون، قورئانی پیرۆز پێش هەموو بەرنامە و یاسایەکی دیکە ئەو مافی یەکسانبوونەی سەلماندووە کە مرۆڤەکان یەکسانن، لە ڕوی مرۆڤایەتییەوە یەکسانن و هاوبەشی یەکن، خوای پەروەردگار هەموویانی لە یەك کەس دروستکردووە، وەك لە سورەتی (الحجرات)دا باسیکردووە کە ئەویش سورەتێکی مەدەنییە، لە ئایەتی(١٣)دا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ﴾ الحجرات:١٣، بابەتی بوونی هۆزو تیرەو قەبیلەی جیاواز ئەمە شتێکی زۆر سروشتییە، ئەمە بڕیارێکی خواییەو دەستی مرۆڤی تیانییە، بۆچی؟ ﴿لِتَعَارَفُوا﴾ بۆ ئەوەی یەکتربناسن، بۆ ئەوەی کە مەجالی یەکترناسینتان هەبێت، مەجالی چاکەکردنتان هەبێت لەگەڵ یەکتری، چاکەبکەن لەگەڵ یەکتری، ئاگاتان لە عورفی یەکتری بێت، یەکتری بناسنەوە، ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ الحجرات:١٣. کە

ئەم دەقەمان هەبێت مەجالی ئەوەی تیادایە کە گەلێك، مەزهەبێك، خۆی بەگەورەتربزانێت لە گەل و مەزهەبێکیتر، گروپێك خۆی بەگەورەتربزانێت لە گروپێکیتر، فیکرەیەك خۆی بەگەورەتربزانێت لە فیکرەیەکی دیکە، توێژێك خۆی بەچاکتربزانێت لە توێژێك، لەسەر ئەم بنەما سەرەکییە چەند لقو پۆپێك دەبێتەوە، یەکەم مرۆڤەکان یەکسانن لە مافە سەرەکییەکاندا، بۆ نمونە ئەگەر لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا کەسانێك هەبن بڕوایان بەئیسلام هەرنەبێت، بڕوایان بەقورئان و بەئیسلام هەرنەبێت، کە ئەم دووانە خۆشەویسترین شتن لای مسوڵمان، پێغەمبەر خۆشەویسترین کەسە و نـمونەی باڵایەتی، کەسێکیش باوەڕی بەومەسەلەیەی تۆ نییە، بەڵام خوای پەروەردگار حەقی ئەوەی داوەتێ کە باوەڕی بەئاسایشو بەجێگیربوونە و لە پەنای تۆدا بژی، تەنانەت ڕێگەی لێنەگریت، دەبێت چاکەی لەگەڵ بکەیت دەفەرموێت: ﴿لاَ يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ الممتحنة:٨، واتە خوا ڕێگریتان لێناکات سەبارەت بەوکافرانەی شەڕتان لەگەڵدا ناکەن و شەڕتان پێنافرۆشن و لەسەر ئاین و لە وڵاتی خۆتان دەرتانناکەن، کە ئێوە چاکـبـن لەگەڵیانداو دادپەروەریش بن، ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾، ئەی ئەوکەسانەی کە شەڕتان لەگەڵ دەکەن؟، هەیە باوەڕی بەئیسلام نییەو شەڕیشتان لەگەڵ دەکات، لە بارەی ئەمانەوە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ

فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم﴾ النحل:١٢٦. دەفەرموێت تەنانەت ئەگەر یەکێك شەڕی لەگەڵتان کرد، نابێت ئێوە ڕەوشتێك بەکاربهێنن کە پێچەوانەی ئەم راستییە بێت، نابێت هەڵسوکەوتێك بەکاربهێنن کە لە ناویانبەرن و تەفروتونایان بکەن، ئەوان چی بەکاردەهێنن دژی ئێوە، ئێوەش هەمانشت بەکاربهێنن, بەڵام ئەگەر بەکاریشی نەهێنن: ﴿وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرينَ﴾ النحل.١٢٦، ئەگەر ئارامبگرن لە بەرانبەریاندا، کە ئومێدی ئەوەتان هەبێت کە ئەوان چاکببـن، ئەوە چاکترە بۆ ئێوە، ﴿وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلاَّ بِاللّهِ وَلاَ تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلاَ تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ۝إِنَّ اللّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾ النحل:١٢٧-١٢٨، واتە مرۆڤەکان یەکسانن و لەسەر بنەمای ئەو یەکسانییە دەبێت بەدادپەروەرانە لەگەڵیاندا بژیت، بەچاکە لەگەڵیاندا بژیت.

# پرسیارەکان

**خوێندکارێك١:** باسی مافی تاكو مافی گشتی و مافی ئاوێتەت کرد، یەکێك لەو مافانە مافی ژیان هەموو کەسێك مافی ژیانی هەبێت، دەبێت بژی، واتە مافی ژیانی هەیە، تەنها سێ کەس نەبێت، پیری زیناکەر، کەسێك خۆی بکوژێت، هەڵگەڕاوە، پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە کە ئایا بۆچی هەڵگەڕاوە بکوژرێت؟

**د.صەباح:** ئەمە یەکێکە لەوپرسیارانەی کە زانا مسوڵمانەکان هەوڵیانداوە وەڵامی بدەنەوە، ئەو کەسەی کە هەڵگەڕاوەتەوە ماوەیەك لە دینی ئیسلام تێگەیشتووە و دەشزانێت کە حوکمی هەڵگەڕانەوە چەندقورسە، دوای ئەوەی کە زۆر بەڕوونیو بەجوانی بەڵگەی ڕاستییەکانی بۆ باسدەکەن، (إتمام الحجة)، دوای ئەوەی کە کۆمەڵێك زانا لەگەڵی دادەنیشن بزانن بۆچی وازی لە ئاینی ئیسلام هێناوە، چونکە هەرچی چاکەی ئاینەکانیترە لە ئیسلامدا هەیەو هیچ کێشەیەکیشی تیادانییە، ئەو زاناو شارەزایانە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەن. ئەم حوکمە لە ڕاستیدا تەنها حوکمێکی تیۆری بووە و بەدرێژایی مێژووی ئیسلام نەمانبینیوە کەسێك کوژرابێت تەنها لەبەرئەوەی کە وازی لە ئیسلام هێناوە کە لە ماڵی خۆیدا دانیشتبێت و نە کتێبی نوسیبێت دژی ئیسلام، نە هەڵمەتێکی دابێت دژی ئیسلام، نە

دەستی تێکەڵکردبێت لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا. تەنها لەبەر بیروبڕوایەکی دەروونی خۆی، هیچ کەسێك نەکوژراوە بەبەڵگەی هەڵگەڕانەوەی، بەڵام ئەم حوکمە لەناو فوقەهاکاندا باسکراوە و کۆڕی زانایانی لەسەرگیراوە، چونکە:

بۆناشیرینکردنی هەڵگەڕانەوەیە، واتە کەسێك جوانییەکانی ئیسلام ببینێت ئەو هەموو خێروبەرەکەتەی کە لە ئیسلامدا هەیە و هەموو ئەو شاکارانەی کە لە ئیسلامو لە شارستانیەتی ئیسلامییدا هەیە نەبینێت، ئایا کارێکی ژیرانەیە کەسێك واز لەم ئاینە بهێنێت و بچێتەسەر ئاینێکی دیکە؟

لەم ماوەیەدا لە یەکێك لە گۆڤارەکاندا کوردێك بووە بەمەسیحی و کەنیسەیەکی کوردی دادەنێت! دەبێت ئەم کەسە بانگبکەیت بڵێیت تۆ چ ڕەخنەیەکت لە ئیسلام هەیە، هەتا ئێستاش مەسیحییەکان لەم هەلومەرجە ناسکەدا پێیاننناخۆشە کەسێك ببێت بەمەسیحی، چونکە دەزانن ئەمە جگە لە مەبەستی مەسیحیبوون مەبەستێکی دیکەی هەیەو مەبەستێکی ئاینی لە پشت بابەتەکەوە نییە، یان ڕقی ئاینییە یان غەرەزی سیاسییە یان دەستێکە، لەبەرئەوە بەڕاستی شەرعزانەکان ئەوەندە بەتوندی ئەم حوکمەیان داوە لەسەر هەڵگەڕاوە، پەیوەندی بەناشیرینکردن و قێزەونکردنی مورتەدبوونەوە هەیە، وەرگەڕان وەك ئەوە وەهایە یەکێك خوای پەروەردگار بیخاتە بەهەشتەوە و بڵێت من دەمەوێت بچمە دۆزەخ، وەك ئەوەی یەکێك لە تەلارێکی بەرزی خۆشدا

بێت بڵێت من حەزدەکەم بچم لە ژێرزەمینەیەکی تاریك‌و ترسناکدا بژیم، یان وەك ئەوەی کەسێك جل‌وبەرگێکی جوانی بدەیتێ بڵێت من حەزم لەو جل‌وبەرگە نییە و پۆشاکێکی پیس‌و دڕاوم بەسە.

پاشان بەدرێژایی مێژووی ئیسلام نەمانبینی کەسێك، تەنها لەبەرئەوەی کە وەك فیکرە باوەڕی بەئیسلام نەمابێت، کوژرابێت، ئەگەر کەسێکی وابووبێت کۆمەڵێك زانایان بۆ بانگکردووە و قسەیان لەگەڵدا کردووە، پاشان ڕەنگە گومانەکەی خۆی بۆ دەرخستبێتن و قسەیان لەگەڵ کردبێت و بڕوای بۆ دروستبووبێتەوە، کەس لەسەر ئەو جۆرە گومانە نەکوژراوە، ئەوانەی کە لە مێژوودا نوسراون کە لە ڕاستیدا بەناوی وەرگەڕاوە کوژراون لە ڕاستیدا لە پاڵ وەرگەڕانەکەدا شتێکیتریان کردووە پێچەوانەی یاسای ئەوکاتەی دەستەڵات و کۆمەڵگە بووە، یان شەڕیان لەگەڵ مسوڵمانان کردووە، یان دژایەتی ئیسلامیان کردووە بەنوسینی پەرتووك، کە ئەو نوسینانەش نەك لەسەر بنەمای زانستی بەڵکو لەسەر ڕق‌وکینەو بڵاوکردنەوەی گەرد بۆ سەر دڵ‌ودەرونەکان بووە، ئەگینا ئەوە حوکمێکە زیاتر بۆ ناشیرینکردنی ڕێگەی کەسی هەڵگەڕاوەیە، هەندێك لە زانا مسوڵمانەکانیش لەم دواییانەدا هاتوون وردەکارییەکی زیاتریان کردووە لە حوکمی وەرگەڕاوەداو دەڵێن: ئەگەر کەسێك تەنها مورتەدبێت وەك کەسێك‌و تاکەکەسێك لە دەرونی خۆیدا، ناکوژرێت، بەڵام ئەگەر بوو بەگروپێك‌و

مەترسی دروستکرد لەسەر گەلو نەتەوە و جەماوەر، ئەوکاتە لەسەر ئەم جەنگە دەکوژرێت و حەقی ئەوەی هەیە کە لێپرسینەوەی لەسەر بکرێت، لە هەمانکاتیشدا مەجالی ئەوەی پێدەدرێت کە بیربکاتەوە و، قسەو هەڵسوکەوت و بیروبۆچوونەکانیشی هەڵدەسەنگێنن لە شەرعدا، ئەگەر لە ٩٩٪ مانای کوفربێت بەڵام لە ١٪ قسەکانی یان کردەوەکانی مانای باوەڕی لێوەربگیرێت، هەر بەمسوڵمان دەژمێردرێت و حسابی بڕواداری بۆ دەکرێت و حوکمی وەرگەڕاوەی بەسەردا ناچەسپێت، لە کتێی زۆربەی شەرعزانەکاندا ئەم قسەم خوێندووەتەوە کە دەڵێت: (ئەگەر یەکێك کارێکی کرد یان قسەیەکی کردو قسەی هیچ مانایەکی هەڵنەدەگرت جگە لە کوفر، ئەوجا پێیدەوترێت مورتەد، بەڵام ئەگەر یەك ڕووی هەبوو کە بتوانین مانای ئیمانی لێبکەین، ئەوکاتە بەمسوڵمانی دەزانین و حوکمی وەرگەڕاوەی بەسەردا ناچەسپێنین)، لەبەرئەمە بنەماییترین ماف بەنیسبەت مرۆڤەوە لە کۆمەڵگای ئیسلامییداو یەکەمین ماف، مافی ژیانە. دووەم مافی یەکسانبوونیەتی بەهاوڕەگەزەکانی خۆی.

# هزری ئیسلامی دەربارەی مافی مرۆڤ

# تایبەتمەندییەکانی مافی مرۆڤ لە ئیسلامدا

لەم بەشەدا باسی مافی مرۆڤ دەکەین.

خوای پەروەردگار داوایکردووە لە مسوڵمانان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بەرانبەر باشبێت، تەنانەت لەگەڵ ئەو کەسانەشدا کە ئاینیان لەگەڵتاندا جیاوازە، تەنانەت ئەگەر ئەوان خراپیش بوون خۆیان سەپاند بەسەر ئەماندا یاخود مامەڵەیان خراپ بووو دوژمنکارییان دەکرد، خوای پەروەردگار هەڵبژاردنێکی خستووەتە بەردەمیان کە ئارامگربن، چونکە باشترین پاداشت ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی کە ئارامدەگرن، ئینجا دەفەرموێت:﴿وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلاَّ بِاللّهِ وَلاَ تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلاَ تَكُ فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ﴾ النحل:١٢٧. واتە فێری ئەمەمان دەکات کە بێگومان ئەو کەسەی ئاینی جیاوازە لەگەڵ تۆ، دەبێت چاوەڕوانی ئەوەبکەیت پیلانت بۆ دابنێت، فێڵت لێبکات، چەواشەکارییت لەگەڵدا بکات و بیەوێت لە پشتەوە خەنجەرت لێبدات، بەڵام خوای پەروەردگار فەرماندەدات بەپێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)و دەفەرموێت: خۆت مەخەرە تەنگییەوە لەو پیلان و فێڵوتەڵەکانەی کە ئەوان دایانناوە، بۆچی؟ بەڵگەی چییە؟ ﴿إِنَّ اللّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّالَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ﴾ النحل:١٢٨. مسوڵمانان وێڕایی مسوڵمانێتییان دەبێت ئەم دوو

سیفەتەیان هەبێت: خۆیان بپارێزن لە حەرام، دووەم چاکەکار بن لەگەڵ هەمووکەس، چاکەکردن لەگەڵ هەمووکەس ببێت بەدورشمو سومبولتان، تەنانەت ئەگەر لە جەنگی مسوڵمان و نامسوڵماندا کۆمەڵێك لەنامسوڵمانان بەدیلی کەوتنە دەستی مسوڵمانان، قورئانی پیرۆزو شەریعەتی ئیسلام فەرماندەدات کە مافی ئەو دیلو بەندییانەش بپارێزن، دەفەرموێت: ﴿فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءحَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا..﴾ محمد٤. واتە ئەم بابەتە ئێستا لە یاسای نێودەوڵەتییدا گرنگییەکی زۆری هەیەو ڕەگوڕیشەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، ئەویش بەباشی مامەڵەکردن لەگەڵ بەندییو دیل، لە ڕاستیدا ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە کە مسوڵمانان و نامسوڵمانان لە یاسای ئیسلامدا وەك یەك بن، چاکترین بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە کە دەگێڕنەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر) کابرایەکی مسوڵمان (توعمەی کوڕی ئوبەیرق)، چوو قەڵغانێکی لە ماڵی دراوسێکەی دزی کە ناوی (قەتاتەی کوڕی نوعمان) بوو، بەڵام چۆنی دزی؟ لەناو تورەکە(فەردە)یەك ئاردا شاردبوویەوە، ئاردەکەی هەڵگرتبووو ڕۆیشتبوو، توورەکە ئاردەکە کونی تێدابوو، هەتا ڕۆیشتبووە ماڵەوە ئاردەکە ڕژابوو، دواتر ڕۆیشتبوو ئاردەکەی لە ماڵی جولەکەیەکدا شاردبوویەوە، جولەکەکەش ئاگای لەمە نەبوو، دوایی ئەم کابرایە هەرگومانی لەسەربوو کەس‌وکارەکەی هاتن سوێندیان خوارد لەسەرئەوەی کە ئەو دزیی نەکردووە و وتیان بڕۆن بزانن قەڵغانەکە لە کوێدایە، بەشوێنی ئاردەکەدا ڕۆیشتن چونە

ماڵی جولەکەکە، قەڵغانەکەیان لە ماڵی جولەکەکەدا دۆزییەوە، بەپێی بەڵگەی ماددیی‌و بەپێی زانستی تاوان، جولەکەکە دزی کردووە، چونکە سپەر(قەڵغان)ـەکە لە ماڵی جولەکەکەدا دۆزراوەتەوە، ئینجا دزە حەقیقییەکەش سوێنددەخوات دەڵێت من دزیم نەکردووە، خۆیشی سوێنددەخوات کە دزیی نەکردووە، هەموو بەڵگەکان لەسەرئەوەیە کە جولەکەکە دزیی کردووە، مادام جولەکەشە زۆر نزیك بوو لەوەی کە پێغەمبەر دەستی ببڕێت، (دیارە قەڵغانەکە پارەیەکی زۆری کردووە)، بەڵام لێرەدا وەحی خودایی هاتە ناوەوە و خوای پەروەردگار فەرمووی: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللّهُ وَلاَ تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيماً﴾ النساء١٠٥، ئەم ئایەتە ئەوەی سەلماند کە مسوڵمان و جولەکە لە بەرامبەر یاسای خوادا وەك یەکن، خوای پەروەردگار بەپێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت ئێمە پەرتووکمان بۆ ناردویت بۆ ئەوەی کە بە حەق حوکم بکەیت لە نێوان خەڵکدا، بەچی حوکم بکەیت؟ بەوەی کە خودا فەرمانبدات، ﴿وَلاَ تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيماً﴾ النساء١٠٥. بەرگری لە مرۆڤی ناپاك (خائین) مەکە، بامسوڵمانیش بن، دیارە پێغەمبەر (د.خ) ویستوویەتی سزای جولەکەکە بدات بەپێی هەبوونی شایەت و دەفەرموێت: ﴿وَاسْتَغْفِرِ اللّهَ إِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُوراً رَّحِيماً﴾ النساء:١٠٦. تەنانەت بۆ ئەوەیش کە ویستووتە سزای ئەو کەسە بێتاوانە بدەیت لە ناخەوە واتزانیوە کە ئەو دزە، دزیش نەبووە، دەبێت داوای لێبوردن لە خوابکەیت ﴿وَلاَ تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّاناً أَثِيماً﴾ النساء١٠٧. کەواتە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە

دەریدەخات کە مسوڵمان و نامسوڵمان لە ڕوانگەی شەریعەتی ئیسلامییەوە یەکسانن لە بەرامبەر یاساداو ئەمەش مافی یەکسانبوونە، لە **مافە دادگەری و یەکسانییەکاندا** نامسوڵمانیش بۆی هەیە سکاڵا بکات، وەك مسوڵمان بۆی هەیە داوای مافی خۆی بکات نامسوڵمانیش بۆی هەیە داوای مافی خۆی بکات، ئەمە بەدەقی قورئان لە بەرپرسیارێتی سزاداندا و لە هەموو لێپرسراوێتییەکاندا هەیە، چونکە ئەم بنەمایەی (لاجريمة ولاعقوبة إلا بنص)، کە هەموو یاساکانی دونیا شانازی پێوەدەکەن لە قورئاندا دەستکەوتووە ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ الإسراء:١٥. خوای پەروەردگار دەفەرموێت ئێمە سزای هیچ گەلێك نادەین هەتا پێغەمبەرێك نەنێرین، پێغەمبەرەکەش حەقیان بۆ ڕووندەکاتەوە، ئینجا کە بۆی ڕوونکردنەوە بیانوویان نامێنێت، ئینجا فەرمانەکان و ڕێگرییەکان و ڕێنماییەکانیان فێردەکات، کە ئاینیان زانیی و لێیتێگەیشتن، ئینجا ئەگەر بەگوێی خوداو پێغەمبەریان نەکرد، خوای پەروەردگار سزایان دەدات، کەواتە ئەمە مافێکی گرنگە کە یەکسانییە لە مافە یاسایی‌و دادوەرییەکاندا (المساوات في الحقوق القانونية والقضائية)، لە مافە سیاسییەکاندا لەم جیهانەدا بەڕواڵەت وەك یەکن و هەمووکەس مافی هەیە، بەڵام تۆ بڕۆ هەندێك وڵاتەوە هەر بەهۆی ئەوەی خەڵکی ئەو وڵاتە نیت لە زۆر ماف بێبەشیت، لە زۆر مافی سیاسی بێبەشیت، لە یاسای زۆر لە وڵاتاندا نوسراوە ئەو کەسەی کە دەیەوێت ببێت بەبەڕێوەبەر، دەبێت باوكو باپیریشی خەڵکی ئەو وڵاتەبێت، بەڵام لە ئیسلامدا وانییە، مسوڵمانان بۆخۆیان

هەموو مافە یاساییەکانیان هەیە و بۆیان هەیە حاکمی خۆیان هەڵبژێرن و چاودێرییان لەسەری دانێن، بۆیان هەیە موحاسەبەیان بکەن. ئەمڕۆ پێیدەوترێت ڕای گشتی، پێیدەوترێت هێزی ڕۆژنامەگەری، بۆ؟ چونکە ئەگەر دەستەڵاتدار چاوێکی بەسەرەوەنەبێت و هێزێك نەبێت لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکات، ئەگەر هێزی جەماوەر لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەیەکدا، لە گۆڤارەکاندا، لە سایتەکاندا، بەرجەستە نەبێت، حاکمی چاوسوور ئامادەنییە ئازادی بدات بەخەڵك، ئامادەنییە بەخۆیدابچێتەوە، لەبەرئەوە هەندێك ئایەت هەیە کە باسی ئەم بابەتە دەکات و هەر لە مەککەش هاتووەتەخوارەوە، مافی سیاسی دەدات بەهەموو خەڵك، لە سورەتی شورادا دەفەرموێت: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ الشوری٣٨. واتە ئەمە بووە بەتایبەتمەندییەك بۆ کۆمەڵگەی مسوڵمانان کە کاروبارو فەرمان و نەهییان بەڕاوێژبێت، نەك کەسێك بێت لە بری خەڵکەکە بیربکاتەوە و قسەبکات، دەبێت خەڵك بەشداربێت بەکردەیی، ئەگینا تۆ لە ڕۆژی هەڵبژاردندا کۆمەڵێك خەڵك دەبەیت بۆ دەنگدان لەسەر فۆڕمێك کە خۆت داتناوە و دروستتکردووە قەڵەمێکی دەدەیتێ‌و دەڵێیت سەحێکی لێبدە، یان هەڵەیەکی لێبدە، ئەمە بەشداریی جەماوەریی پێناوترێت، ئەمە کەمترین بەشدارییە بۆ جەماوەر، دەبێت ئەم بەشداربوونە بەشدارییەکی گشتی بێت، پێویستە ئاگایان لە هەنگاو بەهەنگاوی ئەوحاکمە هەبێت، بەیەکسانیی لە نێوان ژن و پیاودا، کە لە بناغەدا لە ئیسلامدا یەکسانن، وەك یەك مرۆڤن، وەك یەك بەڕێزن، دەبێت وەك یەك چاودێریی بکرێن، هەردووکیان

لێپرسراون لە ڕووی بەڕێوەبردن و مەدەنیو تاوانەوە، ئەمە مافێکی بنەڕەتییە، بەڵام هەندێك جیاوازییان هەیە کە ئەوانەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی ئەم دووڕەگەزە، چونکە بمانەوێت و نەمانەوێت هەندێك جیاوازییان هەیە لە بونیادی لەشو لە ڕووی پسپۆڕییانەوە، ئێستاش ئەو توێژینەوانەی کە دەکرێن دان بەوەدادەنێن، چونکە هەموو کەسێك دروستکراوە بۆ ئەو ئەرکەی کە بۆی دروستکراوە.

## مافی ئازادی

دوای مافی یەکسانبوون مافی ئازادی هەیە، ئازادبوون لە بیروڕادا:

**یەکەم:** باسی ئەوەدەکرێت کە دەبێت هەرکەسێك هەر ئاینێکی هەبوو ئازادبێت و کەس بەزۆر ئاینێکی بەسەردا نەسەپێنێت، ئەمە ئەوە ناگرێتەوە یەکێك مسوڵمان بوو هەر دەبێت مسوڵمان بێت، بۆچی؟ چونکە وەك لە باسی ڕابردوودا باسمانکرد کە مسوڵمانێتی، بوونە لە ناو کۆشكو تەلاردا، هەموو خێرو خۆشییەکی دین و دونیاو ڕواڵەتی و پەنهانی لە ناو ئیسلامدا هەیە، واتە مەعقول نییە تۆ یەکێك هەنگوینی بۆ بەریت و بڵێت من هەنگوینم ناوێت و ژەهرم دەوێت، ئەوکەسەی کە ژەهری پێباشترە لە هەنگوین، ئازادنییە، دەبێت هەر هەنگوینی بدەیتێ، تا دوایی بیردەکاتەوە، نەخۆش ئازاد نییە لەوەی کە بڵێت من ڕقم لەودەرمانەیە نایخۆم، نابێت نەشتەرگەرییم بۆ بکەن و دەشمەوێت چاکببمەوە، شتی وانییە، بەڵام ئەگەر یەکێك لە بنەڕەتدا ئاینێکی هەیە

دەتوانێت ئاینەکە نەگۆڕێت، بۆچی؟ چونکە خوای پەروەردگار بەدەقێکی موحکەم دەفەرموێت: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ البقرة٢٥٦. زۆرکردن و بەتۆپزی، لە وەرگرتنی ئایندا نییە و مرۆڤ دەبێت لەسەر ڕێگەی عەقڵ بڕوات، من لێرەدا قسە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکەم کەواز لە ئیسلام دەهێنن و دەڕۆنە ئاینێکیتر، بابێین بەراورد لە نێوان ئاینەکاندا بکەین، چیت دەوێت کە لە ئاینەکانیتردا هەبێت و باشبێت و لە ئیسلامدا نەبێت؟ بەپێچەوانەوە هەندێك ناڕەحەتی و قورسایی لە ئاینەکانیتردا هەیە، لە ئیسلامدا نییە، جارێك ئاینی جولەکە بانگەوازی کەس ناکات بۆ ئەوەی بچێتە ئاینی جولەکەوە، لەبەرئەوەی دەڵێن ئەم ئاینە تایبەتە بەنەوەی ئیسرائیل، ئاینێك بۆ گروپێکی تایبەت ئاین نییە، بۆ ئەوکەسانە کە بە نەژادو ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم، تەنانەت بۆ ئەوانە نییە کە لە نەوەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمن ببن بەیەهودی، ئەگەر یەکێك ببێت ڕێگری لێناکەن، بەڵام هیچ پێیانخۆشنییە، کەسێك دەبێت بەمەسیحی وەرە بزانین ئەو بەها بەرزانەی کە لە ئاینی مەسیحییەتدا هەیە لە ئیسلامیشدا هەیە یان نا؟، بەڵام ئەو بیرو کەموکووڕییانەی لە بیری مەسیحییەتدا هەیە لە ئیسلامدا نییە، کەواتە ئەو کەسەی کە مسوڵمانە مەسیحییشە، بەڵام مەسیحییەکی ڕاستەقینە، چونکە ئەوکەسەی کە مسوڵمانە دەبێت باوەڕی بەعیساو بەپیرۆزیی مەریەم هەبێت، باوەڕی بەوەهەبێت کە عیسا ڕوحی خوایە، کەلیمەی خوایە، دەبێت بەپیرۆزییەوە ناوی ببرێت، دەبێت پارێزگاری لە پاکێتی مەریەم بکات،

کەواتە مسوڵمانبوون لە ناوەڕۆکیشدا مەسیحییەتیشی تیادایە، خۆشەویستیی عیساو موساو مەریەمو ئەمانەی هەموو تێدایە، ئەوکەسەی کە مەسیحییەو دەبێت بەمسوڵمان شتێك دەخاتە سەر کۆگای بڕوای خۆی، بەڵام ئەوکەسەی کە مسوڵمانەو دەبێت بەمەسیحی لە کۆگای بڕوای خۆی کەمدەکاتەوە، واتە چۆن مەعقول نییە کابرایەکی دەوڵەمەند بڵێت من بازرگانی دەکەم بەڵام لەوسەرەوە کۆمەڵێك لە سامانەکەی بەفیڕۆبدات، بەڵام ئەوکەسەی کە دەیەوێت کەسابەت بکات سەروەت بخاتەسەر سەروەتەکەی، ئەمە شتێکی باشە، ئەوکەسەی کە بانگی دەکەیت بۆ ئیسلام خۆ داوای لێناکەیت واز لە خۆشەویست و پێشەواکەی بهێنێت، چونکە لە ناو ئیسلامیشدا دەبێت محەممەد (درودی خوای لەسەر)و عیساو موساو ئیبراهیمت خۆشبوێت (سەلامی خوا لەسەر هەموویان)، دەبێت خۆشەویستی بۆ هەموویان هەبێت، بەڵام ئەوکەسەی کە واز لە ئیسلام دەهێنێت پایەیەك لە پایەکانی ئاین دەڕوخێنێت، لە پێناوی ئەوەی ژورێکی هەبێتماڵێکی گەورە دەڕوخێنێت، بەڵام ئەوکەسەی کە ماڵێکی دەبێت کۆمەڵە ژورێکیتری دەبێت، لەبەرئەوەیە مەولانای ڕۆمی دەفەرموێت (ئەوکەسەی کە باوەڕی بەمحەممەد (درودی خوای لەسەر) هەبێت باوەڕی بەوانیتریش هەیە، ئەوکەسەی کە (سەد)یشی هەبێت (نەوەد)یشی هەیە، (هەشتا)شی هەیە، (حەفتا)شی هەیە، بەڵام ئەوکەسەی کە(حەفتا)ی هەبێت (هەشتا)ی نییە، کە(هەشتا)ی هەبێت (نەوەد)ی نییە،

كە(نەوەد)ی هەبێت (سەد)ی نییە، واتە ئەم محەممەدە (درودی خوای لەسەر) تەواوكەری كەمالاتە.

لەئیسلامدا مافی قسەكردن هەیە و دەتوانیت گفتوگۆبكەیت، قورئان بۆ خۆی ئەوانەمان بۆ باسدەكات، قسەی فیرعەونی تیادایە، قسەی شەددادو نەمرورد، ئەوانەی كە دوژمنی خوابوون قسەكانیان لە قورئاندا ماوەتەوە، واتە ئەوانیش قسەیان هەبووە، بەلاّم قسەكەیان بێلۆجیك بووە، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ النحل١٢٥.

یان دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَعْلَمُونَ﴾ التوبة:٦. واتای چی ئەگەر یەكێك بێباوەڕیشەو پەنای هێناوە بۆ تۆ، تۆ پەنای بدە؟ مەڵێ تۆ بێباوەڕیت پەنات نادەم؟ نا، پەنای بدە هەتا ئارامبێتەوە و كەشێكی فیكریی بۆ دروستببێت و بێتە ناو مسوڵمانانەوە ﴿حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ﴾ التوبة٦. نافەرموێت (حتى يُسمع) دەفەرموێت: ﴿حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ﴾ بۆ چی؟، بۆ ئەوەی كە خۆی بەویستی خۆی ببیستێت، بەزۆر پێیمەبیستێنە! ئەگەر كۆمەڵگە كۆمەڵگەیەكی مسوڵمان بێت، كۆمەڵگەیەكی پارێزەری ماف بێت، خۆی هێزێكی گازندی وای دەبێت كە خەڵك ڕادەكێشێت ﴿حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ﴾ التوبة٦. جا دەگونجێت كابرا ئیسلامی بەدڵ بێت و بمێنێتەوە، دەشگونجێت بەدڵی نەبێت و بگەڕێتەوە﴿ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ﴾ التوبة٦. پێویستە لەسەرت بیگەڕێنیتەوە ئەوشوێنەی كە بە ئاسایش تێیدادەگەڕێت.

## مافی موڵکایەتی

لەئیسلامدا مافی موڵکایەتی پارێزراوە بۆ هەموو کەسێكو گرنگییەکی زۆریش بەم مافە دراوە، هەموو یاساکان بۆ ئەوەیە کە ئەم مافە بپارێزرێت. هەموو ڕێگاکانی کاروکاسبی ناڕەوا، ئیسلام یاساغی کردووە و ڕێگری لێکردووە، وەك فێڵکردن و سووخواردن و قۆرخکردن، لەبەرئەوە سزای داناوە بۆ ئەو فێڵانە.

## مافی فێربوون

بەداخەوە ماوەیەکی زۆر کۆمەڵگەی ئیسلامی لە مافی خوێندن و فێربوون بێبەشکرابوو، ئەویش دەستێکی لە پشتەوەبوو، بەڵام ئێستا سەیردەکەین ئاسۆکانی خوێندەواری لەبەرچاوی هەمووکەسێکدا کراوەتەوە و هیوادارین ئەو ئاسۆیە زیاتربکرێتەوە.

پێویستە ئەم فێربوونەش فێربوونێکی شایستەبێت، نەك تەنها بنوسێت و بخوێنێتەوە، دەبێت فێری ئەوەی بکەین کە دەنوسێت جوان بنوسێت، کە دەخوێنێتەوە جوان بخوێنێتەوە، چونکە ئەمڕۆ ووشە کاریگەرییەکی زۆری هەیە، تەنانەت ئێستا شارستانییەتی پێیدەوترێت شارستانییەتی ووشە، شارستانییەتی هێماو کۆدو پاسۆرد، شارستانییەتی خوێندنەوە، چەندێك دەتوانیت بخوێنیتەوە ئەوەندە خوێندەوارییت بەهێزدەبێت، چەندێك دەتوانی زانیاریت هەبێت ئەوەندە شارستانییەتەکەت لە پێشەوەیەو مرۆڤایەتییەکەت بەهێزدەبێت، کەواتە

فێربوون مافێکی گشتییە،و مافێکی هاوبەشە بۆ هەموو کەسەکان، لەبەرئەوە دەبێت لە کۆمەڵگەدا گرنگییەکی زۆربدرێت بەنوسین و زانین و خوێندنەوە و چاپکردن، چونکە لە ئیسلامدا فێربوون ئەرکێکی عەینییە بەنیسبەت شتە بناغەییەکانەوە و، بەنیسبەت شتە پێویستییەکانەوە واجبێکی کیفائیە[1]، واجبە لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا هەموو کەس زانیاری بەرامبەر خوای خۆی هەبێت بەپێی توانای خۆی، واجبە لە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامییدا هەموو پسپۆڕییەکان هەبێت، هەموو ئەوپسپۆڕییانەی کە ژیانی ئەمڕۆش پێویستیەتی، دەوڵەتیش لە سەرشانیەتی کەڕێگەکانی خوێندن ئاسانبکات بۆ ئەو خەڵکە، بەڵام لەسەر بنەمای بەرنامەو پەروەردەیەکی ڕاست و دروست، ئەوەی کە پێویستیی خوێندنێکی هاوچەرخە فەراهەمی بکات بۆ هەموو فێرخوازێك لە هەموو ڕەگەزەکان بەبێ جیاوازی، پاشان لە ئیسلامیشدا زانست هەر زانستی شەرعی نییە، هەموولایەنەکان و بوارەکانی زانست کە پێویست بن بۆ مرۆڤایەتی و بۆ ئاوەدانی و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنگەری، پێویستە لەسەردەوڵەت فەراهەمی بکات بۆ خەڵك.

[1]- پێشیدەوترێت فەرزی کیفایە، واتە ئەگەر کۆمەڵێك بەپێی پێویستی جێبەجێیان کرد، کۆمەڵگە گوناهبار نابێت، بەڵام ئەگەر بەپێی پێویست ئەنجامنەدرا یان کەس نەیکرد، ئەوا هەموو کۆمەڵگە تاوانباردەبێت.

## مافی کارکردن

واتە هەمووکەسێك مافی خۆیەتی کارێك بکات کە سوودی پێببەخشێت، کارێك بکات کە سوودی هەبێت، مرۆڤ مافی خۆیەتی چ کارێك هەڵبژێرێت کە لەگەڵ تواناو ویست و پسپۆڕی و حەزوئارەزووەکانیدا دەگونجێت، ئینجا مافی خۆیەتی لەبەرامبەر ئەوکارەیدا ژیانی بۆ دابینبکرێت، ئەو مافو دەرماڵەو ئیمتیازانەی کە دەدرێت بەوکەسە، بەدادپەروەرانە بێت، کاری زۆری لێنەکێشنەوە و پارەی کەمی پێبدەن، لە شوێنی کارکردنیدا ئارامشێکی دەروونی بۆ فەراهەم بکەن، نەوەك ئەوکەسەی کە دەچێت کاردەکات بەتۆپزی کاری پێبکرێت، گەرچی ئەوکارەی کارێکی بەخشندانەبێت یان ئەوکارەی خێری لێبکەوێتەوە بۆ کۆمەڵگە، ئینجا مافی خۆیەتی کە کاتی کارکردنەکەی دیاریبکرێت، پشووی حەفتانەو ساڵانەی هەبێت، لە بەرامبەر ئەوکارەشی کە دەکرێت دەبێت دەرماڵەی مەترسی بۆ سەرفبکرێت، دەگونجێت ئەوکەسە کەمئەندام ببێت، ئەمە هەموو لە ئیسلامدا زانایان لە کۆن و نوێدا باسیانکردووە و ئاماژەیان پێداوە.

## مافی ئاسایش

ئەمە لە هەمووی گرنگترە کە ئیسلام ئەو مافەی پێویست کردووە بۆ هەموو مرۆڤێك کە لە ڕووی دەروونییەوە لە ئاسایشدابێت، لە ڕووی جەستەییەوە لە ئاسایشدابێت و هەموو پێداویستییەکانی ژیانی بۆ دابینبکرێت لە خۆراكو پۆشاكو جێگای مانەوە، چونکە ئەگەر مرۆڤ ئەم

سێ شته بنەڕەتییەی هەبێت ناتوانێت هەستێت بەجێبەجێکردنی ئەرکەکان، چ ئەرکە ماددییەکان یان نیشتمانییەکان، چ ئەرکە نەتەوەییەکان، لەبەرئەوە لەم سۆنگەیەوە ژمارەیەکی زۆر یاساو ڕێسامان هەیە لە ئیسلامدا بۆ پاراستنی مرۆڤ و کەرامەت و پێداویستییەکانی مرۆڤ و ڕێگرتن لەوانەی کە دەستدرێژیی دەکەنەسەر، بۆ ئەوەی لەوپەڕی ئاسایشدا بژی.

## مافی پێکەوەنانی خێزان

پێکەوەنانی خێزان و ڕێگریکردن لە هەڵوەشاندنەوەی، مافێکیتری مرۆڤە، کە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی هـزری ئیسلامی و شەریعەتی ئیسلامی، تەماشای کتێبو بەرنامەکان بکە، ئەوەندەی کەئیسلام باسی مافی ژن و مێردایەتی دەکات، باسی مافی منداڵان دەکات، مافی منداڵ لەسەر باوکودایکو مافی باوکودایک لەسەر منداڵان و هەموو جۆرە مافێکی خێزانی، چ مافی ماددیی بێت یان مەعنەوی یان ئەدەبی بێت، مافی ماددیی ئەوەیە کەباوکودایک پێویستە منداڵەکانیان بەخێوبکەن، بەتایبەتی باوك، مافی ئەدەبی ئەوەیە کەپێویستە منداڵ ڕێزی باوکودایکیان بگرن، بەوەی کەباوکودایك هەرچییەکیان پێناخۆشبێت نەیکەن، تەماشادەکەین خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً﴾ الإسراء٢٣. بەباوکودایك مەڵێ ئۆف، تەنانەت ئۆفێکیان پێمەڵێ..!! واتە شتێك مەکە کەبێزاربن، جاریواهەیە باوکودایك بەقسەیەکی تۆ بێزاردەبن، جاریواهەیە

بەهەڵسوکەوتێك یان بەشێوەی جلـلـەبەرکردنت یان شێوەی ئەو پێڵاوانەی کە دەیکڕیت، یان بەهاوڕێکانت بێزاردەبن، دەبێت نەیکەیت، بەڕاستیی ئەمەش مافێکی گەورەیە، هەموو دەستەبەرکردنی ئەم مافانە و جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانە خێزان دەپارێزێت لە هەڵوەشاندنەوە، هەمیشەمرۆڤـ هەستدەکات لانەیەکی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لانەیە، کۆمەڵگە ماددییەکان وازیان لەم مافە هێناوە و پەراوێزیان خستوون، ئەگەر بەتوندییش وەریانگرتبێت نەیانکردووە بەئەرکێکی ئاینی، لەبەرئەوە بەڕاستیی کۆمەڵگە کۆمەڵایەتییەکان لە ئامێزی شارستانیەتی خۆرئاوادا زۆر فشوفۆڵن.

## مافی هاوهێزی و دابینکردنی پشتیوانیی کۆمەڵایەتی

ئیسلام بڕوایەکی زۆری بەوەهەیە کە هەمیشە مرۆڤەکان پشتی یەکتربگرن و یارمەتیدەری یەکتربن، تواناکانی یەکتر تەواوبکەن و پێکەوە خەریکی پڕۆژەکانی ژیان بن، سەیردەکەین هەژارەکان مافیان بۆ دابینکراوە لە سامانی دەوڵەمەندەکان، ئەوانەی کەنیزمەندو کەمئەندامن مافیان بۆ دابینکراوە لە سامانی دەوڵەمەندەکان، ئەوانەی کەبێـباوکن پێویستە مافیان بۆ دیارییبکرێت، ئەوانەی کە لە ڕووی عەقڵییەوە دواکەوتوون واتە جیاوازن لە ڕووی هۆشیارییەوە، ئەرکێکی تایبەتی خراوەتەسەر کۆمەڵگە بۆ بەخێوکردنیان، ئەوانەی کەپیربوون و ئەوانەی کەبێکارن، پێویستە یارمەتی بدرێن، کەواتە هەموو ئەمانە لە شەریعەتی ئیسلامدا بەتێروتەسەلی باسکراون.

# پرسیارەکان

**ئامادەبوویەك:**

أ- جیاوازیی نێوان دەوڵەتانی خۆرئاواو دەوڵەتانی ئیسلامی چییە بەرامبەر بەمافەکانی مرۆڤ؟، بۆچی مافەکانی مرۆڤ لە دەوڵەتانی ئیسلامییدا زیاتر پێشێل دەکرێن؟

ب ـ ئەو گروپە توندڕەوانەی کە ئێستا هەن لە جیهاندا، زۆربەیان گروپی مسوڵمانن؟ یەکەم ماف کە تۆ ئاماژەتپێدا مافی ژیان بوو، لە کاتێکدا ئەو گروپانە ماڤ ژیان لایان هیچ مانایەکی نییە، مافی ژیان لە کەسەکان دەسەننەوە؟ بۆ تەنها ئەمانە بەناوی ئیسلامەوە دەکرێت؟ بۆ بەناوی ئاینەکانیترەوە ناکرێت؟ شتی وامان نەبیستووە؟

**د.صەباح:** پرسیارەکان بەجێن:

بۆپرسیاری یەکەمت چ جیاوازییەکی جەوهەری هەیە لە نێوان دەوڵەتانی مسوڵمان و دەوڵەتانی نامسوڵمان؟ دیارە ئەو دەوڵەتانەی کە لە ئێستا لە جیهانی ئیسلامییدا فەرمانڕەوان ڕێك ئەمانە کۆپیکراوی سیستەمە خۆرئاواییەکانن، واتە ئەو دەوڵەتە نوێیانەی کە لە جیهانی ئیسلامدا دامەزران هەمان ئەو دەوڵەتانەن کە لە ئەوروپا لە سەدەی (١٩و ٢٠)دا دامەزران، کەواتە ناتوانین بڵێین ئەو دەوڵەتانەی کە ئێستا هەن لە جیهانی ئیسلامییدا ڕێك لە سەداسەد دەوڵەتانێکی مسوڵمانن، بەڵام بۆچی لە ئەوروپا مافی مرۆڤ گرنگییەکی زۆری پێدەدرێت وەك لە ناو دەوڵەتانی مسوڵماندا؟ هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ:

**یەکەم:** ئەوروپا دوای مێژوویەکی دوورودرێژ لە چەوساندنەوەی مرۆڤ لە ئەنجامی بەکارهێنانی عەقڵ، گەیشتن بەو ئەزموونەی ئێستا دەیبینین، کە مافی مرۆڤ بەدیدگای خۆیان دەسەلمێنن، ئەویش لە ڕاستیدا ئەگەر بچیتە بنج‌وبناوانی مەرج نییە بەوشێوەیەبێت، چونکە ئێستا مرۆڤ دوو پێناسەی بۆ کراوە لە ڕوانگەی خۆرئاواییەکانەوە، مرۆڤی خۆرهەڵاتی مافی زۆر کەمترە لە مرۆڤێکی خۆرئاوایی، بۆ نموونە ئێمە پێنجهەزار کەسمان لە هەڵەبجەدا تیاچوون و شەهیدبوون، باسنەکرا هەتا کاتێك کە پێویستیان پێیهەبوو، بەڵام کەسێك لە دارستانێکی وولاتی خۆیاندا ئەگەر تیابچێت باسی مافی مرۆڤ دەکەن، وەك شاعیرێك دەڵێت:

**قتل نمر في غابة جريمة لاتغتفر**

**إبادة أمة في مأمن، مسألة فيها نظر**

کەواتە بەشێك لە هۆکارەکان هۆکاری سیاسی لە پشتییەوەیە، ئەوان لە ڕاستیدا خزمەتی خۆیان کردووە لە ڕووی ماددییەوە.

**دووەم:** هۆکارێکیتر دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی مسوڵمانان خۆیان، چونکە مسوڵمانان چەند سەدەیەکە وازیان لە شەریعەتی ئیسلامی هێناوە، لە ئەنجامی وازهێنانی چەند سەدەی مسوڵمانان بەتایبەتی لە لایەنی فیقهی گشتی، واتە فیقهێك کە بەرگری دەکات لە لایەنە گشتییەکان، ئەوانەی کە حوکمیان کردووە بەسەر مسوڵمانانەوە، زۆربەیان کەسانی دیکتاتۆربوون، کەسی دیکتاتۆریش ئەوەندەی کە دەربەستی مانەوەی کورسییەکەیەتی ئەوەندە دەربەستی مافی مرۆڤەکان نییە.

**بۆ پرسیاری دووەمیشت: بۆچی زۆربەی گروپە تیرۆریستەکان لکێنراون بەئیسلامەوە؟**

**د.صەباح:** لە ڕاستیدا لەناو هەموو میللـەتێکداو لەناو هەموو وولاتێکدا کەسانی توندڕەو هەن و بەئاشکرا دیارن، بەلاّم پێویست ناکات باسی هەموویان بکەین، ئەگینا کاتێك کاتێك تیرۆر دەستیپێکرد، لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسادا دەستیپێکرد، گروپی (ڕۆبسپێر) دەستیانپێکرد، یان کاتێك کە (ڕێگەی درەخشان) لە پیرۆ دەستیانکرد بەتوندڕەوی، مافیاکان لە ئەوروپا دەستیانکرد بەتۆقاندن. لە بناغەدا چەمکی تیرۆر چەمکێکی خۆرئاواییە، پێشئەوەی چەمێکی ئیسلامی و خۆرهەلاّتی بێت، بەلاّم بەهەمانشێوە لە ناو کۆمەلگەی ئیسلامییشدا، لەبەرئەوەی کە کۆمەلگەیەکی ئیسلامییە، هەر لە سەرەتاوە کەسانێکی کەم هەبوون کە بڕوایان بەمافی ژیان نەبووە بۆ ئەو کەسانەی کە پێچەوانەی ئەوان بوون، ئێمە دەربارەی ئەوانە دەلێین ئەوانە کەسانێکن کە لایانداوە لە شاڕێگەی کاروانی کۆدەنگیی زانایان، ئەگەر کۆدەنگیی مسولمانان بواری قسەی هەبێت نایەلێت ئەوانە بەناوی ئیسلامەوە قسەبکەن و بەناوی ئیسلامەوە ئەو حوکمانە جێبەجێبکەن، بەلاّم ئێستا لەبەرئەوەی کە ڕاگەیاندنەکان و میدیا بەدەست ئیسلامەوە نییە، هەتا ئێستا نەتوانراوە ئەو تەمومژە بڕەوێنرێتەوە، زۆر لەوگروپانەش ڕەنگە دەستکردی کەسانی دوژمن بەدەولەتی ئیسلام بن.

**ئامادەبووی٢:** بەڕێزتان وتتان "ژن و پیاو یەکسانن لە ئیسلامدا"، ئەی بۆچی ئافرەت مافی ئەوەی نییە کە ببێت بەسەرۆکی دەوڵەت لە ئیسلامدا؟ کە لە فەرمودەدا هاتووە دەڵێت هەرکۆمەڵگەیەك سەرۆکەکەی ئافرەت بێت سەرکەتوونابێت؟

**د.صەباح:** لە ڕاستیدا هەندێك جیاوازی هەیە، ئێمە نابێت باسی یەکسانیی ڕەها بکەین، چونکە لە نێوان دوو پیاویشدا یەکسانیی ڕەها نییە، لە نێوان دوو ژنیشدا یەکسانیی ڕەها نییە، چ جای ئەوەی کە یەکسانیی ڕەها هەبێت لە نێوان ژن و پیاودا، وەك بنەما دەڵێین ژن و پیاو یەکسانن، بەڵام لە چەند بابەتێکدا دەڵێین ژن و پیاو لەمانەدا جیاوازن، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندیی هەرکامێکیان، بۆ نمونە ئەگەر ئێمە ئافرەتێك دابنێین بۆ ئەوەی کە سەرۆککۆماری وولاتێك بێت، جاری واهەیە ئەم سەرۆککۆماری وولاتە دەبێت بەتەنها بمێنێتەوە لەگەڵ سەرۆککۆماری وولاتێکیتردا، ئەگەر ئەو وولاتە دوژمن بێت دەگونجێت لە ڕووی جەستەییەوە دەستدرێژی بکاتە سەر سەرۆککۆماری ئەم وولاتەیتر، کە ئەمە هیچ عورفێکی دبلۆماسی قبوڵی ناکات، واتە ئێمە هیچ زەمانەتێکمان نییە بۆ ئەوەی کە ئەم بتوانێت خۆی بپارێزێت لەو رووبەڕووبوونەوانە، خۆناکرێت ئەوەی کە دەبێتە سەرۆککۆمار پاڵەوانی بۆکس بێت بۆ ئەوەی کە ئەگەر تەمایەکی وای لێکرا ئەو بەرگری لە خۆی بکات، لە کاتێکدا کە خەڵوەت و بەتەنهامانەوە لە نێوان نامەحرەمدا حەرامە، جا بۆ پاراستنی ئەو بابەتە

دیسانەوە مەجالی تیایە کە ئافرەت ببێت بەسەرۆکی وولآت، بەڵام بەومەرجانەی کە زانا فیقهییەکان دایدەنێن، بەڵام پلەی ئیمامەتی گەورە نەدراوە بەئافرەت بەوەی کە ببێت بەپێشەوای مسوڵمانان لەبەر متمانەیەك کە ئافرەت هەندێك حاڵەتی تایبەتی وەك حامیلەبوون و منداڵبوون و سووڕی مانگانە کە بە سەریدا دێت، ئەگەر ئەم ئەرکەش بکەوێتە سەرشانی ئەوا دەبێتە ڕێگر بۆی، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: (رفقا بالقوارير) واتە هەندێك لێپرسراوێتی گران لەسەر ئافرەت هەڵگیراوە، لە ڕاستیدا (سەرۆككۆماریی) لە ئیسلامدا ماف نییە، بەڵكو ئەركو لێپرسراوێتییەو ئەو ئەركو لێپرسراوێتییەش لە سەرشانی ئافرەت لابراوە.

**ئامادەبووی٢: پرسیاری دووەم: ئەوانەی کە دەبن بەمەسیحی، لەوانەیە هۆکاری سەرەکییان ئەوەبێت کە لە خەڵکەوە تەماشای ئاین دەکەن نەك تەماشای کرۆكو جەوهەری ئاین؟**

**د.صەباح:** هەندێکی پەیوەندیی بەنمایشی ئیسلامەوە هەیە لەلایەن مسوڵمانانەوە، ئێستا ئیسلام وەك حەقیقەت و ڕۆحەکەی کەم ماوە لەناوماندا، بانگەوازی باشیش بۆ ئیسلام ناکرێت، لە ئەنجامدا کەسانێك کە ڕەنگە بیانەوێت بەشوێن حەقدا بگەڕێن حەقەکە نەدۆزنەوە بەئاسانی، چونکە ئەوکەسەی کە بە دوای حەقدا دەگەڕێت و نایدۆزێتەوە زۆر باشترە لەوکەسەی کە بە دوای بەتاڵدا دەگەڕێت و دەیدۆزێتەوە.

**ئامادەبوی٣:** ئیسلام داوا دەکات لە مرۆڤەکان بگۆڕێن لە ڕووی کردارو گوفتاریانەوە بەرەو ڕوانگەیەکی ئیسلامی کە خوای پەروەردگار دەیەوێت، وەك حەزرەتی عومەر (ر.خ) دەفەرموێت (**کنا اذل قوم فأعزنا الله بالاسلام**)، بەڵام کاتێك هەر لە سەرۆکی وولاتێك (کەبەلوتکەی هەرەمەکە دادەنرێت) هەتا هەموو ئەندامان و بنکەی ئەو هەرەمە، هەستی بەو ئەمانەتە نەکرد کە لە بەردەستیدایە، لە قیامەتدا خوای پەروەردگار لێیدەپرسێتەوە، ئایا چ چاوەڕوانییەك بکەین کە ناوی بانگەشە بۆ مافی مرۆڤ و یەکسانبوونەوە بەقسە دەکرێت و کرداری لەگەڵدا نییە؟ ئایا هەر گوفتار ڕۆڵدەبینێت کە کردار نەبێت لەگەڵیدا؟

**د.صەباح:** بێگومان ئیسلام سێ بەشە:

**یەکەم:** ئاستی بڕوای دەرونی (عقیدة).

**دووەم:** ئاستی دەربڕین (اقرار).

**سێهەم:** ئاستی جێبەجێکردن، کە لە هەموویان گرنگترە.

ئەگەر مسوڵمانان لە پێشدا ئاینەکەیان ئەزمونێکی دەرونی بێت و پاشان ببێت بەبڕوایەكو لەناودڵدا بێت، ئینجا ببێت بەجێبەجێکردنێکی ڕۆژانە، ئەوکاتە بەرهەمی باشی لێدەکەوێتەوە، هەموو بەرنامەکانی ئیسلامیش ئەوەیان مەبەستە کە گۆڕانکارییەکی ئەرێنی لەناو کۆمەڵگەدا دروستبکەن و کۆمەڵگە هەست بە بەختەوەری بکات و هەست بەوەبکات کە مرۆڤ، وەك مرۆڤ، پارێزراوە و هیچ کەسێك ناتوانێت دەستدرێژیی بکاتەسەری.

# مافی مرۆڤ له ئیسلامدا

لهبابهتهكانی ڕابردوودا چهند ئاماژهیهكمان كرد له بارهی بابهتهكانی مافی مرۆڤ له ئیسلامدا، لێرهشدا باسی ههندێك پایه و بنهمای مافی مرۆڤ دهكهین له ئیسلامدا.

بێگومان مافی مرۆڤ بهو پێناسه و چهمكهی كه ئێستا باسدهكرێت چهمكێكی تازهی بهخۆی داوه، گرنگیو میحوهرییهتێكی زۆری ههیه له ناو شوێنه ئهكادیمیو زانستییهكاندا، له نووسین و لێدوان و زۆربهی بهرنامهكانی كۆنگره نێودهوڵهتیو ناوچهییهكاندا مافی مرۆڤ بووهته ئهو باسهی كه لقوپۆپی زۆری لێبووهتهوه، قسهوباسی لێوهدهكرێت، ههموو كهسێك خۆی بهوه دهزانێت كه له پێناوی مافی مرۆڤدا كاردهكات، بهڵام ئایا تهنها بهباسكردنی مافی مرۆڤ و بهرزكردنهوهی دروشمی مافی مرۆڤ، مرۆڤهكان ههست بهبهختهوهری دهكهن؟ مافهكانیان دهستهبهردهبێت؟ ئایا بهتهنها گۆرانیوتن بهوهدا كه مرۆڤ مافی ههیه، مافی بوون و ژیان و قسهی ههیه، مافی سیاسی و ڕۆشنبیری و ئابوری و جۆرهها ماف كه ئێستا باسی لێوهدهكرێت،و بووهته بابهتی سهرهكی و جومگهیی له زانستهكانی یاساو سیاسهتدا، تهنانهت زانسته پهیوهندیدارهكان بهئاسایشی نێونهتهوهیی، ههمووی

باسی ئەوەدەکەن مافی مرۆڤ دواهەمین پەیامی مرۆڤایەتییە بۆ خۆی، دواهەمین دەستکەوتی بیری مرۆڤە لەم سەردەمەدا کە لە هەموو سەردەمێك زیاتر ـ بەحساب ـ باسی مرۆڤ دەکرێت، سەردەم سەردەمی "مرۆڤسەنتەری"یە، مرۆڤ بووەتەوە بەمەرکەزو هەموو شتەکان بەدەوری ئەم مرۆڤەدا دەخولێنەوە و دەچەرخێن.

هەندێك کەس پێیوایە مافی مرۆڤ بەرهەمی لیبرالیزمو بەرهەمی سیکۆلاریزمو بەرهەمی ماتریالیزمی ئەمڕۆی ئەوروپیو خۆرئاواییە، واتە باسی مافی مرۆڤ تەنها لە زەمینەیەکدا دەتوانرێت بکرێت کە ئەو زەمینەیە زەمینەی عەلمانیەت و لیبڕاڵییەت و ماددیگەرایی بێت. واتە دەیانەوێت بڵێن مافی مرۆڤ بەبێ ئەمانە مومکین نییە بوونی هەبێت، وەك ئەوەی لە تیۆرییە ئاینییەکەدا مرۆڤ بوونی نەمابێت و لەناوچووبێت و ئامادەیی نەبێت، بەڵام ئایا ئەمە ڕاستە؟!! ئەمڕۆ ئێمە باسی ئەوەدەکەین کە لە ڕوانگەی هـزری ئیسلامییەوە مافی مرۆڤ پێویستە لەسەر چەند پایەیەك دابمەزرێت، چونکە ئەگەر مافی مرۆڤ تەلارێك بێت ئەو بیناو تەلارە پێویستی بەبناغە و بنەڕەت هەیە وەك چۆن تەلارێك بەبێ بناغە و بەبێ بنەڕەت ناتوانێت جێگیرو پتەوبێت و ناتوانێت بمێنێتەوە، دیسانەوە مافی مرۆڤ بەبێ ئەم بناغەو بنەڕەتانە ناتوانێت جێگیر بێت، مرۆڤ بۆ خۆی دەبێت خۆی بدۆزێتەوە و خۆی بناسێتەوە, واتە تۆ دەبێت لەپێشدا بوونی مرۆڤەکە بسەلمێنیت، ئینجا باسی مافەکەی بکەیت، ئەگینا ئەگەر تۆ مرۆڤەکە لەناوبەریت و حسابی بۆ نەکەیت، بەڵکو بیکەیت بەئامڕازێكو ئامێرێكو لە دونیای ماددیی

ئەمڕۆدا کاری پێبکەیت و سەرمایەو دەستکەوتی پێبەدەستبهێنیت، چ سوودێکی هەیە کە باسی مافی بۆ بکەیت؟ واتە لە شارستانییەتی ئەمڕۆدا ئاژەڵەکانیش مافیان هەیە، ئاژەڵەکانیش ڕەنگە هەندێکجار لە مرۆڤەکان ژیانیان خۆشتربێت و مافیان زیاتربێت و حسابیان زیاتر بۆ بکرێت. نەك تەنها ئاژەڵەکان، بەڵکو بوونەوەرەکانی دیکەش، تەنانەت دڕندەکانیش. دەبینین لە دونیای ئەمڕۆدا دونیا بەرەو ئەوەدەچێت باخی زیندەوەران لە کەشێکی ئازاددا دروستبکەن، بۆ ئەوەی ئاژەڵەکان لە بارودۆخێکی سروشتییدا ژیان بەرنەسەر، خەڵکیش بڕوات بۆ سەیریان وەك جاران و نەیانخەنە ناو قەفەس و بەندەوە، بەڵام ئێستا بەپێچەوانەوە مرۆڤەکان کراونەتەناو کۆت و بەندەوە و باسی مافی مرۆڤیش دەکرێت، مرۆڤەکان وان لە ناو گوشارو زەبروزەنگێکی زۆردا، واشیان تێگەیاندوون کە ئەوان ئازادن.

جا، پایەکانی مافی مرۆڤ لە ڕوانگەی هـزری ئیسلامییەوە بریتیین لەمانەی لای خوارەوە:

## یەکەم: پەیوەستبوون بەخوداوە:

وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿رَبَّانِيِّينَ بِمَاكُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَاكُنتُمْ تَدْرُسُونَ﴾ آل عمران:٧٩. واتە ئەی خەڵکینە! ئێوە پەیوەستبن بەخوداوە و ڕەببانی بن، واتە مرۆڤ بۆ سەلماندنی بوونی خۆی پێویستە بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی بوونی خۆی، بگەڕێتەوە بۆ ئەو خودایەی کە ئەوی دروستکردووە و ئەوی ئەفراندووە و ئەوی

کردووه بەو مرۆڤەی کە ڕێزو بایەخی هەیە، مرۆڤ لە تێڕوانینە هـزرییە ئیسلامییەکەیدا هەست بەڕێزوبەهای خۆی دەکات، چونکە قورئانەکەی گوتاری بۆ ئەوە و سوننەتەکەی بۆ بارهێنانی ئەوە، پێغەمبەران بۆ ڕێنمایی ئەوهاتوون، کتێبە ئاسمانییەکان لە ڕاستیدا بۆ ڕێنمایی ئەو هاتوون...هتد. کەواتە پەیوەستبوون بەخوداوە یەکەمین ڕەگەزو پایەیە بۆ مافی مرۆڤ لە ئیسلامدا.

کەواتە دەبێت مرۆڤ پەیوەست بێت بەخوداوە، بەشێك لە مافەکانی فەرامۆش نەکات، بەشێك لەومافانە بریتییە لە گەشەکردن و تەکامولی ڕۆحی، ئەو ڕۆحە دەبێت گەشەبکات، ئەو زانستە دەبێت لەو ئاستەدا نەمێنێت و بەرزبێتەوە، ئەو مرۆڤە دەبێت بەرزبێتەوە و عروج بکات، واتە تەنانەت ئەو ئەرکە ئاینییانەی کە لە سەرشانی مرۆڤەکان فەرزکراون وەك نوێژو ڕۆژوو و زەکات و حەج، لە ڕاستیدا بۆ بڵندبوونەوەی ئەم مرۆڤەن.

کەواتە یەکەمین پایە بۆ مافی مرۆڤ ئەوەیە: ئەو مرۆڤە بوونێکی راستەقینەی پێببەخشرێت، ئەو بوونەش بیبەستێتەوە بەسەرچاوەی بوونەوە، کە خوای پەروەردگارە.

دووەم: بەرپرسیارێتی: واتە کاتێك ڕەوایە باسی مافی مرۆڤ بکەیت کە فێری بەرپرسیارێتی بکەیت، بزانێت کە ژیان ئەوە نییە هەمیشە دابنیشێت و بەتەمای ئەوەبێت خەڵك خزمەتی بکات، دەزگایەكو وەزارەتێك هەبێت خزمەتی بکات، لایەنێك هەبێت بەخێوی بکات، دەبێت مرۆڤ فێری بەرپرسیارێتی بکرێت ئەوسا باسی مافی بۆ بکرێت،

واتە ئەگەر مرۆڤ وابار نەهێنیت و پەروەردەی نەکەیت کە دەبێت بەخشندەبێت بۆ کۆمەڵگەکەی، بەخشندەبێت بۆ خێزان و بۆ ناوەندەکەی‌و کەس‌وکارەکەی، ئینجا بەخشندەبێت بۆ خۆی، چۆن باسی مافی بۆ دەکەیت؟ چونکە باسکردنی ماف بەبێ باسکردنی بەرپرسیارێتی لە ڕاستیدا کوشتنی مرۆڤە، مرۆڤ تەنها وەك وەرگرێك دادەنێت کە هیچ پاداشتێکی نەبێت بۆ خەڵك.

خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ﴾ ، الأحزاب:٧٢. ئەمانەت، واتە لێپرسراوێتی، واتە مرۆڤ هەستبکات ئەرکی لەسەر شانە، ئەرکی دەوروبەری، ئەرکی ژیانی، ئەرکی ژیار، هەموو ئەم ئەرکانە بەیەکەوە وادەکەن لەوکەسە بەرپرس بێت. جائەم لێپرسراوێتییە بەم مانایە، چیاکان لە ئاستیدا لاوازبوون و ئاسمانەکان و زەوی بەهەمانشێوە، وەك شێوازێکی نواندن خوای پەروەردگار بۆمانی دەهێنێتەوە بۆ ئەوەی تێبگەین، واتە ئەگەر ئاسمانەکان ژیرییان پێبدرێت وەك مرۆڤ، زەوی عەقڵی پێبدرێت وەك مرۆڤ، ڕووبەڕووی ئەو بەرپرسیارێتییە گەورەیە ببنەوە کە مرۆڤ تەحەمولی کردووە، ئەوان ناتوانن تەحەمولی بکەن و لە ژێر باری دەردەچن، کەواتە ئەم مرۆڤە گرنگی و بایەخ‌و جەوهەرو ماناکەی لەوەدایە کە لێپرسراوبێت، کەواتە ئەم مرۆڤە بەدوو باڵ دەتوانێت بەرزبێتەوە و عروج بکات، لەلایەکەوە باڵی لێپرسراویەتی‌و بەڕێوەبردنی ئەرك‌و فەرمانەکانی سەرشانیەتی، لەلایەکی دیکەوە باڵی هەستکردن

بەبوونی مافو ئیمتیازات، کەواتە ئەم مرۆڤە هەتا بەرپرس نەبێت ئەگەر باسی مافیشی بۆ بکەیت توشی هەڵەدەبێت، ئێمە ئێستا لە کۆمەڵگەی خۆماندا هەستدەکەین کە باسی ماف دەکرێت وادەزانین ئەوکەسەی مافی هەبێت هیچ ئەرکێکی لەسەرشان نییە، لە حاڵێکدا مافو ئەرك دوو چەمکی پێکەوەپەیوەستن.

## سێیەم : پەیوەستکردنی مرۆڤ بەهەموو بونەوەرەوە:

واتە ئەم مرۆڤە نابێت وافێری بکەیت کە جیاوازو نامۆیە لەم بونەوەرەی کە تیایدا دەژی، دەبێت وابزانێت ئەو بونەوەرەی کە تیایدا دەژی لە پێناوی ئەمدا دروستکراوە، وەك شێخی سەعدی لە یەکێك لە شیعرەکانیدا دەڵێت:

**ابروباد و مه و خورشیدو فلك دركارند**

**تاتو نانی بكف اری بغفلت نخوری**

واتە هەورو باو مانگو خۆرو کەون هەرهەموو کاردەکەن، هەوڵدەدەن، تێدەکۆشن لە گەڕان و لەخولدان بۆ ئەوەی نانێك پەیدابببێت بۆ تۆ، تۆش ئەوکاتە بەبێئاگاییەوە نەیخۆیت، بۆ ئەوەی ئاگاداربیت کە ئەم جیهانە لە خزمەتی تۆدایە، مرۆڤ کەخۆشەویستی هەبوو بۆ دونیایەك بەو شێوەیە هەست بەخزمایەتی بکات لەگەڵ دەوروبەرو ژینگەکەیدا، لەگەڵ ئاسمانەکەیدا، لەگەڵ زەوییەکەیدا...هتد، هەموو بونەوەران ئەوکاتە باسی مافی بۆ بکەیت

ئەو مافە بەفیڕۆنادات و ئەو مافە خراپ بەکارناهێنێت. کەواتە هەرئەوەندە بەس نییە کە بە مرۆڤ بڵێین ئەوە مافەکانتە، دەبێت پێشیبڵێین شوێنی تۆ لەم جیهانەداو لەم بونەوەرەداو لەم گەردوونەدا شوێنێکی شایستەیە، لە پلەو پێگەیەکی بەرزتردایت، لە شوێنێکدایت دەبێت قەدری خۆت بزانیت.

پایەی چوارەم: پایەکەیتر بریتییە لە واقیعیبوون: دوورکەوتنەوە لە خەیاڵو خەون و لە پووچگەرایی و لە ئایدیالیزم، ئەمە واتای ئەوە نییە کە ئەم مرۆڤە دووربخەیتەوە لە ژیان، دەبێت باسی مافی بۆ بکەیت و حەقیقەتی ئەم ژیانەی تێبگەیەنیت و پێیبڵێیت ئەم ژیانە گوڵفەرش نەکراوە بۆ تۆ، ئەم مافانەی کە دەستکەوتوون شتێك نییە کە بە خۆڕایی دەستکەوتبن، ئەم مافانە، یەکەم :خوای پەروەردگار بۆ تۆی داناوە.

دووەم: کۆمەڵگەیەك کە تۆ تێیدادەژیت، بۆیان دەستەبەرکردوویت.

سێیەم: یاسایەك، کە خوای پەروەردگار بۆی داناویت، یارمەتیت دەدات بۆ بەدەستهێنانی ئەو مافانەی کە تۆ پێویستت دەبێت.

کەواتە واقیعیبوون ئەوەیە کە مرۆڤ بزانێت کۆمەڵێك مافی هەیە، بەڵام مەرج نییە لە ژیاندا بتوانێت هەموو ئەو مافانەی بەوشێوەیەی کە هەیە دەستیبکەوێت.

بۆنمونە: یەکێك لە مافەکان ئەوەیە کە هەموو ئەوانەی پەیوەندییان بەتۆوەهەبێت، خوا هیدایەتیان بدات.

کەواتە فەرمان بەچاکە دەکەیت و ڕێگری لە خراپە دەکەیت و بانگەوازدەکەیت و قسەی جوانیان بۆدەکەیت.. هتد. لە کەسانی نزیك‌ودوور، بەڵام خوای پەروەردگار بەپێغەمبەرەکەی (درودی خوای لە سەر) ـ کە خۆشەویسترین کەسە لای ـ دەفەرموێت: ﴿إِنَّكَ لَاتَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ﴾ القصص:٥٦. بەدەست تۆ نییە هیدایەتی کەس بدەیت، ئەمەش واقعییەتێکە، بەتەمامەبە هەموو مافەکانت دەستبکەوێت، بەڵام تۆ هەوڵبدە، نابێت بێ‌هیوابیت لە وەی کە مافەکانت بەدەستنەهێنیت، کەواتە واقیعیبوون ئەوەیە کە زانیاریت بەواقیع هەبێت.

پێویستە تۆ بزانیت کە لە م جیهانەدا توانات چەندە و دەستەڵاتت چەندە، لە بەرئەوە ئەو کەسانەی کە واقیعی نین کاتێك باسی مافی مرۆڤ دەکەن بەشێوەیەکی ناواقیعی باسیدەکەن.

بۆ نموونە، هەیە بەعەقڵێکی شۆڤێنییەوە مامەڵە لە گەڵ مافی مرۆڤـدا دەکات، واتە هەموو شتێك بۆخۆی بەڕەوادەبینێت، بەڵام کەمترین شت بۆ غەیری خۆی بەڕەوانابینێت، بۆخۆی بەڕەوای دەبینێت کە یاسادابنێت و بڕیاربدات و دەستور دابنێت...هتد. بەڵام ئەوەی کە بۆخۆی بەڕەوای دەزانێت بۆ تۆی بەڕەوا نازانێت، ئەوە دوورکەوتنەوەیە لەواقیع.

کەواتە عەقڵی خۆرئاوایی هەرکاتێك پێیوابێت دیوارێك دروستبکات لە نێوان مرۆڤەکاندا، دەڵێت: ئەم مرۆڤانە ئەم کۆمەڵە مافەیان هەیە، بەڵام ئەم جۆرانەیتر کۆمەڵە مافێکیان نییە.

بۆنمونە: ئەوەی کە سەربەدەوڵەتانی باکوورە، سەربەدەوڵەتە دەوڵەمەندەکان و سەرمایەدارە گەورەکان و دەستەڵاتدارەکانی دونیایە، مافی زانستی و پێشکەوتن و هەموو پێداویستییەکی هەیە، بەڵام گەلانیتر ئەو مافەیان نییە، لەبەرئەوەی ـ بەحساب ـ ئەوان پێشکەوتوون و ئەمان دواکەوتوون، ئەمە واقیعیبوون نییە، ئەمە جۆرێکە لە دابڕین و پارچەپارچەکردنی واقیع.

## چوارەم: دوارۆژبینی

واتە تۆ هەمیشە بیر لەوەبکەرەوە مافەکانت دەستەبەربکەیت، هەندێك لەو مافانە ئێستا دەگونجێت بۆت دەستبدات، بۆت بسەلمێنێت، بۆت دابمەزرێت، بەڵام هەندێك ماف هەیە ڕەنگە دواتر بۆت دابمەزرێت، کەواتە بابینینەکەت کورتنەکرێتەوە لە ئایندەی نزیکدا، دەگونجێت ڕۆژێك لەڕۆژان بواری پتر هەبێت و توانای پترت هەبێت.

## پێنجەم: بڵاوکردنەوەی ئاشتی

ئەگەر جیهان ئاشتی تێدانەبێت و مرۆڤەکان مەترسییان لەسەر بوونی خۆیان هەستپێدەکرد، ئەوکاتە باسی مافی مرۆڤ چییە؟ مرۆڤەکە بۆ خۆی نامێنێت، مرۆڤەکە بۆ خۆی لە ناودەچێت، ئیتر باسی مافی مرۆڤی چی؟

سادەترین ماف مافی ژیانە کە پێشتر باسکرا، پاشان مافی ئاسایشە، کە پێشێلکرا، ئیتر بەتەمای چ مافێکیت؟ لەبەرئەوە لە

ئیسلامدا بابەتی ئاشتی گرنگییەکی زۆری پێدراوە، تەنانەت لە ئاستی تاکدا دەفەرموێت: ﴿وَإِذَاحُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا﴾ النساء٨٦. کە ئەم ووشەی ئاشتییە بڵاودەکەیتەوە، ئەرکت زۆرتردەبێت. خەڵك سڵاوت لێدەکات، تۆ دەبێت جوانتر وەڵامیان بدەیتەوە. واتە تۆ خۆت لە خەڵك بەزیاتر بزانیت: بڵێیت من خۆم بەمسوڵمان دەزانمو من بڕوادارمو من گەورەترم.. ئەمەیان بابەتێکی ترە ﴿إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيباً﴾ النساء٨٦. خوابژاردنی بۆ هەموو شتێك کردوە....

جالەبەرئەوە لە ئاستی تاکەوە تا ئاستی خێزان، لە ئاستی کۆمەڵگەوە تا ئاستی نێودەوڵەتی، باسکراوە. لە ئاستی تاکدا نموونەمان بەو ئایەتە هێنایەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَاحُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيباً﴾ النساء٨٦. ئەم ژیانە، بەتایبەتی ئەمڕۆ، ژیانی سڵاوکردنە، ژیانی پێکەوەقسەکردن و پێکەوە چاککردنە.

ئێستا جیهان ئەوەندە بچوکبووەتەوە دەتوانیت لەگەڵ هەموو کەسێکدا سڵاوت هەبێت، ئەگەر ژیان لەسەر بنەمایەکی ئاشتیخوازی دانەمەزرێت، ئەوا باسی مافی مرۆڤ دەبێتە قسەیەکی بێسوود، واتە لە وولاتێکدا کە جەنگی تیابێت، ئەو جەنگە دەبێتە گەورەترین لەناوبەر بۆ بایەخەکانی مافی مرۆڤ و بەها مرۆییەکان، لە بەرئەوە تەماشادەکەین لەم ئاستەدا خوای پەروەردگار کردوویەتی بەئەرك لەسەر تاكو کۆمەڵی مسوڵمانان، کاتێك کە یەکێك پێیاندەڵێت سڵاو، وا جوانترە بڕۆیت

بەدەمیەوە و لەو سڵاوە جوانتربکەیت، لەبەر خاتری ئاشتی، کە ئاشتی هەبوو باسی مافی مرۆڤ ئەو هەستیارییەی نامێنێت و ناونیشانە گەورەکان لەناو خەڵکداو لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا،و لەناو شارو گەڕەکدا،و لەناو خانەوادەدا، مانایەکی تایبەتی دەبێت. تەماشا بکە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَتَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ النور:٢٧. ئەمە وانەی مافە، بەڵام لە چوارچێوەی مۆڵەتوەرگرتندا باسیدەکات، لە چوارچێوەی ئەرکدا بۆمانی باسدەکات، واتە هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە لە ئاسایشدا بژی، لەبەرئەوە ئەرکە لەسەر ئێمە کە دەچینە شوێنێك پێشتر بزانین ئاوەدانە یان ئاوەدان نییە؟ خەڵکی تیادایە یان تیایدا نییە؟ کە زانیمان خەڵکی لێیە ئەوکات بڕۆین ئاشتی بڵاوبکەینەوە لە ناویاندا، چونکە کە ئاشتی هەبوو مرۆڤـ هەست بەبوونی دەکات، بوونی خەڵك دەپارێزن، هەموو مافەکانی مرۆڤـ لقوپۆپن لەسەر مافی بوون، لە مافی ژیان پەیدا دەبن، ئینجا دەفەرموێت: ﴿ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ النور:٢٧. با ئەمەتان لە یاد بێت، جاری واهەیە تۆ دەڕۆیتە ناو کۆڕو کۆمەڵێك خۆت بەوە دەزانیت لە خەڵکەکە گەورەتریت و پلەوپایەت زیاترە، یاخود یەکێك دێتە ئەو کۆڕەوە، تۆ دەبێت لەو کۆڕەدا ئەو بایەخەی مافی مرۆڤە لە دەروازەی ئاشتییەوە بڵاوبکەیتەوە، تەماشا بکە خوای پەروەردگار دفەرموێت ﴿يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا فِي الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا يَفْسَحِ اللَّهُ لَكُمْ﴾ المجادلة:١١. دەرفەتدروستکردن بۆ ئەویتر، تەنانەت لە

دانیشتندا، ئەمە بابەتێکە حسابی بۆ کراوە، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك پێگەی هەبێت، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك شوێنی بوونی هەبێت و بتوانێت بوونی خۆی بسەلمێنێت.

﴿وَإِذَا قِيل آنشُزُوا فَانشُزُوا﴾ المجادلة:١١. جاری وا هەیە دەگونجێت پێگەکەت بەشی هەموو خەڵکەکە نەکات، ئەمەش لە کۆڕو کۆبونەوەیەکی سادەدا بابەتێکی هەستیارە، تەماشادەکەیت ئیسلام باسی دەکات، چونکە پەیوەندیی بەئاشتیو ئاسایشەوە هەیە، زۆر ئاساییە لە کۆڕو کۆبونەوەیەکدا ئێمە لەگەڵ ئەوەدا کە هەست بەبوونی خۆمان دەکەین و حساب بۆخۆمان دەکەین، بەڵام بوونی ئێمە ڕەنگە ئاشتی، یان مافی، خەڵکێکیتر پێشێل بکات، لەبەرئەوە وانەیەکمان هەیە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قِيل آنشُزُوا فَانشُزُوا﴾ المجادلة:١١. ئەگەر وتیان هەستن، هەستن.

ئەمە ڕەنگە بابەتێکی بچوکبێت بەڕواڵەت، بەڵام بابەتێکی بەنرخە لە ڕووی ماناوە، بابەتێکی زۆرگرنگە، واتە ئێستا ئەگەر خەڵك بەمە کاربکەن ململانێی حیزبی ناگاتە ئەو ئاستەی خەڵك دژ بەیەکبێت، جاری وا هەیە حیزبێك یان گروپێك گەورە دەبێت، ئەوەندە گەورەدەبێت ئیتر ڕێکخستنەکانی جێی ئەو گەورەییەی تێدانابێتەوە، لەبەرئەوە ئاساییە کە بەشێکیان دەستبەرداری بابەتەکە بن و جیاببنەوە، وەك ئایەتەکە فەرمووی ﴿وَإِذَا قِيل آنشُزُوا فَانشُزُوا﴾ المجادلة:١١. ئینجا لەوکاتەدا بائەوانەتان کە ئاستی زانستییان لە سەرەوەیە جێگیربن، چونکە لە کۆمەڵگەدا مافی مرۆڤ بەمرۆڤی زاناوە

ماناداترە، مانای ئەوە نییە کە ئەوەی زانانەبێت هەرگیز مافی نییە..!

بەڵام با زاناکانمان ئاڵاهەڵگربن، با زاناکانمان ڕەچەشکێن بن، با زاناکانمان لە پێشەوەی گەلەوەبن، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُواالْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَاتَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ المجادلة:١١. چونکە ویستی خوا وایە بەسروشت ئەم دوو جۆرە مرۆڤە پلەو پایەیان نایابن، هەموو مرۆڤێکی ژێر حساب بۆ دوو جۆر مرۆڤ دەکات:

**یەکەم:** بۆ مرۆڤی مەبدەئی، کەسێك نەتوانیت بیکڕیت بەپلەو پایە، هەرنەتەوەیەك ڕێژەی ئەم جۆرە مرۆڤانەی زۆربوو دەبێت ئەم گەلە ئومێدەواربێت.

**دووەم:** بەمرۆڤی زاناو پسپۆڕ لە هەموو بوارەکانی پسپۆڕییدا، کە یەك بوارو دوو بوار نییە، ئێستا ئێمە لە زانکۆی (سلێمانی)دا ڕەنگە (١٠٠–١٥٠) پسپۆڕیمان هەبێت، پێویستە لە هەر بوارێکدا مرۆڤی زانامان هەبێت، ئەو زانایانە دەبێت ڕۆڵی کاریگەر ببینن، بوونی ئەوان پایەیەکی گرنگە بۆ مافی مرۆڤ.

واتە لە وولاتێکدا کە زاناکانی سەرکزو بێنەوابن، مەبدەئییەکانی سەرکزو بێنەوابن، کەسایەتییەکانی سەرکزو بێنەوابن، باسی مافی مرۆڤ چی دەگەیەنێت، ڕۆژنامەو میدیاکانمان دەبێت تەرکیز بکەنە سەرئەوەی کە گرنگی بدەن بەو دوو لایەنە، ئەو دوو سیفەتە لەناو تاکەکانی هاوولاتیاندا زۆرو بەرجەستە ببن، سیفەتی مەبدەئیبوون لەگەڵ سیفەتی زانایی.

ئەو کەسەی ئەو دوو سیفەتەی تیابوو باشترین پارێزەری مافی مرۆڤن، بەڵام ئەو ئەندازەیە کە لەو سیەفەتەدا کەمبێت باسی مافی مرۆڤ دەبێت بەبانگەشە، مانای نییە.

لەشوێنێکیتردا، هەر لە بارەی پایەی ئاشتییەوە، کە زۆر باسی دەکەین چونکە پایەیەکی زۆر گرنگە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا﴾ الأنفال:٦١. لە قۆناغێکدا وولات خەریکی خۆدروستکردنە، دوژمنی دەرەکیشی هەیە، دوژمنی دەرەکی شەڕت پێدەفرۆشێت و کێشەت بۆ دروستدەکات، گەلێك کێشەت بۆ دروستدەکەن، کێشەی سیاسی و ئابووری و جۆرەها نەخۆشیت بۆ دەهێنن، لەو هەلومەرجانەدا کە دوژمنی سەرسەختت هەیە، ئەگەر دوژمنەکەت ئامادەیی دەربڕی بۆ ئاشتی، تۆش ئاشتی بکە، چونکە تۆ باشترین کەسی گەر ئاشتی بکەیت، هەموو نەتەوەیەك سوود لە ئاشتی دەبات.

مافی مرۆڤـ لەسەرزەمینی ئاشتی، لە کوردستانی خۆماندا، لەو ساتەوەختانەوە کە بەرقەراربووە، هەموو کەس هەست بەبوون دەکات، هەموو کەس هەست بەکەسایەتی دەکات، گەر کەموکوڕیش هەبێت، مادام ئاشتییەکە هەیە دەتوانین چارەسەرێکی بکەین، لەناو خێزانێکدا کە ئاشتی هەبوو، ئاشتی کۆمەڵایەتی و خێزانی، هەموو کێشەکان قابیلی چارەسەرە، مافەکان بەدەستیش نەهاتبن لە ڕێگەی ئەوەدان کە بە دەستیبهێنن. پێویستە زۆر تەرکیز لەسەر ئەو لایەنە بکەین.

## شەشەم: دانــنان بە( فرەیی )دا:

واتە تۆ کاتێك دان دەنێیت بەمافی مرۆڤدا، کاتێك لە کۆمەڵگاکەی تۆدا مانا پەیدادەکات کە ببێتە قەناعەت. ئەم کۆمەڵگەیەش یەك جۆر مرۆڤی تیانییە، یەك بیروبڕوای تێدانییە، چەندین جۆر مرۆڤ هەیە، چەندین جۆر بیروباوەڕ لە کۆمەڵگە دەبێت هەبێت، ئەم فرەییە بەمانای ئەوەنییە کە شەڕوهەراو فیتنە لەناوخەڵکدا دروستبکەین، بەڵکو ئێستا مرۆڤایەتی گەیشتووە بەو بڕوایەی کە کاتی خۆی پێغەمبەران داوایانکردووە، کە ئەم خەڵکە مەرج نییە هەموویان یەك بەرنامەیان هەبێت و دوای یەك پێغەمبەر بکەون، بەڵام هەمیشە ڕووبەرێکی هاوبەش هەیە کە ئەو مرۆڤانە دەتوانن لەسەری کۆببنەوە، ئەو ڕووبەرە بریتییە لە بەرژەوەندیی گشتی، بەرژەوەندیی گشتیش ئەوەیە کە هەموو مرۆڤەکان هەست بەبوونی خۆیان دەکەن و هیچ کەسێك کەسێکیتری بەلاوە زیادنییە، چونکە ئاسمان بەشی هەموومان دەکات، زەوی بەشی هەموومان دەکات.

﴿وَعِبَادُالرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْناً وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَاماً﴾ الفرقان:٦٣. قورئان چەند بەجوانی باسی ئەوانە دەکات کە بە ڕاستیی بەندەی ڕاستەقینەی خوای پەروەردگارن، ئەمانە کەسانێکن خۆیان بەگەورەتر نازانن، لوتبەرز نین، دوژمن نین، ئەگەر خەڵکیش ناحەزیان بوو ئەمان هەر بەئاشتی لەگەڵیان دەجوڵێنەوە، چونکە ئەوکەسەی کە پایەکەی زیاترە ووشیاریی زیاترە، لە ڕاستیدا دەبێت سەیری فراوانتربکات، ئەوکەسەی کە ناحەزیی بەرامبەرت دەکات و تەنانەت دەیەوێت مافت پێشێلبکات، تۆ لە بەرامبەریدا دەبێت بڵێیت: سەرەتا با ئاشتی جێگیر بکەین، پاشان ئەوهاوکێشەیە شایستەی سنووردانانە.

# پرسیارەكان

ئامادەبوویەك: ئایا بۆچی زۆرترین پێشێلكردنی مافی مرۆڤ لەو وولاتە ئیسلامییەكاندایە لە كاتێكدا كە قورئانی پیرۆزو سوننەت هەموو مافەكانیان داوە؟.

پرسیاری دووەم: ئایا سلاوكردن بۆچی خۆشەویستی بلاودەكاتەوە؟ واتە هۆكارەكەی چییە؟

ئامادەبووی دووهەم: یەكێك لە پەیامەكانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بریتیبوو لە بەرپرسیارێتی، بەلام هەندێك كەس هەن مافی مرۆڤ لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا بەكەم دەژمێرن، بەتایبەت ئافرەتان، كە ئەركێكی زیاتریان هەیە لە خۆداپۆشین، كاتێك باس لە نەبوونی ماف دەكرێت بەگشتی خەلك وەربگرین و بەتایەتی ئافرەتان، ئەمە خۆی هۆكارێكی خۆشاردنەوە و دوورخستنەوە نییە لەو ئەركەی كە لە سەرشانیانە؟

ئامادەبووی سێهەم: ئیسلام كە ماف دەدات بەتاكەكانی خۆی، هەموو مافێكی پێدەدات بەلام سنوری بۆ داناوە، ئایا هەمان ماف دەدات بەكەسانی نامسولمان لە كۆمەلگەیەكی ئیسلامییدا؟ ئایا من دەتوانم مافی بلاوكردنەوەی بانگەوازی لێبگرم؟

**د.صەباح:**

سەبارەت بەوەی زۆرترین پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەو وولاَتە ئیسلامییەکاندایە لە کاتێکدا کە قورئانی پیرۆزو سوننەت هەموو مافەکانیان داوە، من ڕەنگە تەسلیمی ئەو گریمانەیە نەبم بلێم زۆرترین پێشێلکردن لێرەیە، چونکە ئێمە زانیارییمان لەسەر وووڵاتە نائیسلامییەکان کەمە، یان ڕەنگە لەوێش پێشێلکردن هەبێت بەلاَم نەگات بەپێشێلکردنی ئێمە، یان لێمانی بشارنەوە، یان کە مافێك پێشێلدەکرێت کۆمەڵێك یاسا هەیە ڕەنگە مافە زەوتکراوەکان بگێڕنەوە، بەلاَم ئێمە وەك مرۆڤی مسولَمان لە وولاَتی ئیسلامییدا لە زۆر ماف بێبەشین، لەبەرئەوەی سەردەمانێکی زۆرە یاسای سیاسی لەم وولاَتانەدا دوورکەوتووەتەوە لە شەریعەت، نە ئەوەیە شەریعەتەکەی دەستکەوتبێت و نە ئەوەیە کە یاسا خۆرئاواییەکەی وەرگرتبێت، هەندێك ڕووکەشی لە یاسای خۆرئاوایی وەرگرتووە و لەملاشەوە وازی لە یاسا ئیسلامییەکە هێناوە، کەواتە نەبوونی سەروەری یاسا لەم وولاَتانەداو نەبوونی سەروەریی مرۆڤ لەم وولاَتانەدا بووەتە هۆکاری پێشێلکردنی مافی مرۆڤ، ئێستا جیهانی ئیسلامی بەتایبەتی بزاڤ و بزوتنەوەیەکی زۆر خێرای دەستپێکردووە بۆ داکۆکیکردن لەسەر مافەکانی مرۆڤ بەدوو چەك:

یەکەم: لەلایەکەوە بەچەکی شەریعەتی ئیسلام، چونکە شەریعەتی ئیسلام بەپێی دەقەکان هەموو ئەو مافانەی سەلماندووە.

دووەم: بەچەکی یاسای نێودەوڵەتی و یاساکانی مافی مرۆڤ و جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ.

ئەگەر ئەم دووانە پشتی یەکتربگرن ـ هەم بزاڤە ئاینییەکان و هەم بزاڤە نائاینییەکان ـ بۆ گێڕانەوەی ماف، ئەوە چاکترین هۆکارە بۆ ئەوەی کە مرۆڤەکان وردەوردە بگەن بەمافەکانیان و ڕزگاریان ببێت لەو سەرکوتکردنەی کە لە جیهانی ئیسلامییدا هەیە.

سەبارەت بەوەی سڵاوکردن بۆچی خۆشەویستی بڵاودەکاتەوە، واتە هۆکارەکەی چییە؟، لە ڕاستیدا ئەمە وەك دابونەریتێکی لێهاتووە، مرۆڤەکان هەر بواری ئەوەیان هەبێت کە دەمیان بگات بەیەکتر، لە یەك نزیکدەبنەوە و لە یەکتر تێدەگەن، زەمینەی ئاشتی سازدەکەن، لە بەرئەوە دوو وواڵتیش کە تەنانەت دوژمنی سەرسەختی یەکتربن هەر ئەوەندەی سەرۆکەکانیان دەگەن بەیەك پێکەوە قسەدەکەن، دەروازەکانی ئاشتی دەکرێنەوە، چونکە لە ناخەوە مرۆڤ تاقیگەیەکی خێرخوازە، بونەوەرێکە بەفیترەت پاکە، ئەگەر کاریگەریی فاکتەرە دەروونیو دەرەکییەکانی لێدووربخەینەوە و بگەڕێتەوە بۆ سروشتەکەی خۆی، کەسێکی ئاشتیخوازە، جائەو ووشەیە بۆ یەکترناسین و بەیەکگەیشتنی خەڵکە، ئەو سڵاوکردنە ئاشتی لە نێوان مرۆڤەکاندا خۆشدەکات.

ئامادەبووی دووهەم: یەکێك لە پەیامەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بریتی بوو لە بەرپرسیارێتی، بەڵام هەندێك کەس هەن مافی مرۆڤ لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا بەکەم دەژمێرن، بەتایبەت ئافرەتان، کە ئەرکێکی زیاتریان هەیە لە خۆداپۆشین، کاتێك باس لە نەبوونی ماف دەکرێت بەگشتی خەڵك وەربگرین و بەتایەتی ئافرەتان، ئەمە خۆی هۆکارێکی خۆشاردنەوە و دوورخستنەوە نییە لەو ئەرکەی کە لە سەرشانیانە؟

**د.صەباح:** ئەم دووانە دوو وتەی پێکەوە بەستراون، کە باسی ماف دەکرێت مانای ئەوەیە کە لە بەرامبەر ئەومافەوە واجب دەبێت لەسەرشانی کە خۆی مافەکە جێبەجێبکات، بەڵام ئەگەر ئێمە تەنها تەرکیزبکەینە سەر واجبەکە لایەنی مافەکە نەخوێنینەوە، باسی مافی بۆ نەکەین، ئەمەش هەڵەیە، بەڵام ئەگەر بێین ئێمە خوێندنەوەیەکی تازە بۆ فیقهو یاساو شەریعەت بکەین، تەماشادەکەین ئەوەی کە ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی منە، لە ڕاستیدا بۆ بەدەستهێنانی مافە بۆ کەسێك یان کەسانێکیتر.

بۆنموونە، ئەرکی سەرشانی منە مرۆڤێکی ڕێکوپێكو چاکەکارو چاکەخوازو دڵسۆزبم، بەباشی هەستم بەئەرکەکانی خۆم، ئەمە ئەرکی سەرشانی منە، بەڵام کە جێبەجێمکرد لەولاوە مافێکی گەورە و چەندین ماف بۆ خەڵك دەستەبەردەبێت، بەهەمانشێوەی من کەسێك هەندێك مافی لەسەرشانە ئەگەر جێبەجێی بکات مافەکانی من دەستەبەردەبن، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێمە تەماشایەکی سەرتاپاگیر بۆ

بنەمای یاساکە بەپێوەری ئیسلامی بکەین، ئەگینا لە یاسا ئیسلامییەکاندا ئەوەنییە کە ئەرکەکان زیاتربن لە مافەکان، نەخێر ئەرکەکانمان هێندەی مافەکانمانە، واتە ئەوەی کە ئەرکی سەرشانی منە بۆ دەستەبەرکردنی مافی کەسانیتردەبێت دەستەبەری بکەم، ئەوەی کە ئەرکی سەرشانی کەسانیتریشە، بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی منە. جاری واهەیە تۆ هەڵدەستیت بەئەرکەکانی سەرشانی خۆت، بەڵام ئەو هەڵناستێت بەئەرکەکانی سەرشانی خۆی، لێرەدا کێشە دەکەوێتە ناو مافەکان، لەبەرئەوە هەرکەسێك هەستێت بەئەنجامدانی ئەرکەکانی خۆی تەماشادەکەین هەموویان دەستەبەربوون و بەدیهێنانی مافەکان بۆ هەموو خەڵك جێبەجێ بووە.

ئەگەر یەکێك بیەوێت خۆی بدزێتەوە لە بەرپرسیارێتی، دەتوانێت جۆرەها بەهانە بهێنێتەوە بڵێت من مافم نییە، بەڵام ئێمە پێیدەڵێین تۆ مافت هەیە، بەڵام ئەو کەسەی کە مافەکەت بۆ ناسەلمێنێت هەرگیز ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ نەکردوە، ئەو کە پێچەوانەی یاساو شەریعەت دەکات نابێت بیکەیت بەپێشەنگی خۆت، لەبەرئەوە ئێمە وەك مرۆڤێکی بەرپرس، وەك هاووڵاتییەکی لێپرسراو چاو لەوکەسانە بکەین بەئەرکەکانیان هەڵدەستن، چاو لەوکەسانە نەکەین کە لە یاسا دەردەچن و واز لە ئەرکەکانیان دەهێنن بەبەهانەی ئەوەی کە نایانەوێت ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن، بەبەهانەی ئەوەی یاخیبوون لە کۆمەڵگاو، نایانەوێت ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن گوایە چونکە مافیان نییە. ئەگەر یەکێك فەرمانبەربێت لە فەرمانگەیەکدا هەستا بەئەرکەکانی، ئەوسا بۆی

هەیە داوای ماف بکات، بەڵام هەڵنەستێت بەئەرکەکانی، بۆی نییە باسی ماف بکات، یەکەمین هەنگاو بەرپرسیارێتییەو دواتر داواکردنی ماف، ئەگەر ئەمە بڵاوبێتەوە لە ناو خەڵکدا دیارە ئەنجامەکەی شایستەی قبوڵکردنە.

**ئامادەبووی سێهەم:** ئیسلام کە ماف دەدات بەتاکەکانی خۆی، هەموو مافێکی پێدەدات بەڵام سنوری بۆ داناوە، ئایا هەمان ماف دەدات بەکەسانی نامسوڵمان لە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامییدا؟ ئایا من دەتوانم مافی بڵاوکردنەوەی بانگەوازی لێبگرم؟

**د.صەباح:** بەڵێ ماف دەدات، بەڵام با هەموو ئەوبانگەوازانەی کە دەکرێت لەسەر بنەمای زانست بێت، واتە کاتی خۆی کە دەوڵەت دەوڵەتی ئیسلامییش بوو، فەیلەسوفی ئیسرائیلی (سەعدی کوڕی مەشهوری ئیسرائیلی) کە بە (ئیبن کەمونە) ناسراوە، پەرتووکی نوسیووە دژی ئیسلامو بڵاویش بووەتەوە، بەڵام چونکە جنێوی تیادانەبووو ناوزڕاندن و ناشیرینکردنی تیادانەبوو، ڕێگەی لێنەگیرا. ئێمەش وەك مسوڵمان بانگەوازی خۆمان لەسەر بنەڕەتی جنێوو ناوزڕاندن ناکەین، واتە ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی هەبێت وەك چۆن ڕێگانادات بەنامسوڵمانێك بانگەوازی خۆی بڵاوبکاتەوە بەجنێوو بەناوزڕاندنی مسوڵمانان، بەهەمانشێوەش ڕێگانادات بەمسوڵمانێك بێت بەناوی بانگەوازەوە بۆ ئیسلام، قسە بەنامسوڵمانان بڵێت، ئەو حاڵەتانەش کە دەبینرێن کەسانێك خۆیان بەمسوڵمان دەزانن، پەرتووك

دەنوسن بەناشیرینی باسی کەسانیتر دەکات، ئەوە لە یاسا ئیسلامییەکە دەرچوون. ئێمە ئایەتێکی راشکاوی موحکەممان هەیە کە خوای پەروەرگار دەفەرموێت: ﴿وَلاَتَسُبُّواْ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ فَيَسُبُّواْ اللّهَ عَدْواً بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ الٲنعام:١٠٨. واتە ئێمە تەنانەت بۆمان نییە بەقسەی ناشیرین باسی بکەین، بەڵام ئەگەر یەکێك بیەوێت بیروباوەڕی خۆی بخاتەڕوو، تەنانەت بۆی هەیە ڕەخنە بگرێت، بەڵام وەك (خیرت فیلْدەرز) سیاسەتوانی دانیمارکی نەکات فلیمێك دەربکات ناوی بنێت فلیمی فیتنە و دژ بەمسوڵمانان و سوکایەتی بەپێغەمبەری ئیسلام بکات، چونکە ئەگەر تۆ بانگەوازبکەیت دەبێت رەچاوی ئەو شوێنە بکەیت کە بانگەوازەکەی تیادادەکەیت، پێویستە هەموو شتێك لە چوارچێوەی یاسادا بێت و یاسا پێشێلنەکرێت، ئەو یاسایەی کە زۆرینەی خەڵك بڕوایان پێیەتی و دەنگیان پێداوە....

# مافی جیاوازیی ( حق الاختلاف )

ئەم باسە، پەیوەندی هەیە بەئەمڕۆی هەموو کەسێکی بیرمەندو ووشیارەوە، لە هەموو لایەنەکانی ڕەوشت و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی ئێمەدا پێویستیمان بەچەسپاندنی ئەم مافەو هێنانەدیی هەیە لە چوارچێوەیەکی شەرعیو ئەخلاقیدا، بەوشێوەی ببێتە خێرو خۆشی و ببارێت بەسەر کۆمەڵگەکەمانداو ببێت بەخێرو خۆشیو ببارێت بەسەر وولاّتەکەماندا، نەك ببێت بەمایەی نەگبەتی و مەینەتی، وەك زۆرجار خراپمامەڵەکردن لەگەڵ جیاوازیدا، شەڕو ناخۆشیی زۆری لێکەوتووەتەوە، کاتێك هاتوون بەشێوەیەکی نادروست و ناوەستایانە مامەڵەیان لەگەڵ ئەم جیاوازییانەدا کردووە و جیاوازییان بەشێوەیەك لە کوفرو گومان و تاوان و گوناه قەڵەمزەد کردووە لە ناو خەڵکدا.

دەربارەی ووشەی جیاوازی (الاختلاف)یش، گەر بگەڕێینەوە بۆ فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبی، ووشەی (الاختلاف) چاوگەیەکی زیادکراوە، واتە (مصدر مضاف فیە) کە لە بنەڕەتدا لە سێ پیتی (خ،ل،ف) وەرگیراوە، ئەم پیتە سەرەکییانە لە زمانی عەرەبیدا وەك (ئیبن فارس) خاوەنی (معجم المقاییس) باسی دەکات کە ماناکانی ئەم سێ پیتە (خ,ل,ف) کە پێکەوەبن لە دەوری سێ مانا دەسوڕێنەوە:

**مانایەکیان:** بریتییە لە جێگرتنەوە، واتە کەسێك بڕوات و یەکێك بێتە جێگەکەی. وەك ووشەی (خلف) بەکاردەهێنرێت، ئەوکەسەی کە جێگەی یەکێکیتر دەگرێتەوە پێیدەڵێن (خلف). یان دەڵێن فلان کەس خەلەفێکی باشە بۆ سەلەفێکی باش یان بەپێچەوانەوە، یان وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ﴾ الأعراف:١٦٩. واتە کۆمەڵێك بوون بەجێگرەوەی ئەوان، تەنانەت ووشەی خیلاف لەمەوە هاتووە، ووشەی (خەلیفە)ش لەبەرئەوە پێیدەوترێت خەلیفە، چونکە کەسێك حوکمڕان بووە و وەفاتی کردووە یان لاچووە، کەسێکی دیکە هاتووەتە شوێنی.

**مانای دووەم:** بریتییە لە(پشت)، کە دەوترێت (خلف) واتە پشتی یەکێك.

**مانای سێهەم:** هەرسێ پیتی (خ,ل,ف) بریتیین لە دروستبونی گۆڕان وەك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت (لخلف فم الصائم اطیب عند الله من ریح المسك). کەواتە (خُلف) یان (خلَف) یان (خلفە) ئەمە بەمانای گۆڕانی بۆنی دەمی مرۆڤە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت ڕۆژووەوان کە بۆنی دەمی دەگۆڕێت لە لای خوا لە بۆنی میسك خۆشترە.

تەنانەت یەکێك کە بەڵێنێك دەدات و دەیگۆڕێت، پێیدەوترێت (خیلاف وەعد) (أخلف وعدە).

کەواتە لە بنەڕەتدا ووشەی (اختلاف) هەڵگری ئەم سێ ماناییە:

**یەکەمیان:** بریتییە لەوەی کە کۆمەڵێك خەڵك هەریەکەیان بۆچوونێکی هەیە، بۆی هەیە بۆچوونێك جێگە بەبۆچوونێکی دیکە چۆڵبکات.

**دووهەمینیان:** بۆی هەیە بۆچوونێك لە پێشەوە بێت، بۆی هەیە لە پشتەوەبێت، هەموانیش دەزانن شتێك لە پێشەوە بێت یان لە پشتەوەبێت ئەمە شتێکی گوێرەییە لە نێوان ئەم دووشتەدا، واتە هەر شتێك لە پێشی شتێکەوەبێت دەتوانیت بڵێیت ئەم لە پێشیەوەیەتی و دەشتوانیت بڵێیت ئەم لە پشتییەوەیەتی.

**سێهەمیان:** بریتییە لە گۆڕان، کە دەوترێت (اختلاف الرأی) واتە بۆچوونەکان قابیلی گۆڕانن. بوونی جیاوازی، کە باسی جیاوازی دەکرێت، پەیوەندیی هەیە بەمانا زمانەوانییەکەوە، کاتێك دەوترێت جیاوازی هەیە لە نێوان زانایاندا یان جیاوازی هەیە لە نێوان بیرمەنداندا، لە ڕاستیدا ئەمە واتای ئەوەیە کە ئەم بۆچوونانە شایستەی ئەوەن کە جێگە بەیەکتر چۆڵ بکەن و جێی یەکدی بگرنەوە.

ئەم بابەتە بەم مانایە لە ڕاستیدا لە کۆنەوە کەلتوری مسوڵمانانەو لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا گرنگی پێدراوە و باسی لێوەکراوە، وەك حەقیقەتێك سەلمێنراوە. لەسەردەمانێکدا کە خەڵك بوون بەئەهلی دەمارگیری، ئەم مافە شێوێنراوە، واتە تا کاتێك کەسەکان زانابن، خوێندەوار بن، ئاسۆی بیریان فراوانبێت، مافی جیاوازی بەیەك دەدەن. بەڵام گەر کەسەکان دەمارگیرو نەزان و ناپێگەیشتووبن، مافی جیاوازی بەیەکنادەن، بەڵکو ئەوکەسەی کە دەستەڵاتی هەیە بەسەریانەوە

دەڵێت دەبێت هەرهەمووتان وەك من وابن، وەك فیرعەون دەیوت: ﴿مَا أُرِيكُمْ إِلاَّ مَا أَرَى﴾ غافر٢٩. من شتێك ناخەمە پێش چاوی ئێوە بێجگەلەوەی کەمن بەباشی دەزانم بۆ ئێوە، کەواتە فیرعەون ئەو عەقڵییەتەی هەبوو قبوڵی جیاوازی نەدەکرد، ئەوەی قبوڵ نەدەکرد کە لە کۆمەڵگەکەدا بیروبۆچوونەکان جیاوازن، لەسەردەمانیتریشدا بەهەمانشێوەی ئەو وابووە.

**ئەم مافی جیاوازییەش چەندین ڕەهەندی هەیە:**

**یەکەم:** خوای پەروەردگار کە باسی بەڵگەو نیشانەکانی خۆیمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ﴾ الروم٢٢. واتە بەشێك لە نیشانەو بەڵگەکانی خوای پەروەردگار:

**یەکەم:** دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بەوشێوەی کە ئێوە دەیبینن، هیچ کەموکووڕییەکی تێدایە؟، بۆمان هەیە گلەیی لە ئاسمان بکەین بڵێین ئاسمان جۆرێکیتر بوایە و زەوی جۆرێکیتر بوایە.

**دووەم:** جیاوازی زمانەکانیش تەنها جیاوازی زمانەوانی نییە! تەنانەت جیاوازی بیروبۆچوون، جیاوازی لۆجیك دەگرێتەوە، چونکە ووشەی ﴿لسان﴾ یەکێك لە ماناکانی زمانە، ئەگینا لە چۆنێتی بیرکردنەوە و ئاستی مەعریفیشدا مرۆڤەکان ئەو جیاوازییانەیان هەیە، بوونی ئەم جیاوازییانە نیشانەی گەورەیی خوان، واتە خوای پەروەردگار نەیویستووە ئەم کەسانە یەك قاڵب بن، لە قۆناغێکی زۆر سەرەتایی مرۆڤایەتییدا مرۆڤایەتی یەك بەش بوون ﴿وَمَا كَانَ النَّاسُ إِلاَّ

أُمَّةً وَاحِدَةً فَاخْتَلَفُواْ﴾ يونس:١٩. بەڵام ئەم پیتی(ف)ـە ڕۆڵدەبینێت واتە کە مرۆڤایەتی زۆر فراوان بووو زۆر گەشەی کرد، زەمینەی جیاوازی دروستبوو، بەڵام لە ئایەتێکیتردا دەفەرموێت ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ البقرة:٢١٣. واتە خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی بۆ ناردون بۆ ئەوەی مژدەیان پێبدات و بیانترسێنێت، مانای چی مزگێنییان پێبدات و بیانترسێنێت؟ واتە مزگێنییان پێبدات ئەگەر باش مامەڵە بکەن لەگەڵ ئەم جیاوازییە، ئەنجامی باشیان لێدەستدەکەوێت، بشیانترسێنێت بەوەی ئەگەر خراپ مامەڵەبکەن لەگەڵ ئەم جیاوازییەدا، ئەوە ئەنجامی خراپیان دەستدەکەوێت، کەواتە ڕۆڵی پێغەمبەران ئەوەیە خەڵك فێری لۆجیکی گفتوگۆو قسەکردن و "بۆچوونگۆڕینەوە"یان بکەن، ئەگەر تەماشای قورئانی پیرۆز بکەین، تەماشای کتێبەکانی دیکەش بکەین، ئەو کتێبانەی کە نیسبەت دەدرێنە پاڵ پێغەمبەرانی پێشوو، ئەوانەش خەڵکیان بانگ کردووە بۆ قسەکردن، ئەگەر خەڵك بانگ نەکەیت بۆ قسەکردن جیاوازییەکان شایستەی ئەوەن کە شەڕی لێبکەوێتەوە، واتە دوو گەل‌و دوو نەتەوە تامەجالی گفتوگۆیان هەبێت زەمینەی ئاشتی و ئازادی لە نێوانیاندا زۆرە، بەڵام ئەگەر گفتوگۆ نەماو یەکێکیان یان هەردوولا دەرگای گفتوگۆیان داخست، ئەوەمانای ئەوەیە کە شەڕ بەڕێوەیە.

دیارە جیاوازی جۆراوجۆرە: جیاوازی هەیە لە زمان و نەتەوە و گەل‌و وولات، لە هەمووی گرنگتر جیاوازی ئاین و بیروباوەڕو ڕەوتی

فیکرییە، جیاوازی بیروبڕوای سیاسییە، جیاوازی لە ناو ئاینێکی دیاریکراودا، جیاوازی فیقهی، چۆنێتی تێگەیشتن لە دەقەکان، نەك تەنها لە ئیسلامدا، بەڵکو لە ئاینی جولەکەشدا، ئەو جیاوازییانە هەمووی هەیە، بۆ نموونە ئەگەر سەیری مێژووی ئاینەکان بکەین باسی ئەوەدەکات کە جولەکەکان سێ کۆمەڵ بوون:١.(صەدوقییەکان) ٢.(یەعقوبییەکان) ٣. (حسیدیمەکان)، ئەمە واتە دروستبوونی لقوپۆپ لە ئاینی جولەکەدا هەتا سەدەی هەشت بەردەوامبووە، لە ئاینی مەسیحیشدا بەهەمانشێوە، ئێمە سەیری مێژووی ئاینەکان دەکەین باسی ئەوەدەکات کە دینی مەسیحییەکان بوون بەدوو بەرەوە، بەشێکیان یەکتاپەرستان بوون، لەگەڵ بەشی پەیڕەوانی کەنیسە. یەکتاپەرستان لە مێژوودا هەتا سەدەی چوارەمو پێنجەمی زاینی مابوون (ئەبیون)مان هەبووە، (سمیصاتی)مان هەبووە، لەگەڵ گروپی (ئەریۆس)ـەکان، ئەمانە یەکتاپەرست بوون، باوەڕیان بەسێ خوایەتی نەبوو، باوەڕیان بەوەنەبوو کە خوا سێ ڕەهەندبێت و سێ لایەن بێت، دوای ئەوە پەیڕەوانی کەنیسە چەند گروپێکیان هەیە لە کۆندا، چەند گروپێکیان هەیە لە تازەدا، گروپە کۆنەکان وەك (نەصتوری)ـیەکان،و (یەعقوبی) - یەکان،و (مەرکانی)ـیەکان. گروپە تازەکان: (کاثولیك)[١]ـەکان و کەنیسەی (ئەرثودوکس)[١] و کەنیسەی (پرۆتستانت)[٢]،

---

[١] - کاتولیك: مەزهەبێکی مەسیحییە (اختیارات زیادی بە کشیشها قائلیندو أنهارا نماینده حچرەت مسیح می دانند، پاب راپیشوای خود دانسته وبرای أو مقام شامخی قائلد. د.سید محمود اختریان، اگلاعات عمومی پیام،تهران، کتاب خان ملی إیران، چاپی ٢، ١٣٨٦، لا٣٢٤.

هەن. ئەو جیاوازییانە هەبووە، ئەم جیاوازییانە بەلۆژیك مامەڵەی لەگەڵ بکەیت دەبێت بەهۆکاری دەوڵەمەندی، بەڵام ئەگەر بەعەقڵی سوڵتەگەری مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و کەسێك بیەوێت خۆی بسەپێنێت و ئەوانیتر نەهێڵێت، ئەوە قابیلی قبوڵ نییە، تەنانەت هاتنی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر) بەدرێژایی مێژوو بۆ ئەو بابەتە هاتوون کە جیاوازییەکان ئاڕاستەبکەن، واتە بەرەو ئامانجێك خەڵکەکە ڕێبەرایەتی بکەن بۆ ئەوەی سەریان لێنەشێوێت و توشی هەراو جەنگو کوشتار نەبن، لە ئیسلامیشدا بەهەمانشێوە ئەو جیاوازییانەی کە دروستبوون دەتوانین بیکەین بەدووبەشەوە:

**یەکەم: جیاوازیی پەسەند.**

**دووەم: جیاوازیی ناپەسند.**

جیاوازی پەسەند بریتییە لە جیاوازیی زانستی، جیاوازیی فیقهی لە نێوان زانایاندا، جیاوازیی لە نێوان زاناکاندا کاتێك دەیانەوێت باشترین کەش بدۆزنەوە و بۆ ئەوەی ڕێنمایی بدۆزنەوە و ڕێبەریی مرۆڤ بکەن بۆ لای خودا.

---

[1] –أرتدکس: مەزهەبێکی مەسیحییە پەیڕەوانی ئەم مەزهەبە بڕوایان بەساباتبوونی دینی مەسیح هەیەو بڕوایانوایە کە ناگۆڕێت،و هیچ کەس ناتوانێت گۆڕانکاری بکات لەدینی مەسیحییدا. د.سید محمود اختریان، اگلاعات عمومی پیام، تهران، هەمان سەرچاوەی پێشوو لا٣٢٤.

[2] – پرۆستانت: مەزهەبێکی مەسیحییە بڕوایان بەنوێگەریو گۆڕانکاری هەیە لەناو دینی مەسیحییدا بەپێی تێپەڕبونی کات. (د.سید محمود اختریان،هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا٣٢٤).

جیاوازیی ناپەسندیش بریتییە لەو جیاوازییەی کە کەسانێك لە دەرەوەی زانست دروستیدەکەن لەناو خەڵکدا، یاخود بریتییە لەو جیاوازییانەی کە خەڵك بەخراپی، بەدەمارگیری، بەنەزانی، پەرەی پێدەدەن و دەیانەوێت بەشێوەیەك بەکاریبهێنن بۆ نانەوەی ئاگری ئاژاوە.

بۆ جیاوازی یەکەم، ئاماژە بەوئایەتە دەکەین کە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾ هود١١٨. بەتەمامەبن کە ئەم خەڵکە هەمووی یەك بەرنامەو یەك بیروباوەڕی هەبێت، خوای پەروەردگار ئەمە بەوانە فێری پێغەمبەرەکەی دەکات، فێری دەکات ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ الكافرون:١. لە کۆتاییەکەیدا دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ، لاَ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ، وَلاَ أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ، وَلاَ أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ، وَلاَ أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ، لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ،﴾ الكافرون:١-٦، دەفەرموێت: ئێوە ئاینی خۆتان و ئێمەش ئاینی خۆمان، واتە هەرکەس بڕوای بەچی ئاینێك هەیە بادوایبکەوێت، بەڵام ڕێگەنادرێت بەکەسێك، بێت بەناوی بەرگری لە ئاینی خۆی خەڵکیتر بکوژێت ﴿وَلاَ تَعْتَدُواْ﴾ البقرة١٩٠. بابەتی دەستدرێژیکردن ڕێگەی پێنادرێت. یاخود قورئانی پیرۆز فێرماندەکات ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ آل عمران:٦٤. ئەی خاوەن کتێبەکان! وەرن بائێمە لەسەر یەك وتە ڕێکبکەوین، واتە ئێمە ڕەنگە لە تەفسیری وتەکەدا جیاوازییمان

هەبێت، بەڵام باناونیشانێکی گشتی کۆبکەینەوە ﴿أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً﴾ آل عمران:٦٤، پەرستش لەسەر ئەو بنەمایەبێت:

یەکەم: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً﴾ آل عمران:٦٤.

دووەم: ﴿وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ﴾ آل عمران:٦٤. کەسمان خۆمان نەکەین بەخودا بەسەر خەڵکیترەوە لەجیاتی خوای پەروەردگار. جا ئەمە دەروازەیەکە لە ڕاستیدا لە قورئانی پیرۆزەوە مافی جیاوازبوون دراوە بەمرۆڤەکان، ئەو مافە مافێکی یەکلاکراوە و سەلمێنراوە.

دیارە باسکردن لە جیاوازی لەسەردەمێکدا کوفرو تاوان بووە، قابیلی هەزم نەبووە بۆ خەڵك، لەبەرئەوەی خەڵکی ئێمە لەم سەردەمانەدا کە سەردەمی دواکەوتن،و سەردەمی چاولێکەرییە، عادەت دەکەن بەوەی کە کەسێك لەباتی خەڵکی دێیەك قسەبکات و بیربکاتەوە، سەرۆکێك لەباتی هەمووخەڵکەکە بڕیاردەدات، ئەمە ئەگەر ئێمە ئاگامان لە مافی جیاوازی نەبێت یان ئاگامان لەکۆی مافە یاساییەکان نەبێت، کۆمەڵگە دەکات بەکۆمەڵگەیەکی بێ بیـر، دەیکات بەکۆمەڵگەیەکی بێناوەڕۆك، بەڵام ئێمە تەماشادەکەین پێغەمبەری خوا(د.خ) هاوەڵەکانی کۆدەکردەوە کە بابەتێکی گرنگ بهاتایەتەپێشەوە، پێغەمبەرێك کە وەحی بۆ دێت و بەوەحی پاڵپشتی کراوە و خوای پەروەردگار پشتیوانی لێدەکات و دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى ۞إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى ﴾النجم٣-٤. تەنانەت

پشتیوانیی قسەکانی دەکات، پشتگیریی دڵی دەکات ﴿مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى﴾ النجم:١١. پشتگیریی چاوی دەکات﴿مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى﴾ النجم:١٧. پشتگیریی هەموو ئەمانەی دەکات، پێغەمبەرێك بەوهەموو مەرجانەوە، دەبینیت مافی جیاوازی دەدات بەخەڵك، مافی ئەوەدەدات بەهاوەڵانی، کۆیاندەکاتەوە ڕاوێژیان لێوەردەگرێت، ڕاوێژیان پێدەکات کە بابەتێکی گرنگی چارەنوسساز بێتەپێشەوە، ئەمە وانەیە بۆ ئەمڕۆی مرۆڤایەتی، بۆ پەیڕەوانی ئەو پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر) کە ئەوانیش بڕوایان هەبێت بەجیاوازی، بڕوایان هەبێت بەوەی کە دەبێت کەسەکان خۆیان بیربکەنەوە، خۆ ئالیەتی بیرکردنەوە هەر ئەوەنییە کە بیربکەنەوە، ئالیەتی هەیە واتە هەلێك بۆ ئەوەی بتوانێت خاوەنی بیربێت و بۆچوونی هەبێت، بتوانرێت لە بابەتە چارەنوسسازەکاندا ڕاوێژی لێوەربگیرێت، دەبێت هەندێك مەرجی تێدابێت، هەلومەرجەکەش بەخوێندن و خوێندەواری و شارەزایی دروستدەبێت، بەوەی لە بوارێکدا پسپۆڕیی پەیدابکات، لە بوارێکی مەعریفی یان لە بوارێکی زانستی یان لە بوارێکی ئەکادیمیدا خۆی پەروەردە بکات، پەروەدەی بکەن و باری بهێنن، ڕای بهێنن بۆ ئەوەی بتوانێت شایەنی رای خۆی بێت، تەماشادەکەیت پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) فەرموودەیەکی هەیە لە صەحیحی بوخاریشدا هاتووە، دەفەرموێت (اقرؤوا القرآن مائتلفتم عليه، فإن اختلفتم فيه فقوموا عنه)، دەفەرموێت: پێکەوەقورئان بخوێنن هەتا هاودەنگن لەسەری، هەرکات جیاوازییتان بۆ دروستبوو، ئیتر دەستیلێهەڵبگرن، واتە جیاوازییەکانی

خۆتان بپارێزن، یەکدەنگیتان هەبێت لەسەر قورئان بۆ کارکردن، بەڵام کە جیاوازییتان هەبوو لەسەری، دژ بەیەك مەوەستن، ئەمە لێکدانەوەیەکە بۆ ئەو فەرموودەیە، بەڵام بۆ ئەمڕۆمان ئەو لێکدانەوەیە زۆر ڕێگەمان بۆ دەکاتەوە، لە نێوان یارانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر) ـ هەتا پێغەمبەر لە ژیانیشدابوو ـ جیاوازی هەبوو، کە لە شەڕی بەدردا کۆمەڵێکیان بەدیلگرت نزیکەی حەفتا کەسبوون، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) ڕاوێژی کرد بەهاوەڵان، ئەبوبەکری ڕاستگۆ فەرمووی ئەمانە خزمی خۆتن، لێیانخۆشبە، عومەری کوڕی خەتتاب فەرمووی ئەمانە سەرانی کوفرن بەبۆچوونی من لە ملی هەموویان بدەن، ئەمە دوو بیروبۆچوونی (سەدوهەشتا پلە) دژی یەك بوون، بەڵام پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) لایەنی بەزەیی و میهرەبانی هەڵبژارد، فەرمووی بەئەبوبەکر: تۆ لە ئیبراهیم(سەلامی خوای لەسەر) دەچیت، ئیبراهیم فەرمووی خوایە! ئەگەر سزایان دەدەیت هەر بەندەی خۆتن، بەڵام ئەگەر لێشیان خۆشببیت تۆ بەخشندەیت، بەڵام ئەی عومەر! تۆ لە نوح(سەلامی خوای لەسەر) دەچیت، نوح دەیفەرموو خودایە! هیچ کەسێك لەمانە لەسەر ئەم زەوییە نەهێڵیت. کەواتە دوو لۆجیکی جیاوازو دوو بیرکردنەوەی جیاوازو دوودەرئەنجامی جیاوازیشیان هەیە، بەڵام پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) حوکمی بەقسەکەی ئەبوبەکر کرد، بۆچوونەکەی عومەریشی وەك بۆچونێك پاراست، دووبارە قورئانیش بەپێی مەنتیقی خۆی بۆچوونەکەی عومەری

هەڵبژارد، سەرزەنشت و گلەیی خۆشەویستانەی لە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) کرد.

تەماشابکەن لە سەردەمی پێغەمبەردا جیاوازی هەبووە لە نێوان هاوەڵاندا،و پێغەمبەر بەو شێوازە ئاراستەی کردوون کە ڕێز لەو جیاوازییە بگیرێت.

دوای وەفاتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) دەبینین لە زۆر بابەتدا هاوەڵانی پێغەمبەر بیروبۆچوونی جیاوازیان هەبووە و ئەو بیروبۆچوونە جیاوازە گرنگ‌و پێویست بووە و باشبووە، بۆ نمونە:

ـ لە بابەتی خەلافەتدا سەیردەکەیت کۆچبەران دەیانوت با خەلیفە لە ئێمە بێت، پشتیوانان دەیانوت با لە ئێمە بێت، جیاوازی دروستبوو، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە جیاوازی دروستدەبێت سەرچاوەی شەرعیەتێك هەبێت بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو جیاوازییانە، بۆچوونە جیاوازەکان وەك‌و بیروبۆچوونی جیاواز پارێزراون، دەبێت بنوسرێن و بوترێن، واتە تۆ سبەینێ دەچیتە ناو کۆڕێکەوە داوای بۆچوونت لێدەکرێت، دەگونجێت زۆرینەی خەڵکەکە پێچەوانەی بۆچوونەکەی تۆبن، بەڵام تۆ بۆچوونە جیاوازەکەی خۆت بڵێ‌و تۆماری بکە.

ـ لە بابەتی ئەوانەی کە زەکاتیان نەدەداو پێشتر ئامادەبوون کە زەکات بدەن بەپێغەمبەر، بەڵام دەیانوت ئێمە زەکات نادەین بەئەبوبەکر، خیلاف دروستبوو لە نێوان هاوەڵاندا، ئایا لەگەڵیاندا بجەنگن یان نەجەنگن؟ پێشەوا ئەبوبەکر بۆچوونێکی هەبوو، پێشەوا عومەر بۆچوونێکیتری هەبوو خوا لێیان ڕازی بێت، بەڵام ئەبوبەکر کە

بەڵگەی خۆی باسکرد، ئەوکاتە عومەر ئەوەندە حەقخواز بوو پاشەکشێی لە بۆچوونەکەی خۆی کرد.

ـ جیاوازی دیکەمان زۆرە هەر لە نێو هاوەڵانی پێغەمبەردا(د.خ)، دەبینین ئەو جیاوازییانە لە تۆمارە فیقهییەکاندا بۆ ئێمە باسکراون و ماونەتەوە، لەبەرئەوەی ئێمە ئەمڕۆ پێویستمانپێیەتی لەناوخۆماندا و لەناو خەڵکدا، نەك هەر بۆ خۆشمان، بۆ بۆچوونی بەرامبەریشمان، ئەمە هەڵوێستێکە پێیدەوترێت (إنصاف)، کە سیفەتی ئەوکەسەیە دان بەبوونی بەرامبەرەکەیدا دەنێت و ڕێز لە بوونی بەرامبەرەکەی دەگرێت و نرخی بۆ دادەنێت، نەڵێت ئەوە کەی بۆچوونە، ئەوە کەی قسەیە، واتە بەسووکی باسینەکات.

ـ جیاوازی لە نێوان زانایانی ئوممەتدا، ئەو هەموو پەرتووکە فیقهیی و کەلامی و قوتابخانە ئەدەبی و هـزرییانەی کە لە جیهانی ئیسلامییدا سەریانهەڵداوە، بەڵگەی حاشاهەڵنەگرن لەسەرئەوەی کە بە سروشت گەلی مسوڵمان لە حاڵەتی ئاساییاندا پاراستویانەو پارێزگارییان لێکردووە، ئەم مافە دەبێت ببێتەباوەڕ و کەلتورو بنەما بۆ ژیان، تەماشابکەن (ئیمامی مالیك) لەگەڵ ئیمامی ( ئەبوحەنیفە)[1]دا زۆر

---

[1] – ئەبوحەنیفە: نعمانی کوڕی سابتی کوفی، (٨٠ – ١٥٠ك) ژیاوە، لای زانایانی سەردمی خۆی لەعێراق خوێندوویەتی لەوانە (ئەبویوسف (١٢٦)و محەممەد کوڕی حەسەن(١٨٩)، زفری کوڕی هەزیل (١٥٨)...هتد. پەرتوکی الفقه الاكبر لەئوصولی دیندا نوسیوە، پەرتوکی (المخارج، الوصيه)ی نوسیوە، تاريخ الأدب العربي، احمد الزيات، دار المعرفة، بيروت، الطبعة التاسعة، ٢٠٠٥، ٢٨٠.

جیاوازییان هەبووە لە فیقهـ و لە بنەماکانی ئیجتیهاددا، بەڵام تەماشادەکەیت زۆر ڕێزیان لە بۆچوونی یەکترگرتووە، (ئیمامی شافیعی) بەهەمانشێوە پێچەوانەی مامۆستاکەی بووە کە ئیمامی مالیکە، بۆچوونی خۆی وتووە، بەڵام ڕێزی لە بۆچوونی ئەویش گرتووە، بەڵام خەڵکی ئێمە خراپ لەم بابەتە تێدەگەن، وادەزانن ئەگەر بتەوێت ڕێز لەو بگریت دەبێت بۆچوونی خۆت نەڵێیت، یان ئەگەر بتەوێت بۆچوونی خۆت بڵێیت دەبێت ڕێز لەو نەگریت. لە کۆندا کاتی خۆی ئەرستۆ وتوویەتی: ئەفلاتۆن دۆستمانەو حەقیش دۆستمانە، بەڵام حەقمان لە ئەفلاتۆن خۆشتردەوێت، ئێمەش وەك مسوڵمان هەموو پێشەواکانمان خۆشدەوێت بەڵام لە ڕاستیدا دەبێت حەقمان خۆشتربوێت لەوان، بەڵگەی شەرعییمان خۆشتربووێت لەوان، ئەم ئیسلامەمان لەوان خۆشتربوێت. لە باتەکانیتردا زیاتر باسی ئەم جیاوازییە و کەلتووری ئیسلامی دەکەین.

## وەڵامی پرسیارەکان:

**ئامادەبوویەك:** لە بابەتی جیاوازیی بۆچوون لە ئایینداو پەیوەندیی لەگەڵ فەرموودەی (من بدل دینه فاقتلوه) چۆنە؟ زۆرێك لە خەڵك پێیانوایە کە ئیسلام مافی ئازادی بەخەڵك نەداوە، بەتایبەتی ئازادی گۆڕینی ئاین، ئەوە تاچەند ڕاستە؟

**د.صەباح:** (من بدل دینه فاقتلوه) ئایا ئەم فەرموودەیە ڕێگری نییە لە جیاوازی؟ با لە دەرەوەی ئیسلام نموونەیەك بهێنینەوە، کەسێك لەسەر ئاینێکە جگە لە ئیسلامو دەیەوێت بچێتە سەر ئاینێکیتر، ئەمەش هەمان فەرموودە دەیگرێتەوە، ئەم فەرموودەیە بۆ خۆی مشتومڕێکی زۆری لەسەرە، ئەصڵەن سیستەمی سزادان لە ئیسلامدا هەوڵدەدرێت خوێندنەوەیەکی جیاوازی بۆ بکرێت لەوەی لە ڕووکەشدا دیارە، ئەو خوێندنەوەیەی بۆ دەکرێت کە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) بنەمای سزادانی لە شەریعەتی ئیسلامیو لەسەر بنەمای وەرگیرانی کۆمەڵگە دامەزراندووە، واتە لە هەر سەردەمێکدا کۆمەڵگە چ سزایەکیان پێقبوڵ بێت چ سزایەك مەقبوڵی عورفی خەڵك بێت، ئەو سزایە کاری پێدەکرێت بەپێی شایستەبوونی ئەو تاوانە، کە سەیری سوننەتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) دەکەیت ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت، بۆ نموونە:

لەسەردەمێکدا سزای ئەوکەسەی کە سەرپێچی بکردایەو سیستەمی کۆمەڵایەتی خەڵکی لەناوببردایە، دیارە سزاکەی کوشتن بووە، کە باسی کوشتنیش کراوە بەلای خەڵکەوە وەرگیراوە، بەڵام ئێستا کە باسدەکەین ئەوکەسەی کە مەترسییەکی وا لەسەر کۆمەڵگە دروستدەکات، ئەگەر بیکوژیت لەناو کۆمەڵگە ئەو سزایە پەسەندنییە، دەڵێن بەندی بکە و دووری بخەرەوە، بەنیسبەتی دزیشەوە کەسێك کە دزیی کردووە سەیردەکەیت ئەوکەسە دەستی براوە، بەڵام لە سەردەمێکیتردا ئەوە پەسەندە کە بەندبکرێت، پەسەندییەتی عورفی گشتی خەڵك بەو سزایە، پلەی پەسەندییەتی سزاکە دەردەکات لە شەریعەتی ئیسلامییدا، زیاتر سزاکان بۆ ئەوەیە کە خەڵك بگێڕێتەوە لە تاوان، تەنانەت بۆ جێبەجێکردنیش نییە، لەبەرئەوە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) فەرمووی (ادرؤوا الحدود بالشبهات)، واتە ئەگەر کەسێك بیەوێت لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە تۆ دێیت پێیدەڵێیت ئەمە تاوانێکی زۆرگەورەیە، پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) ئاوای فەرمووە، کەواتە بکوژرێیت ئەوە موقابیلی تاوانەکەتە، بەڵام با بزانین ئایا تۆ چ گومانێکت هەیە واز لە ئیسلام دەهێنیت و واز لە حەق دەهێنیت؟ یەك گومانی بچوکی هەبێت ناکوژرێت..! تەنانەت ئەگەر کۆمەڵێك زانایان بانگکردو لەگەڵی کەوتنە گفتوگۆو قسەیان پێنەهێشت و هەر سووربوو لەسەر قسەی خۆی، ئەوسا حاکم بۆی هەیە سزایەکی بدات کە بە پێی کەلتوری ئەوخەڵکە پەسەندبێت، ئەمە هیچ پێکدادانێکی نییە لە نێوان ئەو ئازادییانەی کە هەیەتی، واتە هەمووکەسێك لە چوارچێوەی ئەو یاساو مەرجەعیەتەی کە

هەیەتی دەتوانێت ئازادبێت، نەك كەسێك بەگۆترە هەرلەخۆیەوە شتێك دێ بەخەیاڵیدا. دەبێت مرۆڤ واعی بێت، ئەو قسە و گفتوگۆیەی دەیكات لەسەر بنەمایەكی لێپرسراوانە بیكات، كەواتە ئەم فەرموودەیە ـ لەگەڵ ئەو مشتومڕەی كە لە سەریەتی ـ من لەگەڵ ئەوەم كە دەیەوێت بڵێت هەڵگەڕانەوە لە دین چەندمەترسیدارە، هەرچەند تاوانە، بەڵام بۆ جێبەجێكردن وەرگەڕاوەكە گەر گومانی بچووكی هەبێت بەپێی یاسای (الشك یفسر لصالح المتهم) واتە: گومان بەسوودی تۆمەتبار لێكدەدرێتەوە، سزانادرێت و مەجالی پێدەدرێت كە جارێكیتر بگەڕێتەوە.

**ئامادەبووی٢: لە** ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا تاچەند ڕێگەدراوە بەجیاوازەكان؟ كاتێك كە دوای وەفاتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) دوو گروپی گەورە دروستبوون كە شیعەو سوننە بوون، ئەم دوو گروپە هەتا چەند سوودیان هەبووە بۆ ئیسلام؟. پاشان دوو گروپ لە عەقیدەدا دروستبوون، ئەوانیش موعتەزیلەو ئەشعەری لە ئەنجامی نەدۆزینەوەی پرسیارەكانەوە. ئایا ئەوە شەریعەتە كە ناتوانێت وەڵامی پرسیارەكان بداتەوە یان تێنەگەشتنی ئێمەیە لە شەریعەت؟.

**د.صەباح:**

ئەم باسەی ئێمە بۆ نیشاندانی بواری جیاوازی بیرو بۆچوونە، كە بوارێكی زۆرفراوانە، تەنها لەوشتانەدا مەجالی جیاوازیمان نییە كە ئایەتێكی یەكلاكەرەوەمان هەبێت یان فەرموودیەكی یەكلاكەرەوەمان هەبێت كە هەموو خەڵك لە لێكدانەوەكەیدا هاوڕابن و كۆڕایان لەسەری

هەبێت، ئەگینا لەو بابەتانەدا کە بەڵگەی گومان بێت و جیاوازی هەڵبگرێت، لە ڕاستیدا هیچ کێشەیەکمان نییە، بۆ نموونە ئەو جیاوازییانەی لە نێوان موعتەزیلەو ئەشاعیرەدا ڕوویدا، هەندێك جیاوازی هەیە وەك لە نێوان شیعەو سوننەدا، لای شیعەو سوننە دەچێتە بازنەی باوەڕەوە، لە ڕاستیدا ئێمە وەك ئەهلی سوننەت و جەماعەت بیروبۆچوونی شیعەمان قبوڵ نییە، بەڵام زانایانی ئێمە وتوویانە شیعە مادام ئەهلی قیبلەن، ئێمە حسابی مسوڵمانیان بۆ دەکەین، ئەوە ماڵ‌وسامان و خوێنیان لە ئێمە حەرامە، بەهەمانشێوە جیاوازیی بیروبۆچوونیان لەگەڵ ئێمە هەیە، ئەوکەسەی کە ئەهلی قیبلەبێت ئێمە حسابی ئەهلی قیبلەی بۆ دەکەین، کەواتە ئەگەر بوارەکە بواری جیاوازیی تیادابێت، ئەوە مافی جیاوازیی پارێزراوە بۆ هەمووکەسێك، لەبەرئەوە زاناکان وتویانە (علی الاصول اتفقوا، فکان حکما، وفی الفروع اختلفوا، فکان رحمة)، زاناکان لەسەربنەما سەرەکییەکان ئەوەی کە بۆچوونی قەتعیی لەسەرە ئیتتیفاقیان کردووە و بووە بەو حیکمەتەی ئیسلام، لە بابەتە جیاوازەکانیشدا جیاوازیی بیروبۆچوونیان هەبووە و ئەمە مایەی ڕەحمەت و خۆشییە بۆ خەڵك، لە هەموو مێژووی ئیسلامدا یەك قوتابخانەی تەفسیرمان نییە، یەك قوتابخانەی قانونیمان نییە، لە ئەدەب‌وهونەردا چەندین قوتابخانەمان هەیە، تەنانەت لە زانستی سیاسیدا چەندین قوتابخانەمان هەیە، بائەو هەموو قوتابخانانە هەبن بۆ ئەوەی تەفسیری یەکتربکەن.

# هۆیەکانی جیاوازی

## دەرئەنجامەکانی نادیدەگرتنی ئەم مافە چین؟

دیارە مرۆڤەکان لە چەند ڕووەوە جیاوازن و کەس ناتوانێت نکۆڵی لەوەبکات کە لەم جیهانەدا کەسانێکی جیاواز دەژین، لە ناو گەلێکدا بیروبۆچوونی جیاواز هەیە، لە ناو ئاینێکدا بیروبۆچوونی جیاواز هەیە، واتە جیاوازی لەوە دەرچووە کە دیاردە بێت، لە دیاردە دەرچووە، بەڵکو یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی یاسای دروستبوونی ئەو جیهانەی کە خوای پەروەردگار دروستیکردووە، بەڵام دیارە جیاوازیی سروشتی جیاوازییەکی جۆراوجۆرە، بەڵام جیاوازیی نێوان مرۆڤەکان بۆی هەیە جیاوازی هەمەچەشن بێت، بۆی هەیە جاوازی دژ بەیەك بێت، ئێمە هەوڵدەدەین باسی ئەوەبکەین کە لە ڕووی زانستییەوە هۆکارەکانی جیاوازیی نێوان مرۆڤەکان چۆن پۆلێندەکرێن؟ بەشێك لە جیاوازییەکان پەیوەندیی بەسروشت خۆیەوە هەیە، ئەو سروشتەی کە خوای پەروەردگار دروستیکردووە سروشتێکی جیاوازە، واتە سروشتێکە پڕە لە جیاوازی، ئاسمانەکان و زەوی، لە ناو ئاسمانەکانداو لە زەویـدا چەند چینمان هەیە، ئەستێرەمان هەیە، لە ناو ئەستێرەکاندا جیاوازی هەیە، چەندین جۆر گیانلەبەرمان هەیە، ئەگەر بڕۆین زانستی زەویناسی بخوێنین، ئەو هەموو جۆرە جیاوازییە هەیە، ئەگەر کیمیا بخوێنین ئەو

هەموو جۆرە لە توخمەکان هەیە، کەواتە بەشێك لە جیاوازییەکان دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی سروشتی، ئەم جیهانی سروشتە فەیلەسوفەکان پێیدەڵێن جیهانی زۆری(کثرة)و جۆری(تنوع)، تەنها جیهانی خودا خۆی جیاوازی هەڵنەگرە، ئەوەی کە جیهانی بەدیهێنەرە لەسەر جیاوازی و فرەیی دروستکراوە، بەڵام بەدیهێنەر بۆ خۆی تاكوتەنهایە بەوەی کە خۆی پەروەردگاری زەوی‌و ئاسمانەکانە و جیاوازی لە بوونیدا نییە.

بەشێکی دیکەی جیاوازییەکان دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی ژینگەی مرۆڤەکان، ئەگەر تەماشابکەیت دەبینیت مرۆڤەکان لە ژینگەی جیاوازدا پەروەردەدەبن، خوێندنی جیاواز وەردەگرن، ئێستا سەلمێنراوە کە هەندێك شوێن، هەندێك جێگا، تایبەتمەندی خۆی هەیە بۆ بیرکردنەوە، شوێنەساردەکان تایبەتمەندیی خۆیان هەیە بۆ بیرکردنەوە، هەلومەرجی مێژوویی کە گەلێکی تێدەکەوێت بەو شێوەیە بیردەکاتەوە، ئێستا میللەتی کورد دوای ڕاپەڕین کەوتووەتە هەلومەرجێکەوە جیاواز لە هەلومەرجی پێش ڕاپەرین، دوای ڕوخاندنی ڕژێمی بەغدا هەلومەرجێکی نوێی بۆ هاتۆتەپێش، تەماشادەکەیت ئەم هەلومەرجانە بۆ خۆی جیاوازی بیروبۆچون دروستدەکات. بوونی گوشارو پەستان لەسەر مرۆڤ، جۆرێك بیرکردنەوە لەسەر مرۆڤ دروستدەکات کە بە لاچونی ئەو پەستانە بیرکردنەوەکان دەگۆڕێت و کەسەکان وەگۆڕێت، کەواتە بەشێك لە جیاوازییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ژینگە. بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکەلتورەی وەریدەگریت، تەماشادەکەیت ئەوکەسەی کە کەلتورێکی فرەچەشن یان کەلتورێکی

پانۆرامی وەردەگرێت، جیاوازە لەوەی کەلتورێك وەردەگرێت بەیەك ئاڕاستە، ئەوەی کە جیهانی زۆرتر گۆڕابێت، عەقڵی پاراستن و وەرگرتنی جیاوازترە لە کەسێك لە ناوەندەکەی خۆی دەرنەچووبێت، کەواتە بەشێك لە جیاوازییەکان پەیوەندیی بەژینگەوە هەیە و بەشێکی پەیوەندی بەکەلتورەوە هەیە.

بەشێکی دیکەی، پەیوەندیی بەسروشتی مرۆڤەوە هەیە، هەندێك مرۆڤ هەن کەسانێکی کۆمەڵایەتین و تێکەڵی خەڵك دەبن و بەبێ خەڵك ناژین (ئەهلی صوحبەتن ـ وەك تەصەوف باسی دەکات ـ، بەشێکیشیان ئەهلی گۆشەگیری و عوزلەتن و تێکەڵی خەڵك نابن)، کەواتە جیاوازی بەلایەن کەسانی ئەهلی صوحبەتەوە مانایەك پەیدادەکات و بەنیسبەت ئەهلی عوزلەت و گۆشەگیرییشەوە مانایەکیتر پەیدادەکات.

بەشێکیتر لە جیاوازیی، لە سەرچاوەکانی فێربوونەوە سەرچاوەدەگرێت، ئەوکەسەی کە بنەمایەکی فیکری ئاینیی هەبێت بەجۆرێك بیردەکاتەوە،و ئەوکەسەی کە بنەمای سیکولار یان هەر بەرنامەیەکیتری لە دەرەوەی ئاینەوە هەبێت بەجۆرێکیتر بیردەکاتەوە، خەمەکان هەیانە ئاینییە و هەیانە خەمی لە دەرەوەی ئایندایە.

کەواتــە بــوونی سەرچــاوەگەلی جیــاواز بــۆ زانــین و تێگەیــشتن، هۆکارێکیترە بۆ دروستبوونی جیاوازی، کەواتە هـیچ جیاوازییـەك بـەبێ هۆ دروستنابێت، دەبێت هۆی هەبێت.

لەناو چوارچێوەی یەك ئایندا، بۆ نموونە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، ئەو جیاوازییانەی کە دروستبوون هی چییە؟ بەشێکی پەیوەندیی

بەسەرچاوەی فێربوونەوە هەیە، بەشێکی پەیوەندیی بەکەلتورەوە هەیە. بەشێکی پەیوەندیی بەسەرچاوەی فێربوون و بەکارهێنانی عەقڵو بیرو هۆشی زاناکانەوە هەیە، دیسانەوە زاناکان هەریەکەیان دەرکەوتەی سەردەمی خۆیانن، هەوڵیانداوە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە کە لە خۆیان کراوە و لە سەردەمی ئەواندا تەرحکراوە و خراوەتەڕوو، کەواتە هەندێك پرسیار کە ئێستا دەخرێتەڕوو زۆر ئاساییە کە لە کتێبەکانی پێشوودا باسنەکرابێت، کەواتە کەسێك کەئێستا دێت باسی لێوە دەکات جیاوازی دروستدەبێت، بۆچوونێکی نوێ دروستدەبێت.

بەشێکیتر لە جیاوازییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جوڵە بەردەوامەی کە لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا ڕوودەدات، بەشێوەیەکی بەردەوام کۆمەڵگە لە دۆخێکەوە دەچێتە دۆخێکی تازەوە و شتی تازە دێت و شتی کۆن نامێنێت، لەبەرئەوە سەیردەکەیت ئەوانەی سەر بەدونیای کۆنن جۆرێکن و ئەوانەی سەر بەدونیای تازەن جۆرێکی دیکەن. لە ناو زانا نوێیەکاندا قسە وباس دەکرێت بەتایبەتی سەبارەت بەگەڕانەوە بۆ سەرچاوە ئاینییەکان - سەرچاوە ئیسلامییەکان -. بەشێك لە جیاوازییەکان پەیوەندیی بەزمانەوە هەیە، لەبەرئەوەی دەقەکان بەزمانی عەرەبین، تەماشادەکەین چەندین مانای هەیە، هەر ئەم ووشەی (خلف، یخلف، اختلف، یختلف) کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، بینیمان سێ مانای هەبوو، جگە لە مانای لاوەکی کە لەو مانایانە دروست دەبن.

بۆنمونە ووشەی (عین)، هەم بە (چاو) دەوترێت و هەم بە(جاسوس) دەوترێت و هەم بە(کانی)، جاری واهەیە ئەم ووشەیە کە بەکاردەهێنرێت ڕەنگە سێ کەس سێ بۆچوونی جیاوازیان هەبێت، هەریەکەیان مانایەکی جیاوازی هەیە بۆ ئەو ووشەیە.

بۆنمونە لە قورئانی پیرۆزدا ووشەی ﴿قُرُوءٍ﴾ البقرة:٢٢٨، هاتووە، ئەو ئافرەتانەی کە تەڵاقدەدرێن خوای پەروەردگار لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ﴾ البقرة:٢٢٨، ئەو ئافرەتانەی کە تەڵاقدەدرێن دەبێت سێ ﴿قُرُوَءٍ﴾ بمێننەوە، لەوماوەیەدا نە بۆیان هەیە شووبکەن بەیەکێکیتر، نە بۆیان هەیە بەبێ (رجعە) بگەڕێنەوە بۆ لای مێردەکانیان، بەڵام ووشەی ﴿قُرُوَءٍ﴾ چییە؟ لە زمانی عەرەبییدا هەم بۆ پاکی بەکاردێت و هەم بۆ قۆناغی خوولی مانگانەی ئافرەتیش بەکاردێت.

تەماشادەکەیت فەقیهەکانی حیجاز وتیان (عوسمانی کوڕی عەففان و زەیدی کوڕی ثابت و عائیشە- خوایان لێ ڕازی بێت) هەرسێکیان ﴿قُرُوَءٍ﴾ بەپاکبوونەوە مانادەکەن، کەواتە مەزهەبی مالیکی و مەزهەبی شافعی ئەو بۆچوونەیان وەرگرتووە، بەڵام فەقیهەکانی عێراق وتیان پەیڕەوی لە (عومەری کوڕی خەتتاب و ئیبن مەسعود) دەکەین کە﴿قُرُوَءٍ﴾ یان بەقۆناغی خوولی مانگانەی ژنان ماناکردووە، کەواتە ئەم﴿قُرُوَءٍ﴾ ـە هەردووماناکە هەڵدەگرێت، کامیان ڕاستە؟، دەکرێت هەردووکیان ڕاستبن، ڕەنگە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر بگۆڕێت،

ڕەنگە بۆ ئافرەتێك ئەگەر بەسووڕی مانگانە مانای بکەیت باشبێت، هەندێکی بەپاکبونەوە مانای بکەیت، باشبێت.

بەشێکی دیکەی جیاوازییەکان، پەیوەندیی بەشارەزابوون لە فەرموودەوە هەیە، واتە هەندێك لە زاناکان وەك زاناکانی مەدینەو زاناکانی حیجاز فەرموودەی پێغەمبەریان زۆر لە بەربووە، بەڵکو مەدینە بەپایتەختی فەرموودەو زانستی فەرموودە دەزانرێت، بەڵام زانایەك کە لەوێیە مەرج نییە هەموو فەرموودەی لابێت، بەڵام زۆرترین پشکی بەرکەوتووە لە زانستی فەرموودەدا، بەڵام زانایەك لە تاجیکستان (ئەودیو ڕووبار)ەوە ڕەنگە ئەو شارەزاییەی لە زانستی فەرموودە نەبووبێت، لە هەمانکاتیشدا هەر فەقیهو شارەزایە، یاساناسە، لەبەرئەوە سەیردەکەین ئەمیان فەرموودەیەکی لابووە کاری لایە، ئەویان فەرموودەی لانییە، کار بەشتێکیتر دەکات، دیارە لەملایەنەوە جیاوازی دروستدەبێت.

جاری واهەیە لە تەفسیری دەقەکاندا جیاوازی دروستدەبێت، بۆ نموونە: لە دابەشکردنی عێراقو شامدا بەسەر هاوەڵاندا، دوای شەڕ لەگەڵ ڕۆمەکاندا ئەم زەوییانە فەتح کران، زۆر لە هاوەڵان بۆچوونیان وابوو کە دەبێت ئەم سەرزەوییانە دابەشبکرێت بەسەر جەنگاوەراندا، ئەوانەی کە سەرکەوتوون، بەڵگەشیان هێنایەوە بەقورئان، بەڵام حەزرەتی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) بۆچوونێکیتری هەبوو، فەرمووی ئەگەر ئەمە دابەشبکەم بەسەرئێوەدا ئەی بۆ نەوەکانی دوای ئێوە چی دابنرێت؟، هەموویان دەبن بەکۆیلە و کرێگرتەی ئێوە، موناقەشە

دروستبوو لە نێوانیاندا، دواجار توانی بەقورئان تێیانبگەیەنێت کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ﴾ الحشر:١٠.
ئەمە موڵکی تەنها ئەوانە نییە کە سەرزەوییەکانیان گرتووە، موڵکی ئەو نەوانەشە کە پاشان دێن، لەبەرئەوە بڕیاری دا ئەو زەوییانە بەهیچ شێوەیەك تاپۆنەکرێن لەسەر هاوەڵەکان، بەڵکو بەوەقف بیهێڵێتەوە بۆبەرژەوەندیی مسوڵمانان.

یەکێکیتر لە جیاوازییەکان لەوەدایە کە دەق چۆن مانابکرێت، هەندێك بەشێوەیەکی ئامانجداری (مەقاصیدی) سەیری ئاسۆکانی دەق دەکات و دەیەوێت تەحقیقی عەدالەتی ئیجتیماعی بکات، هەیە دوارۆژێکی زۆردووری لەبەرچاوە (وەك حەزرەتی عومەر دەفەرموێت)، هەیە دوارۆژی زۆردووری لەبەرچاو نییە (وەك بیلال‌و کەسانی وەك ئەو)، جاری واهەیە جیاوازییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە مەسەلەکاندا دەقێکی تایبەتی نییە، چونکە زۆرێك لە بابەتەکان دەگەڕێتەوە بۆ کات، خراوەتە بابەتی مەصڵەحەتەوە، بەرژەوەندیی مسوڵمانان لە چیدا بوو بەپێی ئەو بەرژەوەندییە دەبێت، بەرژەوەندییش لە کاتێکەوە بۆ کاتێکیتر دەگۆڕێت، بەرژەوەندی جاری واهەیە لەوەدایە کە مسوڵمانان کارێکی تایبەت بکەن، جاری واهەیە بەرژەوەندییەکە دەگۆڕێت بۆ کارێکیتر، بۆ نموونە لە سەردەمێکدا مسوڵمانان بۆیان هەیە یاسای پەرلەمانی پەیڕەوبکەن، لە سەردەمێکیشدا یاسای سەرۆکایەتی پەیرەوبکەن، کەواتە مادام دەقی لەسەرنییە، بەرژەوەندی لە کامیاندا هەبوو ئەوەیان دەکەیت، بۆ نمونە

جۆری حوکمکردن و ئەو حکومەتەی کە لە وولاتێکی ئیسلامەتیدا پەیڕەودەکرێت، ئایا پاشایەتی بێت یان کۆماری بێت، دەقی لەسەرنییە کە حەتمەن دەبێت وابێت، بەڵام بەپێی بەرژەوەندییە، بەرژەوەندی لە چیدا بوو شەرعی خواش لەوێیە (أينما وجدت مصلحة، فثم شرع الله).

یەکێکیتر لە هۆکارەکانی، سەرچاوەکانی وەرگرتنی مەعریفەت چییە؟ ئەگەر یەکێك سەرچاوەکانی کۆمەڵە کتێبێکی کلاسیکی دیاریکراوبێت ئەوە ناتوانێت لەو چوارچێوەیە دەربچێت، ئەوان هەمووشتێکیان تێدانییە؟ لەبەرئەوە زۆر ئاساییە بۆچوونی ئەو جیاوازبێت لەو زانایەی کە یەك دونیا سەرچاوەی مەعریفی هەیە و سوودیش لە زانستەکانی ئەمڕۆش وەردەگرێت و سوود لە زانستی سیاسەت و یاسا وەردەگرێت.

بەشێك لە جیاوازییە فیکری و فیقهییەکان دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی زاناکان خۆیان، هەندێك لە زاناکان ئاین بەقورسی دەگرێت زۆر بەتوندی، هەندێکیش بەپێچەوانەوە. سەیردەکەیت لە بابەتە فیقهییەکاندا جاروبار هەستدەکەیت فتوایەك ئاسانگیرە و فتوایەکیتر سەختە، تەنانەت یەك زانا جاری واهەیە لە هەندێك لە فتواکانیدا سەختگیرە و لە هەندێکی ئاسانگیرە، لەبەر ئەوەی حاڵەتی مرۆڤەکانیش جیاوازن، لەبەرئەوەی مرۆڤ لە هەندێك ڕۆژدا ئاینەکەی بەتوندی دەگرێت و لە هەندێك ڕۆژی دیکەشدا بەسوكو ئاسان دەیگرێت، لە هەندێك هەڵوێستدا توندده‌یگرێت لە هەندێك هەڵوێستدا سوك دەیگرێت، بۆ ئەوەی ئەم ئاینە بۆ هەموو کاتەکان بشێت، لە ناو

زاناكاندا باسی ئەوەكراوە هەندێك لە جیاوازییەكان دەگەڕێتەوە بۆ تەرازوی ئاسانگیری و تەرازووی سەختگیری، دەبینیت لە هەندێك بابەتدا سێ فەتوا هەیە، بۆ نموونە: لە بابەتی دەستنوێژ گرتن، لە دەستلێوەدانی ژن، سێ بۆچوونی سەرەكی هەیە:

١. بەهەمووشێوەیەك دەستنوێژەكە دەشكێت.

٢. ناشكێت.

٣. ئەگەر بەئارەزووەوە بێت دەشكێت و ئەگەر بەبێ ئارەزوو بێت ناشكێت.

ئەو بۆچوونەی كە دەڵێت دەستوێژ ناشكێنێت، بۆچوونی مەزهەبی حەنەفییەو بابەتەكەی ئاسانكردووە، چاوی لەوەبووە مرۆڤ هەندێكجار پێویستیی بەو ئاسانگیرییە هەیە.

مەزهەبی پێشەوا شافعی بابەتەكەی توند كردووە.

بەڵام مەزهەبی مالیكی و حەنبەلی هاتووە لەو نێوەندەدا قسەدەكات، وتوویەتی ئەگەر بەئارەزووەوە دەستبدەیت لە خێزانت، ئەوە دەستنوێژەكەت دەشكێت و بەبێ ئارەزووبێت ناشكێت. كەواتە هەموو فەتواكان كە ڕاجیاییی تێدایە وەك ئیمامی شەعرانی لە كتێبی (المیزان)دا بەجوانی ڕوونیكردووەتەوە لە بابەتێكدا كە جیاوازی هەبێت هەندێكیان ئاسانكاربوون و هەندێكیان سەختگیربوون و هەندێكیان میانڕەوبوون.

جاری واهەیە لە بابەتەکەدا دوو بۆچوون هەیە: قورس یان ئاسان، جاری واهەیە لە بابەتەکدا سێ بۆچوون هەیە: قورس‌و ئاسان و میانڕەو.

کەواتە بەشێك لە جیاوازییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم شەریعەتە دووئاستی هەیە بۆ جێبەجێکردن:

ئاستی مرۆڤێکی شەرعڕەو، ئاستی مرۆڤێکی ئەهلی وەرع.

واتە بەم شەریعەتە هەم ئەهلی شەرع دەتوانێت کار بکات و هەم ئەهلی وەرع، ئەهلی وەرع ئەوکەسانەن کە پلەیەك لە سەروو ئەهلی شەرعەوەن، ئەهلی وەرع واز لە هەندێك لە حەڵاڵەکان و لە موباحەکانیش دەهێنێت لەبەر تەزکییەی نەفس‌و لەبەر تۆراندنی نەفس، جا لەبەرئەوەیە هەندێك لە زاناکانمان بەسروشت ئاینی خۆیان بەچاکی و زۆر بەتوندی گرتووە، فەتوایان لەسەر ئەو بنەمایە داوە، هەندێکیشیان ئاینەکەیان ئاسانکردووە بۆ گشت مرۆڤەکان، لەبەرئەوەی کە فەرموودەی دروستمان هەیە کە زاناکان دەفەرموون (ماخُیر النبي بین أمرین إلا اختار أیسرهما) واتە: هەرگیز نەبووە پێغەمبەری خوا سەرپشك کرابێت لە نێوان دوو ڕێگەدا، ئیللا ئەو ڕێگەیەی گرتووە کە ئاسانتربووە.

ئەگەر ئێمە بزانین ئەم هۆکارانە هۆکاری حەتمین واتە بەپێی یاسای عەقڵی و فەلسەفیش کە هۆ هەبوو دەبێت هۆکاریش هەبێت، مادام ئەم هۆکارانە هەبوون، کەواتە جیاوازی کارێکی حەتمییە و دەبێت ڕوو بدات، بەڵام دەبێت ژیرانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین و کەلتورێکمان هەبێت کە

پێیدەوترێت ئەدەبی ڕاجیایی، ئەدەبی راجیایی ئەوەیە کە بە شێوەیەکی زانستییانە مامەڵە لەگەڵ ڕاجیاییدا بکەین، بەشێوەیەکی دەمارگیری و بەتانەوتەشەرو بەتۆمەتدان و بە ناووناتۆرەلەیەکتریدان مامەڵە نەکەین، پێمانوابێت ئەو بابەتانەی کە ڕاجیایی هەڵدەگرن هیچ کەسێکی لەسەر تەکفیر نەکەین، بەتایبەت ئەوەی کە بڕوای بەمەزهەبێکی جیاواز هەیە، با وانەزانین ئەم ئاینە ئەوەندە بچوکە کە بەهەشت تەنها هێندەی گوندێك جێگای تیادەبێتەوە، وادابنێت (هەرخۆمو دە دوازدە نەفەرەکەی هاوەڵم دەچینە بەهەشت)، ئەمە هەڵەیە کە ئاین ئەوەندە بەلامانەوە بچوك بێت تەنها دەبێت گروپێك بگرێتەوە، تۆ بۆت هەیە بڵێیت ئەم گرووپەی من باشترینە، بەڵام ناتوانیت بڵێیت هەر ئەمەی من باشە، کە دەڵێیت باشترینە دەبێت دان بەبوونی باشتردا بنێیت، چونکە ئەگەر ئاگامان لە بنەماکانی جیاوازی نەبێت و مافی جیاوازی نەسەلمێنین و بەجوانی مامەڵەی لەگەڵدا نەکەین لە ڕووی دەروونییەوە، کۆمەڵێك کەسی وشکی نەخۆشی شێتمان لێدروستدەبێت، کۆمەڵێك خەڵکی شێت و یاخیمان لێدروستدەبێت، یان لەگەڵمدایە و باشە یان لەگەڵمدانییە و خراپە. ئەمە فیتنەی لێدروستدەبێـت و کێشەیەکی گەورەیە بۆ کەینونەی کۆمەڵگە، لەڕووی سیاسییەوە دیکتاتۆریەت دروستدەبێت، نەسەلماندنی مافی جیاوازی دیکتاتۆریەت دروستدەکات، خۆسەپاندن دروستدەکات، تۆ دەتەوێت

خۆت بسەپێنیت و خۆتت لێبووە بەمەعبود. لەبەرئەوەیە مەولانا خالیدی نەقشبەندیی شارەزووری[١] دەفەرموێت:

**هەر کە غەیری خوا کەوا مەقصودی تۆس**

**تێغی لا دەرکێشە بۆی مەعبودی تۆس.**

(واتە هەر کەسێك بێجگە لە خوا، واتە خۆشت، ئەگەر بیکەیت بە مەعبود و غایەو ئامانجی خۆت، دەبێت (لا) نەخێری بۆ بکەیت بە شمشێرێك و لێیبدەیت بۆ ئەوەی نەبێت بە مەعبوودی تۆ).

ئەگەر تۆ وتت دەبێت هەموو خەڵك وەك من بیربکەنەوە و هەموو خەڵك لەسەر مەزهەبی من بێت، من چی دەڵێم خەڵکیش ئەوەبڵێت، ئەوە خۆپەرستی دەکەیت نەك خواپەرستی.

کەواتە لە ڕووی سیاسییشەوە دیکتاتۆریەت و خۆسەپاندن دەبن بەدەرئەنجامی نەپاراستن و نەسەلماندنی مافی جیاوازی، کەواتە پێویستە ئەم مافی جیاوازییە بۆ خۆمان و خەڵکی بسەلمێنین و جێگیری بکەین بەبڕوایشەوە نەك بەناچاری.

[١]– مەولانا خالیدی شارەزووری، (١٧٧٨یان ١٧٧٩– ١٨٨١)ژیاوە، بەناوبانگترین ئەوانەی کە ڕێبازی سۆفیگەرێتی بەپێی تەریقەتی نەقشبەندی هێناوەتەوە کوردستانو بڵاویکردووەتەوە، لەکوردستان چووە بۆ هیندستانو لەسەردەستی (شێخ عوبەیدوڵا)ی دیهلەویدا تەریقەتی وەرگرتووەو هاتوەتەوە بۆکوردستان، دواتر بەهۆی ناکۆکی لەگەڵ شێخ مەعروفی نۆدێ و هەندێك میرانی باباندا (کە پتر بەهۆی کەسانی نەزان و مەبەستدارەوە درووستبووە) سلێمانی بەجێهێشتووەو ڕۆیشتووە بۆ شام، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە، مەولاناخالید شۆڕشێکی فیکری واگەورەی لەکوردستان بەرپاکرد کە دەیتوانی دەستبگرێت بەسەر میرانی باباندا، بەڵام لەبەرئەوەی کە ناکۆکی نەکەوێتە ناو هاوزمانانی، بەیانییەك بەبێئەوەی کەس پێیبزانێت بەتەنها ڕۆیشت بەرەو شام.

سەیری داستانی موسا بکەن لەگەڵ بەندە چاکەکە (کە بە خدر بەناوبانگە) لە سورەتی کەهفدا، ئەم دووانە جیاوازبوون، دوو میتۆدی جیاواز، دوو بیرکردنەوەی جیاواز، بەڵام لە یەك جیابوونەوە و یەکتریان تۆمەتبارنەکرد، فەرموویان هەرکەسمان بەڕێی خۆیەوە،چونکە ئێمە تەحەمولی یەکتری ناکەین، واتە تۆ لەم دونیایەدا ئەوپەڕی ئەوەیە تەحەمولی هەندێك کەس نەکەیت، کەواتە لەگەڵیدا مەژی، بەڵام لەوە پتر مافت نییە، چونکە تۆ مەعبوودی ئەو نیت، تۆ براو خوشکۆ نزیکی ئەویت، هاوچەشنی ئەویت، کەواتە بڕوابوون بەڕاجیایی ببێت بەڕێگەی ژیان، ئەم مافی لێکجیاوازییە کەهەبووو سەلمێنرابوو، پارێزرابوو بەجوانی، مومارەسەش دەکرا، ئەوا گەورەترین خزمەتی لێدەکەوێتەوە. سەیردەکەیت، نەخۆشەکان، ئەگەر بۆ هەر نەخۆشێك یەك دەرمان هەبێت، هاتو ئەو دەرمانە دەستنەکەوت، هاتو ئەو نەخۆشە تەحەمولی ئەو دەرمانەی نەکرد، چار چییە؟ لەبەرئەوەیە دەبینین جۆرەها دەرمان هەیە بۆ یەك نەخۆشی، چەندین پزیشك هەیە بۆ یەك نەخۆشی.

ئەگەر تەنها یەك نەخشە هەبێت بۆ دروستکردنی خانوویەك لەسەر پارچەزەوییەك، تەنگبوونەوەی ئاسۆکان دروستدەبێت، لەبەرئەوە دەبێت چەندین نەخشە هەبن و پێشنیازی بکەن، بۆ ئەوەی تۆ یەکێکیان هەڵبژێریت، ئەی خوای پەروەردگار کەباسی بەندە سەرڕاستەکانی خۆی دەکات نافەرموێت: ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ۞الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ﴾ الزمر١٧-١٨. واتە مژدە بدە بە بەندەکانم، ئەوانەی کە گوێ لە هەموو قسەیەك دەگرن، بەڵام کامیان

جوانترە ئەوە پەیڕەودەکەن، واتە تۆ دەبێت چەندین قسە ببیستیت و چەندین بیروبۆچوون بناسیت، ئەوسا تۆ عەقڵی خۆت بخەیتەکار کامیان بەلاتەوە لەبارترو گونجاوتربوو، ئەوەیان پەیڕەودەکەیت.

لەسەردەمە زێڕینەکاندا مسوڵمانان زانیویانەو توانیویانەو تێگەیشتوون جوان مامەڵە لەگەڵ ئەم مافەدا بکەن، ئەو هەموو ئینسلکۆپیدیاو زانست و زانیارییەی لێدروستبووە، لە ڕووی زمانەوە، لە ڕوی مێژووەوە، لە ڕوی ئەدەبو شارستانییەتەوە جۆرەها پەرتووکمان هەیەو تەفسیرو فەرمودەمان هەیە کە هەتا هەتایە جێگەی شانازیمانە، ئێستاکەش ئەگەر بمانەوێت دەستبکەینەوە بەو شارستانییەتە بۆ ئەوەی کۆمەڵگەکەمان کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتووو سەرکەوتوو بێت، هەم ئیسلامیو هەم ڕەسەن و هەم هاوچەرخ بێت، واتە پێشکەوتووبێت، دەبێت ئاگامان لەومافە بێت و ئەو مافە بسەلمێنین و بەهەموو شێوەیەك دان بنێین بەم مافەداو نەهێڵین کەس دەستدرێژی بکاتە سەری.

# وەڵامی پرسیارەکان:

**ئامادەبوویەك:** کۆمەڵێك فەرموودەو ئایەتمان هەیە هەڕەشە لە کوشتن دەکات کاتێك کەسێك مسوڵمانێك دەکوژێت، سەبارەت بەبۆچوونی جیاواز ئەگەر ئەو جیاوازییە بووە هۆی کوشتنی بەرامبەر، ئەمە چۆن دەبینیت؟

**ئامادەبوی دووەم:** سەبارەت بەفەرموودەی (٧٣گروپەکە)، لە ڕابردوودا زۆرێك لێکدانەوەی بۆ کراوە، ئەمڕۆ جۆرێکیتر تەفسیری بۆ دەکرێت، لە هەمانکاتیشدا ئەوەی کە تەفسیری بۆ دەکات مەجالی بیرکردنەوە نادات بەبەرامبەرەکەی، ئایا ئەوە قبوڵنەکردنی جیاوازی نییە؟

**د.صەباح:** سەبارەت بە پرسیاری یەکەم کە کۆمەڵێك ئایەت و فەرموودەمان هەیە کە ڕێگری لە کوشتار دەکات، ئەوە ڕاستە، ئەی ئەگەر ئەو جیاوازییە بوو بەهۆی کوشتار؟ ئێمە باسی ئەوەدەکەین جیاوازی وەك حاڵەتێکی سروشتی مامەڵەی لەگەڵکرا، نابێتە هۆکاری کوشتار، ئەوەی کە لە مێژوودا ڕوویداوە هۆکارەکەی لەوەدابووە کە بە پێی میتۆدی ئیسلام مامەڵەنەکراوە لەگەڵ ئەو دیاردەی جیاوازییەدا، واتە جیاوازی بەمافێك دانەنراوە بەڵکو جیاوازی بەتاوان دانراوە، هەموو

ئەو هەولانەی کە زانایان کردوویانە نالێین هەموویان سەرکەوتووبوون، بەڵکو ڕێژەیەکیان سەرکەوتووبوون، ئەوەیە کە ئێمە جیاوازی نەکەین لە نێوان هۆکاری کێشەکاندا، چونکە ئەگەر بەپێی ئەو مەنهەجە مامەڵە نەکەین فیتنەو ئاژاوە و شەڕی لێدەقەومێت.

ئێستا کە دەبینین ئەو شەڕە گەورانەی لە دەوروبەرمان هەیەو لە کوردستانیش هەتا ئێستا بەردەوامە هەمووی جیاوازییە لەسەر بنەمای بیروبڕوا، لەبەرئەوەی خەڵکەکان قبولّ ناکەن کەسێکیتر جیاوازبێت لەگەڵیاندا، لەبەرئەوە ئەو جیاوازییانە بەکاردەهێنن بۆ مەبەستی ئایدۆلۆژی و بۆ مەسەلەی بەرژەوەندیگەرایی، لەبەرئەوە خەڵکانێکی بێتاوان بوون بەسوتەمەنی ئەو ئاگری فیتنەوهەرایە، ئەوە زۆر مەترسییەکی گەورەیە کەسێکی مسوڵمان بەدەستی کەسێك بکوژرێت یان هەرکەسێك کە بێتاوانبێت، چونکە هەرکەسێك بەبێ تاوان کەسێك بکوژێت ئەوە وەك ئەوەوایە کە هەموو مرۆڤایەتی کوشتبێت، کەواتە هەموو هەولّوتوانای زاناکان کە لەمبارەیەوە تێکۆشاون بۆ ئەوەیە کە ئەم جیاوازییە وەك مافێكو خەسڵەتێکی سروشتی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت نەك وەك تاوانێکی گەورە. ئێستا کێشەکە لەوەدایە کە سەردەمانێکی زۆر، جیاوازیی بەتاوان دانراوە.

سەبارەت بەفەرمودەی (٧٣ گروپەکە) کە دەهێنرێتەوە و دەکرێت بەپاساو بۆ ئەوەی کەسێك خۆی بەحەق بزانێت و باقی خەڵك بەناڕەوا، لە ڕاستیدا بۆ خۆی ئەم فەرموودەیە قسەی لەسەرە:

لەلایەکەوە فەرموودەکە فەرموودەی (آحاد)ە، فەرموودەیەکی (موتەواتەر) نییە، لە میزانی زانایانی ئوصولدا فەرموودەیەك کە (آحاد) بێت، بۆ شتی بنەڕەتی،و بۆ شتی عەقیدەیی، پشتی پێنابەسترێـت.

ئەنجا لە مەتن و لە (سەنەد[1])ـەکەشیدا ئیشکال هەیە، واتە هەم سەنەدەکەی لە لایەن زانایانی فەرموودەوە تانەی لێدراوە، هەم دەقەکەشی (عیللەت[2])ی تێدایە و (ناتەبایە[3])ە، چونکە لە هەندێك گێڕانەوەدا هاتووە دەفەرموێت: (کلها في النار الا واحدة)، لە فەرموودەیەکیتردا هاتووە (کلها فی الجنة الا واحدة)، ئەمە دەبێت بەهۆکاری (إضطراب) لە دەقەکەیدا، واتە مەتنەکە بۆ خۆیشی بەتەواوی ساغنەبووەتەوە، جگەلەوەی لە فەرموودەی بوخاریدا نییە، لە کتێبە بڕواپێکراوەکاندا زاناکان بەگومانەوە تەماشای ئەم بابەتەیان کردووە، بەتایبەتی ئەگەر ببێتە هۆکاری فیتنەو ئاژاوە لە نێوان مسوڵماناندا، گەر ئەم فەرموودەیە بسەپێنیت بەسەر گروپە ئیسلامییەکاندا ئەمە هەڵەیە، چونکە لە ناو عورفی زاناکاندا ئەوەی باوەڕی بەم بنەمایانە هەبێت دەچێتە ناو فەرموودەکەوە کە ڕزگاربووە:

**یەکەم:** باوەڕی بەخوا هەبێت.

---

[1] - سەنەد: زنجیرەی ئەوکەسانەیە کە لە گێڕانەوەی فەرموودەکاندا بەشدارن.

[2] - ئەو ناتەواوییەیە کە بە ئاشکرا لە دەقی فەرموودەی گێڕراوەدا دەرناکەوێت و زانایانی فەرموودە پێیدەزانن.

[3] - ئەو فەرموودەیەیە کە کەسێك یان چەندکەسێك لەوانەی دەیگێڕنەوە بەچەند شێوازی جیاواز بیگێڕنەوە. ئەم ناتەباییەش پێیدەوترێت: اضطراب.

**دووەم:** باوەری بەکتێبەکانی خوا هەبێت.

**سێهەم:** باوەڕی بەپێغەمبەران هەبێت.

**چوارەم:** باوەڕی بەفریشتەکان هەبێت.

**پێنجەم:** باوەڕی بەڕۆژی دوایی هەبێت.

**شەشەم:** باوەڕی بەقەزاو قەدەر هەبێت.

جگەلەمانە تەنانەت کەسێك باوەڕی بەقەزاو قەدەر هەبێت بەو شێوەی کە موعتەزیلە باوەڕی پێیهەیە، لە بازنەی ئیسلام ناچێتەدەرەوە، پێیدەوترێت ئەهلی بیدعە، بەڵام ئەهلی بیدعە کافر نین، ئەمانە کەسانێکن کە لادانێکیان لە بیروباوەڕدا بۆ دروستبووە، ئەمە میتۆدی ئەهلی سوننەو جەماعەتە، کە دادگەرو لێبوردەیەو بۆ بەهانە دەگەڕێت خەڵك بەمسوڵمان بزانێت نەك بۆ بەهانە بگەڕێت خەڵك بەکافر لە قەڵەمبدات، من پێموایە ئەم فەرموودەیە ڕەنگە بۆ مەبەستی سیاسی بەکاربێت ئەگینا زانایان پشتی پێنابەستن، ئەوەی لەملاولاوە خەڵك باسی دەکات و خۆی بەگروپی ڕزگاربوو دەزانێت، دوورە لە مەنهەجی توێژینەوەی زانستی، پشتبەخوا خودای پەروەردگار ئێمەش دەپارێزێت لەو جۆرە بیروبۆچوونە.

# ڕۆڵی زانایان لە ڕیفۆرم و بانگکردنی خەڵکدا

ئەم باسە پێویستیی بەوە هەیە لە پێشدا چەند دەروازەیەك بکەینەوە بۆ ئەوەی بڕۆینە ناو باسەکەوە، ئینجا پەیوەستی بکەینەوە بەژیانی ئەمڕۆمانەوە و بەئاستی ژیان و ژیاری کۆمەڵگەکەمانەوە، دەروازەکانیش کە باسەکەی پێدەستپێدەکەین خۆی لە سێ دەروازەدا دەبینێتەوە:

یەکەمیان: دەروازەی مێژوویی: پێشینەی ڕیفۆرمو چاکسازی لە مێژووی گەلانی ئیسلامدا. دەروازەیەکی واقیعی: باسی ئێستاو ڕوانینێك بۆ ئێستای نەتەوەی ئیسلام. پاشان دەروازەیەکی چەمکسازی: تا بزانین ئەو چەمکانەی کە بەکاریدەهێنین مەبەستمان پێی چییە.

سەرەتا دێمە سەر دەروازە مێژووییەکە:

ئەگەر سەیری مێژووی دوورونزیکمان بکەین دەبینین ڕیفۆرمو چاکسازی هەمیشە ناونیشانێکی گرنگو بەرجەستەبووە و سەردێڕی باسو خواسەکانی ناو زانستخوازان و زانایان بووە لە ناو مێژووی ئیسلامیو مێژووی بانگەوازی مسوڵمانانندا، بەو بەڵگەیەی کە ئیسلام لە ڕاستیدا بۆ خۆی ئاینێکی زانستخوازە، ئاینێکی ڕیفۆرمخوازە، واتە ئەگەر سەیری ئیسلام بکەین زۆر هەماهەنگو تەبایە لەگەڵ ئاینەکانی سەردەمی خۆیاندا، لە زۆر سەردەمدا مسوڵمانان بانگکراون و فەرمانیان

پێدراوه كه به دوای زانستدا بگەڕێن، واته ئەگەر ڕۆژێك له ڕۆژان وابزانرێت ئاین ڕێگەدەگرێت له زانست، ئەمه هەستێكی ناتەواوه و بەهیچ شێوەیەك ئیسلام دژایەتی لەگەڵ زانستدا ناكات، بەڵكو زانست بەپاڵپشتی خۆی دەزانێت، لەلایەكیترەوه زانست له ئیسلامدا له پێناوی چاكسازیدایەو له پێناوی زانستەكاندایه، بەومانایەی كه ئامانجی مرۆڤی مسوڵمان ئەوەیه ببێت بەزانایەكی كامڵ، ئامانج ئەوەیه ئەوكەسەی دەبێت بەزانا، پێویسته ڕۆڵی كاریگەری هەبێت لەبەرەوپێشبردنی كۆمەڵگەداو له خزمەتكردن بەخەڵكدا، لەبەرئەوه ئیسلام ئاینێكی هەم زانستییه و هەم چاكسازیخوازه، ئاینێكه بۆخۆی ئێستا بووه بەزانست، ئێستا ئەو هەموو پسپۆڕو ئیسلامناسییەی له ئاینی ئیسلامدا پەیدابووه، تا ئەو ڕاددەیەی نامسوڵمانەكانیش ڕوویانكردووەته بابەتی ئیسلامناسی و دەیانەوێت بزانن ئەم ئاینه چییه؟ ئەم ئاینه ئەمسەرو ئەوسەری له كوێیەو بنەماو كەسەكانی چین وكێن؟

بانگەوازی ئیسلامی بەوشەی (اقرأ) دەستپێكردووه، واته پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) یەكەم ئایەتێك بۆی هاتەخوارەوه پەیوەندیی بەزانستەوه هەبوو، كاتێك جبریل یەكەمین ووشەی وەحی پیرۆزی بۆ هێنا فەرمووی (اقرأ) ﴿اقْرَأْبِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ۝خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ﴾ العلق١–٢. له ئایاتی دیكەدا ئێمه دەبینین خوای پەروەردگار سوێند بەقەڵەم دەخوات ﴿ن وَالْقَلَمِ وَمَايَسْطُرُونَ﴾ القلم:١. هەم سوێند بەقەڵەم دەخوات، هەم سوێند بەودێڕانه دەخوات كه مرۆڤەكان دەینووسن. كەواته بانگەوازی ئیسلام هەر له سەرەتاوه تەبایی و

ئاشتی زۆری لەگەڵ زانستدا هەبووە، مانای ئەوەیە کە یەکەمین کەسانێك ئالآی ئەم پەیامە هەڵدەگرن (خوێندەوار)ی (زانا)ن، ئەوانەن کە لە بواری پەروەردەو زانستدا کاریگەرن، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) کارێکی بنەڕەتی کە کردی لە کۆمەڵگەی خۆیدا ئەوەبوو، کۆمەڵێك زانای پێگەیاند، کۆمەڵێك کەسانی شارەزا لە زانستە جۆراوجۆرەکاندا، ئەگەر سەیری ژیاننامەی پێشەوایان(ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان و عەلی) بکەیت ئەمانە کۆمەڵێك زانابوون پێشئەوەی خەلیفەش بن، پێشئەوەی حاکمو فەرمانڕەوابن، مەلەکەیەکی زانستی لە بوونیاندا هەبووە و سەلیقەیەکی زانایانەو شارەزایانە لە بوونیاندا هەبوو، چونکە هەموو دەزانین بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەو ئاڕاستەکردنی مرۆڤ و سەرپەرشتیکردنی ـ وەك ئێستاو جارانیش ـ زانست بووە، واتە هەرکەسێك شارەزا نەبێت و ئاگایەکی لە بنەماکانی پەروەردەو سیاسەت و شتی لەوبابەتە نەبێت ناتوانێت وولآت بەڕێوەببات، لەبەرئەوە یەکەمین کارێك کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) کردی پەروەردەکردنی کۆمەڵێك کەسی زاناو خوێندەوارو تێگەشتوو بووە، ئێستا گەر بەراوردی بکەین بەستانداردەکانی ئەمڕۆ سەرمان سووڕدەمێنێت دەڵێین ئەم پەروەردەیە موعجیزەیەکی ئیلاهییە کە لە شوێنێکی وەك عەرەبستاندا هاتووەتەئارا، کە دووربووە لە ناوەندەکانی زانست و سەردەمە پێشکەوتووەکان، بۆ نمونە فیقهزانێکی وەك زەیدی کوڕی سابت دروستبووە، شارەزایەکی وەك عەبدوڵلآی کوڕی عەبباس دروستبووە، ئەدیبێکی وەك حەسسانی

کوڕی سابت دەرکەوتووە، دوای ئەوانیش چینەکانی مسوڵمانان بەزانست و زانیاری جیاکراونەتەوە، کێ بوون بەڕیشسپیو پیاوماقوڵو دەمڕاست و کەسانی دەستڕۆیشتووی ناو کۆمەڵگە؟ ئەوانەی کە زانابوون، تەنانەت ئەوانەی کە سەرکردەبوون هەمیشە گەڕاونەتەوە بۆ لای زاناکان، ئەوانەی کە فەرمانڕەوابوون هەوڵیانداوە خۆشیان زانابن و زاناکان بێننە مەیدانەوە، لەبەرئەوە سەیردەکەین نەتەوەی ئیسلام لە سەردەمەکانی زێڕینی خۆیدا ئەگەر هەرگەشەونەشەیەکی کردبێت و هەر پێشکەوتنێکی بەخۆوەدیبێت، بەبۆنەی ئاڵای زانست و زانیارییەوە بووە، کەواتە تەوەرەییترین چەمك لە مێژووی ژیانی ئیسلامییدا بریتییە لە زانست، هەمیشە ئەوانەشی کە هاتوون لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا بانگەوازیان کردووە بۆ ڕیفۆرمو چاکسازی (چ چاکسازییەکە سیاسی، ئابوری، هـزری، یان کۆمەڵایەتی بووبێت)، هەمیشە بانگەوازەکەیان تێکەڵ بەزانست و ڕوناکبیری و کەلتووری و ڕۆشنگەری کردووە، واتە کەسێك نابینیت لە مێژووی ئیسلامییدا باسی چارەسەری کێشەکانی کردبێت و ئاماژەی بۆ زانست و زانیاری نەکردبێت و خەڵکی لێ وریانەکردبێتەوە کە دەبێت لە ڕووی زانست و زانیارییەوە ئێمە پێشبکەوین، کەواتە لە ڕووی مێژووییەوە ئەم باسە پێشینەیەکی زۆری هەیە، واتە هەموو ئەو بەرهەمانەی کە تۆ دەیبینیت و کتێبخانەی ئیسلامی و ئوممەتی ئیسلامی پڕکردووەتەوە، هەمووی زەرورەتێکی چاکسازی و ڕیفۆرمو وشیاری و بەخۆداهاتنەوەی ئوممەت دروستیکردوون و بەدیهێناون.

## دەروازەی دووەم: دەروازەی واقیعییە

ئێستا کە سەیری هەل و مەرجی نەتەوەی ئیسلامی دەکەین چەند خاڵێك بەدیدەکەین:

دەبینین هەر دواکەوتنێك لە هەر کۆمەڵگەیەکدا بووبێت (دواکەوتنی شارستانی بێت یان ئابوری یان سیاسی)، ئەنجامەکەی دوورکەوتنەوەبووە لە زانست، هەرکەلێنێك دەبینیت لە سیستەمی سیاسیو حوکمڕانێتیدا، پەیوەندیی بەوەوە هەیە ئەو کەسانەی کە فەرمانڕەوایەتییان کردووە لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا، پابەندنەبوون بەزانستەوە و لەسەر پێوەری زانستی کارەکانیان نەکردووە، کەواتە ڕیفۆرمەکان بۆچی بەئەنجام نەگەیشتوون؟

چونکە لە ڕووی زانستییەوە کامڵ نەبوون، یان هەر بانگەوازێك لەو سەردەمانەدا نەگەیشتبێتە ئەنجام هۆکەی ئەوە بووە کە کۆڵەکەیەکی بنەڕەتی لە بانگەوازەکەدا ـ کە بریتییە لە زانست و زانستخوازی ـ فەرامۆشکراوە، واقیعی ئوممەتیش دەبینین لە ڕووی دواکەوتوویی و دیکتاتۆریەتی سیاسی و ئایدۆلۆژی و هەژموونی سیاسی و هەژموونی خۆرئاوا لەسەرمان بەناونیشانی جۆراوجۆرو، دواکەوتنمان لە ڕووی سیاسییەوە کە لە ژێر دەستەڵاتێکی دیکتاتۆریەتداین و هەژموونی فیکری خۆرئاوامان بەسەرەوەیە،و لاوەکانمان بەرەو بێشوناسی دەڕۆن، کۆمەڵگەکانمان خەریکە متمانەیانە بەیەکتری نامێنێت، هەر ئەم خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە کە ئێمە تیایدا دەژین چەندین کێشەی بەرجەستەو نادیاری هەیە، هەر دوو وولاتێك پێکەوە کۆمەڵێك کێشەو

گیروگرفتیان هەیە، ئەمە واقیعی ئەمڕۆی ئێمەیە، کەواتە ئەمەش بۆخۆی دەوازەیەکە وامان لێدەکات بیر لە چاکسازی بکەینەوە لە ڕووی سیاسیو فیکریو شارستانیەتییەوە، تەنانەت لە ڕووی ڕاگەیاندنیشەوە دەبێت بیر لە چاکسازی بکەینەوە، ئەو کەناڵەی کە هەمانە فێری ئەوەبن چۆن چاکسازبن بۆ ئەوەی چاکسازی بڵاوبکەنەوە، چۆن بەلاوەکانمان بڵێن ئەو دۆخەی کە ئێوە تیایدا دەژین دۆخێکە پڕە لە ئاڵۆزی و پەشۆکاوی، کەواتە ئەگەر لە ڕووی واقیعییشەوە سەیری واقیعی مێژووی ئیسلامی بکەین، واقیعێکە داوای ڕیفۆرمو چاکسازی دەکات.

لەڕووی چەمکەوە: بزانین جارێکیتر زانست واتای چییە؟ بەتایبەتی گرنگیی زانستە شەرعییەکان، ئەو زانستانەی کە لە ئاین و لە ئایینناسی و لە قورئان و لە سوننەت و لە مێژووی هـزرو لە فیقهـ و.. هتد دەکۆڵێتەوە، گرنگی ئەم زانستە لە ڕوانگەی فەلسەفییەوە، لە ڕوانگەی یاسادانان و تەشریعییەوە باسبکەین، هەروەها باس لەوەشبکەین کە چۆن مرۆڤـ بتوانێت خاوەن بیروبۆچوون بێت لە بوارەکانی ئەم زانستانەدا، ئەم زانستانە فرەچەشنن، هەم فێری ئەوەبین چۆن شەن و کەوی تیا بکەین و لە بێژنگی بدەین، چ زانستێك ئەمڕۆ زۆر پێویستەو چ زانستێك لە پلەی دوودایە، چ زانستێك ئەمڕۆ پێویستیی بەشیکارکردن و کردنەوەی زیاتر هەیەو چ زانستێك پێویستیی بەوەیە تازەگەری تێدابکرێت، بەبێ چارەسەرکردنی ئەم بابەتانە ناتوانین چارەسەری دۆخی هـزری و سیاسی خۆمان بکەین.

## ڕیفۆرم و چاکسازی چیین؟

ئەگەر کەسێك شارەزانەبێت و زانا نەبێت، کە سەیری چواردەوری خۆی دەکات، ڕەنگە وابزانێت هیچ عەیبێکی تیادانییە، دەڵێت ئێمە چ کێشەیەکمان هەیە، بەڵام دەرککردن بەواقیعی نەگونجاوو واقیعی دواکەوتوو تەنها زانایان دەتوانن بیدۆزنەوە و بیری لێبکەنەوە، تەنها کارێکە کە لە توانای خەڵکی ئەکادیمیو زانستخوازو کەسانی پسپۆڕدان، لە هەر بوارێك لە بوارە زیندووەکاندا بێت، کەواتە ئێمە دەبێت بزانین مەبەستمان لە چاکسازی چییە؟ مەبەستمان لە ڕیفۆرم چییە؟ هەر لە سەرەتاکانەوە دەبێت چەمکەکان ڕوونبن و واقیعەکان باش بناسرێن، هەر لە سەرەتاکانەوە دەبێت بزانین چ تەوژمێك لە مێژووی ئیسلامییدا بەکردار تەوژمێکی چاکسازی و چاکەخوازبووە، بەڵام ئێمە چەندین بزاڤ و تەوژمی چاکسازییمان لە مێژوودا هەیە لە دژی دیکتاتۆریەتی ناوخۆییو دژی داگیر کاری دەرەکی، هەوڵیانداوە و خەڵکیان وریاکردووەتەوە.

دیسان دەبێت لەسەر چەمکێکیتر بوەستین و خوێندنەوەی بۆ بکەین، ئێستا ئەرکی سەرشانی زاناو زانستخوازو شارەزایان لە چیدا دەبینرێت؟ واتە زانایان لەم سەردەمەدا کاریان چییە؟ ئەوانەی کە لە زانستی شەرعو زانستە مرۆڤایەتیو زانستە پزیشکییەکاندا یان زانستە سروشتییەکاندا شارەزان، هەموو ئەم زانستانە پێکەوە پاڵدەدەن بەیەکترییەوە و یارمەتی یەکتر دەدەن بۆ ئەوەی ئەم کەسە بەختەوەربێت و حەقیقەت بدۆزێتەوە، ئەرکی زانایان ئەوەیە کە

حەقیقەت بدۆزنەوە بۆ کەسانیتر، مرۆڤ بزانێت پێگەی خۆی کوێیە لەم سەر زەوییەدا؟ ئینجا ئەو بانگکردنەو ئەرکی ئەو بانگخوازییەی کە زانایەك لەسەرشانیەتی (زانا بەمانافراوانەکەی)، ئەوەیە کە خەڵك بانگبکات بۆ بەهابەرزەکانی مرۆڤبوون، بایەخە بەرزەکانی پەیوەستبوون بەخوداوە، بایەخە بەرزەکانی پەیوەستبوون بەدوارۆژو بایەخە بەرزەکانی خزمەتکردنی خەڵكو لەگەڵ خەڵکبوون و لەگەڵ مرۆڤبوون و ڕێزنان لە مرۆڤ، کەواتە ئێستا گەشتینە ئەو خاڵەی کە لە سێ دەروازەوە ئێمە دەتوانین بڕۆینە ناو بابەتەکە:

دەروازەی مێژوویی: کە سەیری مێژوویەك دەکەین ئەم مێژووە بەشێکی پڕە لە شانازی و بەشێکی پڕە لە شکست.

چۆن مرۆڤی ئەمڕۆ لە شکستەکانی مێژوو وانەی دواڕۆژی خۆی وەربگرێت،و چۆن شانازییەکانی مێژوو بکات بەچرای ئەمڕۆی.

دەروازەی واقیعی: ئاوڕدانەوەیەکە لە واقیعی ئەمڕۆ، ئەوەیە زۆر بەوردی و بەدیققەتەوە تەماشای ئەم واقیعە بکەین، لە ڕاستیدا واقیعێکی ئەسەفبارمان هەیە کە زۆر دیاردەی نەخۆشیی پێوەیە، واقیعێکی نەخۆشمان هەیە، بەواتای ووشە نەخۆش، ئەم واقیعەنەخۆشە پێویستی بەچارەسەر هەیە یان نا؟ پێویستی بەچارەسەر هەیە. ئەم چارەسەرە بەچی دەکرێت؟ بەچاکسازی و بەبانگەواز.

## ڕیفۆرم چییه؟

ڕیفۆرم ئەوەیە کەسێك سەیری ئەم واقیعە بکات و وەك پزیشکێکی شارەزا نەخۆشییەکان شیکاربکات و بزانێت چارەسەرەکەی چییەو بانگەواز بکات، مرۆڤی ئەمڕۆ لە حاڵەتێکی وێڵبوون و لە حاڵەتێکی دەست و پێونکردن و ، لە حاڵەتێکی ونبووندا دەژی، ئەم مرۆڤە خەونی گەورەگەورەی هەیە، هیواو ئاواتی گەورەگەورەی هەیە، هەندێك لە ئاواتەکانی پەیوەندییان بەم دونیاوە هەیەو هەندێك لە ئاواتەکانی پەیوەندییان بەجیهانێکی دیکەوەهەیە، ئەم مرۆڤە بانگبکەین بۆ پایەبەرزەکان، چونکە لە سایەی ئەو پایەبەرزانەدا مرۆڤـ دەتوانێت بەختەوەریی ئەم جیهان و ئەوجیهانیش بۆخۆی دەستەبەربکات.

لەم سێ دەروازەوە دەتوانین بڕۆینە ناو بابەتەکەوە و هەریەکەیان بۆخۆی لایەك دەگرێت، لە ئەنجامدا هەموویان خزمەت بەکۆمەڵگە دەکات.

ئێستا کە باسی ڕیفۆرم دەکرێت لە جیهانی ئیسلامییدا، کە باسی ڕیفۆرم دەکرێت تەرکیزدەکرێتە سەر شەش خاڵ کە ئەمانەن:

یەکەم: باس لە هۆکارەکانی دواکەوتن.

دوو: هۆکارەکانی پێشکەوتن.

سێ: جەختکردن لەسەر ئاکارو ڕەوشتی بەرز.

چوار: جەختکردن لە باسوخواسی ئافرەت لەم کۆمەڵگەیەدا.

پێنجەم: ئینجا باسی دادگەریی کۆمەڵایەتی.

شەش: باسکردن لە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ تەکنەلۆجیای هاوچەرخو سەردەم.

ئێستا له جیهانی ئیسلامدا له ناوەندەکانی فێربوون و خوێندندا تەنانەت له کۆنگرەو سمینارەکاندا که باس له ڕیفۆرم دەکرێت، زاناکان، لەم خاڵانەی که باسمانکرد، دەکۆڵنەوە:

یەکەم: بیر لەوەدەکەنەوە که گەلێك بۆچی دوادەکەوێت؟ چۆن و چ کاتێك دەتوانین بڵێین ئەو گەله له کاروانی پێشکەوتن و له کاروانی مرۆڤایەتی بەجێماوە؟ واته هۆکارە سەرەکییەکانی دواکەتن چین؟

یەکەم: بیر لەوەدەکەنەوە دەڵێن هەر میلـلەتێك ئاگاداری سوننەتی ژیان نەبێت، ئەو میلـلەتە دوادەکەوێت، سوننەتی ژیان (بریتییە لەوەی ئەو میلـلەتەی که زیاتر تێبکۆشێت زووتر بەئامانج دەگات، ئەو میلـلەتەی زیاتر خوێندەواربێت زووتر دەتوانێت دەستەڵات پەیدابکات بەسەر سروشت و دەوروبەری خۆیدا، ئەو میلـلەتەی یەك پارچە بێت زیاتر دەتوانێت کۆسپو تەگەرەکانی بەردەمی خۆی تەختبکات، هەر کۆمەڵگەیەك زیاتر یەکگرتوو بێت زیاتر دەتوانێت بەرامبەر بەکارەساته مرۆڤکردو سروشتییەکان بەرگەبگرێت. کەواته تۆ له ژیاندا سەرکەوتوو نابیت ئەگەر نەزان بیت و چاوت کراوه نەبێت و تێگەیشتنت بۆمێژووو ئێستا نەبێت، خەیاڵدانت ئەوەندە فراوان نەبێت که ئەگەرەکانی داهاتوو بخوێنیتەوە، کەواته یەکەمین هۆکاری دواکەوتن ئەوەیە که له خۆماندایە، هۆکاری دواکەوتن پێش ئەوەی که هێزێکی ڕێگربێت له پێشکەوتنمان خۆمان دەبین بەرێگر له پێشکەوتنی خۆمان ئەگەر هەرکاتێك خۆخۆرو دوژمن بەیەکتری بین و یەکتری نەخوێنینەوە.

دووهەم: دووركەوتنەوە لە ئاڵوگۆڕكرنی تێكەڵ بەدەوروبەر، واتە هەركاتێك میللەتێك خۆی ئەوەندە زانیاری پێنەبێت دەستبخاتە ناو بازاڕی مامەڵەكردن لەگەڵ گەلانیتر، ئەو گەلە دەبێت بەگەلێكی چاولێكەر، وولاتەكەی دەبێت بەبۆشاییەك كە لەملاولاوە شتی بۆ بێت، خۆی ئەدەبیاتی نییە ئەدەبیات لەمولەو وەردەگرێت، خۆی فەلسەفەی نییە فەلسەفە لەمولەو وەردەگرێت، هەروەها هونەرو بەرهەمی نوسراو. خۆی دەستاوەردی تەكنەلۆجی نییە لەمولەوی وەردەگرێت، كەواتە ئەم كۆمەڵگەیە، یان ئەم نەتەوەیە، بۆخۆی دەبێت بەكۆڵێكی قورس بەسەرشانی مرۆڤایەتییەوە، لەبەرئەوە سەنگی نامێنێت و لە بازاڕی ژیاندا حسابی بۆ ناكرێت، لە ئەنجامدا دەبێت بەنەتەوەیەكی چاولێكەر، كە مرۆڤ چاولێكەربوو زۆر بەئاسانی دەتوانێت خۆی بدۆڕێنێت، زۆر بەئاسانی دوادەكەوێت، كەواتە بیرمەندان بیریان لەوبارەیەوە كردووەتەوە و لە چەندین كتێبو بابەت و گۆڤارو سمینارەدا ئەو ڕاستییەیان خستووەتەپێشچاو.

**سێهەم: هۆكارەكانی پێشكەوتن:**

باسێكیتر كە زۆر گرنگیی پێدەدرێت لە ریفۆڕمی ئیسلامییدا، بریتییە لەو پرسیارەی دەڵێت: هۆكارەكانی پێشكەوتن چیین؟ ئەو میللەتانەی كە پێشكەوتوون بەچی پێشكەوتوون. بیرمەندان قسە لەسەر ئەوەدەكەن دەڵێن یەكەمین هۆكار بۆ پێشكەوتن بریتییە لە (زانینی نرخی تەمەن و كات)، ڕێز لە كاتی خۆیان دەگرن، واتە ئەو ژیانەی خۆی وابەرنامەڕێژ كردووە كە ساتێكی بەفیڕۆنەچێت، لەبەرئەوە ئێمە

له ناو خۆماندا پێویستمان بەوە هەیە جارێکیتر چاوبگێڕینەوە بەدابەشکردنی ژیانی خۆمانداو بەرنامەو پلان دابنێین، بەتایبەتی خوێندکاران و مامۆستایانی زانکۆو مامۆستایانی ئاینی و خوێندەواران و ڕۆشنبیرانی ئاینی و ڕۆشنبیران.

مەبەستمانە بزانین ئەو تەمەنە، لە بەرامبەر ئەو ئەرکە مێژووییەی کە لە سەرشانمانە، پێویستی بەوەهەیە چاك دابەشی بکەین و بەکاریبهێنین، ئەو وولاتە پێشکەوتووانە لە بابەتی کاتدا زۆر بەگرنگی بۆ بابەتەکان دەچن، کاتیان زۆر لاگرنگە، نمونەیەکی زۆرسادە: کاتێك گەشتێکی فڕۆکەوانی نیوکاتژمێر یان کاتژمێرێك دوادەکەوێت، بەشێوەیەك کاریگەری دابنێت لەسەر ئەو وادە (مەوعید)ـەی کە کەسێك داویەتی، بەپێی یاسای ئەو وولاتانە ئەو کۆمپیانیا فڕۆکەوانییە سزای ماددیی دەدرێت، لەبەرئەوە سەیردەکەین گەشتەکانیان وەك میلی کاتژمێر ڕێکخراوە، کە دەڵێن ئەو فڕۆکە ئەو کاتژمێرە دەگات، تاپێیانبکرێت نایەڵن دوابکەوێت، سزای ماددیی لەسەردانراوە، بەڵام لە وولاتی ئێمەدا سەیردەکەیت زۆر بەئاسانی مرۆڤ لە کات و وادە دیاریکراوەکان لادەدات، وەك ئەوەی تەمەن نرخی نەبێت بەلایەوە، تۆ چوار کاتژمێر دادەنیشیت بێکارو هیچ سزایەکیش دانانرێت لەسەر ئەو کۆمپانیایەی کە بەڵێنی داوە بتگەیەنێت بەشوێنێك، کاتەکانمان زۆر لادەدات، تەنانەت هۆڵەکانی وانەوتنەوەمان، بەڵێن لەگەڵ برادەرێك یان لەگەڵ خوشکێك دادەنێیت تەماشادەکەیت خەڵکەکە پابەند نابێت پێیەوە، ئەمە دواکەوتنە، کەواتە یەکەمین هۆکار لە هۆکارەکانی

پێشکەوتن کاتە، ئێستا ڕیفۆرمخوازەکان زۆر تەرکیزی لەسەردەکەن و پێی لەسەردادەگرن، لەسەرئەوەی کە چۆن ئێمە کاتی خۆمان وەها لێبکەین بەفیڕۆنەڕوات.

**یەکێکیتر لە هۆکارەکانی پێشکەوتن ئازادیی بیروبۆچوونە:**

لەووڵاتی پێشکەوتوودا هەرکەس هەر جۆرە بیروبۆچوونێکی هەبێت، بەبێ دڵەڕاوکێ باسیدەکات و دەریدەبڕێت، بەڵام لە ووڵاتی دواکەوتوودا خەڵکەکە تووشی نیفاق دەبن، ئەو شتە باسدەکات بۆ خەڵك کە لە ناخەوە باوەڕی پێینییە، سەیردەکات بزانێت بەرامبەرەکەی چی پێخۆشە ئەم ئەوە دەڵێت، باخۆیشی بڕوای پێنەهێنێت، چونکە کۆمەڵگەکە فێری ئەوەنەبووە کە ئازادیی بیروبۆچوون و ئازادیی بیروڕادەربڕینی هەبێت،و ئەومافەی هەبێت، بەڵام تەماشادەکەیت لە ووڵاتە پێشکەوتووەکانداو لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا مرۆڤەکە بۆخۆی بەنرخە، بەڵام لای ئێمە بەداخەوە تەنانەت ڕۆتینی فەرمانەگان وایلێهاتووە کەسەکە خۆی بەنرخ نییە، بۆ نمونە کە مامەڵەیەك دەکەیت ڕەگەزنامەو ناسنامەشت پێیە کەچی داوای کۆبۆنی خۆراکت لێدەکات، کۆبۆنی خۆراك لە خۆت گرنگترە، پارچەکاغەزێکە، ئایا ڕێز دانرا بۆ مرۆڤو ڕێز دانرا بۆ جیاوازی؟ نەخێر.

یەکێکیتر لە هۆکارەکانی پێشکەوتن: ئەوەیە کە مرۆڤ ڕابهێنیت لەسەر بیرکردنەوە، لەسەر ئەوەی خۆی بگات بەئەنجام، لەبەرئەوە باشترین هۆکار بۆ ئەوەی خوێندکارێك سەرکەوتووبێت ئەوەیە وای

لێبکەین خۆی بەدوای زانیارییەکاندا بگەڕێت نەك تۆ زانیاری وەك هێلکەیەکی پاککراو بۆ بخەیتە سەردەفرێك، چونکە هیچ ماندوو نەبووە پێیەوە،و زۆر بەئاسانی دەتوانێت وازی لێبهێنیت و نەیەوێت، بەڵام تۆ وەرە وەك مامۆستایەك هەستی بەدواداچوون بوروژێنە لەو خوێندکارەی کە تۆ کاری لەگەڵ دەکەیت، باخۆی بگات بەو ئەنجامەی کە تۆ خۆیشت دەیزانیت، بەڵام با ئەو ماندووبێت بەبابەتەکەوە و قەدری بزانێت.

یەکێکیتر لە هۆکارەکانی پێشکەوتنی وولاتان: خەڵکی وولاتانی پێشکەوتوو ئولفەت لەگەڵ سروشت دەگرن، واتە بەدۆستانە مامەڵە لەگەڵ سروشتدا دەکەن، چونکە سروشت بەشتێك نازانن کە شایستەی ئەوەنەبێت لێی تێبگەن، ئەو سروشتەی کە تۆ لە ناویدا دەژیت و لە ئامێزیدا گەورەدەبیت، سروشتێکی دۆستی تۆیە، دۆستی تۆیە و ئامادەیە بۆ ئەوەی خۆیت پێبناسێنێت، ئەم بەرداشت و ئەم تێگەیشتنە لە بوون، کاریگەری هەیە لەسەر تۆ.

خاڵێکیتر کە لە بانگەوازی ڕیفۆرمی ئیسلامییدا باسی لێوەدەکرێت، چۆن لە ڕەوشت (ئەخلاق) تێبگەین؟، چۆن دژایەتیی دیکتاتۆریەت و هەڵوەشاندنەوەی ڕەوشت و ڕۆچوونی ڕەوشتی بکەین؟ هەروەها بابەتی مامەڵەکردنە لەگەڵ ئافرەت، بابەتی مامەڵەکردنە لەگەڵ خێزان، بابەتی داد گەری کۆمەڵایەتی، چۆنێتی سوودوەرگرتن لە ڕۆژگار.

ئەمانە کۆمەڵێك بوارن کە ڕیفۆرمیستە مسوڵمانەکان بەهەموو پسپۆڕییە جیاجیاکانەوە هەوڵیانداوە قسەی لەسەربکەن.

# وەڵامی پرسیارەکان:

بەشداربوویەك: لە قسەکانی بەڕێزت ئەوە دەردەکەوێت کە بە دڵنیاییەوە هەرتاکێك بیەوێت ڕیفۆرم لە دەوروبەریدا بکات پێویستی بەدووشتە: یەکێکیان ئەو مەنهەجەیە کە خۆی گۆڕانکاری بکات، دووەمیان ئەو واقیعەی کە تیایدا دەژی. پرسیاری من ئەوەیە ئایا جیاوازی لە نێوان فەیلەسوفاندا کە هەمبانەی زانست بوون، لەگەڵ پێغەمبەران و شوێنکەوتووانی پێغەمبەراندا چییە؟

د.صەباح: جیاوازی لە نێوان فەیلەسوفان و پێغەمبەراندا چییە؟

لەڕاستیدا فەیلەسوفانی ڕاستەقینە ئەوانەن کە بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێن، دەیانەوێت جیهان و بوون بەوشێوەی کە هەیە لێی تێبگەن، مەنهەجەکەشیان مەنهەجی عەقڵییە واتە لێکدانەوە و شیکارەکانی لە ڕێگەی عەقڵی خۆیانەوەیە بۆ گەیشتن بەوڕاستییەی کە لە بووندا هەیە. گەیشتنەکەشیان گەیشتنێکی ڕێژەییە، واتە مەرجنییە بگەنە ناو چەقی ڕاستییەکە، بەڵام پێغەمبەرانی خودا(سەلامی خوایان لەسەر) کەسانێکن کە لە لایەن خوداوە ئەوفەرمانەیان پێکراوە و ئەرکیان خراوەتە سەرشان کە بە شێوەیەکی ئاسانتر ڕاستییەکان بەخەڵك بڵێن، چونکە جەماوەری خەڵك ڕەنگە لە قسەی فەیلەسوفان بەوشێوەی کە پێویستەو مەبەستە، تێنەگەن، زمانی فەیلەسوفان زۆرجار زمانێکی ئاڵۆزە، چونکە حەقیقەتەکە ئەوەندە گەورەیە ڕەنگە لە ناو وتەدا بەجوانی جێگای نەبێتەوە.

بەڵام پێغەمبەران بەشێوەیەکی ئاسانترو ئاساییتر ئەو ڕاستییانە بەخەڵك دەگەیەنن، ئەوەی فەیلەسوف پێیدەگات پێغەمبەری خودا

بەخەڵکی دەگەیەنێت و بەشێوەیەکی ئاسانتر. جگەلەوەی پێغەمبەر بۆخۆی دەبێت بەنمونەیەکی ئەخلاقیش، واتە ئەوەی کە دەیهێنێت و دەیگەیەنێت، لە ژیانی خۆیداو لە ژیانی تاکەکەسییدا ڕەنگدەداتەوە.

جیاوازییەکی دیکە لە نێوان فەیلەسوف‌و پێغەمبەردا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەرەکان کەسانی مەیدانین، کەسانی کردەیین،و لەخۆبوردوون، بەڵام فەیلەسوفەکان مەرجنییە لەو ئاستەدابن، میتۆدی فەیلەسوفان ـ وەك وتمان ـ میتۆدی عەقڵییە، بەڵام میتۆدی پێغەمبەران فێرکارانەیە. فەیلەسوف ڕەنگە کەس پابەند(مولزەم) نەکات بەخۆبەختکردن، واتە فەیلەسوف ئەو ئازایەتییەی پێغەمبەری نییە، چونکە پێغەمبەر هەستدەکات بەوەی کە هێزێکی میتافیزیکی لە پشتییەتی و یارمەتیدەریەتی، بەڵام فەیلەسوف ئەمەی نییە، ئەو ئامادەییەی کە لە کاری پێغەمبەراندا هەیە لە کاری فەیلەسوفاندا نییە.

**بەشداربوویەك:**

**ئەوانە کێن کە دەتوانن چاکسازی بکەن لە کۆمەڵگەدا؟**

د.صەباح: سەبارەت بەم پرسیارە من هەوڵدەدەم لە شوێنێتردا باسی بکەم، دەبێت ئەوکەسە لە سنوری خۆیدا چاکبێت، واتە دەبێت ئەو کەسە کەسێك بێت گەندەڵ نەبێت، کەسێك بێت بەکردەیی ئەوکارانە بکات، کەسێك بێت بزانێت چاك چییەو بانگەوازی بۆ بکات و لە خۆشییدا ڕەنگبداتەوە، بشزانێت خراپ چییە و ڕێگری لێبکات و لە خۆیشیدا ئەو خراپییە نەبێت، واتە دەبێت کەسێك بێت خاوەنی ئاکارێکی پەسەندو

خاوەنی بەرنامەو پلان و خاوەنی ئامانج لە ژیان بێت، کەسێکی لەوشێوە دەتوانێت چاکسازی بکات و بانگەواز بۆ چاکسازی بکات.

**بەشداربوویەك:** ئایا زانایان و ڕۆشنبیران تاچەند توانیویانە ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن لەوەی کە خەڵك وورپابکەنەوە بۆ ئەوەی کە متمانەیان بەخۆیان هەبێت یان دەرخستنی ڕاستییەکان و وورپاکردنەوەیان بۆ خەڵك هەبێت؟

د.صەباح: ناتوانین بڵێین لەسەداسەد زانایان و ڕۆشنبیران ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێکردووە، دەتوانن بڵێین ئەوی کە زانای ڕاستەقینە و ڕۆشنبیری ڕاستەقینەیە ناتوانێت بێدەنگ بێت لە خراپەکاری و ناتوانێت بانگەوازنەکات بۆ چاکسازی، واتە وەك چۆن گڵۆپێك ناتوانێت تیشك نەدات، سروشتی گڵۆپ ئەوەیە کە تیشك بدات، سروشتی ڕۆشنبیرو زانا ئەوەیە کە دەوری ڕۆشنگەری ببینێت،و ڕاستییەکانیش دەربخات بۆ خەڵك، لەو پێناوەشدا ئامادەبێت تووشی مەینەت و ئازارو زەحمەت ببێت، وەك شاعیرە کوردەکەش دەڵێت:

هونەرمەندو ژیانی خۆش مەحاڵە

هونەرمەند ڕەنجەڕۆیە ژینی تاڵە

لە دونیادا ئەوەی ئەهلی هونەربێ

دەبێت یان دەربەدەر یان دەسبەسەربێ.

ئێمەش دەڵێین هونەرمەندی ڕاستەقینە ئەوکەسەیە کە دەرك بەواقیعەکە بکات، لە واقیع تێبگات، بۆ خۆیشی کەسێکی دڵسۆزو چاکسازو چاکەخوازبێت.

# هۆكارەكانی لادان و گەندەڵی و
# تێكچوونی ژیانی كۆمەڵایەتی

لەباسی پێشوودا لە چەند دەروازەیەكەوە چوینە ناو باسەكەوە، لێرەدا باسی هۆكارەكانی لادان و گەندەڵی‌و تێكچوونی ژیانی كۆمەڵایەتی دەكەین لە ڕوانگەی هەندێك لە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆزەوە:

یەكەمین هۆكاری ڕوودانی نالەباری و ناهەمواری لە ژیانی كۆمەڵدا بریتییە لە پەیڕەویكردن لە ئارەزووی نەفسی مرۆڤو ویست و حەزەكان، لەوەی كە مرۆڤ ویست و ئارەزووی خۆی بكات بەپێوەر بۆ باشیی خواستەكان، كە ئەمە ڕەنگە بەبۆچوونی هەندێك لە بیرمەندان و ئەو كەسانەی كە بە خۆیان دەڵێن ڕۆشنبیر، ئەمەی پێباشبێت كە مرۆڤ هەرچی دەیەوێت بیكات و مافی خۆیەتی، بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا لەوەی كە نەفس دەیەوێت و ئارەزووو داوای دەكات و ، منی مرۆڤ دەیەوێت، بەیەكێك لە هۆكارەكانی تێكچوونی شیرازەی ژیانی مرۆڤایەتی ناوزەدكراوە ﴿وَلَوِاتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ﴾ المؤمنون:٧١. واتە ئەگەر حەق، یان ڕاستی، یان خوای پەروەردگار، یان ئەوەی كە پێوانەی وەحی‌و نیگاو سروشتی خواییە، پەیڕەوی لە ئارەزووی مرۆڤەكان بكات لەوەدا كە دەیانەوێت و ،

پاڵنەری هەواو ئارەزوو بانگهێشتیان دەکات، ئەوسا گەندەڵی و نادڵنیایی لە ژیانی مرۆڤدا ڕوودەدات، واتە ئەگەر مرۆڤ بیەوێت ئەوەی کە خۆی بەباشی دەزانێت ئەوە باشبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە حەزی لێیەتی و لەبەرئەوەی کە چێژی لێوەردەگرێت، واتە چێژو حەزو ئارەزوو بوو بەپێوەر بۆ مرۆڤەکان و کۆمەڵگە ـ وەك ئەوەی کە ئێستا بەناوی جیاوازەوە بانگەشەی بۆ دەکرێت ـ ئەوە یەکێکە لە هۆکانی تێکچوون و یەکێکە لە هۆکانی لەناوچوون.

یەکێکیتر لە هۆکانی لەناوچوون و گەندەڵی، بریتییە لە دووفاقبوون و ئیزدواجییەت لە شوناسدا، بریتییە لە درۆکردن، واتە مرۆڤ ڕواڵەتێك نیشانبدات پێچەوانەی جەوهەرو ناوەڕۆکی بێت، واتە شوناسی ناخ‌و دەروون و جەوهەری حەقیقی ئەوکەسە جیاوازبێت لەوەی کە نیشانی خەڵکی دەدات، وەك خوای پەروەردگار کە باسی دووڕووەکان دەکات دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾ البقرة:١١. واتە هەرکاتێك پێیانبوترێت فەساد مەکەن، گەندەڵی مەکەن، خراپەکاری مەکەن و لامەدەن لە یاساو لە ڕاستی، خراپەکاری مەکەن لەسەر زەویدا، ئەوان بەو بانگەشەیەی کە هەیانە و بەو هیوایانەی کە خستوویانەتەڕێ، دەڵێن نەخێر هەر ئێمە چاکەخوازین، هەر ئێمە ئەهلی چاکەین، لە ڕاستیدا ئەم قورئانە دۆسیەیەکی گەورەیە کە ناوو دروشمی دووڕووانمان نیشاندەدات لە هەموو سەردەمانێکدا، لەبەرئەوە سەیردەکەین ئەو کەسەی کە خراپەکارە هەرگیز ناڵێت من خراپەکارم، بەڵکو بەپێچەوانەوە، دەڵێت هەر من چاکەخوازم، زۆرجار ڕاگەیاندن دەبێتە

هۆکارێکی سەرەکی بۆ گەندەڵی و لادان، کاتێك کە پێچەوانەی ڕاستییەکان بەرگی چاکەی لەبەربکات و وانیشانی بدات.

هۆکارێکی دیکە کە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێدراوە، بریتییە لە نەزانینی مەعریفی، واتە خاڵیبوونی مرۆڤ لە باری زانست و زانیاری، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَلا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَـكِن لاَّ يَشْعُرُونَ﴾ البقرة:١٢. خراپەکارن، هەرئەوان لادەرو تێکدەرن، بەڵام بەخۆیان نازانن. واتە نازانن کە خۆیان چەندێك خراپن، کەواتە گەورەترین کێشە بۆ مرۆڤ ئەوەیە کە ئەندازەی گەندەڵی و لادانی خۆی نەزانێت. لەبەرئەوە دەبێت لە ناو کۆمەڵگەدا چەند دەزگایەکی بێلایەن هەبن بۆ هەڵسەنگاندنی ئەداو هەڵسەنگاندنی باری تواناو پابەندبوونی خەڵك بەو بەرنامەو یاساو ڕێسایەی کە دانراوە، واتە زۆرگرنگە ـ بەتایبەتی لە سیستەمێکی سیاسیدا ـ کەسانێك هەبن هەمیشە ئاگاداری ئەو سیستەمە بکەنەوە کە چەندێك دەزانن و چەندێك نازانن، چەندێك باری مەعریفییان هەیە، واتە بەو فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپەیە دەتوانرێت بەدەزگای ڕاگەیاندنی دەستەڵات بوترێت: بۆخۆت وادەزانیت کە تۆ لەوپەڕی باشەو چاکەو چاکسازیدایت، لە ڕاستیدا لە نەزانیدا نوقمبوویت.

یەکێکیتر لە هۆکارەکانی گەندەڵی لە وولاتدا، ئەوەیە کە پەیڕەویی لە ڕێگە مادداییەکان بکرێت. پەیڕەویکردن لەو بیردۆزە مادییانەی کە تەنها پشت بەلایەنی ماددیی لە بوونی مرۆڤدا دەبەستێت، واتە پشت لە هەموو ڕیفۆرمەکان و بوارەکانی چاکسازی دەکات، تەنها پشت بەلایەنی

ماددیی دەبەستێت، واتە مامەڵەکردنی سیستەمی نوێ یان سیستەمی سیاسی لەگەڵ مرۆڤدا تەنها وەك بوونەوەرێك‌و وەك ماشینێکە. کە ئەمەش بەڕاستی کێشەی زۆری لێکەوتووەتەوە.

هۆکارێکی دیکە، ڕووکردنە دونیایە: بریتییە لەوەی مرۆڤ هەموو خەمێکی ببێت بەودونیایەی کە تێیدا دەژی، واتە ئاخیرەتی بەتەواوی مانا لە بیر بچێت و بیری لەوەنەبێت کە ڕۆژێکی لێپرسینەوە هەیە، ڕۆژێکی حساب‌و کیتاب هەیە، کە ئەو کەسە دەبێت وەڵامی کارەکانی ژیانی دونیای بداتەوە، وەك خوای پەروەردگار لەسورەتی (العنكبوت)دا ئاماژەدەکات: ﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْباً فَقَالَ يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَارْجُوا الْيَوْمَ الْآخِرَ وَلاَ تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ العنكبوت:٣٦. واتە ئەمە بەڕاستی نیشانەی ئەوەیە کە یەکێك لە هۆکارەکانی گەندەڵی لە کۆمەڵگەداو بڵاوبوونەوەی گەندەڵی لەسەرزەویدا بریتییە لەوەی کە خەڵك واز لەم دوو ئاڕاستەیە بهێنن، واز لە پەرستشی ڕاستەقینە بۆ خوای پەروەردگارو وازبهێنن لە ڕۆژی دوایی، بیری ئەوەنەکەن کە ڕۆژێکی لێپرسینەوە و ڕۆژێکی دوایی و جیهانێکی فراوانترو جیهانێکیتر هەیە، ئەمە بەڕاستی ڕەنگە خاڵی جیاوازی بێت لە نێوان ئەوکەسەی کە ئاینپەروەرە لەگەڵ ئەوکەسەی کە دونیاپەروەرە. ئاینپەروەر، بریتییە لەوەی کە ئامانجی سەرەکی مرۆڤ بریتیبێت لە جیهانێکی باشترو حساب بۆ ئەو قۆناغە بکات کە دوای مەرگی دەستپێدەکات، بەڵام دیارە ئەو کەسەی کە ئاینپەروەرنییەو بڕوای بەبۆچوونی ئاینی نییە لە پێکهێنانی

ژیاندا، پێیوایه هەموو مەبەستێك لەم ژیان و لەم چەندڕۆژەی ئەم دونیایەدا پوختبووەتەوە.

هۆکارێکی دیکە لە دروستبوونی گەندەڵی، پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤە: واتە دان نەنانە بەوەی کە ئەو خەڵکە هەندێك مافیان هەیەو، هەندێك ئەرکی سەرشانی ئەمان هەیە بەرامبەر بەوان، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار بەشێوازێکی جوان و بەڕێگرییەکی بڕاوە دەفەرموێت (ولا تبخسوا الناس أشيائهم) ئەو تێکۆشان و هەوڵو کارو کردەوە و بەرهەمو ڕەنجەی خەڵکیتر بەسووك مەزانن و بەهەرزان سەیری مەکەن ﴿وَلاَ تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ العنكبوت:٣٦. کەواتە پەیوەندییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەوەی کە بەرهەمو ڕەنجو تەقالاو هەوڵوتێکۆشانی خەڵك بەکەم بزانیت، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی گەندەڵیدا، کەواتە ئەگەر بمانەوێت بڵێین یەکێك لە هۆکارەکانی گەندەڵی ئەوەیە کە بە تایبەتی دەستەڵاتدار دێت بەبێبایەخ تەماشای کاری خەڵکیتر دەکات، بەتایبەتی بەبێبایەخ تەماشای کاری ئۆپۆزسیۆن و کەسانیتر دەکات، لە کاتێکدا خوای پەروەردگار دەفەرموێت ئەو خەڵکەیتر ـ کە ڕەنگە نەشیانناسن ـ بەڵام حەقبدەن بەکارو بەرهەمو ڕەنجەکانیان و بەکەم تەماشایان مەکەن (ولا تبخس) کەواتە دەبێت مافەکانیشیان بەکەم سەیرنەکەن.

**هۆیەکیتر لە هۆکانی دروستبوونی گەندەڵی لە ناو کۆمەڵگەدا، ریتییە لە بوونی شەڕوململانێ:**

ئەو ململانێیە کە لەسەر بنەمای گرتنەدەستی دەسەڵات لە نێوان خەڵکدا دروستدەبێت،و خوای پەروەردگار لە سورەتی (النمل)دا بۆمان دەگێڕێتەوە، حیکمەتێکە لەسەر زمانی ئافرەتێك بەناوی (بەڵقیس) کە پادشای موڵکی سەبا (سبأ) بووە، دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ﴿قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا﴾ النمل٣٤. واتە ئەوکەسەی کە (دەستەڵاتدار بێت، سەرۆك بێت )، هیوایەتی ئەوەبێت کە خەڵك کڕنووشی بۆ بەرن، جا بڕۆنەناو هەر کۆمەڵگەیەك یان وڵاتێك، هیوایەتیان ئەوەیە کە گەندەڵی بڵاوبکەنەوە، واتە تەنها ڕێگایەك بۆ ئەوەی کە دیکتاتۆریەت لە شوێنێك لە شوێنەکانی ئەم دونیایەدا جێگیربێت و پایەداربێت،و خەڵك بیر لە لابردنی نەکاتەوە، بریتییە لە بڵاوکردنەوەی گەندەڵی، بێگومان گەندەڵی بەشێکی بریتییە لە گەندەڵی ئەخلاقی و لە گەندەڵی فیکری، بەشێکی بریتییە لە گەندەڵی سیستەمی...هتد، هەموو جۆرەکانی گەندەڵی هۆکارێکی باشە بۆ ئەوەی کە دیکتاتۆریەتەکان درێژە بەدەستەڵاتی دیکتاتۆریی خۆیان بدەن، کەواتە پاوانخوازی و دەستەڵاتخوازی لە ڕاستیدا هۆیەکیتری سەرەکییە بۆ ئەوەی کە گەندەڵی بڵاوبێتەوە لە ناو کۆمەڵگەیەکدا.

**هۆکارێکی دیکە کە پەیوەندیی بەخەڵکی ئاینداره‌وه‌ هەیە، فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە:**

هەرکاتێك باوەڕداران کەمتەرخەمییان کرد لە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپەدا، هەرکاتێك هەڵگرانی پەیامی ڕیفۆرمخوازیو هەڵگرانی پەیامی یەکتاپەرستی هەڵنەستان بەئەنجامدانی ئەوئەرکەی کە لەسەر شانیانە، هەرکاتێك بەخەڵکیان نەوت چی بکەن و چی نەکەن، جوانییەکانیان بۆ ڕوونئەکردنەوە و بانگیان نەکردن بۆ جوانی و کارە باشەکان، ڕوونیان نەکردەوە چی خراپە و هەوڵیان نەدا خەڵکی واز لەو خراپەکارییانە بهێنن، ئەوکاتە گەندەڵی بڵاودەبێتەوە، چونکە سروشتی گەندەڵی ـ وەك میکرۆبو ڤایرۆسی ژیانبەخش ـ هەمیشە لە ژینگەیەکی خراپدا پەرەدەسێنێت، لە ژینگەی تەندروستدا هیچ جۆرە میکرۆبێك بڵاونابێتەوە، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار لە سورەتی هوددا دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلاَ كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُوْلُواْ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ الْفَسَاد فِي الأَرْضِ إِلاَّ قَلِيلاً مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ﴾ هود١١٦. سەیردەکەیت لێرەدا ئاماژەیەك هەیە کە دەبێت لە هەموو سەردەمانێکدا کەسانێك هەبن کە ڕێگا لە گەندەڵی بگرن، واتە جەماوەری خەڵك سەرقاڵی کارو دەرامەتی خۆیانن، دەبێت کەسانێکی هەڵبژاردە هەبن لەناو خەڵکاندا، بۆ ئەو خەڵکە ڕوونبکەنەوە کەچی باشەو چی خراپە، هەرکاتێك ئەوانە هەبوون بەڵام کەمتەرخەمییان کرد، یان کەمتەرخەمییان نەکرد بەڵام جۆرەها کۆسپو تەگەرەیان بۆ دروستکراو جۆرەها تۆمەت و تەشەریان لێدرا، ئەوکاتە دەبینیت ڕێگا خۆشدەبێت بۆ گەندەڵی و بۆ خراپەکاری.

**هۆکارێکیتر لە هۆکارەکانی گەندەڵی بریتییە لە سووکایەتیکردن بەئافرەت:**

سووکایەتیکردن بەئافرەت لە ڕووی دەروونی و لە ڕووی جەستەییەوە و شکاندنی حورمەتی ئافرەت و ناشیرینکردنی ڕوخساری ئافرەت بەوەی کە وەك کاڵایەکی بازرگانی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و ئاڕاستەیەکی خراپ بگرێت و دەستدرێژی بکرێتەسەر، هۆکاری گەندەڵییە. وەك خوای پەروەردگار هەر لە سورەتی (قصص)دا کە باسی گەندەڵیی فیرعەونمان بۆ دەکات یەکێك لە نیشانەکانی، کە دیارە یەکێکە لە هۆکارەکانیش دەخاتەڕوو: ﴿يُذَبِّحُ أَبْنَاءهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ﴾ القصص:٤. فیرعەون وەك دیکتاتۆرێكو، ڕەمزی دیکتاتۆریەت لە هەموو سەردەمو لە هەموو کاتێکدا، کاری ئەوەیە کە نەهێڵێت کەسانی بەجورئەت و کەسانی بەهەڵوێست (کەلێرەدا ڕەمزە)، بمێنن، لەبەرئەوە هات لە ناو بەنی ئیسرائیلدا ئەوەی کە لە باریداهەبوو ڕۆژێك لە ڕۆژان تێبکۆشێت بۆ نەهێشتنی گەندەڵی، کوشتیو ئافرەتەکانی هێشتەوە بۆ ئەوەی سوکایەتییان پێبکات و بەکاریانبهێنن بۆ بڵاوکردنەوەی گەندەڵی، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار بەدڵنیاییەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ﴾ القصص:٤.

**هۆكارێكیتر، دانانی كەسانی نەگونجاوە:**

هۆكارێكی زۆر سەرەكیو گرنگ بۆ دروستبوونی گەندەڵی ئەوەیە كە كەسانێك ببنە دەستەڵاتدارو جڵەوی كاروباری سیاسی ئەو كۆمەڵگەیە بگرنەدەست، كە لە ڕاستیدا شایستەی ئەو پلەوپایە نەبن، وەك لە سورەتی (محەممەد)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ﴾ محمد:٢٢. واتە گرتنەدەستی دەستەڵات هەمیشە ئەو مەترسییەی لێدەكرێت كە كەسانێك بچنە سەر دەستەڵات، كە لە ڕاستیدا شایستەی ئەوەنەبن و نەتوانن مافی ئەو دەستەڵاتە بدەن و نەتوانن هەستن بەئەركی سەرشانی خۆیان، لە ئەنجامدا گەندەڵی بڵاوبكەنەوە لە ناو خەڵكداو پەیوەندیی خزمایەتی و پەیوەندییەكانیتر لە ناوخەڵكدا بپچڕێنن.

كەواتە، ئەمە كۆمەڵێك لەو هۆكارانەبوون كە لە ڕاستیدا ڕێگە خۆشدەكەن بۆ گەندەڵیو بڵاوبوونەوەی خراپەكاری، پێموایە لە سەرووی هەموو هۆكارەكانەوە بۆ دروستبوونی گەندەڵی لە وڵاتدا بریتییە لە خراپیو گەندەڵی لە سیستەمی سیاسی وڵاتدا، واتە ئەگەرسیستەمی سیاسی وڵات گەندەڵ بووو لەسەربنەمایەكی تەواوو بنەمایەكی شەرعی و جەماوەری دانەڕێژرابوو، بێگومان هەموو ئەو هۆكارانەیتریشی لێدەكەوێتەوە، لە ئەنجامدا گەندەڵی دەبێت بەدیاردەو دەبێت بەسیمایەكی بەرجەستە لە ناو كۆمەڵگەدا.

**پاش زانینی ئەم هۆکارانە، پێویستە بزانین مەرجەکانی ئەوکەسەی کە هەڵدەستێت بەڕیفۆرم چییە؟.**

یەکەم: دەبێت ئەوکەسە خاوەنی بڕوابێت: ئەوکەسەی خۆی بەچاکساز دەزانێت دەبێت خاوەنی ئیمان بێت، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلاَّ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ فَمَنْ آمَنَ وَأَصْلَحَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَهُمْ يَحْزَنُونَ﴾ الأنعام:٤٨. واتە ئەوکەسە باوەڕدار بێت، کە یەکەم هەنگاوە بۆ چاکبوون، باوەڕێك کە گرێو گرفتە دەروونییەکان لە مرۆڤدا نەهێڵێت و پرسیارە قورسەکانی وەڵامدابێتەوە ﴿فَمَنْ آمَنَ وَأَصْلَحَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَهُمْ يَحْزَنُونَ﴾ الأنعام:٤٨. واتە ئەو کەسانە ترسیان لێینییە، واتە کەسی باوەڕدارو خاوەنی کردەوەی چاك ترست لێینەبێت و ئەرکی پێ بسپێرەو بەڕێوەبەرایەتی لە قوتابخانەوە هەتا ناوەندێکی کۆمەڵایەتی بدەدەستی و ترست لێینەبێت. ئەمە ئایەتێکە گەلێك مانای لێوەردەگیرێت، یەکێك لەوانە (مەرجی چاکساز کە هەڵگری پەیامی چاکسازی بێت، ئەوەیە بڕواداربێت و خاوەنی کردەوەی چاك بێت).

**مەرجی دووهەم: دەبێت ئەهلی تەوبەو لێبوردن بێت:**

واتە بتوانێت ڕەخنە لە خۆی بگرێت، بتوانێت دان بنێت بەهەڵەکانی خۆیدا، بتوانێت داوای لێبووردن لە خوابکات و موراجەعەی خۆی بکات و بچێتەوە بەخۆیدا، بەچاوی ڕەخنەگرانە و نەشتەرگەرانە لە ڕابردووی خۆی ئەزموون وەربگرێت، لەبەرئەوە سەیردەکەیت خوای پەروەردگار

لە سورەتی (طه) دەفەرموێت: ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ﴾ گه٨٢. واتە ئەم تەوبەیە گرنگە، بەتایبەتی بۆ ئەوکەسەی کە پۆستێکی سیادی یان پۆستێکی خزمەتگوزاری وەردەگرێت، دەبێت هەمیشە ئامادەی بەخۆداچوونەوەبێت، کە قورئان پێیدەڵێت (تەوبە)، کەلتووری ئیسلامی پێیدەڵێت (تەوبە)، بەڵام لە فەرهەنگیتردا پێیدەوترێت (رەخنەلەخۆگرتن)، ووڵاتە پێشکەوتووەکان لە ڕاستیدا لەبەرئەوە واپێشکەوتوون کە ڕەخنە لە خۆیان دەگرن، ڕەخنەی خۆیان بەعەیبە نازانن، ڕەخنەی خۆیان بەپێویست دەزانن، چونکە هەرمیلـلەتێك نەتوانێت ڕەخنە لە خۆی بگرێت ئەوە گەلێکی مردووە، هەر سەرکردەیەك نەتوانێت دان بنێت بە هەڵەکانیدا ئەوە سەرکردەیەکی مردووە، ئەوە ووڵات بەرەو وێرانە دەبات.

**مەرجی سێیەم:**

**ئەوکەسەی کە چاکسازی دەکات دەبێت لێبوردەبێت:**

ئەوکەسەی کە چاکسازی دەکات لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسی و تەشریعییەوە، دەبێت کەسێکی لێبوردەبێت، قابیلیەتی ئەوەی هەبێت لە بەرامبەرو نەیارەکانی خۆشبێت، نەك بەهەڵسوکەوتێکی زۆر توندوتیژ لەگەڵیاندا ڕەفتاربکات، سەیردەکەیت خوای پەروەردگار لە سورەتی (الشورى) دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ﴾ الشورى:٤٠. تەماشا بکە چاکسازیی بەستووە بە(عەفو)ەوە، واتە بتوانیت تەنانەت ئەوشتەی کە مافی خۆتە

چاوپۆشی لێبکەیت و لە بەرامبەرەکەت خۆشبیبت، گەرچی مافەکانی پێشێلکردوویت، ئامادەبیت لەوپێناوەدا دان بەخۆتدا بگریت، پەیوەستبوونێکی زۆر ئۆرگانی لە نێوان لێبوردن و چاکسازیدا هەیە.

### مەرجی چوارەم: لە خوا ترسان(تەقوا):

وەك خوای پەروەردگار لە سورەتی (الاعراف)دا پەیوەندییەکی زۆری کردووە لە نێوان تەقواو چاکسازیدا ﴿فَمَنِ اتَّقَى وَأَصْلَحَ فَلاَخَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَهُمْ يَحْزَنُونَ﴾ الأعراف:٣٥. واتە کەسی چاکەخوازو کەسی چاکساز، ئەوکەسەی کە دەیەوێت گەندەڵی نەهێڵێت، دەبێت لە سنوری خۆیدا گەندەڵی نەهێڵێت و لە سنوورەکانی گومان و حەرامەکان نزیکنەبێتەوە.

### مەرجی پێنجەم: ئامادەیی بەرگەگرتنی ناڕەحەتییەکان لە پێناو چاکسازیدا:

لەپێناو چاکسازیدا، چ چاکسازی سیاسی بێت، چ حـزری و کۆمەڵایەتی بێت، دەبێت کەسی چاکساز ئامادەبێت لە پێناوی ئەو چاکسازییەدا تەحەمولی هەموو ناڕەحەتی وئازارێك بکات، وەك خوای پەروەردگار ئەمانەی هەموو پەیوەستکردووە بەیەکەوە و دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ۝إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ العصر٢-٣، واتە ئەوکەسانەی کە دەیانەوێت چاکسازی بکەن، دەبێت ئەو پەیمان و بەڵێنەیان لە نێواندا هەبێت کە هەمیشە یارمەتیدەری یەکتربن لە پێناوی ڕاستیو ئارامگرتندا، ئەم

ڕێگایە ڕێگایەکی پڕفەرشکراونییە، ڕێگای چاکسازی ئاسان و تەخت نییە، بەڵکو پێویستە هەمیشە ئەوکۆمەڵە ڕیفۆرمخوازە بیری یەکتری بخەنەوە کە ڕاستی و ماف چییەو واجب چییەو لە پێناویدا خاوەنی ئارامگرتن بن.

**مەرجی شەشەم: بابەتی دادپەروەری و یەکسانی:**

دادپەروەری چ لە نێوان دوو لایەندا چ لە خودی وێنەکردنەکانی خۆیدا، وەك لە سورەتی (الحجرات)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ الحجرات:٩. واتە ئەگەر لە ڕاستیدا دووگروپ لە مسوڵمانان توشی هەراو بەزمو جەنگو شەڕ بوون لە نێوان خۆیاندا، دەبێت ئێوە بانگیان بکەن بۆ چاکسازی، ئەگەر ئامادەبن بگەڕێنەوە بۆ چاکسازی ئەوکاتە ئێوەش لەسەر بنەمای دادگەری و دادپەروەری، چاکسازی لە نێوانیاندا دروستبکەن، واتە هەموو بڕیارێکی پێشینی خۆتان لە تیۆردا لابەرن، تەماشای لایەنی مەحسوبیەت و مەنسوبیەت مەکەن، کە بووەتە سیمایەکی کۆمەڵایەتی لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا، تەماشادەکەیت پلەی نزیکبوون لە کەسێك ڕۆڵدەبینێت، تەنانەت لە پێناوی وەرگرتنی بەرپرسیارێتیدا، پێویستە بنەماکان یەکسانی و دادپەروەری بێت. پەیوەندی لە نێوان (عەدلو قیسگ) پەیوەندییەکی زۆر ووردی تێدایە،

له ڕاستیدا عەدل ئەوەیە هەموو ئەو کەسانەی کە بەرامبەرت دەوەستن بەیەك چاو تەماشایان بکەیت و ئامادەنەبیت بەلای یەکێکیاندا مەیلت هەبێت و لایەنگیری بکەیت دژی یەکێکیتر، ئەمە عەدلە. قیسگ ئەوەیە ئەوکارەی کە دەیکەیت هاوتای ئەو فەرمانانەبێت کە لە شەریعەتدا خوای پەروەردگار دایناوە.

**مەرجی حەوتەم: هۆشیارو شارەزابێت:**

بزانێت کە لە چ واقیعێکدا کاردەکات، بزانێت ئەو واقیعەی کە ئەو تێیدادەژی زانیارییەکی تەواوی لەسەری هەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستی بەڕاوێژێکی زۆر هەیە لەگەڵ کەسانی پسپۆڕ، ئەوکەسەی کە دەیەوێت چاکسازیی سیاسی بکات لە وولاتێکدا، دەبێت لە ڕاستیدا ڕاوێژبکات بەوانەی کە شارەزان لە بواری کۆمەڵناسی و دەروونناسی و سیاسەت و ئابووری و پەروەردەو فێرکردن و ....هتد، لە هەموو ئەوبوارانەی کە زیندوون و ڕۆڵیان هەیە لە چاکسازیدا، دەبێت شارەزای ئەو واقیعە بێت بزانێت لە چی واقیعێکدا دەژی، واتە کەسێك شارەزایی هەبێت لە وولاتێکی وەك میسرداو شارەزای واقیعی کوردستان نەبێت، تۆنابێت بیهێنیت چارەسەری واقیعی کوردستانی پێبکەیت، لەبەرئەوە ئەو فەتوایانەی کە دەدرێت بۆ شوێنێکی وەك کوردستان، دەبێت هەڵقوڵاوی واقیعی ئەم کوردستانە خۆی بێت، پێویستمان بەوەنییە کە ئێمە کەسانێك کە شارەزاییان لە واقیعی ئێمە نییە لە هەموو لایەنێکەوە

فەتوامان بۆ دەربكەن، بەپێچەوانەوە ئەوە كێشەیەكی گەورەیە. یان ئەوكەسەی كە دەیەوێت چاكسازیی سیاسی بكات بەڵام بۆ خۆی لە چوارگۆشەیەكدا دانیشتووە و هیچ پەیوەندیی بەواقیعەوە نییە، ئەمە مافی ئەوەی نییە باسی چاكسازی و لافی چاكسازی لێبدات، بزانێت ئەو واقیعە چی دەوێت و نەخۆشییەكانی ئەو واقیعە بەتەواوی دەرك بكات. هەروەها هۆكارەكانی نەخۆشییەكەو پاڵنەرەكانی و زەمینەو خەلفیەتی ئەو نەخۆشییانە بزانێت و شارەزابێت بەو بابەتەی كە دەیەوێت چاكسازیی تێدابكات، شارەزابێت بەڕێگاچارەكان، چونكە بۆ هەموو كێشەیەك چەندین ڕێگەچارە هەیە كە خوای پەروەردگار دایناوە، بەڵام دەبێت تۆ بەزانست بیدۆزیتەوە، ئەو زانست و زانیارییانەی كە ئێستا مێژوویەكی زۆر كەڵەكەبووی زۆریان بۆ دروستبووە، تەماشادەكەیت سوپاس بۆ خوا ڕەوتی زانیاری و زانست هەمیشە بەرەوپێش دەچێت.

**مەرجی هەشتەم: لێكچوونی وتەو كردار:**

ئەوكەسەی كە چاكسازی دەكات دەبێت كردەوەكانی وەك گوفتارەكانی وابێت، ئەو بیردۆزەی كە هەڵیگرتووە لەگەڵ سلوكو ڕەفتاری ڕۆژانەیدا بگونجێت و تەبابێت، ئەو دروشمانەی كە هەڵیگرتوون لە واقیعی ژیانی خۆیدا مەلموسو هەستپێكراوبن و بەرجەستەبووبن، لەبەرئەوە ئەوكەسەی كە چاكسازی دەكات دەبێت لە سنوری خۆیدا كەسێكی چاكسازبێت، كەسێك بێت ئەو مواسەفاتەی

تێدابێت که سبه‌ینێ بیکه‌یت به‌نمونه‌و سه‌رمه‌شق، بیکه‌یت به‌که‌سێك که بۆ خه‌ڵکی باسبکه‌یت.

دوای ئه‌م باسه ئێمه ده‌توانین بڵێین هه‌موو جوڵه‌یه‌کی چاکسازی له کۆمه‌ڵگه‌دا ـ که له هه‌مانکاتدا گرنگییه‌کی مێژووییه ـ گرنگییه‌کی ئاینی‌و نیشتیمانیشه و چه‌ندین کۆسپی بۆ دروستده‌بێت. واته ئه‌وکه‌سه‌ی که ئه‌و مه‌رجانه‌ی تێدابووو هه‌ڵگری بانگه‌وازی ڕیفۆرم‌و چاکسازی و ڕیفۆرمخوازیبوو له کۆمه‌ڵگه‌دا ده‌بێت دڵنیابێت له‌وه‌ی کۆمه‌ڵێك کۆسپی له به‌رده‌مدا بۆ دروستده‌بێت، کۆمه‌ڵێك کۆسپی حه‌قیقی، نه‌ك وه‌همی. ئه‌و کۆسپانه ئێمه ده‌توانین باسی بکه‌ین:

**یه‌که‌م: ئه‌و تێگه‌یشتنه ته‌قلیدییه‌ی هه‌ندێك که‌س بۆ ئیسلام هه‌یانه:**

زۆرجار کۆسپی به‌رده‌می بانگه‌وازی چاکسازی ئیسلامی بریتییه له تێگه‌یشتنی ناته‌واو که هه‌ندێك که‌س به‌ناوی ئیسلامه‌وه له مینبه‌رو دوانگه‌کاندا سه‌باره‌ت به‌ئاین ده‌یخه‌نه‌ڕوو، ئه‌م ئاینه جوان و به‌ڕێزه وه‌ك ئاینێکی دواکه‌وتووو دژبه‌زانست و زانیاری نیشانده‌ده‌ن، پڕی ده‌که‌ن له خورافه و له قسه‌وقسه‌ڵۆکی نابه‌جێ، که له ڕاستیدا ئاینی ئیسلام له‌وجۆره بیروبۆچوونانه به‌رییه.

دووه‌م: بریتییه له‌و ده‌سته‌ڵاته دیکتاتۆریه‌ی که نایه‌وێت خه‌ڵك فێربکرێت له‌سه‌ر حه‌قخوازی و له‌سه‌ر چاکخوازی و چاکسازی، هه‌میشه ئه‌و ده‌سته‌ڵاته دیکتاتۆریانه ده‌یانه‌وێت ئه‌و واقیعه‌ی که خه‌ڵك تیایدا ده‌ژی به‌جوانترین واقیع بیخه‌نه پێشچاو، به‌وخه‌ڵکه بڵێن هه‌موو

خەونەکانتان بەدیهاتووە لە سایەی ئەم سیستەمە سیاسییەدا، بەڵام دەستەڵاتی ڕاستەقینەی هەڵقوڵاو لە جەماوەر هەمیشە خەونی جوانترو تازەتر نیشانی خەڵکدەدات و خەڵك هاندەدات بۆ ئەوەی ئەو خەونانە بهێننەدی، کەواتە کۆسپێکی گەورە لەبەردەم هەموو بزاڤێکی چاکسازیدا بریتییە لە دەستەڵاتی سەرکۆنەکارو دەیەوێت واقیع وەك خۆی بمێنێتەوە و هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردانەیەت.

سێیەم: بریتییە لەو دابونەریت و باوە کۆمەڵایەتییانەی کە بوونیان هەیە و لە ڕاستییشدا باویان نەماوە و سواون.

چوارەم: بوونی ئەو بیردۆزو بیرە ئیلحادییانەی کە دەیانەوێت بیروباوەڕی خواناسی و یەکتاپەرستی و پاپەندبوون بەبەهای بەرزەوە، لە ناوخەڵکدا نەهێڵن.

پێنجەم: بریتییە لە بیروبۆچوونی داهێنراوی ناڕەوا(بیدعی)، واتە لادانی ئیسلام بەناوی خودی ئیسلامەوە، ئەو زیادانەیە کە بۆ ئاینی زیاددەکەن، هێنانەناوەوەی هەندێك چەمکی دوور لە ئیسلام بەناوی بەڵگەی هەڵبەستراو بەناوی ئیسلامەوە، یان ئەو بۆچوونانەی کە لە سەردەمێکدا چەند کەسێکی ریزپەڕ(شاز) خستویانەتەڕوو و ئێستا باویان نەماوە، بەڵام یەکێك بیهێنێت بیخاتە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامییەوە و برەوی پێبدات.

شەشەم: بازرگانیکردن بەسەر ئاینەوە: ئەوکەسانە دەگرێتەوە کە بازرگانی بەزانستی ئاینەوە دەکەن، بازرگانی بەفەتواوە دەکەن، لە ڕاستیدا لە ئەدەبیاتی ئیسلامییدا پێیاندەوترێت (وعاظ السلاطين) واتە

ئەوکەسانەی کە فەتوا دەدەن بەدڵی دەستەڵاتدار، بانگەوازدەکەن بەدڵی دەستەڵاتدار، ئایەتەکان وەك خۆی ماناناکەن، فەرموودەکان وەك خۆی باسناکەن...هتد.

حەوتەم: ڕۆچوونی شارستانی لە بەها مادديیەکاندا.

ئەو ڕۆچوونەی کە هەمووشتێکی لە ماددەدا کورتکردووەتەوە، ڕاگەیاندن و پڕوپاگەندەیەکی هەیە چەواشەکار، ڕاگەیاندنێکی هەیە کە مرۆڤی خاڵیکردووەتەوە لە هەموو بەهایەکی جوان، لە هەموو ناوەرۆکێك، بەڵام بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم کۆسپانەدا چاکەخوازان و ڕیفۆرمخوازان دەبێت چی بکەن؟

لە ڕاستیدا پێویستە چاکەخوازان لە پێشدا خودی خۆیان چاك بکەن و ئەو چاکسازییە لە ناخی خۆیاندا بەدیبهێنن.

دووهەم: چاکسازی لە بەرنامەکانی خوێندندا بکرێت.

سێهەم: ڕیفۆرم لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا بکرێت.

چوارەم:مسوڵمانان ڕوبکەنەوە خوێندنەوە، بتوانن خوێندنەوەیان هەبێت بۆ کۆمەڵگە و بۆ مرۆڤ لە شارستانییەتی ئەمڕۆدا، تا لە ڕێگەی ئەم خوێندنەوەوە بتوانن ڕۆڵی کاریگەریان هەبێت لە نووسین و توێژینەوەدا، بۆ ئەوەی بتوانن رابەرایەتییەکی هـزری و سیاسی بکەن، پەیوەندییەکی تەواویان هەبێت بەخاوەن هـزرو خاوەن مومارەسەکانەوە، پەیوەندییان هەبێت بەدونیای سیاسەتەوە و بزانن ئەم سیاسەتە بەرەوکوێ دەچێت و شارەزابن لەو پێچوپەنایانەی کە لە داڵانەکانی سیاسەتدا ڕوودەدەن، پەیوەندییەکی ئۆرگانییان هەبێت

بەزاناكان و نووسەرانەوە لە هەموو زانكۆكانی دونیادا، چونكە ئێستا جیهانی ئیسلامی كەسانی باشی تیادایە، زانای باشی تیادایە، لەبەرئەوە دەبێت چاكەخواز لەلایەكەوە ئاگاداری گۆڕانكارییەكانی جیهان بێت و لەلایەكەوە ڕاوێژبكات لەگەڵ زانایان و زانستدۆستاندا، زانستدۆستان بەمانا فراوانەكەی زانستخوازانی شەرعی و زانستخوازانی سیاسی و مرۆڤایەتی و زانستی و ئەزمونی و...هتد، ئینجا بەپلانێكی بەردەوامەوە كاربكات و لێپرسینەوەی بەردەوامی هەبێت بۆ جێبەجێكردنی ئەولایەنانە، بەڵام ئەمە كاری تاكەكەس نییە و كاری تەنها كۆمەڵێكیش نییە، كاری كۆمەڵێك لە دامەزراوەكانە، كە دەبێت لە وڵاتدا دروستبێت و ئیشی پلاندانانبێت بۆ:

یەكەم: بۆ دیاریكردنی نەخۆشییەكان، دووەم: بۆ ئامادەكردنی پۆلێكو شەپۆلێك لە چاكەخوازان و دڵسۆزان، ئەوانەی كە ئەو مەرجانەیان تیادابێت كە باسمانكرد، بۆ ئەوەی بتوانێت چاكسازبێت، بەرنامەكانی خوێندن لە هەموو بوارەكانی خوێندندا لە هەموو ئاستەكانی خوێندندا بەوشێوەی كە پێویستە چارەسەربكرێت و گۆڕانكاری تیادابكرێت لەسەر بنەمای ئەوەی كە ئەم وڵاتەمان، ئەم جیهانەمان پێویستی بەپێشكەوتن و بە ئاشتبوونەوەیەكە لە نێوان لایەنی ئاینی و ئیسلامی و لایەنی دەرونی و كۆمەڵایەتی، ئینجا چارەسەركردنێكی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان.

ئیسلام پیرۆزی بەخشیوە بەخێزان و گرنگی پێداوە، بەتایبەت بەو پەیوەندیو تۆڕە كۆمەڵایەتییەی كە جیهانی ئیسلامی پێناسراوە،

نەهێڵرێت بەهیچ شێوەیەك ئەم دامەزراوە بەنرخە تووشی جۆرەها لەرزین و شڵەژان و پەشێوی ببێت، پاشان ڕووکردنە جیهانی خوێندنەوە و نووسین و پەیوەندیکردن بەهـزردۆستان و سیاسەتمەدارانەوە، پێویستمان بەمەنهەجێکی پانۆڕامی و فرەلایەن و گشتگیر هەیە، بۆ ئەوەی کە چارەسەری گیروگرفتەکان بکرێت.

دەتوانین ئەم باسە پوختبکەینەوە لەوەدا کە: ئێمە باسی چاکسازیو ڕیفۆرممان کردو پێناسەمان بۆ کردو لە سێ دەروازەی گشتییەوەچووینە ناو بابەتەکەوە، ئینجا هاتینەوە سەر نیشانەکانی چاکسازی و ڕیفۆرم لە جیهانی ئیسلامدا، پاشان هۆکارو پلانەکان، هەروەها باسی ئەو مەرجانەمان کرد کە پێویستە لە کەسێکی چاکسازو ڕیفۆرمیستدا هەبێت، ئینجا هاتینە سەر باسی ئەو کۆسپانە کە لەوڕێگایەدا هەیە، ئینجا باسی ئەو میکانیزمانەمان کردو کورتمان کردەوە لە شەش خاڵدا کە دەکرێت هەریەکەیان بابەتێکی زۆرفراوان بێت، بەڵام ئێمە تەنها ئاماژەمان دا بەو خاڵانەی کە پێویستن باسبکرێت، هیواداریین خودای پەروەردگار بمانکات بەچاکسازو ڕیفۆرمیست و چاکەکاربین و بتوانین جیهانمان بکەین بەو جیهانەی لە هەموو ڕوویەکەوە گونجاوبێت بۆ ژیان و ئامادەبوون بۆ ڕۆژی دواییش.

# مسوڵمان پێویستە چی بزانێت؟

لەم بەشەدا باسی ئەوپرسانە دەکەین کە بۆ مسوڵمانان دێنەئاراوە سەبارەت بەوەی کە پێویستە مسوڵمان و کەسێکی ئیسلامخوازو هۆگری ئیسلام، بیزانێت سەبارەت بەژیان و شارستانیەت و مەعریفەت، ئەوەی کە پێویستە بیزانێت و خەڵکی بۆ بانگ بکات، وەك ئەرکێکی ئاینی و مێژوویی لە ئەستۆی بگرێت.

خوای پەروەردگار لە قورئاندا بۆ باسکردنی بەهرەیەك لە بەهرەکانی خۆی کە بەخشیویەتی بەئیماندااران دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ الجمعة٢. ئەم ئایەتە لە سورەتی جومعەدایە و بەتێکڕایی باسی لوتفێکی هەرەگەورەی خوای پەروەردگارمان بۆ دەکات کە لە ناو ئەو کەسو گەلو هۆزانەی کە هیچ پەیوەندییەکیان بەشارستانیەتی و تەنانەت بەیاساو خوێندەوارییەوە نەبووە، کەسێکی بۆ هەڵبژاردن و بۆی ڕەوانەکردن کە پێغەمبەرێکە لە خۆیان ﴿رَسُولاً مِّنْهُمْ﴾ الجمعة:٢. نێردراوێکە لە خۆیان، واتە لە هەسارەیەکیترەوە و لە شارستانییەتێکیترەوە بۆی نەناردوون، کەسێکبووە کە ئەوان باش ناسیویانەو ڕەچەڵەکیان زانیوە، تەنانەت ڕۆژانە مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە، بەشێوەیەك کە هەموویان بەئەمین و

دەستپاكو داوێنپاك ناوزەدیان كردووە، پێغەمبەرێكی بەو چەشنەی بۆ ناردن لە خۆیان و لە ناوخۆیاندا، ئەم پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر) چەندكارێكی گەورەی ئەنجامدا، چەند ئەركێكی لەسەر شان بوو زۆربەجوانی ڕاپەڕاندن كە بریتیین لە:

یەكەم: ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ﴾ الجمعة:٢. ئایەتەكانی خوای بەسەردا دەخوێندنەوە، واتە ئەوبەڵگانەی كە لە قورئاندا هەن، ئەمە یەكەمین كاری بوو كە بۆی دەخوێندنەوە، دیارە خوێندنەوەی ئەو ئایەتانە لە سەرزاری پیرۆزی پێغەمبەرەوە(درودی خوای لەسەر) بۆخۆی كاریگەرییەكی ئەوتۆی هەبوو كە مەگەر كەسێك بڕیاری دابایە بەكەلـلـەڕەقی دژی ئەم پێغەمبەرەبێت، ئەگینا دەكەوتە ژێر كاریگەریی ئەو ئایەت و فەرموودانە، دیارە (تلاوة) بەوشێوەی كە پێغەمبەری خوا پێیهەستاوە خوێندنەوەیەكی زۆر ڕەوان و كاریگەربووە، بەتایبەتی ئەوئایەتانەی كە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) بۆ ئەو خەڵكەی خوێندووەتەوە بۆخۆی لە خۆیدا ڕەنگی داوەتەوە، وەك چۆن ئەگەر كەسێك بڕوایەكی تەواوی بەقسەكانی خۆی نەبێت چەند كاریگەری دادەنێت لەسەر دەوروبەری، بەم شێوەش پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) كاتێك قورئانی بخوێندایەتەوە بەهەموو هەست و لە ناخەوە دەیخوێندەوە، ئایەتیش بریتییە لەو بەڵگەو نیشانانەی كەڕوو لە عەقڵ دەكەن و عەقڵ ناتوانێت بەدییان بكات، واتە ئەگەر كەسێك بەعەقڵو بەوردبینییەوە تەماشای ئایەتەكانی خوای پەروەردگار بە گشتی بكات، بەتایبەتی ئایەتەكانی قورئان و لێیان وردببێتەوە، پەی

بەو ڕاستییە دەبات کە هەر بۆخۆیان هەڵگری بەڵگەی ڕاستیی خۆیانن، وەك لوژیکناسەکان دەڵێن (قضايا بيناتها معها، صدقها معها) ڕاستی خۆیانیان لەگەڵدایە.

دووەم: کارێکی دیکەی پێغەمبەر(د.خ) بریتییبوو لە(ويزكيهم) پاکژی دەکردنەوە، واتە دوای خوێندنەوەی ئایەتەکان بەژیانی کردەیی لەگەڵ پێغەمبەردا(درودی خوای لەسەر) و بەهاوڕابوون و هاوڕێبوون لەگەڵ ئەو سەروەرەدا، ئەم باوەڕدارانە پاڵفتە دەبوون و نەخۆشییە دەرونییەکانیان نەدەما، ڕقو کینەو غەشو خیانەتیان نەدەما، پاڵفتەدەبوون، دەبوونە ئەوکەسە کامڵەی کە بە ڕاستی ئاینەکەیان بۆ پەروەردەکردنی هاتبوو.

سێهەم: ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ الجمعة:٢. فێری (کتابو حیکمەت)یان دەکات واتە فێری ئەوەیان دەکات کە یەکەم: ئەم قورئانە بناسن و بزانن، مەبەستیش لە(کتاب) قورئانە، واتە کاتێك کە بە ڕەهایی باسی (کتاب) دەکرێت مەبەست لێی قورئانە، چونکە هیچ کتێبێك ئەوەندەی قورئانی پیرۆز کاملۆ تەواو تێروتەسەل نییە، لە هەمانکاتدا فێری حیکمەتیشی کردوون، وەك زاناکان باسی حیکمەت دەکەن و دەڵێن: بریتییەلەوەی قسەی باش فێربین و هەرکارێك باشە بیکەین، کەواتە بریتییە لەو قسەو کردارە هەڵبژاردەیەی بەرژەوەندی دەستەبەربکات، کەواتە پێغەمبەری خوا(د.خ) فێریکردن ﴿وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ الجمعة:٢، بەڕاستی ئەو خەڵکەش پێشئەوەی ئەم پێغەمبەرەیان بۆ بێت لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرادابوون، واتە

ئەگەر کەسێکیش بهاتایە هەر بەتەماشاکردنێکی سەرەتایی دەیزانی ئەو گەلە گومڕان، ئەوەی کە من دەمەوێت ئەمڕۆ داکۆکی لەسەر بکەم و لەسەری بوەستم، مەسەلەی (کتابو حیکمەت)ە، واتە ئەوکارەی کە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) کردی و تەرکیزی لەسەر کرد لە ژیانی خۆیدا، بریتیبوو لە گەیاندنی پەیامەکانی خوا ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ﴾ الجمعة٢، ژیا لەگەڵیاندا، بەشێوەیەك کە پەروەردەی دەکردن و پاڵفتە دەبوون، ئینجا تەنها بەمە کاری تەواو نەدەبوو، چونکە دەیوست ئەو نەوەی کە ئەو پەروەردەیان دەکات و لەگەڵیاندا دەژی، دەیویست بیانکات بەمەشخەڵداری زانست و ڕەوشت و ئاکارو بیروباوەڕی جوان، بیانخاتە ناو جیهانەوە، لەبەرئەوە پێویستیان بەوەبوو کە فێری (کتابو حیکمەت)یان بکات کە لە تێڕوانینی ئەمڕۆدا واتە: فێری ئەوەیان بکات کە چۆن بژین و چۆن مامەڵە لەگەڵ جیهان و ژیاندا بکەن، ئەوەی کە ئەمڕۆ هەندێك لە زاناکان ناوی دەنێن (الفقه الحضاري). واتە تێگەیشتن لە شارستانیەتی و ژیانێکی ڕێكوڕەوان بریتییەلەوەی مرۆڤ عەقڵی بکرێتەوە و بگوازێتەوە لە عەقڵێکی چەقبەستووەوە بۆ عەقڵێکی بزواو، لە عەقڵێکی چاولێکەرەوە بۆ عەقڵێکی بەڵگەخواز، لە عەقڵێکی شوێنکەوتەی بێ بەڵگە (موقەللید)ەوە بۆ عەقڵێکی موجتەهید، لە عەقڵێکی خورافییەوە کە دوای وەهمو گومان بکەوێت بۆ عەقڵێکی ئاینیو ئیستیدلالیی کە دوای بەڵگەو بورهان بکەوێت، لە عەقڵێکی دەمارگیرەوە بۆ عەقڵێکی لێبوردە، هەروەها زۆربەلایەوە سادەبێت ئەگەر کەسێك پرسیارێکی

لێکردو نەیزانی زۆر بەئاسایی بڵێت نازانم، هەر لەو ڕوانگەوە زانایەکی وەك ئیمامی مالیك خوا لێی ڕازی بێت کاتێك کە پرسیاریان لێکرد لەبارەی فیقهەوە فەرمووی: فیقهـ ئەوەنییە تۆ مەسەلەو بابەتی زۆرت لەبەربێت، فیقهـ ئەوەیە تۆ تێگەیشتنێکت هەبێت و ، ئەو تێگەیشتنەش خوای پەروەردگار دەیبەخشێت بەوکەسەی کە خۆی دەیەوێت. لەلایەکیترەوە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: (العلم ليس بكثرة الرواية) زانست بەوەنییە کە مرۆڤـ زانست یان ئایەتی زۆری لەبەربێت، بۆچوون و بیری خەڵکیتری زۆری لەبەربێت، (ولكنه نور جعله الله في قلوبكم، فليس المهم كثرة الرواية، بل الصيغة والدراية). کەواتە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) دەیویست هەموو تاکەکانی گەلو هەموو مسوڵمانێك خاوەنی بیرتیژیو عەقڵێکی ئازادی بەڵگەداربێت، خاوەنی عەقڵێکی وابێت کە بتوانێت لە ڕووی بەڵگەکانەوە ڕاستی بەدەستبهێنێت، نەك لە ڕووی چاولێکەریو گوێبیستنەوەبێت، فیقهی شارستانییەت لە ڕاستیدا لە چەند بەشوجۆر پێکهاتووە، واتە ئەو تێگەیشتنەی کە بۆ مسوڵمانانی یەکەمجارو نەوەی یەکەمی گەلی مسوڵمان، هاوەڵانی بەڕێز (خوا لێیان ڕازی بێت) لەسەری پەروەردەبوون، ئەو فیقهە شارستانییە لە چەند بەش پێکهاتووە:

بەشی یەکەم: بریتییە لە تێگەیشتنی بەڵگەکان و یاساو نەریتە گەردوونی و کۆمەڵایەتییەکان، واتە دۆزینەوەی ئەو یاساو ئەو ئایەتانەی خوای پەروەردگار کە لە بونەوەرو لە دەوروبەری ئێمەو لە هەناوی

هەریەکە لە ئێمەدا دایناوە، لەسەر ئەو بنەما هەموو ژیان و جیهان بەڕێوەدەچێت، کەواتە یەکەمین کارێك کە دەکرێت بریتییە لە تێگەیشتن لەو ئایەت و سورەتانەی کە ژیان و جیهانی لەسەر بەڕێوەدەچێت، بێگومان ئەو ئایەت و بەڵگەو نیشانانە بڵاوکراونەتەوە لە هەموو بونەوەرو لە دەوروبەرماندا، ئەو کەسانە لێیان حاڵی دەبن و پەیـپـێـدەبەن کە خاوەنی عەقڵو خاوەنی فیقهن، وەك خوای پەروەردگار لە سورەتی (ال عمران)دا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ﴾ آل عمران:١٩٠. واتە لە ئافراندنی ئاسمانەکان و زەوی و لە جیاوازیی نێوان شەوو ڕۆژو لەو یەکبەدوای‌یەکداهاتنەی شەووڕۆژدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەنی ئاوەزن، واتە عەقڵی ساغو پاڵفتەیان هەیە، لە سورەتی (انعام)دا دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ الأنعام:٩٧. خوای پەروەردگار ئەو خودایەیە کە ئەو ئەستێرانەی بۆ کردوون بەنیشانە و بەڕێنیشاندەرو ڕێنما، کاتێك ئێوە بەدەشتاییەکدا دەڕۆن جیهانتان لێتاریکە لە ڕێگەی ئەستێرەکانەوە ڕێگەی خۆتان دەدۆزنەوە، کاتێك لەناو کەشتییەکاندا لەناو دەریادا ڕاودەکەن و گەشت و گوزار دەکەن، ئەگەر بەئەستێرەکاندا نەبێت چۆن دەتوانن ڕێگەی خۆتان بدۆزنەوە، ئینجا دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ الأنعام:٩٧. واتە دیارە ئەوانەی کە شارەزاو زانستدۆستن دەتوانن

وردەکاریی ئەو ئایەتانەی خوا بدۆزنەوە، واتە ئەوە بزانن چۆن لە ڕێگەی ئەستێرەناسییەوە ڕێگا تاریکەکانی ژیانی خۆتان دەدۆزنەوە، ئینجا دێتەوە سەر ژیانی خۆمان و بۆ خۆمان: ﴿وَهُوَ الَّذِيَ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ﴾ الأنعام:٩٨. ئەم ئایەتە بەڕاستی ڕاماندەکێشێت بۆ ئەوەی بزانین (مستقرو مستودع) چییە؟

ـ مستقر: بریتییە لە ڕەحمی دایکان.

ـ مستودع: بریتییە لە پشتی باوکان.

واتە لە لایەکەوە بۆچی هەناوی دایکانمان دەبێت بەشوێنی بڕیارو ئۆقرەگرتن و لە لایەکیشەوە بۆچی پشتی باوکانمان دەبێت بەشوێنی ئەمانەت، شوێنی سپاردە(ودیعە)، واتەمرۆڤەکان تالەپشتی باوکیاندان بەئەمانەت لە پشتی باوکدا دانراون و بەرەو منداڵدانی دایك دەڕۆن کە بە (قرار مكين) ناوبراوە و لەوێدا پێدەگەن و کەسێکی ساغ دروستدەبێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قَدْ فَصَّلْنَا الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ﴾ الأنعام:٩٨. واتە ئەمە وردەکاریی دروستبوونی مرۆڤە لەبەرەی باوكو دایکێکەوە.

جا تێگەیشتن لە بەڵگەکانی خوای پەروەردگار تێگەیشتنێکی بەردەوامە، تێگەیشتێنکە لە ئاستێکدا ناوەستێت، چونکە خوای پەروەردگار بەدرێژایی زەمین و کات ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەم جیهانە بەرەو کوێ دەچێت و ڕۆژ بەڕۆژ ئێمە شاراوەکانی گەردوون دەدۆزینەوە لە ڕێگەی ئەو مەشخەڵی زانستەوە کە خوای پەروەردگار وەك لوتفێك بۆی فەراهەم کردووین، وەك خوای پەروەردگار لە سورەی

(نمل)دا دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَارَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ النمل:٩٣. واتە زەمانێك دێت کە خوای پەروەردگار ئایەتەکانی خۆیمان نیشاندەدات و ئیتر زانستمان دەچێتەسەرەوە، وردەکاریی زانست تێدەگەین و ئەوجا تێدەگەین کە ئایەتەکانی خوا تەواوە و هیچ جێگەی مشتومڕو موناقەشە نییە، کەواتە یەکەمین هەنگاوێك بۆ تێگەیشتن لە سوننەتی ژیان ئەوەیە کە ئێمە بزانین ئەم ژیانە خاوەنی سوننەت و یاساو نەریتە، ئەو سوننەت و یاساو نەریتانەش لە ڕێگەی زاناکانەوە دەدۆزرێتەوە، لەبەرئەوە زاناکان لە ڕاستیدا ڕابەرو مەشخەڵدار و سەرقافڵەی یەکتاپەرستانن و زانایانی ڕاستەقینە ڕێچکەشکێنن بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت خوای خۆیان بناسن.

## خاڵی دووهەم: جێگیریی و گشتگیریی و نەگۆڕیی

هەنگاوێکیتر ئەوەیە کە ئێمە بزانین ئەو یاساو ڕێسایانەی کە خوای پەروەردگار ئەم جیهانەی لەسەری دروستکردووە، هەموویان نەگۆڕو جێگیرن، کەواتە هەنگاوی دووەم کە پەروەردگار جیهانی لەسەر دروستکردووە کۆمەڵەیاسایەکی جێگیرو گشتگیرن، لەبەرئەوە پێویستە بزانین کە ئەم جیهانە بە خۆڕایی دروستنەکراوە و بەسادەیی بەڕێوەناچێت، بێ یاساو بەڵگەو بەهانەش بەردەوام نییە، هەموو شتێکی بەپێی یاسایە، هەموو جموجووڵێکی لەسەر بنەمای بەرنامەیەکە، ئەمە لە قورئاندا پێیدەوترێت (سُنّە) واتەبەرنامە، چ ئەم

یاسایە یاسایەکی گەردوونی بێت کە پێیدەوترێت (سوننەتی کەونی)، یان یاسایەکی کۆمەڵایەتی بێت کە پێیدەوترێت (سوننەتی کۆمەڵایەتی)، ئەم یاسایانە نەگۆڕن و گۆڕانیان بەسەردانایەت و هیچ جیاوازییەك لە نێوان مرۆڤەکاندا ناکات، ئەم یاسایانە ئەگەر لە ناو باوەڕداراندا هەبێت کاری خۆیان دەکەن، لە ناو بێباوەڕانیشدا هەر سوودی خۆیان هەیە،و خوای پەروەردگار لە سورەتی (فاطر)دا دەفەرموێت: ﴿فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلاً وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلاً﴾ فاطر:٤٣. بۆ نمونە لە شاری مەدینەدا کوڕی خۆشەویستی و جگەرگۆشەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) بەناوی (ئیبراهیم) کاتێك وەفاتدەکات و ئەویش بۆی خەمبار دەبێت و فرمێسك لە چاوی پیرۆزی دەڕژێت، ویستی خوا وابوو لەوڕۆژەدا خۆر گیرا، خەڵکیش هاتن وتیان خۆر لەبەر خاتری مردنی ئیبراهیم گیراوە، چونکە لەناویاندا ئەوشتە باوبوو، عەقڵیەتێکی خورافی گەرای هەبوو، کە خۆرگیرانیان دەبەستەوە بەمردنی کەسێکی گەورەوە یان مردنی ئازیزێکەوە، ئەگەر پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) کەسێکی بێبنەما بووایە، یاخود لە دوای شتی پڕوپووچ بووایە، یان مەبەستی ئەوەبووایە دەستەڵاتی خۆی جێگیر بکات، باشترین هەل بوو بۆ ئەوەی ئەوەندەی دیکە خۆی جێگیربکات لە ناو خەڵکداو بێدەنگ بووایە لەو قسەیە یان پشتیوانی بکردایە. بەڵام پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) کە تەماشای کرد بابەتەکە خەریکە وایلێدێت لە ڕێرەوی خۆی دەردەچێت، چووە سەر دوانگەکەو خەڵکی هەمووی کۆکردەوە فەرمووی (أيها الناس! إن

الشمس والقمر آيتان من آيات الله) خۆر و مانگ دوو نیشانە و دووبەڵگەن لە بەڵگەکانی خوای پەروەردگار (لاینکسفان لموت احد ولا لحیاتە) کەواتە بەمەرگی هیچ کەسێكو بەژیانی هیچ کەسێك تووشی گیران نابن، واتە نەخۆر و نەمانگ بەبۆنەی ژیانی کەسێکەوە ناگیرێن، ئەمە فەرموودەیەکە لە ناو زانایاندا ڕێککەوتنی لەسەرە کە هیچ گومانێکی لەسەرنییە، کە هەستی کرد حەقیقەت زۆر گرنگترە لەوەی کە چاوپۆشی و دابەزینی لەسەر بکرێت، چووە سەر دوانگەو حەقیقەتی ڕاگەیاند.

یەکێکیتر لەو خاڵانەی ئێمە لە فیقهی ئایەت و سوننەتدا بۆمان ڕووندەبێتەوە، ئەوەیە کە میلـلـەتان لە ڕاستیدا بەڕۆچوونی رەوشت، بەترازانی ڕەوڕەوەی رەوشت و بڵاوبوونەوەی تاوان و گوناحو تێکچوونی هاوسەنگی تیادەچن.

هەموو نەتەوەیەكو گەلێك وەك ووزەی مرۆڤێك چۆن بەقۆناغەکانی لەدایکبوون و منداڵی و گەنجیو کامڵبوون و نەخۆشییدا بەرەونەمان دەچێت، نەتەوەکان و گەلانیش بەهەمانشێوە ئەو یاسایەیان بەسەردا دەچەسپێت، لەبەرئەوە یەکێك لەو یاساگەورانەی کە خوای پەروەردگار لە ڕێگەی قورئانەوە فێرماندەکات و زانایانی مێژوو جەختی لەسەردەکەنەوە و زانایانی کۆمەڵناسیش دیسانەوە جەختی لەسەردەکەنەوە، ئەوەیە کە میلـلەتان ڕەنگە بەداگیرکردن و پاکتاوکردن و سیاسەتی کۆمەڵکوژی لەناونەچن، بەڵام لەناو خۆیاندا ئەگەر تووشی نەخۆشی و گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و گیروگرفتی ئاکاری

و نەمانی هاوسەنگی بوون، قابیلی لەناوچونن، وەك خوای پەروەردگار لە سورەتی (روم)دا دەفەرموێت: ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ الروم:٤١. واتە خوای پەروەردگار کە باسی بڵاوبوونەوەی گەندەڵیمان بۆ دەکات و دەرکەوتنی گەندەڵیمان بۆ ڕووندەکاتەوە دەفەرموێت: ئەمە هەمووی هەوڵو کاری خۆتانە، کاتێك کە خەڵکی بەدەستی خۆیان درێژە بەگەندەڵی و خراپەکاری دەدەن و تاوان و گوناه دەکەن و رەوشتی خراپ بڵاودەکەنەوە لە ناو خۆیاندا، کەواتە زۆر ئاساییە گێژەنەی ژیانی کۆمەڵایەتییان بترازێت و تووشی لەناوچوون ببن، لەبەرئەوە کاتێك لە پێغەمبەری خوایان (د.خ) پرسی (متی الساعة؟) کەی کاتی قیامەت دێت؟ (قال للسائل) پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) فەرمووی بەوکەسەی پرسیارەکەی کرد: (اذا ضیعت الامانة فانتظر الساعة)، ئەگەر وایلیهات ڕاسپاردە فەوتا، دیارە کە ووشەی راسپاردە(ئەمانەت) تێگەیشتنێکی زۆرفراوانی هەیە، لەلایەکەوە مەبەست لەو ڕاسپاردە سادانەیە کە کەسێك لای کەسێکیتر شتێك بەئەمانەت دادەنێت، ئەمە بۆخۆی مەبەستێکە لە مەبەستەکانی ئەمانەت، یاخود کاتێك پۆستێك دەدرێت بەکەسێك، یاخود کاتێك گەلێك متمانە دەدات بەیەکێك جێگەی متمانەی ئەو ئەمانەتە نییە، ئەم کارانە فەوتاندنی ئەمانەتن، ئەگەر کەسێك دانرا بۆ کارێكو توانای ئەو کارەی نەبوو ئەوکاتە ئەوەندە گەندەڵی و خراپە بڵاودەبێتەوە ئەگەر لەوکاتەدا جیهان تێکبچێت زۆر سروشتییە، ئینجا لە پێغەمبەری خودایان پرسی(درودی خوای لەسەر):

(وكيف إضاعتها؟) چۆن ئەمانەت دەفەوتێنرێت، فەرمووی: (إذا وسد الأمر إلى غير أهله فانتظر الساعة)، واتە ئەگەر فەرمان و دەستوروبڕیاری وولآت چ بڕیاری سیاسی بێت چ ئابووری چ بڕیاری هـزری و پەروەردەیی بێت، واتە گەر ئەو بڕیارانەی کە ژیانی خەڵکی پێوەبەستراوە، درایە دەستی کەسێك کە شایستەی ئەو فەرمان و بڕیارە نییە، ئەوکاتە (فانتظر الساعة) ژیان تێکدەچێت، چونکە مانای قیامەت وەك نیشانەکانی باس دەکرێت لە ئایەتە پیرۆزەکان و فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر)، ئەوەیە کە ئاسمانەکان تێکدەچن، کێوەکان تێکدەچن، ڕووبارەکان تێکدەچن، بەتایبەتی ئێستا تەماشای ژیانی ئەمڕۆی خەڵك بکەین تەماشای هەموو جیهان بکەین، جیهان لە لاسەنگیی و لە دەستدانی هاوسەنگیدا دەژی، ئەو هەموو نابەرامبەری و ناعەدالەتییەی تان و پۆی ئەم جیهانەی گرتووەتەوە، ئینجا لە وولآتە تایبەتەکاندا وەك وولآتەکانی خۆمان و دەوروبەر، لە هەر شوێنێك ئەو هاوسەنگییە تێکچووبێت ژیانی خەڵکیش تێکچووە، ئەوانەی کە بە شایستەیی کاربەدەستن و فەرمانبەرن، خەڵك گوێیان بۆ بگرێت و نەخرێنە پەراوێز، ئەوکەسەشی کە حەقە لە پەراوێزدابێت نەچێتە ناو مەتنی بابەتەکەوە و نەبێت بەدەمڕاستی خەڵك، یان لەو شوێنانەدا کە زانایان و بیرمەندان و هۆشیاران دوادەخرێن و نەزان و نەشارەزاکان فەرماندەیی وولآتیان پێدەدرێت، هۆشیارتر بکرێنەوە لە ئەنجامی ترسناکی واقیعەکەیان. ئەمە ئەو حاڵەتانەیە کە پێغەمبەری خوا دەفەرموێت (إذا وسد الأمر إلى غير أهله). زۆر فەرموودە هەیە لەم

بارەیەوە کە باسی ئەوەدەکات زۆربەی ئەو هاوسەنگییانەی کە ژیانی ئەمڕۆو گەلان پێیەوە دەناڵێنن پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە خەڵکی توشی تاوان و گوناه بوون و لایانداوە لە شەریعەت و لە تەرازووی ڕاست و دروست، لە بەرئەوە ئەو کێشانە دروستبوون و ئەو گێروگرفتانە سەریانهەڵداوە.

فەرمودەیەکی دیکەمان هەیە لەم بارەوە کە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت ( یامعشر المهاجرین، خمس اذا ابتلیتم بهن) پێنج نەخۆشی هەن ئەگەر ئێوە تاقیکرانەوە پێیان، زانایان دەفەرموون لە فەرموودەکەدا وەڵامی (ئەگەر) (اذا)ـەکە لە دەقەکەدا نەهاتووە، بەڵام دەزانرێت چییەو وەهای لێدێت: (خمس اذا ابتلیتم بهن فلا خیر فیکم) واتە ئەگەر ئێوە توشی پێنج نەخۆشی بوون ئەوە خێرتان تێدا نییە، لەبەرئەوە تووشیبوون (وأعوذ بالله أن تلهکهن) پەنادەگرم بەخوا بۆ ئەوەی توشی ئەو پێنج نەخۆشییە نەبن.

بزانین نەخۆشییەکان چین، یەکێکیان دەفەرموێت (لم تظهر فاحشة فی قوم قط حتی یعلن بها، إلا فشا فیهم الطاعون والأوجاع التي لم تکن فی أسلافهم الذین مضوا) لێرەدا (فاحیشە) مانا تایبەتییەکەی مەبەستە کە بریتییە لە تاوانی خراپەکاری و داوێنپیسی، دەفەرموێت: لە هەر گەلێکدا زینا ئەوەندە بڵاوبوویەوە کە بە ئاشکرا باسکرا، وەك ئێستا دەبینی لە زۆر لە بەرنامەکاندا بەناوی ئازادی ڕەگەزییەوە باسی زینادەکرێت و ناوی زینای لێنانرێت (بەڵام لە واقیعدا ناو، لە حەقیقەتی شتەکە ناگۆڕێت)، هەرکاتێك ئەو تاوانە بڵاوبوویەوە بەشێوەیەك کە

خەڵك بەئاشكرا باسیكرد، بێگومان لەناو ئەو خەڵكەدا بەشێوەیەك تاعوون و پەتا بڵاودەبێتەوە كە هەرگیز لە پێشینانی ئەواندا نەبینراوە، كەواتە یەكەمین نەخۆشی كە ئوممەتێك پێوەی دەناڵێنن و ئەنجامی زۆر مەترسیداری هەبێت، چ لە ڕووی جەستەییەوە بێت یان لە ڕووی دەروونیو كۆمەڵایەتییەوە، بریتییە لەو تاوانە جنسییانەی كە لە كۆمەڵگەیەكدا یان لە شوێنێكدا بڵاودەبێتەوە وایلێدێت خەڵك بانگەشەی بۆ دەكات و تەنانەت بەشێوەیەك لە شێوەكان خەریكە لەوە دەرچێت كە وەك عەیبە باسبكرێت، ئەوە ئەنجامەكەی و سزاكەی هەر لەم دونیایەدا دەبینرێت، كە بریتییە لەو نەخۆشییانەی بەروبوومی سروشتیی ئەو تاوانەن.

نەخۆشییەكی دیكە كە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) باسیدەكات دەفەرموێت (ولم يمنعوا زكاة أموالهم إلا منعوا القطر من السماء، ولولا البهائم لم يمطروا)، ئەمەش نەخۆشییەكیترە كە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) وەك دەردێكی مەترسیدار بۆمانی باسدەكات كە ئەوەیە وایلێدێت خەڵكێكی زۆر زەكات واجب دەبێت لەسەریان، بەڵام زەكات نادەن لە ئەنجامی ئەو لە خۆدەرچوونە ئابورییە هەركەسێك لە ئەندازەی بەڕەی خۆی زیاتر پێڕادەكێشێت، لە ئەنجامدا خوای پەروەردگار بەرەكەتی ئاسمانیان لێدەبڕێت و ئەگەر لە بەرخاتری ئاژەڵی بەستەزمان نەبوایە بارانی بۆ نەدەباراندن، كەواتە ئەمەش نەخۆشییەكی گەورەیە كە ئێمە ئێستا بەچاوی خۆمان دەیبینین لە جیهاندا هەژاری بەتەواوی بڵاوبووەتەوە و ملیۆنان كەس ئێستا

خەریکە لە برساندا بمرن و ملیۆنان لە ژێر هێڵی هەژارییەوە دەژین کە مەترسی هەیە لەسەریان، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو گومڕاییە ئابوورییەوە دێت کە کۆمپانیا گەورەکان و سەرمایەدارە گەورەکان زەکات نادەن و بەزەییان بەخەڵکدا نایەتەوە.

دەردێکی دیکە کە زۆر کوشندەیە، پەیمانشکاندنە، وەك سوننەتێکی ژیان خوای پەروەردگار لە ڕێگەی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر) پێماندەفەرموێت: (ولم ينقضوا عهد الله وعهد رسوله إلا سلط الله عليهم عدوا من غيرهم فأخذوا بعض مافي أيديهم)، هەرکاتێك ئوممەت وەهای لێهات کە ئەو پەیمانەی لەگەڵ خوای خۆیاندا بەستوویانە هەڵیبوەشێننەوە، ئەو پەیمانەی لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا بەستوویانە هەڵیبوەشێننەوە (کە بریتییە لە پابەندبوون بەعەقیدە و شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە) دوژمنێکی دەرەکییان بەسەردا زاڵدەکات، ئەو دوژمنە دەرەکییەش هەموو پێداویستییەکانی ئەوان دەدزێت، چونکە ئەمان لە حاڵەتی دۆڕاندان، لە حاڵەتی شکستدان، زۆر بەئاسانی تەسلیمی داگیرکەرو دیوی دەرەوە دەبن.

ئەنجا باسی دەردێکی دیکە دەکات و دەفەرموێت: (وما لم تحكم أئمتهم بكتاب الله ويتخير بما أنزل الله، إلا جعل الله بأسهم بينهم)، هەرکاتێکیش دەستەڵاتدارانی مسوڵمان لەناو خۆیاندا حوکم بەپەرتووکی خودا نەکەن و نەگەڕێنەوە بۆ ئەو ڕێنماییانەی کە خوای پەروەردگار بۆیناردوون، ئەوکاتە خۆیان دەکەونە گیانی یەکدی، شەڕو دووبەرەکییان تێدەکەوێت و تووشی شەڕی ناوخۆ دەبن، ئێستا ئەو

واقیعەی ئێمە دەیبینین پشتگیری ئەم فەرموودەیە دەکات، سەیری ئەو هەموو نەخۆشییانەی بڵاوبوونەتەوە، ئەو هەموو دوژمنە زاڵە بەسەرماندا، ئەو هەموو کێشە و ململانێ ناوخۆییەی خەریکە هەموومان دەفەوتێنێت، سزای خواش هەندێکجار سزایەکی گشتگیرە بەتایبەتی خوای پەروەردگار بەڵگەی تەواوی لەسەر هەموو خەڵك وەرگرتووە، لەبەرئەوە زاناکان دەفەرموون کاتێك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَاتَّقُوا فِتْنَةً لاَّتُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً﴾ الأنفال:٢٥. واتە ئەی خەڵکینە! هەرهەمووتان خۆتان بپارێزن لە فیتنەو بەڵایەك، لە قۆناغێك، کە تەنها ئەوکەسانە ناگرێتەوە کە ستەمکارن، واتە ئەگەر میللەت بێدەنگ بوو، لە بەرامبەر ستەمەوە هەڵوێستی نەبوو، کەمتەرخەم بوو، بەشدارییەکی باشی نەبوو لە دۆخی سیاسی و ئابوری و پەروەردەیی وڵاتدا، جەماوەر خۆی دوورخستەوە لەسەر بنەمای ئەو بیرۆکە هەڵەیەی کە (دەست بەکڵاوی خۆت بگرە با نەیبات)و (هەرکەس بەبیروبڕوای خۆی)و (کەس ناڕواتە گۆڕی کەس)، کە ئەمانە کۆمەڵە بیرۆکەیەکی دواکەوتووانەن کە یەکناگرنەوە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا، ئەوا نزیکە خوای پەروەردگار سزای هەموویان بدات، ئەوەتا پێغەمبەری خوا(د.خ) دەفەرموێت(إن الناس إذا رأوا منكرا ولا يغيرونه، أوشك أن يعمهم بعقابه)، ئەمە فەرموودەیەکی دروستە کە زانایان ئیمامی ئەحمەدو خاوەنی سونەنەکان گێڕاویانەتەوە، واتە: ئەگەر خەڵك شتی ناڕەوایان بینیو نەیانگۆڕی، ئەوە زۆرنزیکە خوای پەروەردگار سزای

هەموویان بدات، چ ئەو کەسەی تاوانەکەی ئەنجامداوە و چ ئەوکەسەش تاوانەکەی ئەنجامنەداوە.

لەفەرموودەیەکی دیکەدا بەدەقێکیتر هاتووە ( إن الناس إذا رأوا ظالما فلم يأخذوا على يديه أوشك أن يعمهم الله بعقاب)، (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) دەیگێڕێتەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) فەرمووی (إذا رأيت أمتى تهابوا أن تقول لظالم ياظالم، فقد ودع منهم) واتە ئەگەر ئوممەتی منت بینی ترسا لەوەی بەستەمکار بڵێت "ئەی ستەمکار"، ئەوە (فقد ودع منهم)، واتە ئەوە بوون و نەبوونی وەك یەك وایە، واتە خوای پەروەردگار وازی لێهێناوە و بێبەشە لە پشتگیری و پشتیوانیی خوای پەروەردگار.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا دەبێت ئێمە بڕوامان بەوە هەبێت یەکێك لە بڕیارەکانی خوای پەروەردگار ئەوەیە کە دەبێت لە هەموو سەردەمو کاتێکدا کۆمەڵێك هەبن لەسەر حەقبن، کۆمەڵێك هەبن بەرگری لە حەق بکەن گەرچی کەمیش بن، بەڵام ئەو کۆمەڵە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە بەتایبەتی پشتیوانییان لێدەکرێت، حەق بۆ خۆی ئەوەندە بەهێزە کە هیچ بەتاڵێك ناتوانێت لە بەرامبەریدا بوەستێت، چونکە حەق لۆجیكو ئامانجی بەهێزە، بەو هۆکارانەی هەیەتی بەهێزەو تەوفیقی خوای پەروەردگاریشی لە پشتەوەیە، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقُلْ جَاء الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقاً﴾ الإسراء:٨١.

واتە بەڕاستی حەق جێگیرەو هەردێتەکایەوە و بەتاڵیش ناجێگیرە، بەتاڵ بریتییە لەو کەفی سەرئاوەی کە زۆر بەئاسانی دەڕوات، بەڵام ئەوەی کە سوودبەخشە بۆ خەڵکی (کەبریتییە لە ئاوەکە) جێگیردەبێت لەزەویداو خێرو بەرەکەتی هەموو شوێنێك دەگرێتەوە.

ئەمە بەشێکبوو لەو فیقهی ئایەت و سوننەتانەی زانینی پێویستە. لە باسەکانی دیکەشدا باسی فیقهی مەعریفی دەکەین، کە بە وویستی خودا ئەم باسانە بتوانێت سوودێکی بۆ خوێنەرانی ئازیز هەبێت، دڵنیاشین لەوەی کە ئوممەتی ئیسلام هەرگیز لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە، تا دەستیگرتبێت بەشەریعەتی خواو قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر).

# فیقهی مەعریفە

ڕەگەزێکی دیکە لە ڕەگەزەکانی فیقهی ژیان یان ژیارناسی لە ئیسلامدا، فیقهی مەعریفەو زانینە، واتە لە ڕوانگەی ئەم ڕەگەزەوە دەتوانین گرنگییەکیتری ژیاری ئیسلامی بۆ خۆمان و بۆ کەسانی دیکەی غەیری خۆمان دەستنیشان بکەین، چونکە هەر ژیارێك لەمێژوودا بەچەند ڕەگەزێك دەناسرێتەوە کە بە پێی ئەو ڕەگەزو نیشانانە دەتوانین نرخیان بۆ دابنێین، یان هەڵوێستەیان لەسەر بکەین و پێگەی ئەو ژیارە لە کۆی ژیاری مرۆڤایەتییدا دەستنیشان بکەین.

دیارە لە ئیسلامدا مەعریفەو زانین گرنگی و بایەخێکی تایبەتی هەیە، زانایانی مسوڵمان زۆر لە سەرەتاوە بیریان لەوەکردووەتەوە (تأصیل) بۆ زانست و زانیاری بکەن، (تأصیل) واتە بنەمادۆزی، بەدوای ڕەگوڕیشەی ئەم وتەو گوتەزا گرنگەدا بڕۆن.

وەك دەبینین لە قورئانی پیرۆزدا و لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا(درودی خوای لەسەر) دونیایەك لە گرنگی و بایەخ دراوە بەزانست و زانیاری، هەم بەشێوەی ڕەهاو هەم سنووردار(موقەیەد) باسێکی گرنگی زانست و زانیاری کراوە، خەڵکی هاندراوە بۆ ئەوەی بەدوای زانست و زانیارییدا بڕۆن و هیچ کاتێك بەکەم رازیـنـەبن لە زانست و زانیارییدا، واتە هەرچەندێك زانست و زانیاری بەدەستبهێنن گرنگی

پێبدەن و ڕۆژ بەڕۆژ بەتاسەو سۆزێکی زیاترەوە پێوەی خەریك بن و کێبەرکێ بکەن لە پێناوی بەدەستهێنانیدا، واتە تەنانەت لەگەڵ میللەتانیترداو لەگەڵ خەڵکیترداو لەگەڵ پەیڕەوانی ئاینەکانیتردا بکەونە کێبرکێیەکی شەریفانە بۆ بەدەستهێنانی زانست و زانیاری لە هەرکوێیەك هەیە، تاکەکانی ئەم گەلە پێویستە لە ناو خۆشیاندا بەدوای زانست و زانیارییدا بڕۆن، لەگەڵ ئەمانەشدا زانا مسوڵمانەکان بیریان لەوەکردووەتەوە کە ڕێگاو ڕەوشتی تایبەت بۆ زانست و زانیاری دیارییبکەن، لەبەرئەوە دەبینین چەندین پەرتووكو نوسراومان هەیە سەبارەت بەئادابی فێربوون و ئادابی گوێگرتن و بەدەستهێنانی زانست و زانیاری، ئەوەی کە زانکۆکانی ئەمڕۆ، زانکۆ هاوچەرخەکان گرنگی پێدەدەن، کە چۆن گیانی زانستخوازی لە ناو خوێندکارو مامۆستاو خاوەن پسپۆرە دیارەکاندا دروستبکەن و گەشەی پێبدەن.

لە هەموو پەرتووکەکانی فەرموودەدا بەشێکی تایبەت دانراوە بۆ باسی زانست و زانیاری، تەنانەت دەبینین لە صەحیحی بوخارییدا پێشەوا بوخاری دوای باسکردنی ئیمان و باسی پایەکانی ئیمان و گرنگییەکەی، دێتەسەر باسی زانست و بەشێکی گەورەی بەناوی (باب العلم) تەرخانکردووە، تەنانەت ئەم باسەی پێشخستووە بەسەر باسی پەرستشەکاندا، واتە لە باسی زانستەوە دەچین بۆ باسی پاكوخاوێنی، ئینجا دەچین بۆ باسی نوێژو زەکات و باقی ئەرکان و پایەکانی ئیسلام، لەبەرئەوەی هەموو زانا مسوڵمانەکان هاوڕان لەسەرئەوەی کە زانست و

پایەی زانست پێش کردەوەیە، واتە دەبێت تاکی مسوڵمان لە پێشدا زانابێت، پاشان هەوڵبدات ئەو زانین و زانیارییەی کە هەیەتی بیکاتە واقیعو کردەوە، جگە لە پێشەوا بوخاری پێشەوایان ئیبن ماجە، دارەمی لە دوو کتێبە گەورەکەیاندا بەناوی (سونەن) بەهەمانشێوە گرنگییان بەزانست داوە، لە ناو زاناکاندا هەمانە پەرتووکی تایبەتی سەبارەت بەزانست و زانیاری نوسیوە، وەك (عومەری کوڕی عەبدولبەڕ) کە پەرتووکێکی زۆر بەنرخی هەیە بە ناوی (جامع بیان العلم وفضلە) واتە هەم باسی ئەوەدەکات کە زانست چییەو گرنگییەکەی لە کوێدایە،و ڕوونیدەکاتەوە چ شتێك دەبێتە بەدیهاتووی زانست، هەم باسی گەورەیی زانستمان بۆ دەکات، لەبەرئەوە فیقهی مەعریفی یان زانیاریناسی و ڕەوشتی بەدواداچوونی زانست ڕەگەزێکی سەرەکییە لە ڕەگەزەکانی ژیاری ئیسلامی و زۆرگرنگە مسوڵمانان بزانن کە ئاینەکەیان ئاینی زانست و زانیارییەو هەر شتێك لەگەڵ زانست و زانیارییدا یەکیانگرتەوە ئیسلام پشتگیری دەکات، بیری ئیسلامی پێشوازی لێدەکات و گرنگی پێدەدات، ئەم فیقهی مەعریفەیە لە ئیسلامدا چەند ڕەگەزو بنەماو پایەیەکی هەیە، کە ئێمە هەوڵدەدەین لەم باسەدا ئاماژە بۆ گرنگترینیان بکەین:

**بنەمای یەکەم:** سوودوەرگرتن لە هەموو زانستەکان:

پێویستە مسوڵمانان بەدوای هەموو زانستێکدا بڕۆن، بەتایبەتی ئەو زانستانەی کە سوودبەخشە بۆیان لە ژیانی ڕۆژانەیاندا، چ ژیانی فیکری یان کردەیی بێت، بۆ نموونە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) لە فەرموودەیەکی دروستدا دەفەرموێت (طلب العلم فريضة على كل مسلم)، بەدواداچوونی زانیاری ئەرکی سەرشانی هەموو مسوڵمانێکە، بەبێ جیاوازی نێوان ڕەگەزو تەمەنەکان، واتە وەك چۆن نوێژو ڕۆژوو و زەکات و حەج و...هتد بەمەرجەکانی خۆیان پێویستدەبن لەسەرمسوڵمان، بەهەمانشێوەش بەدواداچوونی زانست و زانیاری پێویستە لەسەر مسوڵمانان و ئەمەش ئەو بنەمایەیە کە مرۆڤایەتی تازە پێیگەشتووە، زانا مسوڵمانەکان دەیانەوێت بڵێن زانست و زانستخوازی وەك ئەرکێکی ئیسلامییە لەسەر هەموو هاووڵاتییەك، پێویستە دەستەڵاتیش هەموو پێویستییەکانی بخاتەبەردەست بۆ ئەوەی بەخوێندەواری ژیان بەسەربەرێت، لەبەرئەوە مەسەلەکە بڕاوەتەوە لە ئیسلامداو کۆمەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵگەی زانست و خوێندەواران و ئەوکەسانەیە کە بە دوای زانستدا دەگەڕێن، واتە هەر لەبەرەبەیانەوە کە لە خەو هەڵدەستیت، پێویستە بیر لەوەبکەیتەوە ئەو ڕۆژە فێری زانستێك ببیت، زانیارییەك وەربگریت، بەتایبەتی ئەمڕۆ کە دەبینین بوارەکان فرەچەشنن و هەرکەسێك دەتوانێت لە کەناڵی جیاوازو لە کەناڵی تایبەتییەوە بەدوای زانیاریدا بگەڕێت، جاران ژیانی

کۆمەڵگەکەمان لە بارودۆخێکی نەگونجاودابوو، لە ئەشکەنجەو مەینەتیو دژوارییەکی زۆردابوو، بەدەستهێنانی زانست قورسایی و ئەرکێکی گەورەی دەخستە سەرشانی مرۆڤەکان، ئەمڕۆ بەپێچەوانەوە دەروازەکانی زانیاری و ئاسۆکانی زاست لە بەردەمی هەموو کەسێکدا کراوەتەوە و مرۆڤ لە جاران بۆی گونجاوترە کە بە دوای زانیارییدا بڕوات و بەدەستیبهێنێت، کەواتە هیچ بەهانەیەك نەماوەتەوە بۆ مرۆڤ بەتایبەتی بۆ کەسی مسوڵمان کە کەمتەرخەمی بکات لە بەدەستهێنانی زانستەکاندا.

زاناکان بیریشیان لەوەکردووەتەوە کە زانستەکان پۆلێن بکەن، کەسایەتییەکی وەك فارابی بۆ خۆی پۆلێنێکی تایبەتی هەیە بۆ زانست، ئەبوعەلی سینا بۆ خۆی پۆلێنێکی تایبەتی هەیە، بەهەمانشێوە پێشەوا شافعی، بەتایبەتی بەنیسبەت مسوڵمانەوە فێربوونی بنەماکانی ئاین و پایەکانی ئاین و لقەکانی، ئەرکێکی زانستییە لەسەرشانی، هیچ مسوڵمانێك نابێت کە متەرخەمی لێبکات، تەنانەت ئەو زانستانەشی کە یاریدەدەرن بۆ فێربوونی بنەماکانی زانست، پێویستە بەدوایدا بڕۆن، لەبەرئەوە دوو چەمك هاتووەتەپێشەوە، فەرزی عەین و فەرزی کیفایە، هەندێك لە زاناکان دەڵێن ئەوەی کە بنەڕەتیی بێت بۆ کەسێکی مسوڵمان لە ژیانی تاکەکەسیو خێزانیو کۆمەڵایەتییدا، تەنانەت لە ژیانی پیشەییداو لە شوێنی کارەکەیدا، ئەوەی کە پەیوەندیدارە بەخۆی، ئەمانە ئەرکی سەرشانەو فەرزی عەینە لەسەری، واتە نابێت بەهیچ جۆرێك کەمتەرخەمی تێدابکات و ئەگەر کەمتەرخەمی کرد

بەڕاستی خوای پەروەردگار لێپرسینەوەی توندی لەگەڵدا دەکات و لۆمەو سەرزەنشتی دێتەسەر، ئەگەرکەسێك لە فەرمانگەیەکدا فەرمانبەرە، دەبێت ئەو پسپۆڕییەی کە پێیسپێردراوە و بابەتی پەیوەندیداریش بەو پسپۆڕییەوە باش فێرببێت، پسپۆڕیی بەڕێوەبردن یان ژمێریاریو هەر پسپۆڕییەکیتر. واتە ئەگەر کەمتەرخەمی تێدابکات، وەك ئەوە وەهایە کەمتەرخەمی لە نوێژەکان و ڕۆژوودا بکات. بەڵام هەندێك زانست هەیە پێیدەوترێت زانستی تەواوکەری بابەتەکە، واتە مرۆڤ پێویستە بزانێت کە کۆمەڵگەی ئیسلامی پێویستیی بەچییە، دەبێت لاوان بپرسن لەوانەی کە خاوەنی پسپۆڕین و ئەوانەی کە بۆ خزمەتی کۆمەڵگە هەوڵدەدەن، کە چ وولاتێك پتر پێویستمان پێیەتی لە هەلومەرجی ئێستاماندا، کە کوردستانی پێدا تێدەپەڕێت، دەبێت لاوان و خوێندەوارەکانمان بچن یان بنێردرێن بۆ ئەو وولاتانە، بۆ بەدەستهێنانی پسپۆڕییە تایبەتییەکان، ئەوە فەرزی کیفایەیە لەسەرشانیان واتە ئەگەر کەسێك نەچێت بەشوێن ئەو جۆرە پسپۆڕییانەدا، ئەوا هەموو کۆمەڵگەکە تاوانبارە، بەڵام ئەگەر کەسانێك بچن شانی بدەنەبەرو قۆڵی دڵسۆزی لێهەڵماڵن، واجبەکە لەسەرشانی خەڵکەکە لادەچێت.

کەواتە دەبێت بزانین زانست دوو پۆلێنی بۆ کراوە، پۆلێنێك بریتییە لەو زانستە بنەڕەتییانەی کە تاك پێویستی پێیەتی بۆ خۆی لە کارەکەیدا، بۆ ئەوەی کارەکەی بەجوانی ڕاپەڕێنێت، کەسێك لە بواری ڕاگەیاندندا یان ڕۆشنبیری یان پزیشکی یان هەر پسپۆڕییەکی

سوودبەخش‌و بنەڕەتی، بەڵام کە کردنت بەپیشە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆتدا بژێوی حەڵاڵت لەسەر ئەو پسپۆڕییە بەدەستهێنا، ئەوەش کە پسپۆڕییەکەت بەرەوپێشدەبات، ئەوەش دەبێت بەفەرزی عەین لەسەرت، بەڵام باقی پسپۆڕییە گرنگەکان کە پسپۆڕیی خۆت نییەو هەستدەکەیت کە کۆمەڵگە پێویستی پێیەتی ئەوە فەرزی کیفایەیە، بەڵام هەمیشە دەبێت لە ناو مسوڵمانانی کەسانێك هەبن بەدوای ئەو بابەتەدا بڕۆن، ئەمەش کاری دەوڵەت و کاری ئەو کەسانەن کە دەمڕاستی مسوڵمانانن و بەشێوەیەك لە شێوەکان ڕۆڵی چاودێریان هەیە لە ناو کۆمەڵگەدا، دەبێت ئەوان ئەوکەسانە بدۆزنەوە کە بەهرەیەکیان لە بوارێکدا هەیە، بۆ ئەوەی ئامادەی بکەن و هانی بدەن بۆ ئەوەی بەدوایدا بچێت، لەبەرئەوە لە ژینگەیەکەوە بۆ ژینگەیەکیتر جیاوازی دروستدەبێت لە نێوان زانستەکاندا، وولاتێك کە کشتوکاڵیی بێت پێویستە پسپۆڕیی زۆر لە لقوپۆپەکانی زانستی کشتوکاڵدا پەرەی پێبدرێت و خەڵك هانبدرێت بۆ ئەوبوارە، یان ئەو وولاتەی پشتی بەنەوت بەستووە پێویستە لەسەری پسپۆڕیی جیاواز لە فەلسەفەی نەوتەوە هەتا پاڵفتەکردن و دەرهێنان و خستنەبازاڕو بەڕێوەبردنیەوە ئامادەبکات و گرنگییەکی تەواوی پێبدرێت، ئێستا لە قۆناغی ئێستای ژیانی میللەتاندا زانستەکانی کۆمپیوتەر بەهەموو لقوپۆپەکانیەوە گرنگییەکی زۆری هەیە، بۆ ئەوکەسانەی کە خەریکی کۆمپیوتەرن فەرزی عەینە فێری ببن و بۆ کەسانیتریش فەرزی کیفایەیە.

لەسیستەمی زانستخوازیی ئیسلامییدا پلەو گرنگیی ئیجتیهاد بەدیهێنراوە و داڕێژراوە، بۆ ئەوەی کە مرۆڤ بەزانستێکی کەم قەناعەت نەکات و هەمیشە بەدوای کەسانی شارەزاتردا بگەڕێت تا زانستیان لێوەرگرێت، بۆ ئەوەی پرسیاربکات، ئێستا یەکێك لە کەلێنەکان لەم وولاتەدا هەیە تەنانەت لەناوخوێندەوارە مامناوەندەکانیشدا هەیە، کە پۆست یان پلەیەك یان پلەیەکی زانستی یان بڕوانامەیەك بەدەستدەهێنێت، دوای ئەوە بەلایەوە عەیبە پرسیاربکات لە خۆی زاناتر، یاخود دان بنێت بەوەی کە لەو زاناتر هەبێت، ئەمەش دەردێکی کوشندەیە زاناکانمان لە کۆنەوە خەڵکیان لێ وریاکردووەتەوە، تابزانن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ یوسف:٧٦. لە سەروو هەموو خاوەنزانینێکەوە کە سێکی زۆر شارەزا هەیەو دەبێت ئاگامان لێیبێت، کەواتە ڕەگەزی یەکەم ئەوەیە کە ئێمە دەبێت بەدوای زانستدا بڕۆین لە هەرکوێیەك بێت، بەتایبەتی ئەو زانستانەی کە کۆمەڵگەکەمان پێویستی پێیەتی.

**ڕەگەزی دووەم**: بریتییە لە ڕێگرتن لە چاولێکەریی کوێرانە:

ئەمە دەردێکی کوشندەیەو بەداخەوە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا هەبووە و بەردەوامییشی هەیە، لە کۆمەڵگە کۆنەکانیشدا هەبووە. خەڵك بەپێی مۆدیل دوای شتێك کەوتوون، بۆ نموونە دوای زانستێك کەوتوون و وای لێهاتووە کە ئێمە لە هەندێك پسپۆڕییدا پتر لە پێویستیمان هەیەو

هەندێك لە پسپۆڕی كە زۆر پێویستە نیمانە، تەنها لەبەرئەوەی كە مۆدیل نییە، هەندێك پسپۆڕی گەیشتووەتە حاڵەتی تێربوون، پێویستە ئەم كێشەیە چارەسەربكرێت، ئەو چاولێكەرییە دەردی كوشندەی هەموو گەلان بووە، شارستانییەتەكان لە ڕێگەی ئەو چاولێكەرییەوە ڕووخاون و توشی شكان هاتوون، خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا زۆر بەشێوەیەكی توند ڕەخنە لەوكەسانە دەگرێت كە چاولێكەریی دەكەن تەنانەت چاولێكەریی باووباپیران و سەرۆكەكان، وەك خوای پەروەردگار لە سورەتی (الزخرف)دا لەسەر زمانی ئەوان دەفەرموێت: ﴿إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ﴾ الزخرف:٢٣. كاتێك پێغەمبەران لێیاندەپرسن بۆچی بتپەرستی دەكەن و ڕێگەی نەفامیتان گرتووە؟ ڕەوشت و ئاكارتان بەوشێوەنییە كە پێویستەو پەسەندە، لە وەڵامدا دەیانوت ئەمە ڕێگاو ڕەوشتی باووباپیرانمانە، لەبەرئەوە ئێمەش لەسەر ڕێگەی ئەوان دەڕۆین. ئەمەیە چاولێكەری، لەبەرئەوە ئەگەر لە یەكێك بپرسیت بۆچی شێوەی جلوبەرگو رەفتارت شێوەی مسوڵمانانەو كوردانە نییە؟ لە سەرۆكێك دەپرسیت بۆ شێوازی حوكمەكەت مسوڵمانئاساو كوردانە نییە؟ لە وەڵامدا دەڵێت ئەمە مۆدێلە! ئەوەش لە ئەنجامدا ڕێگرێكی گەورەیە لە هـزری هەوڵدانی سیستماتیك بۆ فێربوونی زانست! لە تازەگەری و نوێگەری. لە سورەتی (**البقره**)دا دەفەرموێت: ﴿وَإِذَاقِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَاأَنزَل اَللّهُ﴾ البقرة:١٧٠. كاتێك پێیاندەوترێت پەیڕەویی لە فەرمانەكانی خودابكەن، دەڵێن: ﴿قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَاأَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءنَا﴾ البقرة:١٧٠، نەخێر، ئێمە

دوای حوکمە شەرعییەکان و بڕیارەکانی خوای پەروەردگار ناکەوین، بەڵکو دوای ئەو نەریت و باوانە دەکەوین کە باووباپیرانی خۆمان لەسەری بوون، ئینجا خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَيَعْقِلُونَ شَيْئاً وَلاَيَهْتَدُونَ﴾ البقرة:١٧٠، ئەگەر گریمان باووباپیرانیان لەسەر ڕێگەی عەقڵ‌و زانست و زانیاری ڕۆشتبوونایە، ئەمە ڕێی تێدەچێت کە مرۆڤ بینی باووباپیرانی ڕێگەیەکی ڕاستیان گرتبێتەبەر، بەڵام ئەگەر بەتەنها هەر بەپاڵنەری باووباپیران و پاڵنەری دەمارگیریی کوێرانە خەڵك شوێن باووباپیرانی کەوتبێت، ئەوە نابێتە بەڵگەیەکی هۆشمەندانە. لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلاَ﴾ الأحزاب:٦٧. زۆرجار کە کۆمەڵگەکان تووشی گومڕایی دەبن ئەوەیە دوای گەورەکانیان دەکەون بەبێ لۆجیك‌و بەبێ بەڵگە، واتە بەم میتۆدەی ئیسلام خەڵك ڕادەهێنرێت لەسەرئەوەی کە داوای بەڵگەبکەن، کاتێك سەرۆکێك یان سەرۆکی حیزبێك، سەرۆکوەزیرانێك زانیارییەك بڵاوبکاتەوە، خەڵك گفتوگۆی بکەن و ئەویش بەوردبینییەوە هەوڵدەدات بەرنامە و یاسا دابنێت. ئەمە پایەیەکی زۆرگرنگە کە لە فیقهی مەعریفەی ئیسلامییدا ڕەچاوکراوە...

لەبەرئەوە گەورەترین کۆسپ لە ڕێگەی مەعریفەو زانستدا بریتییە لە چاولێکەری، وەك دەبینین قورئان تۆماری کردووە لەسەر گەلانی پێشوو، لەسەر بتپەرستان و لەسەر ئەوانەی کە لاڕێبوون و بەگوێی پێغەمبەرانیان نەدەکرد، ئەو ڕەخنە گەورەیەی ئاڕاستەکردون کە ئەوان چاولێکەربوون و بەبێ بیرکردنەوە و لێکدانەوە شوێن هزرێك یان

بەرنامەیەك دەكەوتن. لە فەرموودەكانی پێغەمبەریشدا (درودی خوای لەسەر) فەرموودەیەكمان هەیە كە پێشەوا تیرمیزی دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) فەرموویەتی (لاتكونوا إمعة، تقولون إن أحسن الناس أحسنّا)، واتە كەسانێك مەبن كە دوای واتەوات و ڕەفتارو هەڵسوكەوتی خەڵك بكەون بەشێوەیەكی بێ بەندوبار، مەڵێن (إن أحسن الناس أحسنّا) ئەگەر خەڵك باشبێت ئێمەش باشدەبین، (وإن ظلموا ظلمنا، و لكن وطنوا أنفسكم إن أحسن الناس أن تحسنوا وإن أساءوا فلاتظلموا)، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) لەم فەرموودەیەدا دەفەرموێت ئێوە كەسانێكی دواكەوتوو مەبن، كەسانێك مەبن بزانن خەڵك چی بەدڵەو چی دەكات و چی ناكات؟ مەڵێن ئەگەر خەڵك باشبێت لەگەڵیان دەبین، تەنانەت ئەگەر ستەمیشان كرد هەر لەگەڵیان دەبین، واتە دوای ئەو شەپۆلە گشتییە مەكەون، ڕەنگە زۆرجار ئەو شەپۆلە گشتییە هەڵەبێت، بەڵكو پێغەمبەری خوا دەفەرموێت (وطنوا أنفسكم) واتە خۆتان لەسەر ئەم بەرنامەو مەنهەجە جێگیر بكەن، ئەمە دروشمتان بێت (إن أحسن الناس أن تحسنوا) ئەگەر خەڵك باشبوون ئێوەش باشبن و لە باشیدا دوای خەڵك بكەون و كاری خەڵك هەڵسەنگێنن و لێكیبدەنەوە بەوردی، (وإن أساءوا فلاتظلموا) ئەوكاتە ئەگەر شتێكتان بینی خراپە، وەك ئەوان مەبن، ئێوە ستەم مەكەن و بەدوای خراپەی خەڵكدا مەڕۆن.

ئێستا بەداخەوە خەڵكانێك هنە بەو عەقڵییەتی چاولێكەرییەوە مامەڵە لەگەڵ دابونەریت و تەنانەت ئەو هـزرانەشدا دەكەن كە لە

دەرەوە دێن، بەبێ لێکدانەوە و توێژینەوە، بەبێ ئەوەی پرسیار بکەن لە پسپۆڕان و زاناو زانستخوازان دوای خەڵك دەکەون، تەنانەت لە بیرکردنەوە و جلوبەرگو هەڵسوکەوت و ڕەوشت و ئاکاردا، دیارە زاناکان ئەمەیان بەکۆسپێکی گەورە داناوە لە ڕێگای پێشکەوتن و مەدەنیبووندا، چونکە ئێستەش سیستەمی پەروەردەیی و فەلسەفەی پەروەردە بەرەو ئەو ئاڕاستەیە دەچێت کە خوێندکارو زانستخواز ڕابهێنێت لەسەر لێکدانەوە، بۆ خۆی ئەنجامگیریی لۆجیکی بکات، چونکە ئەوعەقڵەی کە خوای پەروەردگار پێیداویت و ئەو بەزەییە گەورەی خودای پەروەردگار لەگەڵی کردوویت بەو عەقڵ‌و زانست و ئاوەز و ژیرییەی پێتە، دەتوانیت لێکدانەوەبکەیت بۆ هەموو شتەکان، ئەگەرخۆیشت لێکدانەوەت پێنەکرێت کەسانێك هەن لە دەوروبەرت کە بە شارەزاو داناو بیرمەند ناسراون، دەبێت پرسیان پێبکەیت.

**پایەی سێهەم:** بریتییە لە هەنگاونان بۆ ئەو جێگەی کە زانست بەسەریدا زاڵدەبێت و شارەزاییت دەربارەی هەیە:

لەو شتانەدا زانیاری گونجاوت لە سەری نییە بڕیاری هەستیاری لەسەر مەدە و قسەی بازاڕی مەکە، لەم بارەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَاتَقْفُ مَالَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ الإسراء:٣٦. بە دوای شتێکدا مەڕۆ کە زانستێکی تەواوت پێینییە، یان زانستێکی باشت لەبارەوە نییە، دەفەرموێت: ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ

مَسْؤُولاً﴾ الإسراء:٣٦. دەیکات بەبەرنامەو دەفەرموێت بەدوای شتێکدا مەڕۆ کە زانستت لەسەری نییە، واتە هەر شتێکت بینی لە پێشدا بیر لەوەبکەرەوە زانستت لەسەری هەیە یان نا، چونکە هەرقسەیەك دەیکەیت و هەر هەڵوێستێك وەریدەگریت، تەنانەت پشتگیرییەك لە ڕووداوو دیاردەیەك، یان ناڕەزاییەك، دەبێت لەسەر ئەو بنەمایەبێت کە زانستت پێی هەیە. ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾ الإسراء:٣٦. چونکە زانست لەم ڕێگایانەوە نییە، ڕێگایەك لە ڕێگەکانی زانست بیستنە، ڕێگایەکیان بینینە، ڕێگای عەقڵو دڵە، واتە لێکدانەوە و شیکردنەوە و ئەنجامگیرییە، هەموو ئەم بەهرەجوانانە لە مرۆڤدا خوای پەروەردگار پرسیاریان لەسەر دەکات، چونکە تۆ ئەگەر تەنها پشت بەبیستن ببەستیت و هەرچۆنێکت بیست بڵێیت وایە، ئەمە لە ڕووی مەنهەجییەوە زۆر نەخوازراوو نەویستراوە، خوای گەورە لێتدەپرسێت، تۆچۆن پشت دەبەستیت بەهەموو بیستراوێك؟ بەهەمانشێوەش بۆ بینین.

هەموو لێکدانەوەیەك کە دەیکەیت بەدڵو عەقڵ دەیکەیت، لێتدەپرسن چۆن پشتتکردە ئەوەی کە بە مێشکتدا دێت، یان ئەوەی کە بە عەقڵی خۆت بەدڵتە، کەواتە ئێمە پێویستمان بەپێوەرێك هەیە، پێوەریش بریتییە لە زانست و زانیاری، نەك بڵێت ئەو زانستەی کە خۆم بەزانستی دەزانم، نەخێر، دەبێت ئەو زانستەبێت کە زاناکان بەزانستی دەزانن، ئەوکەسانەی پسپۆڕن لە بواری زانستی مرۆڤایەتی و ئەو یاساو ڕێسایانەی کە لە ناو خاوەن پسپۆڕییەکاندا حسابیان بۆ دەکرێت،

تەنانەت پێغەمبەری خوا (د.خ) پرسیاریان لێکرد لەسەر هەندێك شت فەرموویەتی (ما المسؤول عنها بأعلم من السائل) کاتێك پرسیاریان کردووە کەی جیهان کۆتاییدێت: (متى تأتي الساعة) کەی قیامەت دێت؟ پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) زۆر بەڕاشکاوی و زۆر بەخاکیبوونێکی زانستییانەوە دەفەرموێت: ئەوکەسەی کە پرسیاری لێکراوە لەبارەی هاتنی قیامەتەوە شارەزاتر نییە لەوکەسەی کە پرسیارەکە دەکات، خوای پەروەردگار پێیفەرموو ﴿يَسْأَلُكَ النَّاسُ عَنِ السَّاعَةِ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللَّهِ﴾ الأحزاب: ٦٣. خەڵکی پرسیارت لێدەکەن کەی قیامەت دێت، تۆش بەدڵنیاییەوە پێیانبڵێ: ئەم زانیارییە تەنها لای خودایە.

ئەو لەخۆبوردەییەی پێغەمبەری خوا فێرماندەکات کە قسە نەکەین لەسەر شتێك کە زانیاری و ژمارە و داتامان لە سەری نییە. لێرەدا ئاماژە دەکەین بەهەندێك نموونە، بەتایبەتی لەم هەڵبژاردنانەی ئەمدواییەی کوردستاندا، هەرلیستێك بۆ خۆی ڕێژەیەکی بەدەستهێنا، دوای ئەوەی کە ئەنجامەکان ڕاگەیاندران زۆرکەسمان دەبینی لە کەسی سیاسی لە خۆیەوە قسەی دەکرد بەبێ ئەوەی زانیاری تەواوی هەبێت قسەی دەکرد لە بارەی ئەنجامەکانەوە و دەیوت فلانکەس دەنگی نەداوە و فلان دەنگی داوە، کە ئەمە پێچەوانەی ئەم یاسا قورئانییەیە. کەواتە هەرکاتێك زانیاریت بەشتێك نەبوو قسەی گۆترە مەکە، زۆرجار پێغەمبەری خوا(درودی خوای لە سەر) کە پرسیاری لێدەکرا وەستانێکی بۆ دەکرد و هەڵوێستەیەکی دەکرد، تاپرسیاری لە خۆی

زاناتر بکردایە، بەتایبەتی ئەمینی وەحی جبریل (سلاوی خوای لێبێت)، زۆرجار ئەو پێغەمبەرە نازدارە خۆشەویستە کە خوای پەروەردگار لە ڕێگەی قورئانەوە زۆر شتی فێرکردووە زۆر بەئاشکرا بۆ نمونە دەفەرموێت: نازانم (ذو القرنين) پێغەمبەر بووە یان پێغەمبەر نەبووە !.

ئەمە بنەمایەکی زۆر بەهێزە کە دەبێت ئاگامان لێیبێت، چونکەئەگەر مرۆڤ سنووری مەداریكو زانیاری خۆی زانی، مانای وایە کە زانستێکی باشی هەیە، چونکە ئەوکەسەی نەزانێت کە دەزانێت ئەوە نەزانە، ئەوکەسەی بزانێت چەند دەزانێت و سنوری زانیاری و شارەزایی خۆی بزانێت زانایە، کە زانیمان چەندێك دەزانین، دەشزانین چەندێك نازانین، لەبەرئەوە لەو شوێنانەدا کە زانینێکی تەواومان نییە یان زانینێکی یەکلاکراوەمان نییە لە بابەتەکەدا خەڵك حەواڵەی کەسانی شارەزاو خاوەنئەزموون دەکەین، قورئان فێرماندەکات و دەفەرموێت: ﴿فَاسْأَلُواْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَتَعْلَمُونَ﴾ النحل:٤٣. ئەگەرشتێکتان نەزانی، پرسیاربکەن لە زانایان. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ﴾ النساء:٨٣. واتە لە ڕاستیدا ئەگەر ئەوکەسانەی تووشی کێشە دەبن، تووشی پرسیار دەبن، تووشی پارادۆکسێکی زانستی و فیکری و فەلسەفی دەبن، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لە سەر) گەر شارەزابن لە سوننەدا، یان ئەگەر خۆیان شارەزانەبن لە سوننە و فەرموودە، با بگەڕێنەوە بۆ ئەوانەی کە دەمڕاستن، ئەوانەی کە خاوەن بڕیاری زانستین لە ناو مسوڵمانانداـ تەنانەت تەنها ئەوکەسانە دەتوانن

حوکمی لە بارەوە بدەن کە لە پلەی ئیجتیهاددان، جا لەبەرئەوە ئەمە پایەیەکی زۆر گرنگە، بنەمایەکی زۆر گرنگە لە فیقهی مەعریفەی ئیسلامیدا کە بەوشێوە گرنگی دەدرێت بە خاوەنی پسپۆڕی، لەبەرئەوە کاتێك کە قسە دەکرێت لە بارێکی سیاسی و بوارێکی سیاسییەوە، لە بابەتێکی پەیوەندیدار بەکاروباری بەڕێوبردنی وڵات و کاروباری دەستەڵات، دەبێت لە شارەزاکانی بواری سیاسەت رێنمایی وەرگرین، کاتێك کە باسێکی ئابوری دێتەپێشەوە دەبێت لە شارەزاکانی بواری ئابووری بپرسین و ئەوان گونجانی واقیعی بۆ رێکخەن، واتە بیبەنە ئەو قاڵبە یاساییەوە کە ئەنجامەکەیمان پێبڵێن، ئەوسا ئێمە بڕیاری لەسەر بدەین و هەڵوەستەی لێوەربگرین.

**بنەمای چوارەم:** بوونی دیالۆگو قسەکردن:

واتە ڕەچاوکردنی بیروبۆچوونە جیاوازەکان. دەبینیت زۆرجار نامیلکە لەملاولاوە بڵاودەبێتەوە لە بارەی بابەتێك لەو بابەتانەی ئێستا گەرمە و قسەو باسی لەسەرەو گفتوگۆی زۆری هەڵگرتووە و ڕاجیایی زانایانی لەسەرە، کەسانێك هەن لەو نامیلکانەدا ئەو بۆچوونەی خۆیان بڵاودەکەنەوە کە دەڵێت: بۆچوونی جیاواز هەر نەبێت لە بابەتەکاندا، لە حاڵێکدا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (ڕەزای خوای لەسەر) دەفەرموێت: (لەو بابەتانەدا کە هاوەڵان قسەیان کردووە، حەزم لەو بابەتانە زیاتر هەیە کە ڕاجیاییان تێیدا هەبووە تا ئەو بابەتانەی یەکدەنگیان تێیدا

هەبووە)، کەواتە مانای وایە کە هەمیشە بواری چەند بیروبۆچوونێکی جیاوازهەیە و ئەوکاتەش من سەرپشکم کە کامیان هەڵبژێرم، بەڵام لەو مەسەلەیەدا کە یەکدەنگن، ناتوانم بۆچوونێکی جیاواز هەڵبژێرم. لەبەرئەوە، ئەو، ڕاجیایی پێخۆشە لەناو هاوەڵاندا تا ڕێککەوتن لەسەر بیروبۆچوونێکی تایبەتی. لەبەرئەوە دەبینین ئێستا لە ناو لاواندا، بەتایبەت لە ناو زۆر لە بیروبۆچوونە جیاکاندا، خۆیان بەشێوەیەك لە شێوەکان بوون بەدەمڕاستی مسوڵمانان کاتێك بابەتێك دەخەنەڕوو، بابەتەکە سیاسی بێت یان ئابوری، پەروەردەیی یان عەقیدەیی، تەنها یەك بیروبۆچوون وەردەگرن و باقی بیروبۆچوونەکانیتر باسناکەن و لەبەرچاوی ناگرن، لەبەرئەوە خەڵك سەری لێدەشێوێت. ئەو بابەتانەی کە ئیختیلاف هەڵدەگرن تاوانە یەك بۆچوون بێنیت و بیسەپێنیت بەسەر خەڵکدا و بابەتە جیاوازەکان باسنەکەیت، تەنانەت بۆچوونی خۆت بەتاکە بۆچوون دەسنیشانبکەیت، چونکە خوای پەروەردگار ئەم جیهانەی لەسەر بنەمای جۆراوجۆرو هەمەچەشنە دروستکردووە، واتە خوای پەروەردگار ویستی وابووە کە ئەم جیهانە جۆراوجۆربێت و خەڵکەکان جیاوازییان هەبێت لە بیروبۆچوون و شێوازی بیرکردنەوەدا، تەنانەت لە خولگەیەکی عەقلێدا، تەنانەت لە ژینگە و سەرچاوە هـزرییەکانیاندا، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ النحل:١٢٥. خوای پەروەردگار هەر لە بواری بانگەوازکردندا بۆ لای خواو بۆ لای تەوحید،

دەفەرموێت: هەندێك كەس وا دەخوازێت بەحیكمەت قسەیان لەگەڵدا بكەین، هەندێك وا دەخوازێت بەئامۆژگاری قەسەیان لەگەڵدا بكەین، هەندێكیش بەشێوازی گفتوگۆ قسەیان لەگەڵدا بكەین.

تەماشای پێغەمبەران بكەین كاتێك لەگەڵ گەلەكانیاندا قسەیانكردووە، ئەوانیش خەڵكی گفتوگۆبوون، واتە حسابیان بۆ كەسی بەرامبەرەكەیان كردووە و نادیدەیان نەگرتوون، ﴿قَالُواْ يَانُوحُ قَدْ جَادَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَالَنَا فَأْتَنِا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ۞ قَال آنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ اللّهُ إِن شَاء وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ۞ وَلاَيَنفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ اللّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَرَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ۞﴾ هود:٣٢ـ٣٤. تەماشای ئەم شێوازی گفتوگۆیە! تەنانەت پێغەمبەران لە ناو خۆیاندا دیالۆگیان لەگەڵ گەلەكانیاندا بەشێوازی جیاواز كردووە، چونكە هەركەسێك بەشێوازێك گفتوگۆی لەگەڵ خەڵكو گەلی خۆی كردووە كە ئەوان بتوانن لێی تێبگەن. ئەوان، بۆ نموونە گەلی نوح، گەیشتوونەتە ئاستێك كە حەزرەتی نوح هەموو شێوازەكانی گفتوگۆی لەگەڵیاندا بەكارهێناوە، هەتا گەیشتونەتە ئەوئاستەی كە پێیانوتووە: ئەی نووح! تۆ زۆر قسەت لەگەڵدا كردووین و هەموو شێوازەكانی گفتوگۆت لەگەڵدا تاقیكردووەتەوە، بەڵام ئێمە هەر قبووڵمان نییە، فەرموو چ هەڕەشەیەكت پێیە جێبەجێی بكە ئەگەر ڕاستدەكەیت، واتە ئەوان وتوویانە ئەگەر ڕاستە خوایەك هەیەو تۆی

ناردووە وەك پێغەمبەر بۆ ئێمە، چیتان لە دەست دێت بیکەن، دیسان لەوێشدا نوح هەر دەرگای گفتوگۆی دانەخست و فەرمووی ﴿قَال آنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ اللّهُ إِن شَاء وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾. واتە ئەگەر خوا بیەوێت ئەو سزایەی کە بۆی ئامادەکردوون هەر بۆتان دەهێنێت و ناتوانن ڕێگری لە خودابکەن. ﴿وَلاَيَنفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ اللّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ﴾ . دیارە حەزرەتی نوح نزیکەی (٩٥٠)ساڵ هەر بانگەوازی کردو هەر شێوازەکانی گفتوگۆی بەکاردەهێنا لەگەڵیاندا، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو چونکە بەتەواویی دڵسۆزی گەلەکەی بوو، واتە ئەگەر پێغەمبەرێك ئەوەندە پشوو درێژ نەبێت چۆن(٩٥٠)ساڵ خەریکی بانگەواز دەبێت؟ بەڵام ئەوان هەر لە کێشەی خۆیاندابوون، لەبەرئەوە دەفەرموێت: ﴿إِن كَانَ اللّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَرَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾.

گفتوگۆی ئیبراهیم، موسا، هەموو پێغەمبەران(سەلامی خوایان لەسەربێت)، هەموویان بەهەموو شێوەیەك حسابیان بۆ بەرامبەر کردووە، لەبەرئەوە گفتوگۆیان لەگەڵدا کردوون و لە ڕێگەی گفتوگۆوە چونەتە پێشەوە. کەواتە پایەکەی دیکە بۆ بەدواداچونی زانست و زانیاری بریتییبوو لە گفتوگۆ لەگەڵ بەرامبەر، بتوانیت بەرامبەر بهێنیتە قسە بۆ ئەوەی چی لە ناخیدایە دەریببڕێت بەبێ موجامەلە و بەبێ شکاندن و لەکەدارکردن و دەستکاریکردن.

## بنەمای پێنجەم:

کاتێك دەبینیت بیروبۆچوونی پێچەوانە (واتە ئەوکەسەی لە بەرامبەر تۆدایە) ڕاستە، دەبێت ئەوەندە ویژدانت هەبێت وەریبگریت و پەیڕەوی بکەیت. لە مێژووی ئیسلامییدا نموونەی زۆرمان هەیە، پێشەوا موسلیم لە صەحیحی خۆیدا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) ئەبوهورەیرەی نارد فەرمووی موژدە بدە بەهەر کەسێك شایەتی بدات بە تەوحیدو بڵێت (لا اله إلا الله) و یەقینی تەواوی پێی هەبێت، ئەوە خوای پەروەردگار دەیخاتە بەهەشتەوە، بۆ ئەوەی ئەم مژدەیە بگەیەنێت ناونیشانێکیش لە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) وەردەگرێت، لە ڕێگادا دەگات بەپێشەوا عومەر، رێگای نادات و دەڵێت ئەم قسەیە بەخەڵك مەڵێ تا لەوبارەیەوە لە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) دەپرسم، دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ شتی وات فەرمووە؟ ئەویش دەفەرموێت: بەڵێ، پێشەوا عومەر دەڵێت: دەی من بۆچوونم وایە ئەم موژدەیە بەناو خەڵکدا بڵاو مەکەرەوە، چونکە خەڵك ئەگەر ئەم موژدەیە ببیستن، ئیتر واز لە کردەوە دەهێنن، ئینجا پێغەمبەری خوا تەماشای کرد بۆچوونێکی ڕاستە، لە ڕاستیدا بۆ گەلێ کەس سوودی ئەو موژدەیە پێچەوانە دەبوویەوە لەوکاتەدا و دیارە وەك حوکمێکی شەرعییش ئەو ئەرکەی بەئەبوهورەیرە نەسپاردبوو، تەنها پێشنیازێك بووە، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت مرۆڤ کە بینی بۆچوونێك لە بۆچوونەکەی خۆی بەهێزترە، فەتوایەك لە فەتواکەی خۆی

بەهێزترە، پێویستە ئەو بۆچوونە قبوڵ بکات و توند نەبێت و لەخۆبایی نەبێت بەبۆچوونی خۆیەوە. ئەمە پایەیەکی زۆرگرنگە کە لە فیقهی مەعریفەی ئیسلامییدا هەیە.

بێگومان ئەم فیقهی مەعریفەیە، پایەیەکی زۆر گەورەیە لە هـزری ئیسلامییدا بەو شەش بنەمایەوە کە باسمانکرد.

لە پەروەردگاری مەزن دەخوازم مایەی تێگەیشتن بووبێت و بیکەین بەچرایەك لەبەردەستی خۆماندا، بۆ ئەوەی هەم باوەڕمان بەدیالۆگ هەبێت و هەم باوەڕمان بەوە هەبێت کە بیروبۆچوونی بەرامبەر قبوڵ بکەین کاتێك بۆماندەرکەوت ئەو بۆچوونە لەوەی ئێمە پەسەندترە و لەوەی ئێمە زۆرتر ڕاستیی دەپێکێت و بەرژەوەندیی دابیندەکات بۆ مسوڵمانان.

# بیردۆزی دژایەتیی شارستانییەتەکان

## ( ساموێل هەنتینگتن[1] )

کاتێك کە بیردۆزی دژایەتیی شارستانییەتەکان سەریهەڵدا مەبەست لەم بیردۆزە ئەوەبوو بەهەموو خەڵکی بگەیەنێت مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی جەنگێکی گەورەی کەونی و جیهانی دەبێتەوە لە ئاستی شارستانییەتەکاندا، بەتایبەتی شارستانیەتی خۆرئاوا ڕوبەڕووی شارستانیەتی ئیسلامی و هاوپەیمانەکانی دەبێتەوە.

لەم باسەدا تیشکێك دەخەینەسەر فەلسەفەی ململانیێو کەلتووری دورخستنەوەی ئەویتر کە لە ڕاستیدا خۆرئاوای لەسەر بنیاتنراوە، ئەوەی کە باسدەکرێت لێرەولەوێ و خەڵکی پێچەواشە دەکرێت ئەوەیە کە گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەویتر، بۆچوون گۆڕینەوە و ئاڵوگۆڕی ڕاوێژ لەگەڵ کەسانی دیکە، گوایە ئەمە بەرهەمو دەرهاویشتەی شارستانیەتی خۆرئاوایە، گوایە مافی مرۆڤ دەرهاویشتەی شارستانیەتی خۆرئاوایە و تائەوان نەهاتبوون ئەم گوتەزاو بیروبۆچوونانەیان فێرنەکردبووین و لە جیهانێکی زۆر دواکەوتوودا دەژیاین و باوەڕمان بەدیالۆگ لەگەڵ خەڵکانی جیاوازدا نەبووە. ئەم قسەیە یاخود ئەم بانگەشەیە

---

[1]– ساموێل هەنتینگتن (١٩٢٧ ـ ٢٠٠٨ز) پرۆفیسۆری ئەمریکی لە زانکۆی هارڤارد، زانا لە بواری سیاسەتدا.

لەلایەکەوە پێداهەڵگوتن و بە شکۆڕاگرتنی هـزری خۆرئاواییە بەڕەهایی و لەلایەکیترەوە ڕیسواکردن و ناشیرینکردنی هـزری ئیسلامیو کۆمەڵگەی مسوڵمانان لەخۆدەگرێت.

ئێمە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ قورئانی پیرۆز، دەفەرموێت : ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ﴾ القصص٥.

ئەم ئایەتە باس لەوەدەکات خوای پەروەردگار هەمیشە ویستویەتی لە ڕێگەی بەرنامەو یاساو بڕیارەکانی خۆیەوە ئەو کەسانەی کە زۆرلێکراون و ستەمیان لێدەکرێت، ڕزگاربکرێن لە کۆت و بەند و ستەم و خۆیان ببنە پێشەوای ژیانی خۆیان و ببنە سەرکردەو ڕابەر لە کۆمەڵگەی خۆیاندا و خاوەنی ویست و بەڕێوەبردن (ئیرادەو ئیدارە)ی خۆیان بن، ئەوان میراتگری سەرزەوی بن، هەڵگری باری ئەمانەتی ئاوەدانکردنەوەی ئەم سەرزەوییە بن. بەپێی ئەم ئایەتە بێت ئێمە جیاوازییەکی زۆر سەرەکی دەبینین لە نێوان هـزری ئیسلامو هـزری خۆرئاواییدا، کاتێك کە سەیری بنەماکانی هـزری خۆرئاوایی دەکەین، کە سەیری دەرهاویشتە و دەستنماکانی هـزری خۆرئاوا دەکەین دەبینین هەمیشە ئەوان لە ڕوانگەیەکی خۆبەگەورەگرتن و خەڵکی دیکە بەپەراوێز لەقەڵەمدان، مامەڵەیان لەگەڵ خەڵکدا کردووە، واتە بڵاوکردنەوەی ئەوەی کە ئەوان دیموکراتیەتیان هێنابێت بۆ دونیا و مافی مرۆڤیان هێنابێت و ئەوان خۆشی و کامەرانییان هێنابێت و هەڵگری پەیامی مرۆڤدۆستی و مرۆڤنەوازی بن، ئەمە لە ڕاستیدا

جۆرێکە لە کەلتوری پێشێلکردن و پەراوێزخستنی ئەویدی، ئایەتەکە باس لەوەدەکات دەیەوێت هەر لە ناو خەڵکە جیاوازەکاندا و لە ناو خەڵکە لاوازەکاندا کەسانێك دابنێن بەپێشەواو کەسانێك لە ستەمو لە ستەملێکراوان ڕزگاربکات، لەبەرئەوە بیرمەندان لەسەر ئەوە خەریکە کۆکبن لەوەی کە جەوهەری ململانێ لە نێوان ئێمە و کەسانێکی خۆرئاواگەرا، کەسانێك کە نێردراون، یاخود بەڕاستی لە مەتەرێزی خۆرئاواوە دەیانەوێت دژایەتی هـزری ئیسلامی و هـزری خۆرهەڵات بکەن، جیاوازییەکە لە وەدایە (کەئێمە باوەڕمان بەکەلتوری لەناوبردن و پەراوێزخستن نییە)، بەڵێ ڕەنگە لە کەلتوری ئیسلامییدا دیکتاتۆرەکان ئەوانەی کە پاوەنخوازی دەستەڵاتبوون و بەشێوەیك لە شێوەکان قبوڵیان نەبووە کەسێکیتر لە مەیدانەکەدا ئامادەیی هەبێت، ئەو جۆرە کەسانە هەبوون کە نەیانهێشتووە یان نەیانویستووە هیچ دەنگوڕەنگێکی دیکە هەبێت، بەڵام هێڵی سەرەکی ئیسلامەتی، ئەو هێڵە ڕەسەنەی کە زانا مسوڵمانەکان لەسەری بوون بەبیرو مەزهەبە جیاوازەکانەوە، هەمیشە داکۆکییان لەسەر ئەو خاڵە کردووە کە پێویستە هەموو دەنگوڕەنگە جیاوازەکان هەبن، هیچ کەسێك تەنانەت ئەگەر وتەزایەکی لاوازیشی هەبێت یان تەئویلێکی لاوازیشی هەبێت لە بازنەی زانایان و بیرمەندان دوورناخرێتەوە،و حساب بۆ بیروبۆچوون و ڕەنگەکانی دەکرێت، هەر لە بنەڕەتدا بەپێی لێکۆڵینەوە مێژووییەکان هەمیشە ژینگەی ئەوروپا ژینگەیەك بووە خەڵکی لە خۆی دوورخستوەتەوە و تەنانەت خەڵکانێك ناچاربوون ئەوروپا بەجێبهێڵن و

ڕووبکەنە سەرزەوییەونەکان، وەك خەڵکە پرۆلیتارەکان کە ناچاربوون ئەوروپا بەجێبهێڵن و ڕووبکەنە ئەمەریکا دوای ئەوەی ئەمەریکا دۆزرایەوە، تەنانەت ئەوکۆچە یەکلەدوایـیەکانەی ئەسکەندەرو تیرەو هۆزە جەرمانییەکان و ڕۆمانییەکان و جەنگی خاچپەرستەکان لەگەڵ جیهانی ئیسلامی، ئەوە دەگەیەنێت کە هەمیشە ئەوروپا ویستویەتی خەڵکێك لەخۆی دووربخاتەوە،و لەسەر حسابی خەڵکێکیتر پەرەبەخۆی بدات، هەمیشە ستەمی داگیرکاری ئیمپرالیزم بەکاربهێنن، ئێستاکەش کە جیهانی مۆدێرنە و چەندین مۆدیلی جیاواز هاتۆتەڕوو، تەماشادەکەین خۆرئاواییەکان لەگەڵ گەلانیتردا وەك کۆمەڵێك ئاغاودەرەبەگ هەڵسوکەوت دەکەن، تەنانەت ئەگەر کەسێك دژیان وەستابێت لە مێژووی ئەواندا، ئەوا بەڕاستی مێژووی وێرانکردن و بەسوتماککردنی شارەکان پەیڕەوکراوە، وەك مێژوونوسەکان باسیاندەکەن، (نیرۆن[1]) شاری ڕۆمای سوتاند، ئەوروپییەکان لە جەنگی خاچپەرستەکاندا کە هاتن وڵاتانی مسوڵمانانیان داگیردەکرد، بەشێوەیەك ڕەفتاریان دەکرد کە بە هیچ یاسایەك و هیچ پێوەرێك ڕەوانییە و ڕەوانابێت، تەنانەت کاتێك لە (ئەندەلوس)دا کۆبوونەوە، واتە هەردوو هەرێمی (پۆرتۆ) و (غال)، دژ بەمسوڵمانەکان و توانییان مسوڵمانان دەربکەن و دەستەڵاتی ئیسلامی لە ئەندەلوس نەهێڵن، هەڵوێستیان لە مەڕ مسوڵمانان و جولەکە لەو وڵاتەدا دیارە،

---

[1] ـ نیرۆن: ئیمپراتۆری رۆمانی (٣٧ ـ ٧٨ ن).

مێژوونوسەکان باسیاندەکەن کە چۆن دەستیانکردبوو بەپاکتاوکردنیان، چۆن هەوڵیاندا هیچ نیشانەیەکی مسوڵمانێتی یان نیشانەیەکی یەهودی لەو وڵاتەدا نەهێڵن، لە ناوچەی(باڵکان ـ بلقان)دا لە کۆتایەکانی سەدەی بیستەمدا کە هەستیانکرد بەوەی وڵاتێکی وەك وڵاتی بۆسنە بەزۆرینەی مسوڵمانەوە خەریکە دروستدەبێت دوای هەڵوەشاندەوەی یەکێتی یوگسلافیای جاران، بەهەموو شێوەیەك هەوڵیاندا ئەو وڵاتە دروستنەبێت، کە دروستیش بێت لەسەر بنەمایەکی لاواز دروستببێت و کەمترین ئیمتیازات بدەن بەمسوڵمانەکان، لەسەر بنەمای ئەوەی کە ئەوروپا حساب بۆ کەسێکیتر بەبیرو ئایدۆلۆژیایەکی دیکەوە لە بازنەی خۆیدا قبوڵناکات، وڵاتێکیتر کە رەنگە بتوانێت بۆشاییەکانی تاکی خۆرئاوایی پڕبکاتەوە و هەبێت، تەنانەت ئێستا چەندین ساڵە وڵاتێکی وەك تورکیا لە هەوڵی ئەوەدایە دەیەوێت بڕواتە ناو یەکێتی ئەوروپا، تەماشادەکەین ئەوروپییەکان تا ئێستاش ناڕازیین لەوەی وڵاتێکی گەورەی وەك تورکیا بەو شارستانییەتە قووڵەی کە هەیەتی ببێت بەئەندام، هەرچەند زۆرینەی زۆری مەرجەکان و پێشمەرجەکانی ئەوروپایان قبوڵکردووە، بەڵام هێشتا بەتەواوی نەگەشتوونەتە ئەوەی کە ڕێگابدەن وڵاتێکی وەك تورکیا ببێت بەئەندام، لەبەرئەوە ڕەنگە تورکیا گەشتبێتە ئاستێك کە بڵێت ئەگەر ئەوان داوابکەن من ببمە ئەندام ئەمان قبوڵی ئەو ئەندامیەتییە نەکەن، ئەمە بۆ خۆی نیشانەی ئەوەیە کە عەقڵی خۆرئاوایی تەنها کاتێك قبوڵی بوونی دەنگی جیاوازو ڕەنگی جیاواز دەکات کە ئەو دەنگ و ڕەنگە جیاوازە دەنگێکی کز و

ڕەنگێکی کاڵ بێت لە تابلۆی جیهان و تابلۆی سیاسەتی نێونەتەوەییدا، بەتەواوی دیارو بەرجەستەبێت کە ئەوان هەمیشە ترسێکیان لێنیشتووە لەوکەسەی کە دێت، لەویتر ترسێکیان هەیە، لە مسوڵمان، لە عەقڵی ئیسلامی لە هـزری ئیسلامی، لەبەرئەوە هەمیشە لە بیری ئەوەدابوون تەنانەت بیردۆزەکانیان تیۆرە سیاسی و ئەمنییەکانیان ئەوەبووە کە ترسێك هەیە هەڕەشەمان لێدەکات، ئەو ترسە لە خۆرهەڵاتەوە دێت، لە ناو خۆشیاندا ئەوروپیەکان ترسێکیان هەیە لەوەی کە بەروبوومی سەرزەوی، بەشی ئەو هەموو مرۆڤە نەکات، ئەمە لە سەردەمی یۆنانەکانەوە ئەم ترسەیان هەبووە، تا کۆتاجار لە لایەن بیرمەندێکی وەك (ماڵتۆس[1])ەوە ئەو بیرۆکە فراوانکرا کە وتی: ئێمە بیر لەوەبکەینەوە کە سنورێك بۆ زیادبوون و تەشەنەسەندنی دانیشتوان دابنێین. بەڵام لە هـزری خۆرهەڵاتییدا، لە هـزری ئیسلامییدا، ئەم شتانە نییە، مسوڵمان باوەڕی وایە خوای پەروەردگار هەر شتێکی دروستکردبێت ڕۆزیشی بۆ داناوە و بڕیاری بۆ داوە، خوای پەروەردگار ئەم جیهانەی لەخۆوە دروستنەکردوە، کەسێك دروستناکات ئەگەر شتێکی بۆ دانەنابێت لە سەرزەوییدا، ئەگەر بڕێکی لە خۆراکی لەم سەرزەوییەدا بۆ دانەنابێت، لەبەرئەوە دەبینین هەموو ئەو برسیەتی و گرانی و قەیرانە ئابورییانەی کە لە جیهاندا ڕوودەدات و بڵاودەبێتەوە، زۆری دەرهاویشتەی مومارەساتی نادادپەروەرانەی خەڵکی خۆرئاوایە،

---

[1] ـ تۆماس مالتوس(١٧٦٦ ـ ١٨٣٤ز ) زانای ئینگلیزی لە بواری ئابووریدا.

لەبەرئەوە دەبینین ملیۆنان خەڵك لە ژێر هێڵی هەژارییەوەن کە خەریکە زۆربەیان دەمرن، لەملاشەوە تەماشادەکەیت چەندین خۆراك و بەهەزاران تەن خۆراك خراپدەبێت و فڕێدەدرێتە ئۆقیانوس و دەریاکانەوە، ئەم خۆپەرستیو خۆویستییەی خۆرئاوا بەڕاستی گەورەترین کێشەیە و گەورەترین لەکەیە دەدرێت لەو دروشمانەی کە بەرزیانکردووەتەوە، کە گوایە خزمەت بەمرۆڤایەتی دەکەن، ئەوکاتانەش فراوانخوازییان کردووە و وڵاتانیان داگیرکردوە، لە ڕاستیدا نەیانویستووە خەڵکی ئەو وڵاتانە فێری خوێندەواری و فێری پێشکەوتنی تەکنەلۆجی بکەن، بەپێچەوانەوە بەهەموو توانایەکی سەربازی خۆیانەوە جەنەڕاڵەکانیان ناردووە بۆ ئەم وڵاتانە و لەگەڵ جەنەڕاڵەکاندا خەڵکانێکیان ناردووە تا خێروبێری ئەم وڵاتانە بۆخۆیان بەرن، هیچ تەکنەلۆجیاو هیچ پێشکەوتنێکیان بەدیاری نەهێناوە بۆ ئەم وڵاتانە، مەگەر شتێك کە خزمەت بەگەورەیی و سەرکەوتنی ئەوان بکات.

ئەم لێکدانەوانە لە ڕاستیدا بۆ ئەوە نییە کە درزێکی گەورە دروستبکەین لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا، بۆ ئەوەش نییە پێمانوابێت کە خۆرهەڵات و خۆرئاوا هیچ خاڵێکی هاوبەش لە نێوانیاندا نییە، بەپێچەوانەوە ئێمە دەبینین خوای پەروەردگار بانگیان دەکات و دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ ٱلْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾ آل عمران٦٤.

واتە: هەمیشە پێوانەیەك لە گفتوگۆدا هەیە لە نێوان ئێمەو خەڵکیتردا، ئێمە بەو عەقڵییەتەوە بۆیدەڕۆین، لەبەرئەوە ئەگەر کەسێك لە ئەوروپاوە مسوڵمان ببێت، بۆ خۆی دەبێت بەپێشەوا، نەك لە ناو وڵاتێکی پێشکەوتوو و گەلێکی ڕاقییدا، بەڵکو لە ناو هەر گەلێکی ژێردەستە و ستەمدیدەشدا عەقڵەکان کە دێنە ناو بازنەی ئیسلامەوە بۆخۆیان دەبن بەپێشەوا، لەوڕوانەگەیەوە تەماشادەکەیت لە وڵاتەکانی ئەودیوی ڕوباری (جەیحون و سەیحون)ەوە کە ئێستا پێیدەوترێت ئاسیای ناوەڕاست، خەڵکانێکی زۆر هاتنەناو بازنەی ئیسلامەوە و بوون بەپێشەواو سەرمەشق و مامۆستا، وەك: (پێشەوا ئەبوحەنیفە، فارابی، ئەبوعەلی سینا، ئەبورەیحانی بیرونی[1]....هتد)، وەك ئەو هەموو شارازایانەی کە لە مێژووی ئیسلامدا باسکراون و ناویان هاتووە کە هیچکامیان لە ڕووی نەژادەوە عەرەب نەبوون، کە هاتنە ناو ئیسلامەوە لەگەڵ پاراستنی ڕەگەزی خۆیان، لەگەڵ ئەوەی کە حسابێکی زۆریان بۆ دەکرا، بوون بەخاوەنپایەیەکی وەها کە ئێستا مسوڵمانان لە هەموو جیهانەوە شانازییان پێوەدەکات، بەڵکو بوون بەدروشمێکی پڕبەها بۆ

---

[1] - ئەبورەیحان محەممەدی کوڕی ئەحمەدی بیرونی خوارزمی (٣٦٢- ٤٤٣ یان ٤٤٠هـ) ژیاوە، مێژوونوسان بۆچونیان جیاوازە لەساڵی مردنەکەیدا، لەدایكوباوکێکی فارس لەخوارزم لەدایکبووە، زانایەکی بیرکاریـزانو ئەندازیاربووە، (بیرون) شارێکە لە(پاکستانی ئێستا)، زۆردانراوی بەپێزی هەیە لەوانە: الآثار الباقیة عن القرون الخالیة، والصیدلة في الطب، والجماهر في الجواهر.. (ابن أبی اصیبعة، **عیون الأنباء في طبقات الأطباء، ل٤٥٦.)**

هەموو مسوڵمانان، بایی ئەوەیە کەساڵەهای ساڵ شانازییان پێوەبکرێت ئێستاشی لەسەر بێت.

شارستانیەتی خۆرئاوایی لەسەر ئەو بیرۆکەیە دامەزراوە، بەڵێ خەڵك بانگدەکات بۆ ئەوەی کە شەیدا و سەرسامی دروشمەکانی بێت، بەڵام هەرگیز ئەو پێگەیان پێنادات کە ببنە پێشەوا، ببنە سەردەستە و ڕابەر، ببنە کەسانێك کە جیهان بیانکات بە نمونە و سەرمەشق. بۆ چەندین سەدە تەنها بیریان لەوە دەکردەوە کە کۆیلەکان بازرگانییان پێوەبکرێت و لە ئەفەریقاوە ببرێن بۆ ئەوروپا و ئەمەریکا، بەهەموو تەفسیرێك ئەم ململانێیەی کە جیهانی ئێستای لەسەر دەژی، لە ڕاستیدا ململانێیەکی زۆر نابەرانبەرە، ململانێیەکی زۆر ناشەریفانەیە و کەلتوری دورخستنەوە و پەراوێزی ئەویتری پێوەیە.

ئەم بیرۆکەیە و ئەم فەلسەفەی ململانێیە کە مرۆڤ هەمیشە لەگەڵ ئەویتردا لە زۆرانبازی و لە ململانێدا بێت، هەرکاتێکیش بەرانبەرەکەشی هێنایەسەر بیروبڕواکەی خۆی، هەمیشە ئەو بە کۆیلەو ژێردەستەی خۆی بزانێت، ئەمە بیرۆکەیەکی خۆرئاواییە و لە سەردەمی یۆنانەکانەوە بۆیانماوەتەوە، چونکە یۆنانییەکان باوەڕیانوابوو کە تەنانەت خواکان لە ناو خۆیاندا لە زۆران و ململانێدان، ئەوان لەگەڵ مرۆڤەکاندا لە زۆران و ململانێدان، مرۆڤەکان لە ناوخۆیاندا ویستی جیاوازو بەرژەوەندیی جیاوازیان هەیە و هەمیشە ئەوکەسە دەیباتەوە کە بەهێزترە، نەك ئەوکەسەی کە لەبارتر و گونجاوتر و باشتر یان عەقڵدۆستترە، بەڵام لە هـزری ئیسلامییدا هەمیشە خوای پەروەردگار لە ڕێگەی قورئانی پیرۆز

و فەرموودەی پێغەمبەرەوە(درودی خوای لەسەر) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ الحجرات: ١٣. هەمیشە ئەوکەسە ڕێزی زیاترە کە خاوەنی تەقوای زیاتر بێت، زیاتر مافەکان بپارێزێت، زیاتر پەیوەستبێت بەو سنورانەوە کە خوای پەروەردگار دیاریکردووە.

ئەوعەقڵیەتەی کە لە خۆرئاواییدا هەیە هەمیشە عەقڵیەتێکی پەراوێزخستنە، ئەم عەقڵیەتە هەرگیز نەیتوانیوە و ناتوانێت بیرۆکەی یەکتاپەرستی و تەوحید، بیرۆکەی یەکخستن و بەیەکچاوسەیرکردنی مرۆڤەکان پیادەبکات، تەنانەت بیری مەسیحی و بیری یەهودی بەتەواوی لە یەك دوورو ناتەبان، هەرچەندە لە بەشێك لە مێژوودا هاوبەشن و بەشێك لە ئەدەبیاتی یەهودی تێکەڵ بەئەدەبیاتی مەسیحی بووە و ڕیشەی هاوبەشیان هەیە، بەڵام ئەو وێنەیەی کەسێکی یەهودی بۆ خودا هەیەتی، خودایەکی تایبەتە بەخۆیان، لەگەڵ ئەو وێنەکردنەی کە مەسیحی بۆ خودا هەیەتی، بەتەواوی جیاوازن لە یەکتری، ئالێرەدا سەنترالیزمێك هەیە پێیدەوترێت (مەرکەزیەتی خۆرئاوایی لە بیرۆکە و هەڵس و کەوتدا)، باسی چەمکی هاووڵاتی دەکرێت، بەڵام هەر لە کۆنەوە یۆنانییەکان و دواتریش ئەوانەی ئێستا هەمیشە خۆیانیان بەهاووڵاتی پلەیەك زانیوە و خەڵکی تریان بەپلەدوو زانیوە، ئەگەر بەڕواڵەت لە هەندێك یاساو دەستورداو لە هەندێك تواناو ئیمکانیات و خۆشگوزەرانیدا ئەو مەجالەیان بەئەویتردابێت، بەڵام کە دێینەسەر مەسەلە جومگەییەکان، بەهیچ شێوەیەك ناتوانن قبوڵی ئەویتر بکەن،

تەنانەت ئێستا سەرۆكێكی وەك (ئۆباما) كە سەرۆكی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكایە بەحاڵەتێكی سەیر لێیدەڕوانن، وەك دەرچوونبێت لە یاسایەك تەماشای دەكەن، چونكە ئەم پیاوە خاوەنی ڕیشەو بنەمایەكی نائەمەریكی و، ئەفەریقییە و باوكیی مسوڵمانبووە، خۆشەویستی بۆ شارستانیەتێكیتر هەیە، لەبەر ئەوە بۆ ماوەیەكی زۆر و ئێستاش گەلێك لە ئەمەریكییەكان دەیانوت شایستەی ئەوە نییە ئۆباما سەرۆكی ئەمەریكا بێت و هەندێكیش لە ڕەگەزپەرستەكان بە سەرۆكێكی ناشەرعییان دەزانی. ئەمە بابەتێكی زۆر گرنگە كە دەبێت ئێمە ئاگامان لێیبێت.

هەربیرۆكەی خۆرئاوایی بوو كە سیفەتی پیرۆزی دەدا بەدەستەڵاتدارەكان، سیفەتی خوایەتییان دەدا بەئیمپراتۆرەكان و لە ڕێگەی ئەوانەوە ئەم بیرۆكەیە گوازرایەوە بۆ خۆرهەڵات، كەواتە بابەتی ململانێیەكە لە بیری خۆرئاوادا جێگیربووە، ئەو زۆرانبازییە تەنانەت لە نێوان خوداكان لە ناوخۆیاندا، لە ناو ئەو بتانەی كە دەیانپەرستن و كردبوویانن بەڕەمزی پیرۆزی، تەنانەت ململانێی ئەوان لەگەڵ مرۆڤـ بۆ خۆی ئەوە دەسەلمێنێت بەشێوەیەك تەماشای مرۆڤیتر بكەن كە شێوازی دورخستنەوە و پەراوێزخستنە.

فەلسەفەی هـزری ململانێیی لە ڕاستیدا لە دەستپێكی بیرو ئەزموونی خۆرئاوادا لە بواری سیاسی و ئابوری و چینایەتییدا ڕەنگیداوەتەوە، تەنانەت لە ناو خێزانیشدا ڕەنگیداوەتەوە، ئەوان هەموو شتێك بەزۆران و ململانێ تەفسیردەكەن، پێیانوایە ئەم زۆران و

ململانێیە تەفسیری هەموو خودایەك بێت، تەفسیری هەموو گوتەزایەکبێت، لەبەرئەوە ئێمە بڕوامان بەوە هەبێت مرۆڤەکان هەمیشە لە حاڵەتی دژایەتی و ململانێدان، کەواتە دەبێت باوەڕمان هەبێت ئەم ململانێیە هەمیشە ئەنجامەکەی بریتییدەبێت لە بوونی سەرکەوتوویەك لەگەڵ دۆڕاوێك، یان بوونی کۆمەڵێك کەسی سەرکەوتوو لەگەڵ کۆمەڵێك کەسی دۆڕاو و بەزیودا، لەم جۆرە دۆخانەشدا ئەوەی کە بابەتەکە یەکلاییدەکاتەوە بریتییە لە هێز نەك عەقڵ، بریتییە لە دەستەڵات نەك چارەسەرو قازانج بۆمرۆڤەکان. دەبینیت چۆن لە پێناوی ئەم فەلسەفەیەدا ئەوەی پێیبوترێت ئەخلاق و بەهاو بایەخە مرۆڤایەتییەکان و پرانسیپ هەمووی ژێرپێدەکەون و وەك لەمپەر حسابیان بۆ دەکرێت و دەبێت لەناو بچن، لە پێناوی ئەوەی ئەم فەلسەفە خۆرئاواییە بۆ ژیان، ئەم تێگەیشتنە خۆرئاواییە بۆ پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان سەربکەوێت، دەبێت ئەوەی لایەنی رەوشتییە لە ناو کۆمەڵگە مسوڵمانەکاندا لاوازبێت و خێزان هەڵوەشێت، پەیوەندییە ڕۆحی و مەعنەوییەکان نەمێنێت، ئاین ببێت بەکۆمەڵێك ڕەمزو نیشانەی رووکەش و بریتییبێت لە کۆمەڵێك مزگەوت و کۆمەڵێك کەسی نوێژخوێن، کەسانێك کە ڕواڵەتی ئیسلامییان هەبێت، بەڵام لە ناخەوە کەسانی وێران بن، کەسانێك بن وەك داشی دامە کایەیان پێبکرێت و لە ئەنجامدا گەندەڵی بڵاودەبێتەوە، کە گەندەڵی و خراپەکاری بڵاوبوویەوە، پەرەدەدرێت بەو زۆرانبازی و

ململانێی یەکترڕەتکردنەوەیە، ئیتر ڕێگە خۆشدەبێت بۆ فەلسەفە ئیلحادییەکانی دیکە، بۆ فەلسەفەی (مەکیاڤیلی[1])، کە هەمووشتێك بەڕەوا دەزانێت بۆ گەیشتن بەئامانج، بۆ فەلسەفەی (پراگماتی) کە باوەڕی تەنها بەو فیکرە هەیە کە سوودێکی دیار و بەرچاوی هەبێت، لەبەر ئەوە ئەگەر لە کابرایەکی پراگماتی بپرسیت بڕوات بەخودا هەیە؟ دەڵێت ئەگەر سوودی هەیە بڕوام پێیـهەیە، سوودیشی بۆمنەبێت باوەڕم پێیـنییە! بەهەمانشێوە هەموو ئەو کارە پڕبەهایانەی کە لە ژیاندا هەن ئەوان تەنها باوەڕیان بەسوودە دیار و بەرچاوەکەی هەیە و مەعنەویات بەبێسوود دەزانن.

ئەوەی کە پێویستە ئێمە بیزانین کاتێك کە فەلسفەیەك، بیروبۆچوونێك، شارستانییەت و ژیارێك، لەسەر ئەمە دامەزرا کە بەرژەوەندی لە چیدابێت، بکرێت، با ناڕەوا و نامرۆڤانەش بێت، کاتێك کەوابوو هەڵوێستەکان لەسەر ئەو بنەمایە دیاریدەکرێن، هەڵوێست دژ بەدەنگی جیاواز و ڕەنگی جیاواز وەردەگیرێت، دەیانەوێت ئەوکەسەی کە بیروبۆچوونی جیاوازە دووربخرێتەوە و بڕیاری بەدەست نەبێت، تەنانەت بوونی نەبێت، لە ناو کۆمەڵگەدا بەرجەستەنەبێت، کاتێك کە ئەم فەلسەفەیە دێتە ووڵاتێکەوە و کاری پێدەکرێت و ڕەنگدەداتەوە و ڕەواجی پێدەدرێت، ئیتر پێویستە هەموو دەنگوڕەنگەکان کورتبکرێنەوە لە ڕەنگو دەنگێکدا کە سەردەستەیە و باقی دەنگەکان

---

[1] ـ ماکیاڤیلی ئیتالی: ١٤٦٩ ـ ١٥٢٧ ز)، نووسەری پەرتووکی (میر)ی بەناوبانگ کە وەرگێڕراوە بۆ کوردیش.

دەبێت کپ بکرێن ومافی بوونیان نەبێت. بەڵام لە فیکری ئیسلامییدا ـ وەك لە سەرەتاوە باسمانکرد ـ تەنانەت ئەو وتە و بۆچوونەش کە لاوازبێت، هەر تۆمار کراوە و حسابی بۆ کراوە، کێ دەڵێت ڕۆژێك لە ڕۆژان بەڵگەی لەسەر نابێت و نابێت بەبۆچوونی زۆرپەسەند؟

کەواتە بیروبۆچوون و فەلسفەی خۆرئاوایی بۆ ململانێ و زۆرانبازی، هەڵوێستێکی زۆر دیاریکراوە و ڕۆشنبیری و کەلتورێکیش کە لەو فەلسفەفەیەوە سەرچاوەی گرتبێت، فەلسەفەیەکە باوەڕی تەنها بەمەرکەزییەت هەیە، تەنها باوەڕی بەخۆی هەیە، تەنها باوەڕی بەمن و بەمن من و بەخۆپەرستی هەیە، تەنها باوەڕی بەو کەسە هەیە کە هەمیشە سەردەکەوێت، باوەڕی بەو هێزە هەیە کە لە سەرووی هێزەکانەوەیە، ئەوکەسەی کە سەرکەوتووە هەموو شتێك و هەموو بەرژەوەندییەکان دەبات بۆ خۆی، وەك ئەوەی کە دوای جەنگی جیهانی دووەم ئەو لایەنەی کە بەهەمووشێوەیەك سەرکەوت لە ڕووی سیاسیو سەربازی و ئابورییەوە کە بریتییبوو لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بنکەی سەرەکیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی بردە ئەمەریکا، ئێستاش ئەو ڕێکخراوە جیهانییە هەر لە ئەمەریکایە، هەروەها ئەنجومەنی ئاسایش لە ئەمەریکایە، خەڵك بەشێوەیەکی سیاسی هەموویان ڕوویان لە ئەمەریکایە، چونکە ئەوسەرکەوت و ئیتر قسە قسەی ئەوە و ماف مافی ئەوە، کەواتە بەپێی ئەم لۆژیکە بێت ئەوکەسەی شەقی هەبێت حەقیشی هەیە، ئەوکەسەش شەقی نەبێت حەقی نییە! لەبەرئەوە هەموو مێژووەکان دەبێت لەوێدا کۆتاییان

پێبهێنرێت و هەموو ئامانجەکان دەبێت لەو ئامانجەدا پوختبکرێنەوە کە سەرکەوتوو بۆ خۆی بڕیاریدراوە.

ئەم مەرکەزیبیەتە وەك حاڵەتێکی دەروونی وایە بۆ کەسانی خۆرئاوایی بەگشتی و بۆ تاکی ئەمەریکی بەتایبەت، کە دەبێت مرۆڤەکان بەچاویلکەی ئەوان سەیری جیهان بکەن و لە فیلتەرەکانی ئەوەوە متمانە و باوەڕ پەیدابکەن، کە ئەمەش لە ڕاستیدا ستەمێکی گەورەیە کە لە باقی شارستانییەتەکان دەکرێت و نەخوێندنەوەی شارستانییەتەکانی دیکەیە. لە پەیماننامە نێودەوڵەتییەکاندا ئەمەریکا بۆ خۆی فشار دەخاتە سەر وولاّتان بۆ ئەوەی ئیمزای بکەن، بەلاّم خۆی ئیمزای ناکات، وەك ئەوەی کە بینیمان لە ڕێککەوتننامەی (سیداو ـ CIDAW[1])دا کە باس لە هەندێك بێبەندوباری کرا سەبارەت بەئافرەت و مەسەلەکانی (جێندەر)، خەڵکی هاندەدا بۆ ئەوەی ئیمزای بکەن بەلاّم خۆی ئامادەنەبوو ئیمزای بکات و ڕێزی لێبگرێت، ئەمەش سیاسەتێك دروستدەکات لە ئاستی نێودەوڵەتییدا پێیدەوترێت: سیاسەتی (بانێكو چەندهەوا)، لەبەرئەوەی خۆی بڕیاردەرەو قەڵەم و یاسا بەدەستی خۆیەتی، ئەو شتەی کە ئەو بەڕەوای دەزانێت دەبێت بەڕەوا، بالەڕاستییشدا ناڕەوابێت، ئەوشتەی ئەو بە ناڕەوای دەزانێت دەبێتە ڕەوا بالەڕاستییشدا ناڕەوابێت، ئەودەبێت بەپێوەری پێشکەوتن و دواکەوتن و سەرکەوتن و ژێرکەوتن و شارستانیەتی و نەبوونی

---

[1] ـ لە ١٨ی کانوونی یەکەم ١٩٧٨دا لە نیویۆرك لە ڕێکخراوی گشتی نەتەوە یەگرتووەکان بەسترا و باس لە مافەکانی ئافرەت دەکات.

شارستانیەت...هتد، تەنانە باس لەوەدەکات دەستکاریی بەرنامەکانی خوێندن لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا بکرێت، دیارە ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز بڕیاریداوە: ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ﴾ القصص:٥. یان دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ﴾ الحج:٤١. واتە: مسوڵمانان گەر تواناو دەستەڵات پەیدابکەن لە شوێنێکدا، نایانەوێت خێروخۆشیی ئەو شوێنە تەنها بۆ خۆیان بێت، ئەوەبوو کاتێك کە عەرەبە مسوڵمانەکان هاتن فتوحاتی ئەم وڵاتانەیان کرد لە کوردستانەوە تا چینگیانگ (تورکستانی چین)، لەولاشەوە هەتا دەگاتە زەریای ئەتڵەس، خەڵکانی ئەو وڵاتانە باوەشیان بۆ ئیسلام کردەوە و بۆ خۆیان بوون بەپێشەوا، لەبەرئەوە (ئەبو حەنیفە) و (ئەبو عەلی سینا) و (پێشەوا غەزالی) و (پێشەوای حەرەمەینی جوینی[1]) دروستبوون، ئەم زاتەی کۆتایی، واتە (پێشەوای حەرەمەینی جوینی) کەسێك بوو لە نەیسابورەوە هات چوارساڵ ئیمامی مەککە و مەدینە بوو، ئێستاش چاکترین کتێب لە فیقهی شافعییدا ئەو کتێبەیە کە ئەو دایناوە: (نهاية المطلب في دراية المذهب). بەڵام ئێمە دەبینین لە ئەنجامی بوونی ئەم فەلسەفە و ئەم ململانێ خۆرئاواییەدا، نموونەیەك، دەبێت بەگەورەترین و باشترین نموونە و سیفەتێکی شارستانی هەیە، جگەلەوەش لە کەسێکیتریشدا قبوڵی ناکات، واتە ئەگەر مسوڵمانێك

---

[1] ـ امام الحرمين(١٠٢٨ ـ ١٠٨٥ز ) پێشەوا لە تەفسیر و عەقیدە و تەسەووف و فیقهدا، خاوەنی گەلێك نووسینی کەموێنەیە.

بشبێت بەئەمەریکی بتوانێت بەپلەکانی دەستەڵاتدا بڕوات، دەبێت بەهەڵاوێرد لە یاساکەدا و شتێکی سەیروسەمەرە ڕوودەدات، بەڵام لە یاسای ئیسلامیو هـزری ئیسلامییدا شتی وەها نییە، کەواتە لە ڕاستیدا فەلسەفەی ململانێ و بەرگری لە هـزری خۆرئاوادا لەسەر بنەمای لە سەرکارلابردن و خستنە شوێنی کەسانیتر دانراوە، پێیانوایە دەبێت هەموو هـزرو زانست و توانایەك لە پێناوی ئەو پڕۆژە غەربییەدا تەیاربکرێت و بەکاربهێنرێت، یاخود نابێت هیچ پڕۆژەیەکیتر مافی بوون و مافی کارپێکردنی هەبێت، لەبەرئەوە دەبینین لە ڕووی دەرونیو ڕاگەیاندنیشەوە جەنگی کەسانی جگە لە خۆیان دەکەن. ڕەنگە لە ڕاستیدا هەندێك لەو کەمتەرخەمییە یان ئەو (هەستبەلێپرسراوینەکردنە)ی لە ناو کۆمەڵگە مسوڵمانەکان یان کۆمەڵگا خۆرهەڵاتییەکان یان کەسانی هەڵگری ئەم پەیامە ئاینەدایە، ڕێگەخۆشکەربێت بۆ ئەوەی ئەم فەلسەفەی ململانێیە، فەلسەفەی باوی سەردەم بێت. مسوڵمان لە ناخەوە هەست بەدۆڕان و شکست بکات، مسوڵمانان تووشی ئەو بڕوایە بکەن کە ناتوانن بەربەرەکانێ بکەن لەگەڵ ئەو فەلسەفە ململانێخوازەی لە خۆرئاوادایە، بەڵام ئەگەرئێمە بەخۆماندا بچینەوە تەماشای (بەور)ـەکانی باشوری خۆرهەڵاتی ئاسیا بکەین، تەماشای وولاتێکی وەك یابان، چین، کۆریای باشور، قازاخستان بکەین، ئەو وولاتانەی کە لە خەو بێداربوونەتەوە و وازیان لە سستی و تەمبەڵی هێناوە، تەماشای کردەوەکان و کارنامەی ساڵانەی زانکۆو پەیمانگەکانیان بکەین، تەماشای هەوڵو تێکۆشانی ئەو خەڵکە بکەین

که لەو وولاّتانەدایە، بۆماندەردەکەوێت پێشکەوتنی خۆرئاوا تەنها ڕووکەشی بابەتەکەیە و قۆناغێکە لە قۆناغەکانی مرۆڤایەتی نەك قەدەری مرۆڤایەتی بێت.

جا لەبەرئەوە ئێمە زۆر پێویستمان بەوە هەیە هەر لە ڕوانگەی ئەو ئایەتەوە کە باسمانکرد، ﴿وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ﴾ القصص:٥، لە ڕوانگەی ئەو ئایەتەوە جەخت لەسەر ئەوەبکەینەوە کە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا و لە ڕوانگەی هـزری ئیسلامییدا زۆر گرنگە ئێمە نرخو بایەخ بگێڕینەوە بۆ مرۆڤـ و توانای عەقڵی مرۆڤـ، هەروەها پێمانوابێت ئەو مرۆڤە زۆر شتی لەباردایە کە بتوانێت چاری بکات، هەموو پارێزگارییەکی کەسێتی و دەروونی بۆ بەکاربهێنین، چونکە دەبێت پێمانوابێت ئەم مرۆڤە زۆری لە توانادایە و دەتوانێت بیکات و هێشتا ئەنجامی نەداوە، بەدرێژایی مێژووی ئیسلامیش بیرمەندان و زانایانی مسوڵمان کاریان لەسەر ئەوەکردووە کە مرۆڤـ هەستبکات بەتواناو بایەخی خۆی، بەتوانای خۆی، بەو ڕێگەپێدراوانەی کە ئەنجامی دەدات و ئاگاشی لەوەبێت ئەم سەرزەوییە بۆ هەموو مرۆڤەکانە، بەبیروبۆچوونە جیاوازەکانەوە و بەعەقڵیەتە جیاوازەکانەوە، بەلاّم هەمیشە ئەو پێوانەیە هەیە کێ سوودبەخشترە؟ کێ بەهرەمەندترە؟ کێ دڵسۆزیی پتری بۆ مرۆڤایەتی هەیە؟ کێ سنورەکانی خۆی باشتر دەزانێت؟....هتد. ئەو کەسە مافی سەرکردایەتی و سەرۆکایەتی هەیە، مافی سەرۆکایەتی هەیە لە هەموو دوانگەکاندا، لە دوانگە یاسایی و کۆمەلاّیەتییەکاندا و لە دوانگە

سیاسییەکاندا.. ئەگەر وانەبێت دەبێت خۆمان رادەستی ئەو قەدەرەبکەین کە دەیەوێت خۆرئاوا بکات بەو نموونەیەی کە بە هەموو شێوەیەك دوای بکەوین و بەباش و خراپی هەڵپەڕین، بەباشو خراپی سەرسامبین، نەك تەنها تەکنەلۆجیاکەی وەربگرین، تەنانەت دابونەریت و هـزرو هەڵسوکەوتیشیان وەربگرین، ئەمەش ئەو مەترسییەیە کە بەڕاستی زاناکانی ئیسلام لە کۆنەوە خەڵکیان لێ ورياکردووەتەوە.

یەکێکی وەك (رفاعة رافع طنطاوي[1]) کە چووەتە فەرەنسا لەوێ هەستیکردووە کە زۆر لایەنی باش لە خەڵکی فەرەنسادا هەیە کە ئێمە سوودی لێوەربگرین، وەك لایەنی پەروەردەو خوێندن و گرنگیدان بەپسپۆڕییە جیاوازەکان و تێگەیشتن لە سروشت، تێگەیشتن لە مرۆڤـ، تێگەیشتن لە ڕێکخستنی ڕۆژانەی خەڵك، لە هەمانکاتدا وتوویەتی: پێویستە ئاگاداربین شوناسو پێناسی خۆمان بپارێزین و ئاگامان لە خۆمان بێت و ئاگامان لە نەوەکانی داهاتووبێت، ئاگامان لە زمانی نەتەوایەتییمان بێت...هتد، لەسەر ئەوبنەمایە ئێمە دەتوانین بەدڵنیاییەوە سەیری دواڕۆژ بکەین و پێمانوابێت ئەو ململانێیە تەنها ململانێیەکی هـزرییە و (والبقاء للأصلح) (مانەوە بۆ ئەو کەسەیە کە چاکسازترە)، (والبقاء للأنفع) (مانەوە بۆ ئەو کەسەیە کە سوودبەخشترە).

---

[1] - رفاعة الطهطاوي(١٨٠١ ـ ١٨٧٣) زانا بە شەریعەتی ئیسلامی و یەکێك لە رابەرانی رێنیسانسی زانستیی میسری و دامەزرێنەری یەکەمین قوتابخانەی زمانەکان لە میسر کە بووەهۆی وەرگێڕانی گەلێك پەرتووکی بەسوود لە فەرەنسی و زمانەکانیترەوە بۆ عەرەبی.

بێگومان باسەکە، باسێکی زۆر گرنگە و پەیوەندیی هەیە بە ژیانی هەموومانەوە و پێویستە کە هەموو تاکێکی ئەم وولاتە بەخۆیدا بچێتەوە، چونکە ئێستا لە هەموو دونیادا مەترسییەکی گەورە لە جیهانگیری پەیدابووە، بریتییە لەوەی هەموو میللەتێك ترسی ئەوەی هەیە کە شوناسە مێژووییەکەی بسڕدرێتەوە، لەبەرئەوە بەهەموو شێوەیەك دەستیگرتووە بەڕابردووی خۆیەوە، دەستیگرتووە بەدروشمەکانی ڕابردووی خۆیەوە، بەئەدیبان و شارەزایان و زاناو پاڵەوانەکانییەوە، تا بتوانێت لە بەرامبەر ئەم شەپۆلی جیهانگیرییەدا بەرگری بکات و زەمانەتی ڕۆژێکی ڕوناکو داهاتوویەك بۆ خۆی بکات....

# ئۆپۆزسیۆن لە فیقهی ئیسلامییدا

ئەگەر ئێمە بە وردیی تەماشای ئایەتەکانی قورئان و فەرمودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) بکەین دەزانین مرۆڤـ چەند بەرپرسیارێتییەکی گەورەی لەسەر شانە و چەند لێپرسراوێتییەکی گەورەی گرتووەتەئەستۆ، کاتێك دەچێتە ناو بازنەی ئیسلامەوە و بڕیاری مسوڵمانبوون و پابەندبوون بەفەرمانەکانی ئیسلام دەدات، ئەوسا بایەخ‌و گرنگیی ئۆپۆزسیۆنبوون وەك هەڵوێستێکی سیاسی و یاسایی دەردەکەوێت بۆمان، نەك تەنها گرنگیی ئۆپۆزسیۆن، بەڵکو ئەدەبیات و شێوازی چۆنێتی بەڕێوەبردنی ئەم پرۆسەیە لەناو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو لەناو فەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خوای لەسەر) و لەناو پەرتووکە فیقهی و کەلامیی و عەقیدەییەکاندا و ئەو نوسینانەی کە زۆر بەوردیی ئاماژە بۆ ئەم چەمکە دەکەن، بۆمان دیاریکراوە، خودی ئۆپۆزسیۆنبوون بەناو چەمکێکی نوێیە و تازە پێی ئاشنابووین، یاخود تازەکی خەریکین مومارەسەی دەکەین لە کایەی سیاسیی ڕۆژانەماندا، وەك چەمکێکی سیاسی تازە بووەتە چەمکێك کە بیرمەندان و ڕۆشنبیران لە وڵاتەکەماندا قسەوباسی لەسەردەکەن، یاخود سیاسییەکانمان گرنگی پێدەدەن، لە حاڵێکدا ئەم چەمکە لە قورئانی پیرۆزدا پێیدەوترێت

(الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر)، له ئەدەبیاتی ئیسلامییدا له سەردەمی پێغەمبەری خواوە(د.خ) تا دواهەمین سەردەمەکانی زێڕینی ئیسلام بابەتی فەرمان بەچاکەو ڕێگری له خراپە وەك بنەمایەکی گرنگ له بنەماکانی ئیسلام باسکراوە و ئاماژەی پێدراوە، خوای پەروەردگار له سورەتی (العصر)دا دەفەرموێت ﴿وَالْعَصْرِ۝ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ۝ إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ العصر:١– ٣.

ئەم سورەتە بە ووشەکورت و ، بەمانا گرنگو گەورەیە، هێڵی سەرەکی ئۆپۆزسیۆنمان لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامییدا بۆ دیاریدەکات.

بەوەدا دەزانین مەسەلەکە پەیوەندیی بە ئۆپۆزسیۆنەوە هەیە، چونکە باسی مرۆڤ دەکات، مرۆڤ کە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە بەبێ کۆمەڵایەتیبوون ناتوانێت درێژە بەژیانی خۆیو ناتوانێت درێژە بەئەرکی کۆمەڵایەتی خۆی بدات، لەم سورەتەدا بووە بەبابەتی حوکمی شەرعی، کاتێك خوای پەروەردگار سوێند بەسەردەم دەخوات گرنگی کاتمان بۆ دەردەخات، گرنگیی کات له پرۆسەی بنیاتنانی کۆمەڵگادا چونکە ئەگەر مرۆڤەکان بەهەند سەیری کات نەکەن و بەگرنگییەوە بۆی نەڕوانن و حسابی بۆنەکەن له بەرنامەی ژیانی خۆیاندا، دیارە هەرهەموویان تووشی زیان دەبن کاتێك بیردەکەنەوە سەیردەکەن سەرمایەی تەمەنیان بەسەرچووە و ئەو سەرمایە گەورەیەیان بەفیڕۆداوە کە فەرموی: ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ﴾ العصر:٢.

واتە: بەڕاستی هەموو مرۆڤەکان بەبێ ڕەچاوکردنی ئینتیمای سیاسی و فیکری، یاخود بەڕەچاونەکردنی ئینتیمای سیاسی و فیکری، هەموو مرۆڤێك بەگشتی لە زیاندایە بێجگە لەم جۆرە مرۆڤانەی کە خوای پەروەردگار باسەکانیمان بۆ دەکات و دەفەرموێت:﴿إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ العصر: ٣. جگەلەوانە کە باوەڕیان هەیە، ئیمانێك گەیشتووەتە قۆناغێك کە دڵنیان لە بوون و ژیان، دڵنیان لەوەی کە ئەم جیهانەو ئەم ژیانە خاوەنێکی هەیە. جگەلەوانەی کە کردەوەی باش ئەنجامدەدەن، واتە کردەوەی باش دەبێت دروشمی هەموو کەسەکان بێت، دەربارەی کردەوەی باشیش پێغەمبەری خوا(د.خ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت (البر حسن الخلق والإثم ماحاك في صدرك وكرهت أن يطلع عليه الناس)، زۆر بەجوانی ڕوونیکردووەتەوە، لە شوێنێکیتردا دەفەرموێت (دع مايريبك إلى ما لا يريبك)، واتە: هەر شتێك کە لە دڵتدا گومانت هەیە بەرامبەری دەبێت وازی لێبهێنیت بۆ ئەوشتەی کە گومانت بۆ دروست ناکات، کەواتە کردەوەی چاك ئەو کردەوەیەیە کە مرۆڤەکان یاخود باوەڕداران، زۆرینەی باوەڕداران، بتوانن دانی پێدابنێین، کەواتە کردەوەی چاك دروشمی ژیانی مرۆڤ بێت لە هەموو ئاستێکدا، دەبێت مرۆڤ بیر لە کردەوەی چاك بکاتەوە و بڕیاری کردەوەی چاك بدات، چ وەك تاك چ وەك کۆمەڵگە و دەستەو تاقم، چ وەك چینی دەستەڵاتدار یان ئەوکەسانەی کە لە دەستەڵاتدا نین، کەواتە هەموو مرۆڤەکان دەبێت ئاگایان لەوەبێت کردەوەی باش ئەنجامبدەن، بەڵام بەرزونزمیی ئەم ژیانە و تەپوتۆزی ڕێگای ژیان و ئاڵۆزییەکانی کە ڕووبەڕووی

مرۆڤەکان دەبێتەوە، بووە بەهۆکاری ئەوەی کەمرۆڤـ هەمیشە نەتوانێت کردەوەی چاك ئەنجامبدات، جاروبار کردەوەی باشی لە بیردەچێت وجاروبار کردەوەی چاکی بۆ ئەنجامنادرێت و کۆسپی بۆ دروست دەبێت، یان لە خودی زاتی خۆیدا قابیلیەتی ئەوەی نییە کردەوەی چاك ئەنجامبدات، لەبەرئەوە دەکەونە هەڵەوە.

زۆر سروشتییە مرۆڤەکان بکەونە هەڵەوە، زۆر سروشتییە مرۆڤەکان تاوانیش بکەن، خراپەش بکەن، تەنانەت گەندەڵیش بن، بەڵام لێرەدا ئەرکی سەرشانی کۆمەڵگە و زانایان و ئەرکی سەرشانی ڕۆشنبیرانە، ئەرکی سەرشانی قەڵەمبەدەستانی ناو کۆمەڵگەیە کە هەمیشە یەکتری ڕابسپێرن لەسەر چاکەکردن و پەیڕەویکردن لە ڕاستی، لە بڕگەی تەواوی﴿وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ﴾ العصر:٣. واتە: لەناو خۆیاندا وەسیەتدەکەن پاراستنی ماف بەوشێوەی کە پێویستە، چەمك و ناوەرۆکی سیاسییمان بۆ دەپێوێت، واتە کاری ئۆپۆزسیۆنی سیاسی ئەوەیە، لەوەش پتر نییە کە ئایەتەکە ئاماژەی پێدەکات و جەختی لەسەر دەکاتەوە و دەیکات بەهۆکاری ڕزگاربوون، واتە کاتێك لەناو کۆمەڵگەدا کۆمەڵێك هەبن کە شارەزای راستی بن و بیری یەکدی بهێننەوە، ئەوە پێیدەوترێت ئۆپۆزسیۆنی سیاسی، بەڵام جاری واهەیە ئەم ئۆپۆزسیۆنە سیاسییە ڕەنگە بەتەواوی مەبەستەکە نەپێکێت، دەستەڵاتێکی دیکتاتۆر لەبەرامبەر ئۆپۆزسیۆنی سیاسییەوە خۆی دەنوێنێت و هەموو دەرفەتەکانی لێدەگرێت و هەموو دەرفەتەکانی مومارەسەی ئۆپۆزسیۆنبوونی لێدەگرێت و نایەڵێت بۆ خەڵکی بدوێت، نایەڵێت

بەرنامەو پرۆژەیان هەبێت بۆ چارەسەرکردن و چاکسازی، لەبەرئەوە قۆناغێکیتر دەستپێدەکات لە ژیانی سیاسی خەڵکدا کە سیاسەتمەداران پێیدەڵێن: (ڕووبەڕووبوونەوەی سیاسی)، واتە کاتێك دەسەڵاتی دیکتاتۆری ڕێگەنادات ئۆپۆزسیۆنی سیاسی و ئۆپۆزسیۆنی نەرمونیان ڕۆڵی هەبێت، فەرمان بەچاکە و نەهی لە خراپە ڕۆڵی هەبێت، یاخود کاتێك ئۆپۆزسیۆنی سیاسی هەموو ڕێگاکان دەگرێتەبەر بۆ ڕاستکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی، بەڵام دەسەڵاتی سیاسی هەرئامادەنییە لە ژێرباری یاسادا بێت و لە چوارچێوەی دەستوردا بێت، ئامادەنییە گەلو جەماوەر چاودێریی لەسەر دابنێن، لەوحاڵەتەدا قۆناغێکیتری نەویستراو بەڵام قۆناغێکی گرنگ پەیدادەبێت، کە پێیدەوترێت ڕووبەڕووبوونەوەی سیاسی، ئەمەش لەو برگەدا دەردەکەوێت کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ العصر: ٣. واتە: باوەڕداران دەگەنە قۆناغێك کە ئۆپۆزسیۆن ناتوانێت کارەکانی خۆی بکاتۆ فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە بکات، ناتوانێت چارەسەر پێشکەش بکات، لەو قۆناغەدا دەبێت ڕوبەڕوو ببێتەوە بەشێوەیەکی سیاسی، دەبێت ئۆپۆزسیۆن دەستبکات بەیاخیبوون، یاخی بێت لەو دەسەڵاتە دیکتاتۆری و پاوەنخوازە کە ڕێگا لە باوەڕداران دەگرێت کە چارەسەری دۆخی ناجێگیرو ئالۆزی وڵات بکەن، هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ال عمران:١٠٤. واتە: دەبێت هەمیشە لە کۆمەڵگەی

مسوڵماندا کەسانێك هەبن کە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە بکەن، بەڵام فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپەش پێویستیی بەشارەزایی هەیە، واتە کاتێك کە من دەمەوێت فەرمان بە چاکە بکەم دەبێت چاکە بناسم، کاتێك دەمەوێت ڕێگری لە خراپە بکەم دەبێت خراپە بناسم و بتوانم پێوەرێکم هەبێت کە چاکە و خراپە جیابکەمەوە، ئەو پێوەرەش بریتییە لە شەریعەت.

ئەم دەستەواژەیە کە لە ڕووی ئاشتییەوە دەستەواژەیەکی زۆر میانڕەوە: ئۆپۆزسیۆن، واتە لە هـزری ئیسلامییدا ــ وەك لە زۆربەی کتێبەکاندا باسکراوە ــ دەڵێت فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە ئەو مەرجەی بۆ دانراوە کە نەگاتەئاژاوە و خوێنی تێدا نەڕێژرێت، واتە مسوڵمانان بەناوی فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپەوە یەکتر تێکنەشکێنن، واتە بەشێوازێکی دروست و ئاشتییانە و دۆستانەو نەرمونیان بتوانن ڕەخنە لە یەکتربگرن، پێشەوا عومەر (ر.خ) دەیفەرموو (رحم الله امرأ أهدى إلي عيوبي) واتە خوا لەو کەسە خۆشبێت کە ناتەواوییەکانی خۆمم پێڕادەگەیەنێت و وەك دیارییەك پێشکەشمی دەکات، (ئەبوبەکری سددیق) (ر.خ) کاتێك بوو بەجێنشینی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) ڕوویکردە جەماوەرو فەرمووی (إني وليت عليكم ولست بخيركم)، من کراوم بەسەرپەرشتیاری ئێوە، بەڵام مەرج نییە کە چاکترین کەسی ناوئێوە بم، لەناو ئێوەدا هەیە لە من چاکترە، بەڵام فەرمووی (فإن أحسنت فأعينوني) ئەگەر لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەستەڵاتدا ڕێگەی باشم گرت (فأعينوني) یارمەتیدەرم بن،

(وان أخطأت فقوّموني)، بەڵام ئەگەر هەڵەشمکرد ڕاستمبکەنەوە، ئەم قسەیەی لەگەڵ تاك بەتاکی مسوڵمانانی سەردەمی خۆی بوو، واتە لێپرسراوییەتەکەی خستەسەرشانی یەکبەیەکی مسوڵمانان، هەروەها لێپرسراوێتییەکەی خستەسەرشانی کۆی مسوڵمانان، کەواتە دەستەڵاتدار دەبێت بۆ خۆی ئەوەندە گەورەیی تیابێت خۆی داوابکات لە خەڵك کەچاودێربن بەسەریەوە و ئاگاداری هەنگاوەکان و هەڵسوکەوتی بن.

لەبەرئەوە ئەوەی کارێکی چاکی کرد جەماوەرو شارەزایان و دەمڕاستانی خەڵك پشتگیری لێبکات، ئەگەرخراپیشی کرد ڕاستی بکەنەوە نەك بیڕوخێنن، کەواتە ئیشی ئۆپۆزسیۆن لە ڕاستیدا ڕوخاندن و نەهێشتن و لەناوبردنی دەستەڵات نییە، لە ڕاستیدا ڕاستکردنەوەی دەستەڵاتە، لەبەرئەوە دەستەڵات پێویستیی بەئۆپۆزسیۆنەو ئەگەر ئۆپۆزسیۆن نەبێت، پێویستە هەوڵبدات دروستی بکات چونکە هەر ئەبوبەکری سددیق و عومەری کوڕی خەتتاب بوون (ر.خ) دەیانفەرموو بەخەڵك چاکە لە ئێمەدا نییە ئەگەر فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپەی ئێوە نەبیستین،و خێر لە ئێوەشدا نییە ئەگەر فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە نەکەن، واتە هەرکاتێك کۆمەڵگە وەهای لێهات ئامادەنەبوو ڕەخنە بگرێت لە دەستەڵات و ، زانایان و پسپۆڕان و شارەزایان ئامادەنەبوون ڕەخنەبگرن، ئەوە مانای وایە ئەو کۆمەڵگەیە چاکەی تیانەماوە و هەرکاتێك ڕەخنەیانگرت و فەرمان بەچاکە و ڕێگرییان لە خراپە کرد، بەڵام دەستەڵات ئامادەنەبوو گوێیان لێبگرێت، ئەوکاتە

دەستەڵاتەکە چاکەی تیانییە، بەڵام ئەگەر ببێت بەقۆناغێك نە خەڵك ڕەخنەبگرێت و نەدەستەڵات قبوڵی ڕەخنەش بکات، ئەوە ئەو دەوڵەتە دیکتاتۆرییە، کە لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێدەکات و دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ النمل:٣٤.

یاخود ئەو ئایەتەیان بەسەردا دەچەسپێت کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيراً﴾ الإسراء:١٦. واتە هەرکاتێك خوای پەروەردگار بیەوێت، ویستی ئەوەبکات، کە کۆمەڵگەیەك بەرەو هەڵدێر و لەناوچوون بڕوات، کەسانێك دەکات بەدەستەڵاتدار بەسەریانەوە و لە بری ئەوەی خەریکی باشکردنی ژیانی خەڵك بن، خەریکی باشکردنی وەزعی خۆیان دەبن، ئیتر خەڵك ڕوو لە بێبەندوباری دەکەن و ڕوو لە گەندەڵی و خراپە دەکەن، ئەوکاتە خوای پەروەردگار سوننەتی خۆی بەکاردەهێنێت و بەپێی یاسای خۆی ئەو کۆمەڵگەیە بەرەو هەڵدێر دەچێت و لەناو دەچێت، ئەگەر کۆمەڵگە وایلێبێت دەستەڵات قبووڵی ئۆپۆزسیۆن نەکات و ئۆپۆزسیۆن فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە نەکات و جەماوەر نەبێت بەچاودێر بەسەر دەستەڵاتەوە، جیهان دەبێت بەگەندەڵی، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ﴾ الروم:٤١، واتە کاتێك کە گەندەڵی لە کۆمەڵگایەکدا بڵاودەبێتەوە ئەم گەندەڵییە هۆکارەکەی تەنها دەرەکی نییە، هۆکارەکەی تەنها ئەوەنییە کە لە دەرەوە دوژمنیان هەیەو

پیلانیان بۆ دەچنێت، بەڵکو ئەوەیە کە لە ناو خۆیاندا گەندەڵن و کردەوەکانیان گەندەڵی بەرهەمهێناوە، لەبەرئەوە زانامسوڵمانەکان وتوویانە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە واجبی سەرشانی یەك بەیەکی مسوڵمانان و هەموو کۆمەڵگەیە، واتە لە ڕێگەیەکەوە واجبی عەینییە لەسەرشانیان و لەلایەکیشەوە واجبی کیفایەیە لەسەر شانیان.

بەڵام ئەو کەسەی فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە دەکات یان ئۆپۆزسیۆنە، پێویستە لە ڕاستیدا بۆ خۆی بزانێت چۆن ئۆپۆزسیۆن دەبێت و ڕێگاکان بناسێت، واتە شارەزایی هەبێت و زانابێت و بزانێت چی باشەو چی خراپە، چونکە ئەگەر یەکێك نەزانێت باشی و خراپی کامەیە چۆن دەتوانێت ئۆپۆزسیۆن بێت؟ لەبەرئەوە پێویستە هەرلەڕوانگەی ئەم بنەمایەوە کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دایدەنێت، ئەوکەسانەی کە دەبن بەنوێنەری گەل لە هەر ئەنجومەنێکدا، لە ئەنجومەنی شارێکی بچوکەوە تا پەرلەمانی وولاتێكو تا شوێنێکی گەورەو گرنگی وەك ڕێکخراوی نێودەوڵەتی، دەبێت ئەو کەسانە لە ڕاستیدا شارەزاییەکی تەواویان دەربارەی چاکەو خراپە هەبێت، تابتوانن بەکردەوەش ئۆپۆزسیۆن بن نەك ئۆپۆزسیۆنێکی رووکەش....

فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە ئەو ناونیشانە ئیسلامییەیە کە هەم قورئانی پیرۆزو هەم سوننەتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر)و هەم فیقهی ئیسلامی دایناوە بۆ ئەو دەستەواژەی کە ئەمڕۆ پێیدەوترێت ئۆپۆزسیۆن، بەڵام ئێستا بابێین بزانین کاری ئۆپۆزسیۆن چییە؟.

کاری ئۆپۆزسیۆن وەك پەرتووکی (حکم المعارضة في الإسلام) پێناسەی دەکات، بریتییە لە (إنکار رعیة أو بعضها علی الحکومة تصرفا یخالف تشریعات الدولة أو یضر بمصلحتهم)، واتە هەرکاتێك خەڵك توانییان و بڕیاریاندا ڕەخنەبگرن لە حکومەت و لە دەستەڵات، هەرکاتێك ئەو دەستەڵاتە پێچەوانەی دەستوری وولاتەکە جولایەوە یاخود هەڵسوکەوتێکی کرد، کارێکی کرد، پێچەوانەی بەرژەوەندیی گەل بوو، ئەوە پێیدەوترێت ئۆپۆزسیۆن.

(فحقیقتها أمر بالمعروف ونهي عن المنکر) کەواتە ڕاستی و جەوهەری ئۆپۆزسیۆن بریتییە لە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە، واتە ئەو حکومەتە وەك هەر کەسێك بۆی هەیە کاری باشبکات و بۆی هەیە کاری خراپ بکات، بنەمای کارەکەش ئەوەیە، واتە هیچ منەتێکی تیانییە کاتێك کە سەرۆکایەتیو وەزارەتەکان و کابینەی حکومەت و بەڕێوەبەرێتییەکان و فەرمانگەکان....هتد کارەکانیان بەشێوەیەکی یاسایی بەڕێوەدەبەن و خزمەتی خەڵك دەکەن و بەرژەوەندییەکانی وولات دەپارێزن، دەبێت وابن، کێشە ئەوکاتە دروستدەبێت ئەو لایەنانە یان هەندێکیان، کارێك بکەن پێچەوانەی یاساو دژ بە بەرژەوەندیی جەماوەر بێت، ئا لەو حاڵەتەدا دەبێت ئەوجەماوەرە وا پەروەردە کرابێت بەوشێوەی کە ئیسلام پەروەردەی دەکات کە (لاطاعة لمخلوق فی معصیة الخالق) واتە: هیچ کاربەدەستێك ئەومافەی نامێنێت بەسەر ئەو خەڵکەوە کە گوێڕایەڵی بن کاتێك دەبینن ئەو کاربەدەستە پێچەوانەی شەریعەت و یاسای ئیسلام و یاسای وولاتە، ئەمەش

جەوهەری ئۆپۆزسیۆنە، جائەم کارەش جاری واهەیە بەقسەیەك، جاری واهەیە بەنووسینەو، جاری واهەیە بەڕێپێوان، داخستنی بازاڕەکان، نەچوونە سەرکار...هتد، ئەمەش کاتێك ئاساندەبێت کە جەماوەر کاری خۆیان ڕێکبخەن.

بۆئەوەی مەسەلەی دەستەڵات نەبێت بەبابەتی شەڕوئاژاوە لەناو وولاتدا، پێویستە هەوڵبدەن دەستەڵاتی سیاسی لە وولاتدا بەشێوەیەکی ئاشتییانە ئاڵوگۆڕبکەن و هەموو لایەن و دەستەڵاتەکان کێشەی سیاسیی خۆیان لە ڕێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە بێنەئاراوە، هەرکاتێك حیزبی دەستەڵاتدار قەناعەتی بەوە هەبوو لە ڕێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە دەستەڵات یەکلابکاتەوە دەستەڵاتدار بگۆڕرێت بەبێ ئەوەی شەڕوئاژاوە بێنێتەئاراوە، ئەمەش کارێکی زۆرباشە، چونکە پاراستنی گیانی یەك مرۆڤـیش گرنگە چ جای تێکڕای، ﴿وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً﴾ المائدە:٣٢. هەرکەسێك هەوڵبدات گیانی مرۆڤێك بپارێزێت وەك ئەوەوایە هەوڵیدابێت هەموو مرۆڤایەتی بپارێزێت، بەڵام هەرکەسێك لە پێناوی مەبەستێکی سیاسیدا ئامادەبێت خوێنی مرۆڤێکی بێتاوان بڕێژێت وەك ئەوەوایە هەموو مرۆڤایەتی لەناو ببات. بەڵام تائێمە بۆمان هەڵکەوێت بەشێوازێکی ئاشتییانە ئاڵوگۆڕی دەستەڵات بکەین ئەوا هەم زانایانی ئیسلام بەدڵیانە و هەم هـزری ئیسلامی بەدڵیەتی و هەم قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر)، ئەو هەموو هاندانەی پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: (اسمعو وأطیعوا وإن

ولي عليكم عبد حبشي كان رأسه زبيبة)، ئەم هەموو هاندانە چۆن تەفسیردەکرێت بۆ پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) کاتێك کە لە سەرەمەرگدایە سوپایەکی گەورە دروستدەکات و ئوسامەی کوڕی زەیدی هەژدە ساڵە دەکات بەفەرماندەی ئەو سوپایە و بڕیاردەدات پێشەوایان ئەبوبەکرو عومەر سەربازبن لە بەدەستیدا، تا مسوڵمانان پەروەردە بکات لەسەر ئەوەی کە لێپرسراویەت و وەزارەت ئەوەندە گرنگ نییە کە خۆتی پێبەرزتر بزانیت بەسەر خەڵکداو شانازی پێبکەیت بەسەر خەڵکدا، بەڵکو لێپرسراوێتی، ئەرکێکی قورسە لەسەر شانت، کەواتە لە بنەڕەتدا ئاڵوگۆڕی دەستەڵات بەشێوەیەکی ئاشتیانە ئامانجێکی ئیسلامی بەدیدەهێنێت کە بڵاوبوونەوەی ئاشتییە لەناو کۆمەڵگەدا، وەك ئەرك تەماشای ئەم لێپرسراوێتییە بکات، وەك واجب تەماشای ئەم لێپرسراویەتییە بکات.

ئیسلام وەك لە دەقەکاندا دەیبینی دەڵێت: گەر(ئەهلی حەلـل‌و عەقد) واتە کاربەدەستانی وڵات و دەمڕاستان، نوخبەی ڕۆشنبیر، کۆبوونەوە و کەسێکیان بۆ ئەم کارە دەستنیشانکرد و زانییان ئەو مەرجە پێویستانەی تێدایە، دەیکەن بەسەرۆك، پێشەوا، ڕابەر.... ئینجا ئەوکەسە ئەرکەکانی دیاریکراوە، هەرکاتێك ئەرکەکانی جێبەجێکرد ئەوکاتە خەڵکیش گوێڕایەڵی دەبن و فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن، ئەگەر لادەریش بوو، ئەوە ئەوکەسە گونجاوانەی باسمانکرد، هەوڵدەدەن ڕاستیبکەنەوە.

یەکبەیەکی مسوڵمانان لێپرسراون لەبەرامبەر خوای پەروەردگاردا کە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە بکەن و ئەودەستەڵاتدارە ڕاستبکەنەوە، ئەمەش ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامییە. بەڵام ئەو کەسەی کە دەبێت بەئۆپۆزسیۆن ئامانجی ئەوەنییە کە خۆی بچێتە دەستەڵات و دووبارە دیکتاتۆریەت دروستبکاتەوە، واتە تەنها ڕوخسارەکان بگۆڕدرێن، تەنها دەموچاوەکان بگۆڕدرێن، ئۆپۆزسیۆن لە ڕاستیدا هەوڵی ئەوەدەدات کۆمەڵگە کۆمەڵگەیەکی ڕاستبێت، کاروباری مەدەنی و ڕۆژانەی خەڵك بەشێوەیەکی دروست و زانستی و بەرنامەدارو ڕێكوپێك بەرەوپێش بچێت، لەلایەکیتریشەوە دەوڵەت دەوڵەتی دامەزراوە و یاسابێت، ئاڵوگۆڕی لێپرسراوەکان بەشێوەیەکی شایستەییانەبێت.

هەموو دەستەڵاتێك بەحوکمی سروشتی کارەکەی پێویست بەوەدەکات چاودێریی بەسەرەوە هەبێت، چاوی مرۆڤی وردبین، چونکە زۆرجار دەستەڵات دەتوانێت لە ڕێگەی ڕاگەیاندن و میدیاوە، لە ڕێگەی ئەو هۆکارو سیاسەتانەی کە خۆی دەیزانێت، کارێك بکات کە باشترین نموونە پێشکەش بکات، هەموو کارەکانی خۆی بەشێوازێکی حەکیمانە نیشانی خەڵك بدات، بەڵام ئەگەر ئۆپۆزسیۆن وریابێت ئاگاداری ڕاستییەکانی بابەتەکان بێت، ئاگاداری هەموو هەنگاوەکان و ڕەفتاری ڕۆژانەی دەستەڵات بێت لە دەزگاو وەزارەت و فەرمانگەکاندا، ئالەو حاڵەتەدا دەتوانێت چاودێرێکی ڕاستەقینەبێت، ئەوکاتە دەتوانێت فەرمان بەچاکە و نەهی لە خراپە بکات، بوونی ئۆپۆزسیۆن بەم پێوەرە گرنگییەکی زۆری دەبێت.

فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە ئەوەندە گرنگ بووە زاناکانی موعتەزیلە دایانناوە بەیەکێك لە ئەرکانی باوەڕ لەو پێنج بنەمایەی کە باوەڕیان پێیهەبووە و کاریان بۆ کردووە، بەم بیرۆکەیەوە ویستویانە تاکێکی وەها بەرهەمبهێنن کە خۆی بەلێپرسراو بزانێت لە کۆمەڵگەدا، چونکە ئێمە تاکێکمان ناوێت کەمتەرخەمبێت، چونکە لە هـزری ئیسلامیو قورئان و سوننەتدا کەسێك کەمتەرخەمبێت، بە کەسێکی وەرگێراو دانانرێت، هەڵوێستی کەمتەرخەمی لە هیچ مسوڵمانێك قبوڵناکرێت، وەك پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت (من أصبح ولم يهتم بأمر المسلمين فليس منهم)، هەرکەسێك ڕۆژ بکاتەوە و گرنگی نەدات بەکاروباری مسوڵمانان، ئەوە لەوان نییە، ئیتر کارەکە سیاسی بێت یان ئابوری یان پەروەردەیی یان ئاسایشی وڵات و خەڵکبێت، گەر کەسێك گرنگی بەوەنەدات چۆن خۆی بەمسوڵمان دەزانێت، بەتایبەتی ئێمە دەزانین کە خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ﴾ المؤمنون:٨. ئەوانەی کە چاودێرن واتە سەرپەرشتیاری جێبەجێکردنی پەیماننامەی خودان، لەبەرئەوە مسوڵمان دەبێت ووشیاربێت، پێویستە کۆمەڵگەی ئیسلامی لە کەسانی ووشیارو ئاگادارو شارەزا پێکهاتبێت، لەبەرئەوە ئەرکی سەرشانی قوتابخانەو زانکۆکان و خێزانەکان و ڕۆشنبیرەکانە، بۆ ئەوەی خەڵك لەسەر ئەو ووشیارییە پەروەردە بکرێت، جالێرەدا بوونی ئۆپۆزسیۆن بەم پێودانگە گرنگە، بەڵکو بەشێکە لە ڕوانگەی فیکری ئیسلامیو بەشێکی تەواوکەری مسوڵمانێتییە و بەشێکی گەورەیە لە

بەشەکانی باوەڕ، وەك لە سورەتی (العصر)یشدا دەفەرموێت:﴿إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ العصر: ٣.

لێپرسراوێتی لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا هەرەوەزییە، دەبێت ئاوێنەی یەکتربین، باشییەکان و خراپییەکانی یەکتری دەربخەین، جەوهەری ئۆپۆزسیۆن لە هەموو هـزری مرۆڤایەتییدا ئەم دوو ووشەیەیە.

هەموو ئۆپۆزسیۆنێکیش کاتێك کە لە بەرامبەر دەستەڵاتەوە دەوەستێت، دەبێت بڕوا بەدەستەڵاتەکەی دروستبکات کە ئەم خاوەنی دڵسۆزی ئەو خاك و گەلو ووڵاتەیە و ئامانجی تەنها دەستەڵات نییە، ئامانجی ئەوەنییە ئەو بڕوخێت و ئەم جێگای بگرێتەوە، چونکە ئەگەر بەو عەقڵییەتەوە بچێتە مەیدان، دەستەڵات سووردەبێت لەسەر ئەو دۆخی (أخذته العزة بالإثم)ـە، واتە: یاخی دەبێت و ئامۆژگاری وەرناگرێت، دەستەڵات فێری دەمارگیری دەبێت، ئەگەر دەستەڵاتیش بەو عەقڵیەتەوە بێتەمەیدان کە ئۆپۆزسیۆن بەدوژمنایەتی و ئاژاوەگێڕی بزانێت، ئەوکاتە هەموو ئاستەنگێك دەخاتە بەردەمی ئەو ئۆپۆزسیۆنە و کەش‌وهەواکە لە کەش‌وهەوای دروست و ساغەوە دەگۆڕێت بۆ وەزعێکی خراپ‌و کۆمەڵگە بەرەو هەڵدێر دەچێت.

لەو قۆناغەی مێژوودا کاتێك کەسانی توندڕەوو پەڕگیر پەیدادەبوون، بەپلەی یەکەم تاوانی دەستەڵات بوو، دەستەڵات خەڵك دەکات بەدوژمنی خۆی، دەستەڵاتە کە خەڵك یاخی دەکات، دەستەڵاتی ناشارەزاو دیکتاتۆرە کە خەڵك ناچاردەکات ڕوبەڕووی بێتەوە

بەشێوازی توندوتیژانە، مامەڵەی هەڵەش بەهەڵە هەمیشە ئاژاوەی لێکەوتووەتەوە.

هەندێك نوسەر بەهەڵە لە مامەڵەی ئیسلام لەگەڵ ئەم بابەتەدا تێگەیشتوون، بۆ نموونە یەکێك لەو نوسەرانە دەڵێت (لایمکن أن نتحدث عن المعارضة داخل سیاق الدولة)، دەڵێت ئەگەر ئۆپۆزسیۆن بەم جۆرەبێت کە خۆی باسی دەکات، نابێت قسەبکەین لەبارەی ئۆپۆزسیۆنەوە لە سیاقی دەوڵەتێکی ئاینیدا، یان ئەگەر دەوڵەت دەوڵەتی ئاینی بێت ڕێگە بەئۆپۆزسیۆن نادات. گەر بپرسین لەو نوسەرە مەبەستی چ دەوڵەتێکە؟ ئەگەر مەبەستت دەوڵەتی کڵێسایە کە بڕیاریداوە: هەمیشە جگەلەخۆی، ناحەق بێت، وەك دەوڵەتی سیۆکراتی کە حەقی لەسەر خۆی تاپۆکردووە و دەبێت خەڵك تەنها لە چاوی ئەوەوە سەیری دونیا بکەن، ڕەنگە قسەکە ڕاستبێت، بەڵام ئەگەر مەبەستی هەموو دەوڵەتێکی ئاینی بێت بەدەوڵەتی ئیسلامیشەوە، لێرەدا بەونووسەرە دەڵێم: بەهەڵەداچوویت، چونکە بنەمای پێکهاتەی شەخسیەتی کەسی مسوڵمان بنەمای دروستبوونی دەوڵەت لە ئیسلامدا بریتییە لە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە، واتە بریتییە لە بەرپرسیارێتی تاك سەبارەت بەو کۆمەڵگەیەی کە تیایدا دەژی، سەبارەت بەو کاروبارانەی دەوروبەری، ئیتر کاروباری سیاسی یان ئابوری یان کۆمەڵایەتی بێت، هـزری بێت یان فەرهەنگی، بەتایبەتی دەزانین کە لە هـزری ئیسلامییدا مافی جیاوازی لە بیروبۆچووندا، مافی جیاوازی لە نەتەوە و ڕەگەزو مەزهەبدا، دراوە بەهەموو کەسێك، کەواتە

ئەو چەمكە ئەگەر ڕاستبكرێتەوە: لە ناو دەوڵەتی ئیسلامییدا، گەورەترین مەودا هەیە بۆ ئۆپۆزسیۆن.

گەر سەیرێکی ژیانی خەلیفەی چوارەمی ئیسلام پێشەوا عەلی بکەین، کاتێك کۆمەڵێك لە پێشەوا عەلی جیابوونەوە، پێیاندەوترا خەواریج، سەرەتا (٣٠)هەزار کەس بوون، دواتر بەگفتوگۆ (١٠)هەزار کەسیان گەڕانەوە نێو ریزی کۆمەڵگە، خەواریج پێشەوا عەلییان بەمسوڵمان نەدەزانی، بەڵام پێشەوا عەلی گفتوگۆی لەگەڵ کردن و فەرمووی (ئێوە سێ مافتان بەسەرمانەوە هەیە:

یەکەم: بۆمان نییە ڕێگەی مزگەوتتان لێبگرین.

دووەم: نابێت دەستپێشخەربین لە شەڕ لەگەڵ ئێوە.

سێهەم: ئەگەر جیهادیشمان کرد نابێت بێبەشتان بکەین لە دەستکەوتەکان.

فەرمووی (إن لكم علينا ثلاثة من الحقوق، ألا نمنعكم من المساجد، وألا نبدأكم بقتال، وألا نحرمكم من الغنائم)، ئەوەندە نەرم بوو لە هەڵسوکەوتیدا ئامادەنەبوو شەڕیان لەگەڵدا بکات، پێشەوا عەلییان بەمسوڵمان نەدەزانی، گەرچی خەلیفە و کەسایەتییەکی گەورە بوو، ئەوە هەڵوێستی پێشەوا عەلییە بەرامبەر بەدوژمنە سەرسەختەکانی، شەڕی لەگەڵ نەکردن تا ئەوان دەستیانکرد بەشەڕکردن و هاوەڵانی خۆشەویستی پێغەمبەریان شەهیدکرد، تەنانەت خێزانەکەی (عەبدوڵڵای کوڕی خەبابی کوڕی ئەرەت)ی هاوڕێی ناسراوی پێغەمبەر (درودی

خوای لەسەر)یان کوشت و کۆرپەکەشیان کوشت و ئەو هاوەڵە بەڕێزەشیان شەهیدکرد، ئینجا پێشەوا عەلی بڕیاریدا شەڕیان لەگەڵدا بکات، چونکە بوونەهۆی ئاژاوەیەکی گەورە لە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامییدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە بڕیاریدابوو هەتا ئەوان شەڕ نەفرۆشن ئەمان شەڕیان لەگەڵدا نەکەن، لە ئەنجامدا پێشەوا عەلی هەر بەدەستی ئەوان شەهیدکرا، بەدەستی (عەبدولڕەحمان کوڕی مولجەم)ی دووڕوو.

کەواتە ئۆپۆزسیۆن دەبێت بە وتە ڕاکانی خۆی دەربب‌ڕێت و نەگاتە ئاستی توندوتیژی، تاکاتێك کە ئومێدی چاکت بەو دەستەڵاتە هەبێت و بزانیت ئەو دەستەڵاتە گوێ لە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە دەگرێت.

ئەمە پوختەیەکی کورت بوو لەسەر ئۆپۆزسیۆن و ڕۆڵی ئۆپۆزسیۆن و گرنگیی ئۆپۆزسیۆن و پێویستبوونی ئۆپۆزسیۆن لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامییدا..

# ڕاگەیاندنی ئیسلامی و
# فەلسەفەی ڕاگەیاندنی ئیسلامی

### بەراوردێك لە نێوان ڕاگەیاندن و فەلسەفەی ڕاگەیاندنی ئیسلامی و نائیسلامی:

ئەم بابەتە ئەمڕۆ بابەتێکی زیندووە لە ناو نوسەران و بیرمەندانی هەموو تیۆرەکانی ڕاگەیاندندا،کە لە ڕاستیدا جێبەجێکردن یان وردکردنەوەی تیۆرێکی فەلسەفی تایبەتە.

پاش داڕشتنی تیۆری ڕاگەیاندنیش کاری ڕاگەیاندن دەستپێدەکات، واتە کەناڵێکی ڕاگەیاندن چ بینراوبێت یان بیستراو یان خوێندراوەبێت، لە بۆشاییەوە نایەت، واتە هەرکەناڵێکی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەو گۆڤار و ڕادیۆیەك لەمڕۆدا لەسەر بناغەی فەلسەفەی تیۆرێکی تێکەڵ لە تیۆری مەعریفی مرۆڤناسانە و تیۆرێکی ڕاگەیاندندا دادەمەزرێت، لەبەرئەوە هەرکاتێك کەناڵێکی ئیسلامی دادەمەزرێت خەڵك دێن لە ڕوانگەی فەلسەفەی ڕاگەیاندنی ئیسلامییەوە بۆیدەڕوانن و لە ڕوانگەی ئەو تیۆرو مەعریفەناسییەی ئیسلامەوە لە پێژنگی دەدەن و هەڵیدەسەنگێنن، لەبەرئەوە ئێمە پێویستە بزانین لە بنەڕەتدا فەلسەفەی ڕاگەیاندنی ئیسلامی لە چەند جیهانبینییەکەوە سەردەردێنێت و بەرەو چەند ئامانجو خولیایەکی گرنگ هەنگاو دەنێت.

خودی تیۆریستە خۆرئاواییەکان کاتێك کە باسی فەلسفەی ڕاگەیاندن دەکەن، ناتوانن خۆیان لەو ڕاستیە بێئاگابکەن کە هەموو فەلسەفەیەکی

ڕاگەیاندن لە ڕاستیدا لە دونیابینی و جیهانبینی تایبەتی خۆیەوە سەرهەڵدەدات، تەنانەت یاسای سیاسییش کە دەبێتە چوارچێوەی یاسای کۆمەڵایەتی لە ڕاستیدا بە فەلسەفەیەکی ڕاگەیاندنی تایبەتەوە کاردەکات، لەبەرئەوە دەبینین لە جیهانی ئیسلامییدا جەدەلیەت و دژایەتییەك دروستبووە لە نێوان جەماوەری مسوڵمان و ئەو ڕاگەیاندنانەدا کە ڕووی وتاریان ئاڕاستەی جەماوەرو کۆمەڵگەیەکی مسوڵمان دەکەن، بەڵام لەسەر بنەمای فەلسەفەیەکی خۆرئاوایی، لەسەر بنەمای تیۆرێکی کۆمەڵایەتی خۆرئاوایی، کە ئەمەلەڕاستیدا بریتییە لە چاندنی تۆوێکی بێگانە و نەگونجاو لەسەر زەمینێکی ئیسلامی کە ژینگەیەکی جیاواز و بۆچونێکی جیاواز و هەڵگری بارێکی مەعریفی جیاوازە.

بێگومان پێویستە کەناڵی میدیای مسوڵمان لە کەناڵی میدیای نامسوڵمان جیاوازبێت، چونکە لە بنەڕەتدا تیۆری فەلسەفەی ڕاگەیاندنی ئیسلامی جیاوازە لە تیۆری فەلسەفەی ڕاگەیاندنی نائیسلامی، ئیتر هەرناوێکی لێبنێیت.

ئەگەر ئێمە بێین سەرنجێکی ئەو تیۆرانە بدەین کە لە خۆرئاوادا سەریانهەڵداوە، بەچەند شێوەیەك پۆلێندەکرێن کە لەسەر بنەمای فەلسەفەی میدیای ئازاد دایانمەزراندووە، کە لە پێش هەموویانەوە فەلسفەی لیبرالیزم و تیۆری فەلسەفەی لیبراڵی کە لەسەر بنەمای عەلمانیەت و جیهانبینی عەلمانیەت و ئامانجەکانی ئەو بنەمایە دروستبوە. کۆڵەکەی بنەڕەتیی ئەم فەلسەفەیە بریتییە لە بنەمای ئازادی ڕادەربڕین کە ئەمیش لە ڕاستیدا بەسێ قۆناغی جیاوازدا تێپەڕیوە:

**قۆناغی یەکەم قۆناغی سەرەتایی:**

لەم قۆناغەدا لەسەر بنەمایەکی ئاینی پێناسەیان بۆ ئازادی ڕادەربڕین دەکرد، کەسانێکی وەك (مۆڵتۆن)و هاوچەرخانی ئەو پێیانوابوو ئازادی ڕادەربڕین بنەمایەکی ئاینی هەیە، ئەوان پێیانوابوو خوداوەند بۆ خۆی دەیەوێت خەڵك ئازادبن، خوداوەند بۆ خۆی دەیەوێت میدیایەکی ئازاد هەبێت تا مرۆڤەکان بتوانن ڕاستییەکان بدۆزنەوە، کەواتە هەرلەسەرەتاوە ئەوان لەو قۆناغەوە دەستیانپێکرد. وتیان ڕادەربڕین بنەمایەکی سروشتیی هەیە واتە مافی سروشتیی مرۆڤەکەیە ئازادی ڕادەربڕینی هەبێت، پێیانوابوو ئازادی ڕادەربڕین مافێکی سروشتیی لچکاوە بەسروشتی مرۆڤەوە. ئەم قۆناغەیان لەسەر بنەمایەکی پراکماتی و بنەمایەکی قازانج دانا، کە بائێمە تەوجیهی ئازادی ڕادەربڕین بکەین، وتیان ڕادەربڕین لەبەرئەوە باشە چونکە قازانجو سوودی بۆ مرۆڤ هەیە، لە ڕاستیدا ئەم بیردۆزە و ئەم تیۆرە چەندین ڕەخنەو گلەیی لێکرا.

ئازادی ڕادەربڕین بەو شێوە بێسنوورەی کە ئەوان پێوەی خەریکن، لە ڕاستیدا بووەتەهۆی ئەوەی هیچ جۆرە سنورێك نەبێت بۆ ئەو بابەت و ماددە ڕاگەیاندنانەی کە بەسەرخەڵکیدا دابەشی دەکەن، لەو ڕاگەیاندنەدا تەنها مەبەستیان ئەوەبووکە سوودی بۆ خۆیان هەبێت، لەبەرئەوە زۆرجار ئەم فەلسەفە ڕاگەیاندنە ئەوەی لێدەکەوێتەوە کە بەرژەوەندیی گشتی کۆمەڵگە دەکەوێتە مەترسییەوە. کەواتە ئەگەر ئێمە بێین پۆلێنی فەلسەفەی لیبڕالی بکەین بەو پەشێوییە بێسنورەی ڕووی کردۆتە وولاتان و کۆمەڵگەکان، لە ڕاستیدا مەترسی ئەوەی لێدەکەوێتەوە لەولاوە بەزیانی مرۆڤەکان تەواوبێت.

**قۆناغێکی تر لە فەلسەلەی میدیای ئازاد بریتییە لە فەلسەفەی لێپرسراوی کۆمەڵایەتی:**

پاش ئەوەی لایەنە نێگەتیڤەکانی فەلسفەی لیبرالی دەرکەوت، وتیان دەبێت ئێمە بەرەو هەنگاوێکی تربڕۆین، وتیان بابێین چارەسەری بکەین، هاتن فەلسەفەی لێپرسراوی کۆمەڵایەتییان دامەزراند کە ئەم فەلسەلەفەیە هەتا ئەندازەیەك لەگەڵ تیۆری ئیسلامییدا یەکدەگرێتەوە، چونکە پێیوابوو ڕاگەیاندنی ئازادی ڕادەربڕین دەبێت لەسەر بنەمای لێپرسراوێتی کۆمەڵایەتی دابمەزرێت، واتە هەموو کۆمەڵگە لێپرسراون بەرامبەر هەموو کۆمەڵگە، کە ئەمە بەشێوەیەك لە شێوەکان لەگەڵ یاسای فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە یەکدەگرێتەوە، چونکە لەوە و پێش زۆر بەهەڵە چەمکی ئازادییان مانا دەکرد و ڕێگەیان بە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دەدا بەئارەزووی خۆیان ئەوەی کە قازانجی پتریان پێدەبەخشێت ئەو ماددەیە پێشکەش بکەن، بەڵام لە راستیدا کاتێك ئازادە کە لە ژێر چاودێری کۆمەڵگە دەرنەچێت، واتە کۆمەڵگە بتوانێت ئاڕاستەی بکات بەڵام بەشێوەیەکی هاریکاریانە.

**قۆناغی سێیەم فەلسەفەی ڕاگەیاندنی ئاڕاستەکراو**

ئەم فەلسەفەیە لە دوو تەوژمدا خۆی دەبینێتەوە:

**تەوژمی یەکەم:** تەوژمی سۆشیالیزمی زانستی، واتە ئەو سۆشیالیزمەی کە بە خۆی دەوت زانستی، نەك ئەو سۆشیالیزمەی کە لە راستیدا زانستی بێت، چونکە لە سەردەمێکدا سەریهەڵدا کە

پێیانوابوو زانست گەیشتوەتە قۆناغێك کە ئیتر بووەتە ئەڵتەرناتیڤی ئاین، لەبەرئەوە وتیان ئێمە قوتابخانەکەمان ناودەنێین (سۆشیالیزمی زانستی)، چونکە لەو سەردەمەدا هەر شتێك ئاوەڵناوی زانستیی لەسەر بوایە لە ناو خەڵکدا بەگشتی و لە ناو ڕۆشنبیران و خوێندەواراندا کاریگەریی زیاتری هەبوو.

**تەوژمی دووەم:** بریتییە لە دیموکراتی یاخود سۆشیالیستی ڕیفۆرمخوازانە: کە ئێستا لە وڵاتانی ئەسکەندەنافیا زیاتر پەیڕەوی دەکرێت.

ئەم دوو فەلسەفەیە بۆچونیان لەسەر ڕاگەیاندن ئەوەیە کە دەبێت ڕاگەیاندن ئاڕاستە بکرێت.

کەواتە دوو ئاراستە هەبوو:

یەکەمینیان: بەرەو بەدیهێنانی ئامانجەکانی چینی پڕۆلیتار و زەحمەتکێش.

دووهەمینیان: بەرەو بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی.

دوای ئەم دوو مەدرەسەیە کە پێیدەوترێت (**مدرسة الإعلام الموجه**) ئێمە تەیارێکی ترمان هەیە پێی ئەگوترێت:

**میدیای گەشەپێدان:** یان میدیای گەشەسەندن و میدیای پەرەپێدان (**الإعلام التنموي**)، لێرەدا ڕاگەیاندن ڕۆڵێکی زیاتری پێدەدرێت بۆ گەشەپێدانی تواناکانی مرۆڤ کە دیارە ئەمیش لە چەند ئاڕاستەیەکی هـزریدا خۆی دەبینێتەوە:

**یەکەم:** قوتابخانەی مۆدیرنیتەیە: کە دەڵێن دەبێت ئێمە بەوشێوەیەی کە گۆڕانگاری لە جیهانی خۆرئاواییدا ڕویدا لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت لە ژیانی ئاینی و پەروەردەیی خەڵکدا، بەهەمانشێوە ئێمە بێین بیری خۆرئاوایی بهێنینە ناو خەڵك و هەموو کۆسپە چاولێکەرییەکان لە دابونەریت لە ناوبەرین، بۆ ئەوەی جیهان پێشبکەوێت.

بێگومان لە بۆچوونی ئەم رێبازەدا پێشکەوتن واتە پێشکەوتنی خۆرئاوایی و پێشکەوتن لەسەر مۆدێلی خۆرئاوا.

**دووەم:** گەشەپێدان کە پێیدەوترێت قوتابخانەی پەیڕەویکردن.

ئێمە کاتێك دەمانەوێت ڕەخنە لەم فەلسەفانە بگرین دەزانین هەرکام لەم تیۆرانە ڕەنگە لایەنی باش یان خراپی هەبێت وەك هەر چەمکێکی مرۆیی، بەڵام لە بەرامبەر ئەو تیۆرو قوتابخانانەوە دەتوانین تیۆرێك دابنێین کە ناوی بنێین تیۆری ڕاگەیاندنی ئیسلامی و ئەو تیۆرە بگونجێنین لە ناو ئەو کەناڵو میدیایانەی کە کار بۆ ئیسلام دەکەن.

تەبعەن ئێمە پێویستمان بەوەهەیە لە پێشدا شەن و کەوێکی بابەتیانەی زانستی ئەو قوتابخانانەی پێشووبکەین.

بنەڕەتی ئەو تیۆرانە لە ڕاستیدا لە یەکێك لەم دوو حاڵەتە بەدەرنییە:

**یەکەم:** هەندێك لەو تیۆرانە لەسەر ئەو بیرۆکەیە دروستبوون کە هیچ حسابێك بۆ بڕواهێنان بە خودایەکی تاكوتەنها ناکات، واتە چەمکی

خواپەرستی و خواناسی بەشێوەیکی تەواو لە مەنزومەکەیاندا بەتەواوی دەسڕێتەوە.

**دووەم:** بەپێچەوانەوە ڕەنگە باوەڕی بەخواناسی هەبێت، بەڵام پێیوایە ئەوخواناسییە نابێت هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ڕاگەیاندن و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی هەبێت، کە ئەمەش لە ڕاستیدا خاڵی لێکجیابونەوەی تیۆری ڕاگەیاندنی ئیسلامییە لەگەڵ تیۆری نائیسلامیدا.

ڕاگەیاندنی ئیسلامی لەسەر دوو کۆڵەکەی سەرەکی بنیاتدەنرێت:

**یەکەم:** ناوەڕۆکو بنەمای خۆی لە وەحی و سروشی ئیلاهی وەردەگرێت، واتە ئەو پەیامەی کە دەیەوێت بیگەیەنێت بەجەماوەر، بە وەرگر بەڕەهایی بریتییە لە ناوەڕۆکی ئەو پەیامەی کە خوای پەروەردگار لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە ناردوویەتی بۆ مرۆڤایەتی، بەڵام بەڕێگەدان بەعەقڵ بۆ ئەوەی مامەڵەی لەگەڵدا بکات و کارلێکردنی لەگەڵدا بکات، واتە هیچ ڕێگرییەك لە عەقڵی مرۆڤ نییە کە لەو پەیامە بکۆڵێتەوە و لەو پەیامەدا ئەوەی بەکەڵکی دێت بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆی ئەوەبکات، ئەوە بوروژێنێت یان داکۆکی لەسەر بکات. کەواتە کۆڵەکەی یەکەم بریتییە لە پەیامەکەی خوا.

**دووەم:** کۆڵەکەی دووەمی تیۆری ڕاگەیاندنی ئیسلامی بریتییە لە تێگەیشتن لەو واقیعەی کە ئەوکەسەی تیادەژی، واتە تێگەیشتن لە واقیعی سیاسی و واقیعی کۆمەڵایەتی و واقیعی ئابوری بەهەموو لقوپۆپەکانیەوە و بەهەموو ئاڵۆزییەکانیەوە...

ئێستا دێینەسەر خاڵێکی زۆر گرنگ: لەگەڵ بوونی بابەت و ناوەڕۆکو مادەی ڕاگەیاندنی دەوڵەمەندو لەگەڵ بوونی تواناو کاراو لەگەڵ بوونی زمان و لەگەڵ بوونی زۆر لە کەرەستەکان و بوونی زۆر لە کێشەکان و وەڵام بۆ ئەو کێشانە، چ شتێك وامان لێدەکات کە واز لەم تیۆرە ئیسلامییە بهێنین؟ لە بەرنامەیەکی ڕەبانی، بەرنامەیەك کە هەمیشە لە خزمەتی مرۆڤدایە، وازی لێبهێنین بچین دەستەودامێنی ئەو بیردۆزو فەلسەفە و تیۆرانە ببین کە لە شوێنەنامۆکانەوە بۆماندێت، کە بە هیچ شێوەیەك نەلە ڕووی مەعریفی و نەلەڕووی مێژووییەوە بەکاری ئێمە نایەن.

لەڕاستیدا ئەمە هۆکاری زۆری هەیە:

یەکێك لە هۆکارەکان ئەوەیە کە تا ئێستا هەوڵنەدراوە ئەم تیۆرە ئیسلامییە سەبارەت بەڕاگەیاندن بەئەندازەی پێویست ڕاڤەبکرێت و بڵاوبکرێتەوە و خەڵکی بیبینێت.

کەواتە هۆکارێکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەستکورتییەی کە خەڵکانی مسوڵمان و پابەندبەئیسلامەوە هەیانە، بەوشێوەی کە پێویستە نەهاتوون راڤەیەکی دروست و تەواوی ئەم بابەتە بکەن، واتە بەشێوەی پێویست بانگەشەی تەواو بۆ ئەم تیۆرە نەکراوە.

**دووەم هۆکار:** دەگەڕێتەوە بۆ تازەبوونی ئەزمونی ڕاگەیاندنی ئیسلامی، هەرچەندە لە ڕاستیدا ڕاگەیاندنی ئیسلامی لە سەرەتاکانی بانگەوازی ئیسلامییەوە بەشێوەیەك لە شێوەکان بوونی هەبووە، لەوکاتەوەی ئایەتی قورئان بۆ یەکەمجار هاتەخوارەوە بۆسەر

پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر)، و بەدرێژایی مێژووی ئیسلام ڕاگەیاندن بەشێوەیەکی سەرەتایی یان بەشێوەیەکی بابەتییانە، بوونی هەبووە لەناو کۆمەڵگەدا، بەڵام چەمکی ڕاگەیاندن وەك ئێستا فرەچەشن و هەمەڕەنگ نەبووە.

کارکردن لەسەر دەنگوڕەنگ، کارکردن لەسەر گەیاندنی پەیام بەجوانترین و ڕەوانترین ووشەو بەڕازاوەترین جوانترین و کاریگەرترین وێنە، ئەمە بۆ خۆی پرۆسەیەکی نوێیە بۆ هەمووشتێك کە تازەبێت، دیارە بەشێوەی پێویست ڕەنگە چارەسەر نەکرابێت یاخود ڕونکردنەوە دەربارەی نەدرابێت یاخود نەگەیەنرابێت بەخەڵك. ئەو پێشکەوتنە میدیایی و ڕاگەیاندنەی کە خۆرئاوا پێیگەیشتووە ئەنجامی چەندین سەدە هەوڵ‌و تەقەلـلاو تێکۆشان بووە لە بواری ڕۆشنبیری‌و فەلسەفی‌و کۆمەڵایەتی و بواری پەروەردەییەوە، بەڵام لەو ڕوانگەیەوە کە مرۆڤ بۆخۆی هەموو شتێکە.

کەواتە هەوڵێکی زۆر دراوە تامیدیا گەیشتووە بەم ئاستەی ئێستا، بەڵام لای ئێمە هێشتا ڕاگەیاندن تازەیە، واتە ڕاگەیاندنێکی پسپۆڕ کە ئامانجی گەیاندنی پەیامی ئیسلامبێت بەخەڵك هێشتا چەمکێکی تازەیە، ئەوەشمان لەبیرنەچێت لە باوەشی ژینگەیەکی وادا دروستبووە و سەریهەڵداوە کە١٠٠٪ ژینگەیەکی ئیسلامی نییە، بەو مانایەی کە ئێمە لە ئیسلام تێگەیشتوین، هەروەها هـزری سیکۆلار بەهەموو شێوەیەك زاڵبووە بەسەر واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتیماندا لە جیهانی سێیەمدا، بەتایبەت لەم وولاتانەی ئێمە، دەستەڵاتەکان کە ئاڕاستەی میدیاو

ڕاگەیاندنیان کردووە، واتە ئێستەش لە هەندێك لە وولاّتاندا ڕێگانادرێت بەوەی کە کەسانێکی ڕۆشنبیری نوخبەی مسوڵمانی تێگەیشتوو لە ئیسلام، بۆخۆیان کەناڵێکی ڕاگەیاندن دابمەزرێنن، لە ژێر چاودێری و سانسۆری دەستەلاّتدا نەبێت، لە حاڵێکدا ئەگەر دەزگاو کەناڵێکی راگەیاندنی لەم شێوەیە هەبێت، ڕاگەیاندنکاری مسوڵمان دەزانێت چی بڵێت، پەیامی پێیە لە ڕووی هونەری‌و تەکنەلۆجیای ڕاگەیاندنەوە.

ڕەنگە ئێمە هێشتا لە سەرەتادا بین، بەلاّم پەیامەکەمان بەڕاستی پەیامێکی ئیسلامییە، پەیامێکی جیهانییەو بۆ هەموو مرۆڤەکانە، چونکە ئەگەر ئێمە سەیری بەرنامەی ئیسلام بکەین سەبارەت بەسروشتی مرۆڤ و بایەخدان بەعەقڵ و ئاوازی مرۆڤ، ئەو ژیانەی کە پێویستە مرۆڤێك لەسەری بژی، دەتوانین ئاڕاستەیەکی ڕاست و دروست بۆ ڕاگەیاندن و میدیا دابنێین، چونکە تێگەیشتنی ئێمە بۆ مرۆڤ تێگەیشتێکی واقیعیانەیە، تێگەیشتنی ئیسلام پێیوایە کە مرۆڤ خوای پەروەردگار بەبوونەوەرێکی عاقڵ دروستیکردووە و خاوەنی ژیرییە، خاوەنی بیرە، خاوەنی هەست و تێگەیشتن و خاوەنی بوونێك و ڕۆحێکی شەفافە، لەبەرئەوە دەتوانێت عەقڵی خۆی بەکاربهێنێت و ، ڕاستی، لە چەوتی جیابکاتەوەو، باشی، لە خراپی جیابکاتەوەو، هیچ کارێکی ڕاگەیاندنیش بەبێ تێگەیشتن لە ماهیەتی مرۆڤ سەرکەوتوو نابێت، بەبێ ئەوەی پێناسەیەکی ڕێكوتەواو سەبارەت بەمرۆڤ بدات بەدەستەوە سەرکەوتوو نابێت، ئێمە لە هزری ئیسلامییدا دەزانین چ پێناسەیەك بۆ مرۆڤ کراوە، چۆن لە هەڵسوکەوتی کۆمەلاّیەتی

ئەوکەسەدا ڕەنگدەداتەوە. ئەوەتا بیرمەندێکی وەك (عەبباس مەحمود عەققاد) لە یەکێك لە پەرتووکەکانیدا بەتێگەیشتن لە دەقە ئیسلامیۆەکان لەسەر مرۆڤ دەڵێت: (الإنسان كائن مكلف)، مرۆڤ بوونەوەرێکە ئەرکی لەسەر شانە، عەققاد دەیەوێت پێمانبڵێت مرۆڤ هەمیشە لە بەردەم بەرپرسیارێتی و لێپرسیارێتیدایە، هەمیشە قابیلی ئەوەیە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لێپرسینەوەی لەگەڵ بکرێت سەبارەت بەهەموو قسە و کردەوە و هەڵوێستێکی، کەواتە ئەم مرۆڤە دەبێت هەم خاوەنی جیهانبینی بێت و هەم خاوەنی زانست و زانیاری بێت، هەم خاوەنی حیکمەت و دانایی و خاوەنی ڕەوشت و ئاکارێکی بەرزبێت.

یەکێکیتر لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ کە بیرمەندی مسوڵمان هەڵیهێنجاوە لە دەقەکان و پێویستە ڕاگەیاندن ئاگاداری ئەو خاڵە گرنگە بێت، ئەوەیە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی ئەخلاقییە، مرۆڤ بوونەوەرێکە هەمیشە دەبێت بیر لە باشی و خراپی خۆی بکاتەوە، پێویستە لە ناخی خۆیدا دادگایەك دابنێت، لەبەرئەوە بەهەموو شێوەیەك دەبێت کەناڵێکی ڕاگەیاندن ئاگاداری بواری رەوشت و ئاکاربێت، ئەوەش تەنها بە لایەنە قەدەغەکراوەکان لێکنادرێتەوە، بەڵێ قەدەغەکراوەکان زۆر گرنگن و بەهەموو شێوەیەك دەبێت مرۆڤ خۆی لێبپارێزێت، دەبێت کەناڵەکانمان لە بابەتی دژەڕەوشت بپارێزین، بەڵام لە ڕاستیدا رەوشت چەمکێکی زۆر فراوانی هەیە، چەمکی ڕاهێنانی مرۆڤ لەسەر شکۆمەندی و ڕێزوبایەخ‌و بەهابەرزەکان و ڕاستگۆیی و ئەمانەتداری و پاکداوێنی...هتد، ئەمانە هەموو ڕەوشتی گرنگن کە لە

ڕاستیدا زۆر جەختی لەسەر دەکرێت و کاری ڕاگەیاندن زۆر گرنگە کە ڕەچاویان بکات.

ئێمە باسی ڕاگەیاندن دەکەین و یەکەمین کاری ڕاگەیاندنیش ئەوەیە کە بزانێت خەڵك فێری خێرخوازی بکات و شیکاری چاکە بزانێت و خەڵك فێری ئەوەبکات کە بە دوای چاکەکارییدا بگەڕێت، تا لە بواری تیۆرییەوە بیخاتە بواری کردەیی، ئەمەش دیارە پێویستی بەوەهەیە کە هەنگاوێکی تەواو هەبێت بۆ ڕاگەیاندن بۆ ئەوەی زۆر بەڕاشکاوانە بڵێت چی باشە چی خراپە.

یەکێکیتر لە تایبەتمەندییەکانی تیۆری ڕاگەیاندنی ئیسلامی، گرنگیدانە بەئازادی تاك، لەبەرئەوە تەماشادەکەین لە ئیسلامدا وەك لە قورئانی پیرۆزدا بەتایبەتی، ڕێگە لەوەگیراوە کە مرۆڤ بچێتە ناو بازنەی تایبەتیی کەسەکانەوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت (ولاتجسسوا) الحجرات١٢. واتە، بەسەریەکەوە سیخوڕی مەکەن و بەدوای نهێنی یەکتردا مەگەڕێن. تەنانەت لە فیقهی ئیسلامییدا ئێمە یاسایەکی زۆر ڕوون و ئاشکرامان هەیە کە ڕێگەنادات بەوەی خەڵك بوختان بۆ یەکێکیتر بکات یان ناوی یەکێکیتر بزڕێنێت.

لەفەلسەفەی ڕاگەیاندنی ئیسلامییدا بابەتێکی دیکە هەیە کە زۆرگرنگە و پەیوەندیی بە سیستەمی گشتییەوە هەیە، سیستەمی گشتی واتە: حسابکردن بۆ کۆمەڵگە زۆر بە هەستیارییەوە، واتە دەبێت ئاگاداربین لەوەی کە شتێك هەیە پێیدەوترێت ئاسایشی کۆمەڵگە، بۆ ئەوەی ئاسایشی تاك و خێزان و کۆمەڵگە پارێزراوبێت و تووشی

مەترسی نەبێت، چونکە هەر وڵات و کۆمەڵگەیەك بگریت بەشی ئەوەندە ناحەزو نەیار و دوژمنی بەسەرەوەهەیە کە هەرکاتێك بیانەوێت پەلاماری بدەن و بەدوای فرسەتێکدا دەگەڕێن.

گرنگترین خاڵ لە بابەتی یاسای گشتییدا بریتییە لە پارێزگاریکردن لە بیروبڕوای کۆمەڵگە. کە سەبارەت بەکۆمەڵگەی کوردەواری بیرو باوەڕی ئیسلام ئەو بیروباوەڕە ئیسلامییەیە کە هەزارو چوارسەد ساڵە میلـلەتی ئێمە لەسەری پەروەردە بووە و لەسەری دەژی و بووە بەبەشێك لە ناسنامە و شوناسی.

پاشان پاراستنی سروشتی ئەم ئاینەش گەلێك گرنگە، لەبەرئەوە کەناڵی ڕاگەیاندن کە لە وڵاتێکی ئیسلامیدایە، دەبێت زۆر گرنگی بدات بەم لایەنە، زۆر گرنگی بدات بە بەرپاکردنی نوێژ وئەرکی زەکات و چاکەکردن و مانگی ڕەمەزان و حەج و رەوشتەکانی نێو کۆمەڵگە.

لە هەموو بیردۆزێکدا حساب بۆ ئەوە کراوە کێ خاوەنی دامودەزگاکانی ڕاگەیاندنبێت، بەپێی بیردۆزی ئیسلامی ڕێگری ناکرێت لەوەی تاکەکان یان هەندێکیان، یان دەزگایەك یاخود کۆمەڵێك، خاوەنی کەناڵێك بن، بەڵام ئەم خاوەنداریێتییەی ئەوان بەمانای ئەوەنییە کە بە ئارەزووی خۆیان چییاندەوێت لەو کەناڵەوە پەخشی بکەن، بەڵکو شەریعەت و یاسایەك هەیە کە ژیانی مسوڵمانانت بۆ ڕێکدەخات، کەواتە ئازادی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامە لە فەلسەفە و بیردۆزی ڕاگەیاندنی ئیسلامییدا سنوورێکی دیاری بۆ دەستنیشانکراوە، بەڵام ئەم سنوورە بریتینییە لە سوودی رابوردوو یان سوودی دەستەڵاتێك یان سوودی تاك

لەسەر حسابی کۆمەڵگە، ئەم سنوورانەش لە ڕاستیدا لە پێناوی ئەوەدایە ناوەڕۆکی ئەو پەیامەی کە لە لایەن وەحی خوداوە بۆ خەڵکی نێردراوە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست و کاریگەر بگەیەنرێت بەجەماوەر، جەماوەریش تەنها بریتینیین لەو جەماوەرەی کە مسوڵمانە یان باوەڕی بەو ڕەوتە هـزرییە هەیە کە کەناڵێك پێشکەشی دەکات، دەگونجێت سێ کەس کە دادەنیشن بەرامبەر کەناڵێکی وەك(کەناڵی ئاسمانی پەیام ) یەکێکیان لایەنگربێت یەکێکیان نەیارو سێهەمیش بێلایەن بێت. کاری ئەم کەناڵی پەیامە لە ڕاستیدا بریتییە لەوەی کە ئەو کەسەی لایەنگرە بەلایەنگری بیهێڵێتەوە و ئەوەش کە نەیارە بیکات بەبێلایەن و ئەو کەسەشی کە بێلایەنە هەوڵبدات بیکات بەلایەنگر..!

کەواتە گشتگیرییەك هەیە لە جوگرافیاو لە ڕووبەری ئەو کەسانەدا کە کەناڵێکی ڕاگەیاندنی ئیسلامی ڕووی تێدەکات و تاپێشی دەکرێت دەبێت تەرکیز بکەینە سەر ئەو بابەخانەی کە هەموو مرۆڤایەتی پێویستیان پێیەتی، هەموو مرۆڤایەتیش پێویستیان بەدادگەریی‌و دڵسۆزیی‌و ڕاستیی‌و بڵاوکردنەوەی ئاشتی و پێکەوەژیانە، پێویستیان بەوەهەیە کە خەڵك ووریابکرێتەوە لە چارەنووس و مەسەلەکانی لادان و ئەو مەترسییانەی کە خەریکە خەڵکێك تووشی ببێت...هتد. دەگەینە ئەو بابەتەی کە ڕاگەیاندنی نائیسلامی بەو فەلسەفەو بنەما فەلسەفییەی کە هیچ حیسابێك بۆ خواپەرستی ناکات، بەهیچ شێوەیەك لە بەرژەوەندی کۆمەڵگەی مسوڵمان و تاکی مسوڵماندا نییە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر ئێمە بەدیلێکی ڕۆشن و بەهێزمان نەبێت و ڕاگەیاندنێکی

ئیسلامیی تەواو و ئامانجدارمان نەبێت، بەچ شێوەیەك دەتوانین بڵێین باڕاگەیاندنی نائیسلامی نەمێنێت؟ بائێمە دوای ئەو بیردۆزە جیاوازو نامۆیانە نەکەوین، نەبوونی بیردۆزە ئیسلامییەکەیە کە ئەو بیردۆزە نامۆیانە هێرشیان هێناوەتە ووڵات و ئەو فەزایەی کە ئێمە تیایدا دەژین، بەشێوەیەك لە شێوەکان مافیشیان بەخۆیانداوە و ئەومافەش ڕەنگە وەك مافێکی ئەمری واقیع هەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئێمە وەك مسوڵمان زیاتر بەرپرسین لەوەی کە تەعبیر لە ئیرادەو مافی خۆمان بکەین بەداڕشتن و پشتگیریکردن لە فەلسەفەی ڕاگەیاندنی ئیسلامی....

# ئەركی مرۆڤـ لە دیدی ئیسلامەوە

وەك دەزانین مرۆڤـ ئەفرێندراوێكی خودایە، كەسایەتی مرۆڤـ بەتەواوی بەستراوەتەوە بەهەستانی مرۆڤـ بەو ئەركو فەرمانانەی كە خراوەتە سەرشانی كە بریتین لە:

١. یەكتاپەرستی.

٢. بڕوابوون بەپێغەمبەر(درودی خوای لەسەر).

٣. هەوڵدان بۆ خزمەتكردن، بەتایبەت بە مرۆڤـ.

شەریعەتی ئیسلام هەر لە بنەڕەتیدا، ئەگەر هەموو فەرمانەكانی وردبكەینەوە، بۆ خزمەتكردن و پاراستن و ڕێزلێنانی مرۆڤە، ڕێزلێنان لە بیروبڕوای لە بوون و كەسایەتی و ناموسوماڵو سەروەت و سامان و كەسایەتی، لەبەرئەوەدەبینین شەریعەتی ئیسلام بەپێی یاسای گشتی هاتۆتەخوارەوە، لەبەرئەوەی مرۆڤـ بەپێی گۆڕانكارییەكانی سەردەم و بەپێی ئەو پێشكەوتن و ئەو گۆڕانكارییە تازانەی كەدێت بەسەر باری ژیانیدا، باری ژیانی تاكیی بێت یان كۆمەڵایەتی، بەپێی ئەو گۆڕانكارییانە مامەڵە بكات لەگەڵ شەریعەت و خۆی بگونجێنێت لەگەڵ سروشتدا. ئەركو فەرمانی مرۆڤـ لە هەموو ئان و ساتێكدا لەو ئەرك و فەرمانانەدا بەرجەستە دەبێت كە شەریعەتی ئیسلامی جەختی لەسەر كردووەتەوە كاتێك كە باسی خواپەرستی دەكرێت بەمانا فراوانەكەی،

کاتێك باسی تەسلیمبوونی شەریعەت و یاسای خوادەکرێت بەمانافراوانەکەی، ئەمە مانای ئەوەیە کە ڕێزێکی تەواو لەم مرۆڤە گیراوە و خوای پەروەردگار دەیەوێت مرۆڤ ژێردەستەی هاوجۆری خۆی نەبێت.

کەواتە بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤە لە کۆیلایەتیی خراپبەکارهێنان، جائەگەر مرۆڤ بەشێوەیەکی ڕاست خودای خۆی بناسێت پابەندبێت بەشەریعەتی خوای پەروەردگارەوە، بەهەمانشێوەش دەتوانێت دەرکی زاتی خۆی بکات و کەرامەتی خۆی و ئازادی خۆی ببینێت، کەرامەتی مرۆڤ پەیوەستە بەئیمان و ئیسلامەتییەوە و ئەمەش یەکێکە لە سوودە گەورەکانی باوەڕبوون بەیەکتاپەرستی و باوەڕبوون بەپێغەمبەری خوا، لەبەرئەوە فەیلەسوفێکی وەك (محەممەد ئیقبال[1]) لە یەکێك لە مەنزومەکانیدا دەڵێت: (ئەگەر یەکێك ڕەمزی بوونی خۆی بزانێت و تێیبگات، بۆ غەیری خوا سوجدە نابات، خۆی رادەستی هیچ بڕیارێك ناکات جگە لە بڕیاری خوای پەروەردگار). لە ڕوانگەی قورئانیشەوە مرۆڤ ئەوەندە ڕێزی لێنراوە کە ڕووی وتاری ئاڕاستەکراوە و حسابی موکەللەفو لێپرسراوی بۆ کراوە، مرۆڤ بەرپرسە لە جێبەجێکردنی فەرمانە گەورەو گرانەکان، کەواتە کەرامەتی مرۆڤ یەکێکە هۆکارەکانی هاوسەنگبوونی باوەڕبون بەیەکتاپەرستی و باوەڕبوون بەخودا، بەڵام لێرەدا ئەم پرسیارە دێتەپێشەوە : ئەگەر مرۆڤ لای خوا بەڕێزبێت، لە

---

[1] - اقبال لاهوری(١٨٧٧ ـ ١٩٣٣ز) بیرمەند و شاعیر و فەیلەسووفی پاکستانی، دکتۆرای فەلسەفەی لەفەرەنسا خوێندووە و کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر جیهانی ئیسلامیی هاوچەرخ داناوە.

قورئان و شەریعەتی ئیسلامدا بەڕێزبێت، ئەم بەڕێزییە چۆن تەفسیربکرێت لە حاڵێکدا ئەو هەموو بیروبۆچوونە جیاوازە هەیە؟ ئەو هەموو ئەرکو بیر و ئایدۆلۆجیا جیاوازەی هەیە؟ ئەو هەموو بەرژەوەندییە دژ بەیەکەی هەیە؟

بوونی ئەم جیاوازییانە پێویستە بەشێوەیەکی جوان مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. چونکە گەر بەشێوەیەکی وەستایانەو شارەزایانە مامەڵەی لەگەڵدا نەکەین، بێگومان دەبێتە هۆکاری خوێنڕێژی و هۆکاری پێکدادانی مرۆڤەکان لە ژێر ناونیشانە جۆراوجۆرەکاندا.

لەبەرئەوە کە فریشتەکان پرسیاردەکەن لە خوای پەروەردگار، داوای ئەوەدەکەن خوا بۆیان ڕوونبکاتەوە و وەك وانە فێریان بکات وتیان: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء﴾ البقره:٣٠. کاتێك خوای پەروەردگار بڕیاریدا مرۆڤ بخاتە سەرزەوی و ئەو پلەی جێنیشنییەی پێببخەشێت پرسیاریان کرد، پرسیارەکەیان وەك ئینکاری کاری خودانەبوو، بەڵکو داوای ڕونکردنەوە و تەسبیتی وانەیەکیتر لەوانەکانی بیروباوەڕیان لێدەکرد و وتیان: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ البقرة:٣٠. ئەوان ئەو پرسیارەیان ئاڕاستەی خوای پەروەردگار کرد کە بە پێوانەیەك بێت کە فریشتەکەکان لایانوابوو دەبێت ئەوکەسەی کە جێنشین بێت ئەو سیفەتانەی تیادابێت، خەریکی تەسبیحاتی خوابێت، خەریکی بەپیرۆزو بێگەرددانانی خوداوەندبێت، خەریکی پاکڕاگرتنی ناوی خوداوەندبێت، نەك مرۆڤێك کە لەسەر سادەترین بابەت و

زۆرلاوەکی، بەیەکەوە بەشەڕدێن، جەنگو کێشەی دوورودرێژ دروستدەکەن لە نێوان خۆیانداو ئاگری ئاژاوە هەڵدەگیرسێنن وەك ئەمڕۆ دەیبینین لە جیهاندا. ئەو هەموو جەنگو کێشەی هەیە بمانەوێت تەفسیرێکی عەقڵی و مەنتیقی بۆ بکەین نایدۆزینەوە، بەڵام لێرەدا دەپرسین، ئەگەر مرۆڤـ ئەوەندە گرنگو بەڕێزە، ئەو هەموو جەنگو کێشەیە بۆ؟ ئەو هەموو ناکۆکیو جیاوازییە بۆ؟ لەبەرئەوە کە سەیری ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) و ژیاننامەی ئەو خۆشەویستە دەکەین، جارێکیتر بۆمان ڕووندەبێتەوە کە ئەم مرۆڤە بەڕێزە وێڕای ئەو جیاوازیانەی کە هەیانە لە ڕووی بیروبۆچوون و نەتەوە و بیروڕای سیاسی و شوێنی دانیشتنەوە، تەنانەت لە ڕووی سەرچاوەی فیکری و سەرچاوەی سیاسییشەوە، ئەم کەسانە دەتوانن لەسەر ڕاستەڕێیەك کۆببنەوە و پێکەوە بجولێن و پێکەوە بدوێن تا ئاڵوگۆڕی بیرو بۆچوونەکان و ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندی بکەن و بەهەموو شێوەیەکیش خۆیان بپارێزن لە توندوتیژی و بەهەموو شێوەیەك خۆیان بپارێزن لە زۆرلێکردن و هەڕەشە لە یەکتری نەکەن، بێگومان بەدروستکردنی چەند ئامانجێکی گەورە و بەرز بۆ هەموو مرۆڤەکان، دیارە ئەمەش کاتێك دەبێت کە ئەو بەرنامەجوان و بەرزەی کە خوای پەروەردگار دایڕشتوە و خەڵکی بۆ بانگکردووە، دەکرێتە پێوەر، چونکە ئەو مەنهەجە هـزرییە قورئانییە بە ڕاستی دابینکەری بەختەوەری مرۆڤەکان و پێکەوەژیانە، دابینکاری ئەوەیە کە گەلان هۆزو تیرەجیاوازەکان، تەنانەت شارستانیەت و ژیارە

دژ بەیەکەکان ئەندازەیەك بەخۆیاندا بێنەوە و لەسەر ڕووبەرە هاوبەشەکان کاربکەن، مامەڵەی باشیان لەگەڵ یەکتردا هەبێت، ڕێزی ئاڵوگۆڕکراو لە نێوانیاندا هەبێت، ئەگەر ئەم مەنهەجەش پەیڕەوبکرێت دیارە زۆر کێشە چارەسەردەکرێت، تەنانەت مرۆڤایەتی لە باشترین دۆخدا دەژین. بەداخەوە ئەوەی ئێمە ئێستا دەیبینین لە جیهاندا ناوچەیەك نییە لە ڕووی جیۆپۆلۆتیکەوە گرنگ بێت و کێشەیەك یان چەند کێشەیەکی تێدا دروستنەکرابێت، هەموو هەوڵی هێزە دونیاخۆرەکان ئەوەیە کە نەهێڵن ئەم میللـەتانە پێکەوە گفتوگۆبکەن بە شێوەیەکی دۆستانە بۆ ئەوەی بزانن کە ئایا ئەمانە لە ڕاستیدا دوژمنی یەکترن؟ ئایا ئەمانە ناحەزو نەیاری یەکترن؟ لەبەرئەوە زۆر جەختدەکەمەوە لەسەر تێگەیشتن لەو ئایەتە پیرۆزەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا﴾ الحجرات:١٣.

لەراستیدا گەلێك لە مرۆڤەکان هەرئەوەندەیان زەحمەتە تا دەگەن بە دیداری یەکدی و لە کەشێکی دوور لە هەڕەشەو دوور لە توندوتیژیدا پێکەوەدادەنیشن، ئەگەر تەماشای بابەتەکان بکەین، ئەوەندە دەهێنێت ئێمە زاڵ بین بەسەریدا. ئەو بارودۆخەی کە ئێمە تیایدا دەژین چ بارودۆخی نێودەوڵەتی یان ناوچەیی بێت، لە ڕاستیدا زۆر ئاڵۆزکراوە، زۆر دژایەتی پێوەدیارە، پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان چ وەك تاك چ وەك گەلان بەڕاستی پەیوەندییەکی نادۆستانە و نامرۆڤانەیە.

ئێمە لەم هەلومەرجەدا وەك مسوڵمان لە هەموو کەس پتر لێپرسراوین لەوەی کاربکەین و ئاوڕبدەینەوە لەو دەقە شەرعییانەی کە بانگەوازمان دەکات بۆ کەلتوری لێبوردەیی، بانگەوازمان دەکات بۆ ڕەچاوکردن و پەیڕەوکردنی سیاسەتی پێکەوەژیانی ئاشتییانە، بەتایبەتی کاتێك پرۆگرامێك دادەنێین بۆ قوتابخانە و زانستگاکانمان، کاتێك کە سیاسییەکانمان دەکەونە گفتوگۆو بازرگانەکانمان دەگەڕێن و دەیانەوێت خێروبێرێك لە وولاتانیتر بهێنن بۆ وولاتەکەمان، لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا ئێمە زۆر پێویستمان بەوە هەیە وردترو قوڵتر لەو دەقە شەرعییانە وردببینەوە.

لێرەدا ئاماژە بکەین بۆ ئەو نمونانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هەن و جەختدەکەنەوە لەسەر ئاسانیی ئەم شەریعەتە، جەختدەکەنەوە لەسەر ئەو لایەنە ڕۆشن و درەخشاوانەی کە لە شەریعەتی ئیسلامدا هەیە، جەختدەکاتەوە لەسەر لێبوردەیی و پێکەوەژیان و ئاسانگیری و عوزرهێنانەوە بۆ یەکترو توانەوە لە خۆشەویستی یەکتردا، گەر ئەم رەوشتانەشمان لە خۆماندا بەدیهێنا، بەدڵنیاییەوە دەتوانین زاڵبین بەسەر زۆر لەو قەیرانانەی کە ڕوبەڕوومان دەبنەوە، چ قەیرانی سیاسی بێت چ ئابووری، چی قەیرانی کۆمەڵایەتی بێت.

پێش هەمووشتێك دەبێت ئەوە بزانین کە قورئانی پیرۆز بابەتی لێبوردەیی بەوشێوەیە باسکردووە کە یەکێك بێت لە تایبەتمەندییەکانی هەموو تاکێکی مسوڵمان کاتێك مامەڵە لەگەڵ ئەویتردەکات، ئێمە ژمارەیەکی زۆر ئایەتمان هەیە کە داوای لێبوردن(عەفو)مان لێدەکات،

زۆر ئایەتمان هەیە باسی ئارامی(حیلم)مان بۆ دەکات، هەندێك ئایەتیش باسی ئەوەمان بۆ دەکات گەر یەکێك خراپەیەکی لەگەڵ کردیت، تۆ نەك هەر لێی خۆشبە بەڵکو بەجوانی لێیخۆشبە: (**صفح جمیل**)، وای لێبکە کە هیچ لە دڵیدا نەمێنێت، چونکە بەوشێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت کە تۆ هیچت لە دڵدانەماوە.

لەلایەکیترەوە قورئانی پیرۆز ڕێگری دەکات لە هەندێك ڕەوشتی خراپ، کە بنەمای هەموو خراپەیەکن لە ناو کۆمەڵگەدا. ڕێگری دەکات لە درۆ، لە خۆبەگەورەزانین، ڕێگری دەکات لە دەستتەنگی و ڕەزیلی(بخل)، لە شانازیکردن بەسەرخەڵکەوە، ڕێگری دەکات لە ڕووپامایکردن....هتد. هەر شتێك وەزعی خۆشی مرۆڤایەتی تێکبدات، کانیاوی سازگاری نێوان مرۆڤەکان لیخنـبکات، لە شەریعەتی ئیسلامدا ڕێگریی لێکراوە.

تەماشادەکەیت ئیسلام تەنها بانگەوازی نەکردووە بۆ ئەوەی ڕەوشتی باشمان هەبێت ودووربـبین لە ڕەوشتی خراپ، بەڵکوهاتووە زۆر بەدرێژی باسی ئەوەی کردووە کە کردەوە باشەکان کامانەن و ڕیزی کردووە بۆمان، لەولاشەوە کردەوە خراپەکانی باسکردووە بۆ ئەوەی خۆمانی لێدووربخەینەوە.

حیکمەت لە هەموو ئەمانەدا چییە؟

بێگومان ئەگەر لە کۆمەڵگەدا یاسایەکی رەوشتی و یاسایەکی عورفی وەها هەبێت کە خەڵك لەسەری بڕۆن و یاساکەش نوسراوبێت بەبەڵگە گیرابێت لەسەر خەڵکی، دیارە ئەوە سوودبەخشترە، تا خەڵك نەیەت

بەئارەزووی خۆیان سیفەتە باشەکان یان سیفەتە خراپەکان دیارییبکەن، دەبێت یاسایەکی نوسراو هەبێت بۆ ئەوەی خەڵك نەکەونە هەڵەوە.

یاسای ئەخلاقی کە گەورەترین کۆڵەکەی دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی پڕ لە لێبوردەییە لە قورئانی پیرۆزدا لەتاکەوە دەستپێدەکات، تا دەگاتە خێزان، تا دەگاتە کۆمەڵگە، تا دەگاتە دەوڵەت، پاشان هەموو بازنەی گەورەی مرۆڤایەتی، لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا تەماشادەکەین میتۆدی قورئانی تەرکیز دەکات لەسەر زانست و حیکمەت...

لەبەرئەوە پرۆسیسی ڕاهێنانی مرۆڤ لەسەر لێبوردەیی و گیانی لێبوردەیی و پێکەوەژیان پشتدەبەستێت بەچەند کۆڵەکەیەك:

**یەکەم:** بریتییە لە پاکژکردنەوەی دەروون:

ئەوەی کە زاناکانی ئەخلاق پێیدەڵێن (طهارة النفس)، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا، قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾ الشمس٧– ١٠. یەکەمین هەنگاو کە پێویستە مرۆڤ کاری لەسەر بکات، پێش کارکردن لەسەردەرەوە، پێشئەوەی کار لەسەر فەرمانگە و ناوەندە کۆمەڵایەتییەکەت بکەیت، بریتییە لە کارکردن لەسەر خۆت، کارکردن لەسەر دەروونی خۆت، هەمیشە خۆت بەوەبزانیت کە خۆت شایانی زەمو سەرزەنشتکردنیت نەك خەڵکیتر. !

کەواتە مرۆڤی سەرکەوتوو ئەوەیە کە بتوانێت دەروونی خۆی پاك بکاتەوە، مرۆڤی سەرکەوتوو ئەوەیە کە بتوانێت لە ناخەوە پاکببێتەوە،

بەڵام هەرکەسێکیش ناخی پاکنەبووبێتەوە، لەو سەرەوە بەنائومێدی و دەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە.

یاخود خوای پەروەردگار جەختدەکاتەوە کە باسی قیامەتمان بۆ دەکات دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ لاَيَنفَعُ مَالٌ وَلاَبَنُونَ، إِلاَّ مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ الشعراء:٨٨– ٨٩. دڵ دەبێت ساغبێت و ڕەقیی و کینەو دوژمنایەتی و خۆبەگەورەزانین و ڕوپامایی و خۆپەرستی تێدانەبێت.....هتد، ئینجا ئاگامان لەوەبێت قورئانی پیرۆز زۆر باسی ئەوەدەکات کە مرۆڤـ پێویستدەکات کاتێك کە دەچێتە ناوخەڵك و تێکەڵیان دەبێت بزانێت رەنگە کەسانێك هەبن بەرامبەری خراپ بن و دەیانەوێت سووکایەتی پێبکەن و ڕقی هەستێنن، لەوحاڵەتانەدا قورئان داوای ئەوەمان لێدەکات ڕقی خۆمان بخۆینەوە. سەرنجێکی ئەو ئایەتە بدە کە دەفەرموێت: ﴿وَسَارِعُواْ إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾ آل عمران:١٣٣. پەلەبکەن، واتە پێشبڕکێ بکەن لەناو خۆتاندا هەوڵی ئەم دووشتە بدەن: ﴿مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ) یەکەم خۆمان بەگوناهبار بزانین و خۆمان بەوەبزانین هەمیشە پێویستمان بە لێخۆشبوونی خودایە. گەر مرۆڤ ئەوە بکاتە کەلتوری، هەرگیز خۆی بەگەورەتر نازانێت لە خەڵکانیتر، خۆی بەچاکتر نازانێت لە خەڵکیتر، ئینجا بەتەمای دوواڕۆژێکی گەشبن لە بەهەشتدا، بەهەشتێك کە پانتاییەکەی ئاسمانەکان و زەوییە و ئامادەکراوە بۆ تەقواکاران، بەڵام ئەهلی تەقوا کێین؟

پارێزگاران ئەوانە نین کە بە خۆیان دەڵێن (موتتەقی)، ئەوانەن کە ئەم سیفەتانەیان تیایە، سیفەتی کردەیی ڕۆژانەیان﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاء وَالضَّرَّاء﴾ آل عمران:١٣٤. لە هەموو هەلومەرجێکدا ئەوان ئامادەن سامانی خۆیان و زانست و زانیاری خۆیان ببەخشن، بەخشندەبن بەرامبەر بەدەوروبەر چ لەو کاتانەدا کە کاتی خۆشییەو ڕەنگە مرۆڤـ غافلْ بێت، چ لەو کاتانەدا کە کاتی ناخۆشییەو مرۆڤـ تەنها خۆی لە بیرە، لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا مرۆڤ کۆنترۆڵکردنی تووڕەیی بێتە کەلتوور بۆی ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ﴾ آل عمران:١٣٤. ئەوانەشی کە ڕق و تورەیی خۆیان دەخۆنەوە ئامادەنین ڕقو تووڕەیی خۆیان بەسەر خەڵکدا بتەقێننەوە، بەڵکو بە خۆیاندا دەچنەوە و سنوور بۆ خۆیان دادەنێن ﴿وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾ آل عمران:١٣٤، هەمیشە لێبوردەن بەرامبەر بەخەڵك. ئەمە ڕەوشتی ئەهلی تەقوایە، ڕەوشتی کردەییە، کە دەبێت خۆمانی لەسەر ڕابهێنین، نەك بەپێچەوانەی هەندێك مرۆڤی ئەم سەردەمەوە کە ئامادەنییە لە خۆشیو ناخۆشیدا ببەخشێت و بەخشندەبێت، هەموو بەخشندەییەکانی لەبەرخاتری خۆی دەبێت نەك لەبەرخاتری خەڵك، ئامادەنییە ڕقی خۆی بخواتەوە، بەڵکو زۆر بەئاسانی دەچێت میدیاکان بەکاردەهێنێت و ئەو شتەی کە لە ناخیایەتی و ئەو تووڕەییەی کە لە ناخیدایە و ئەو خۆپەرستییەی لە ناخیایەتی، دەیەوێت لە ڕێگەی میدیاکانەوە دەریبخات و دووژمنایەتی خەڵك دەکات. ئەوبێزارییەی کە بۆی دروستدەبێت لەسەر هەڵوێستی کەسێك یان لایەن و حیزبێك ئەو نایەوێت کاتی بەسەردا بڕوات ڕقەکەی

دەردەبڕێت، ئەمەش لەگەڵ پێوەرە قورئانییەکەدا ناگونجێت، ئەوپێوەرە قورئانییە داوای ئەوەمان لێدەکات لەو حاڵەتانەدا کە توڕەیت، با توڕەییەکەت نەبێتە کردەوە و مەیکە بەقسەیەك کە خەڵکی پێـزویربکەیت و ئازاری دەروونی خەڵکی پێبدەیت: ﴿وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾ آل عمران:١٣٤. بەڵکو ئەگەر خەڵکیش بەرامبەر تۆ خراپ بوون و بەپێچەوانەی یاسای برایەتی لەگەڵ تۆدا ڕەفتاریان کرد، تۆ بیانبوورە، ئایەتەکە ووشەی (ناس) بەکاردەهێنێت، کە هەموو خەڵك دەگرێتەوە نەك تەنها مسوڵمان، واتە نەیفەرمووە:﴿والعافين عن المؤمنين﴾ بەڵکو: ﴿وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ آل عمران:١٣٤. جگەلەوەش ئەمە بەڵگەیەکیشی تێدایە کە دوای ئەو عەفوکردنەش چاکەبکەن لەگەڵ خەڵك، واتە ئەگەر خراپیش بێت لەگەڵتدا تۆ چاکەی لەگەڵ بکەیت، چونکە ئایەتێکیترمان هەیە دەفەرموێت: ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾ فصلت:٣٤. فەرموودەیەکی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) جەخت لەم مانا بەرزانە دەکاتەوە و دەفەرموێت (من كظم غيضا وهو يقدر على إنفاذه، ملأ الله قلبه أمنا وإيمانا) واتە: هەرکەسێك بتوانێت توڕەییەکەی بخواتەوە لە حاڵێکدا دەتوانێت ئەو توڕەییە بکات بەکردەوە بەرامبەر بەوکەسەی کە خراپەی بەرامبەری کردووە، ئالەو حاڵەتەدا خۆی بگرێت و لێبوردەبێت خودا دڵی پڕدەکات لە ئارامی و باوەڕ.

ئەگەر مرۆڤـ دوای هەوەس و ئاراستەی ماددیی کەوت و وازیهێنا لە بەرنامە قورئانییەکە، لەخۆی بایی دەبێت و گومڕا دەبێت، ئامادەنییە راستی وەربگرێت و بەسووکیی سەیری بەرامبەرەکەی دەکات، بەسووکیی سەیری کەسێك دەکات کە نەتەوە و ئاینی جیابێت، یان تەنانەت مەزهەبی یان حیزبەکەی جیابێت.

من لێرەوە داوادەکەم لە هەموو تاکێکی کورد لە جیهاندا، با واز لەو حاڵەتی خۆبەگەورەزانین و خەڵك بەسووکزانینە بهێنین، بەڵکو بەپێچەوانەوە خۆمان لە رووی رێز و برایەتییەوە بەکەمتر بزانین لە خەڵك و، خەڵك وەك مرۆڤـ بەگەورە بزانین، ڕێزی ئەوکەسە زیاتر بگرین کە جیاوازییەکەی پترە لەگەڵمان، چونکە ئەمە کەلتوری لێبوردەییە و دەمانکاتە ئەو مرۆڤەی کە خوای پەروەردگار ڕێزی لێگرتووە و کەرامەتی بۆ بڕیارداوە.

خوای پەروەردگار مرۆڤەکان پەروەردە دەکات لەسەر ئەوەی دوای ئارەزووپەرستی نەکەون، سەیردەکەین بەپێغەمبەرەکەی خۆی دەفەرموێت: ﴿وَلاَتَتَّبِعُواْ أَهْوَاء قَوْمٍ قَدْ ضَلُّواْ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيراً وَضَلُّواْ عَن سَوَاء السَّبِيلِ﴾ المائدة:٧٧. دوای ئارەزوو نەکەوێت، چونکە مرۆڤ لە ڕێگەی خوا لادەدات.

کەواتە ئەوەی کە من دەمەوێت خۆم و حزبەکەم یان گروپەکەم بسەپێنم، یاخود بەسووکی سەیری خەڵکیتر بکەم، پێموابێت خۆم هەموو جیهان ئاوەداندەکەمەوە بەڵام بەرامبەرەکەم هیچی نەکردوە! ئەمە ئارەزووگەری و خواستی ئارەزووپەرستیە و ڕێگرە لە دادگەری لە

نێوان مرۆڤەکاندا. هەموو ئەو کێشانەی کە ئێستا لە وولاتانی خۆمان و جیهاندا بوونی هەیە لە ئارەزوپەرستییەوە سەرچاوەی گرتووە، ئارەزووە نایەڵێت دادپەروەری دروستبێت لە نێوان مرۆڤەکاندا کاتێك مامەڵە لەگەڵ یەکتردەکەن و هەڵسەنگاندن بۆ یەکتردەکەن.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ﴾ المائدة:٨. واتە: ئاگاتان لێبێت دوای ئارەزووپەرستی نەکەون، کە دوای ئارەزووپەرستی کەوتن ئەوا زۆر نزیکە لەوەی کە واز لە دادپەروەری بهێنن.

ئینجا قورئانی پیرۆز بەڕاستی ڕێگەی خۆشکردووە بۆ بڵاوکردنەوەی کەلتوری لێبوردەیی کاتێك چەندین وانەی ڕەوانمان دەداتێ لە ئەخلاقی کۆمەڵایەتیدا.

بۆنمونە گومان،: گومانمان بەرامبەر بەخەڵك نەبێت، گومانپەیداکردن بەرامبەر بەخەڵك لە هەڵسەنگاندنی هەڵسوکەوتی خەڵکدا،بۆنموونە خوای پەروەردگار دەفەرموێت :﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾ الحجرات:١٢. جاری واهەیە ئێمە لە ڕوانگەی خۆپەرستییەوە هەر قسەیەکی خراپ لەسەر خەڵکێك ببیستین باوەڕدەکەین، لە ڕوانگەی خۆپەرستییەوە کاروکردەوە و قسەو گوفتاری خەڵك بەپیلان دەزانین و متمانەمان بەخەڵك نییە، قورئان ڕێگری دەکات لەوە و دەفەرموێت متمانەت بەخەڵك هەبێت، بەڵام نەك بەو مانایەی هەرکەسێك قسەیەکی بۆ کردیت تۆ وەریبگریت، دەڵێم هەموو شتێك بەپێوەری خۆی هەڵسەنگێنن هەرقسەیەکتان بۆ هات لە

لایەن کەسێکەوە کە دڵنیانین لێی دەفەرموێت:﴿یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا إِن جَاءکُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَیَّنُوا أَن تُصِیبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَافَعَلْتُمْ نَادِمِینَ﴾ الحجرات: ٦. کەواتە پێویستە بە وریایی هەڵسوکەوت بکەیت بەرامبەر هەرگوزارەیەك کە بۆ ماندێت کاتێك لە پایەیەکی سیاسیی یان ئیداریی یان یاساییداین، ئەو پایە جیاوازانە کە بە حوکمی ئەرکەکەت پێتدەدرێت، جۆرەها قسەوباسو هەڵسەنگاندنت بۆ دێت، لەسەر کەسێکی دیاریکراو یان لایەنێکی دیاریکراو، تۆنابێت خۆشباوەڕبیت یان بەپێی ئەوەی کە دەرونت حەزی لێیەتی مامەڵە لەگەڵ ئەو خەڵکەدا بکەیت، چونکە خوای پەروەردگار بڕیاریداوە (بە پێی ئەو ئایەتەی کە باسمان کرد) تەنها ڕێگایەك بۆ ناسینی ئەویتر بریتییە لە زانست و زانیارییەکی ڕاست، ﴿وَلاَ تَقْفُ مَا لَیْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ﴾ الإسراء:٣٦. بەدوای شتێکدا مەڕۆ کە زانستی تەواوت پێینەبێت، ﴿إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾ الإسراء٣٦. واتە: ئەو شتەی کە بۆت باسدەکەن چاوی بۆ بەکاربهێنە، گوێی بۆ بەکاربهێنە، دڵی بۆ بەکار بهێنە، لەپێشدا بیستن(سمع)ی بۆ بەکاربهێنە، ئینجا چاو(بصر)ی بۆ بەکاربهێنە، ئینجا (فُؤَاد)ی بۆ بەکاربهێنە واتە دڵی بۆ بەکاربهێنە و هەڵسەنگاندنی بۆ بکە، ئینجا دەتوانی زانستێکی تەواو، زانستێکی وردو ڕاستەقینە پەیدابکەیت بەو بابەتەو پێویستە لەسەر بنەمای ئەو زانستە هەڵوێست وەربگریت. قورئانی پیرۆز خۆی فێرماندەکات کە ئامانجی سەرەکی پەیامی هەموو پێغەمبەران بریتییە لە بەختەوەریی مرۆڤایەتی، تەنانەت ئەو هەموو

جەختکردنەوەی لەسەر یەکتاپەرستی دەکرێتەوە و ئەو هەموو ڕێگرتنە لە شیرکو بێباوەڕی، لەبەرئەوەیە مرۆڤەکان بەختەوەربن، لەبەرئەوەیە مرۆڤەکان نازانن یەکتاپەرستی چ خێرێکی تێدایە، پێغەمبەران دێن فێریاندەکەن، نازانن شیرکو بتپەرستی چ خراپەیەکی تێدایە، پێغەمبەران لەو خراپانە ئاگاداریاندەکەنەوە، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار زۆر بەڕوونی دەفەرموێت:﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَاء رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ لاَيُظْلَمُونَ﴾ یونس:٤٧. واتە هاتنی پێغەمبەران لەبەر دادپەروەریو یەکسانی و بەختەوەرییە.

کە ئێمە هەستمانکرد لە وولاتەکەماندا دادوەری هەیە جیاوازی چینایەتی نییە، جیاوازی نەتەوایەتی و ئاینی نییە، جیاوازی لە نێوان هەژارو دەولەمەندا نییە، کە هەستمانکرد ئەو دادپەروەرییە هەیە، ئەوکاتە لە ناخەوە هەست بەبەختەوەری دەکەین.

پێغەمبەران هاتوون بۆ ئەوەی ئەو چەمکە بەرزانە لە سەرزەوییدا پیادەبکرێت، پێغەمبەران بۆ ئەوە نەهاتوون بەزۆر بیروبڕوایەك بسەپێنن بەسەر خەڵکدا، بەڵکو بەڵگەیان پێبووە و ڕاستییان بۆ خەڵك ڕوونکردۆتەوە، ئینجا خەڵك خۆیان سەرپشکبوون، دیارە ئەگەر دوای ڕاستی بکەون ئەوە خێری دونیاو ئاخیرەتیان بەدەستدەکەوێت، ئەگەر دوای ڕاستی نەکەوتن ئەوە خۆیان زیاندەکەن، ئەمەش بەچی دەبێت؟ بەدیالۆگ.

تەماشابکە قورئان پڕە لە دیالۆگ:

-﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُلِ اللَّهُ وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ سبأ:٢٤.

-﴿قُل لَّا تُسْأَلُونَ عَمَّا أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْأَلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ سبأ:٢٥.

-﴿قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ﴾ سبأ٢٦.

تەماشادەکەین ئەم قورئانە جوانترین شێواز و ڕەوشتی بەرزمان فێردەکات، پێویستە کاتێك دەکەوینە گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکێکیتردا هەمیشە بەو ڕۆحییەتەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین کە تێبگات ئێمە هیچ دوژمنایەتییەکی تایبەتیمان لەگەڵیدا نییەو دان بەبوونیدا بنێین، بەڵکو ئەگەری ئەوە دادەنێین کە ئەو لەسەر ڕاستی بێت و قسەی لەگەڵدەکەین، ئەگەر ئەوە دابنێین ئێمە خۆمان تاوانمان کردبێت و ئەو بەخراپ لە ئێمە تێگەیشتووە، ئەگەری ئەوەدابنێین ئەو باشبووە و ئێمە خراپبوین... هتد، هەمووشی دەچێتەوە لای دیوانی خوای پەروەردگار خۆی: ﴿قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ﴾ سبأ٢٦.

دیارە ئەم باسە باسێکی زۆر ڕیشەییە و پەیوەندیی بەبونیاتنانی کەسێتی هەموومانەوە هەیە و پەیوەندییشی بەوەوە هەیە کە لە ناخەوە ئامادەبین بۆ ئەوەی لێبوردەبین بەرامبەر خەڵکی، لە ناخەوە دەبێت ئێمە ئامادەبین فێری ئەوەبین خزمەتگوزاری خەڵك بین، هەموو هەوڵمان بۆ ئەوە نەبێت کە خەڵك لە خزمەتی ئێمەدابێت، ئەمە

پێچەوانەی لۆجیکی قورئانە و پێچەوانەی بنەمای پێکەوەژیانە، پێچەوانەی پەیامی پێغەمبەرانە، لەبەرئەوە هـزری ئیسلامی زۆر جەخت لەسەر لێبوردەیی دەکاتەوە، زۆر جەخت لەسەر ڕێزگرتن لە مرۆڤـو داواکردنی خۆشی و کامەرانی بۆ هەموو مرۆڤێك دەکاتەوە، بەم تێگەیشتنەوەیە کە ئێمە دەتوانین ڕەگەزێکی باشبین لە کۆمەڵگەکەی خۆماندا، هەروەها ئەگەر ئێمە تەنانەت کە باسی تێکۆشان لە پێناوی خوادا دەکرێت، تەنها هەوڵو تێکۆشانێك شەرعییە کە تەنها لە پێناوی خوادابێت لە ڕێی دادپەروەری و بەرقەراری دادپەروەریدابێت، نەك لەبەر خاتری ئەوەی بگەم بەدەستەڵات یان تۆڵەبستێنمەوە یان زاڵبم بەسەر خەڵکدا، چونکە ئەمانە هەڵەی گەورەن، ئامانجی ناشەریفە کە بمەوێت بەناوێکی شەرعییەوە بگەم بەمەبەستێکی ناشەرعی، نەك ئامانجم لە هەوڵو تێکۆشانم ئەوەبێت بگەمە دەستەڵات،و تۆڵە لە خەڵکێك بکەمەوە یاخود خەڵکێك سەرشۆڕ و سەرکزبکەم، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:
﴿فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ لاَتُكَلَّفُ إِلاَّ نَفْسَكَ وَحَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَسَى اللّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَاللّهُ أَشَدُّ بَأْساً وَأَشَدُّ تَنكِيلاً﴾ النساء٨٤.

ئەمەش کورتەیەك بوو بۆ ئەوەی بچینە ناو باسێکی زۆر گرنگەوە کە کێشەی گەورەی مرۆڤەکانە لەم سەردەمەداو هـزری ئیسلامییش ـ قورئانی پیرۆز وەك سەرچاوەی سەرەکیی هـزری باوەڕداران ـ زۆر بەوردی و ڕوونی جەختی لەسەردەکاتەوە....

لەباسی پێشوودا ئاماژەمان بە چەند بنەمایەکی ئەم دوو پرەنسیپە گرنگەکرد و گەشتینە ئەوەی کە تەنانەت لە هەلومەرجی جەنگو تێکۆشانی مسوڵمانانداندا لەگەڵ غەیری خۆیاندا، پێویستە مەبەستی مسوڵمانان بانگەواز بێت بۆ ئاینەکەی خوداو برەودان بەڕێگاو ڕێبازی شەریعەتەکەی خودا بێت، واتە هیچ مەبەستێکی خۆیان لە ئارادا نەبێت، مەبەسی تاقمگەرایی و مەبەستێکی دونیایی نەبێت بۆ دەستەڵات و پاوانکردنی دەستەڵات و تۆڵەسەندنەوە لە خەڵکی نەبێت، چونکە تا ڕێگا ئاشتەواییەکان فەراهەم بن نابێت ڕێگای توندوتیژی و جەنگ و کوشتار بگرینەبەرو بڵێین: لە هەلومەرجی نەخوازراودا ڕێکدەکەوێت مسوڵمانان ڕوبەڕووی کەسانی ناحەز و نەیار ببنەوە و هەڵوێست بگاتە ڕوبەڕووبوونەوە، واتە هەموو ڕێگاکانی گفتوگۆو ئاشتی دادەخرێن، واتە هیچ ڕێگایەك نامێنێتەوە بۆ پاراستنی بانگەوازی مسوڵمانان جگە لە جەنگو کوشتار، ئەمە بەو مانایە نییە کە ئیتر بڕیاری جەنگ دەبێت بڕیارێکی کۆتایی بێت و هەتاسەر لەگەڵ یەکدی بجەنگین، بەتایبەتی لەو حاڵەتانەدا ڕەنگە لایەنی بەرامبەر تەسلیمی واقیعی تازەببێت و ڕەنگە تەسلیمی سەرکەوتنی مسوڵمانان ببێت، لە حاڵەتی سەرکەوتندا زۆرگرنگە مسوڵمانان ئاگاداری شەریعەتی پەروەردگار بن، واتە نابێت لە ئەنجامی سەرکەوتن و دەستکەوتی مادددییدا کە ڕەنگە مرۆڤ مەستی سەرکەوتنبێت و ئیتر پێیوابێت هەموو ئاستەنگەکانی بۆ تەخت بووە، لەو حاڵەتانەدا ئایەتێکی زۆر گرنگمان هەیە کە خوای پەروەردگار

گوتارێکی زۆر ڕوونی تێدا باسکردووه و دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلاَتَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِناً﴾ النساء٩٤.

ئەم ئایەتە بەو دەستپێکردنە کە ڕوی گوتار لە ئیمانداران دەکات، باسی ئەوەدەکات کە هەمیشە هەوڵو تێکۆشان و گەڕانی ئێوە کە لە پێناوی خوادایە دەبێت زۆر وردو بەسەرنج بن، بەدیققەت بن، ﴿فَتَبَيَّنُواْ﴾ واتە بزانن بۆ کوێ دەچن و بەرەو کوێ دەچن؟ حاڵی خۆتان ببینن و حاڵی بەرامبەریشتان ببینین، دەکرێت ئێوە ئەوەندە بەهێزبن بەزوویی بەرامبەرەکەتان تەسلیمی واقیعەکەببێت و بێتەپێشەوە و دەستی ئاشتی بۆ ئێوە درێژبکات، لەو حاڵەتانەدا نابێت مسوڵمانان سەرمەستی سەرکەوتن بن، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلاَتَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِناً﴾ النساو٩٤. واتە: ئێوە ڕەدی بانگەوازی ئاشتی بەرامبەرەکەتان مەکەنەوە، چونکە ئەگەر وابێت﴿تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ النساء٩٤. دیارە ئێوە سەرمەستی داواکردنی پێداویستییەکانی دونیان و دەتانەوێت دونیاتان دەستبکەوێت.

ئیسلام نایەوێت بەرامبەر لەناوببات، مسوڵمان دەبێت جیاوازی هەبێت لە نامسوڵمان، پێویستە هەڵگرانی ئاڵای ئیسلام جیاواز بن لە کەسانێکیتر، واتە هەمیشە دەرفەتی ڕزگاربوون بۆ لایەنی بەرامبەر بکرێتەوە، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿فَعِندَ اللّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ كَذَلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ اللّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُواْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَاتَعْمَلُونَ

خَبِيراً﴾ النساء٩٤. بێگومان ئەگەر بەوردی لە هەلومەرجی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکە وردبینەوە جێبەجێی بکەین بەسەر واقیعی ئەمڕۆماندا، بنەمایەکی زۆرگەورە لە فیقهی سیاسی ئیسلامییمان بۆ دەردەکەوێت، کە ئامانجی دەستەڵاتی ئیسلامی لەڕاستیدا سەرکوتکردن و لەناوبردنی دەنگو ڕەنگە جیاوازەکان نییە بەو ئەندازەیەی کە مەبەستیەتی بانگەوازی خوداو خواپەرستی و ڕزگارکردنی مرۆڤـ لەسەر زەویدا بەردەوام بێت، چونکە بابەتەکە بابەتی بانگەوازو ڕێنماییکردنەو بابەتی ئاینداری و پەیوەستبوونە بەخوداوە، نەك بابەتی دەستەڵات و سەرکەوتن و دەستکەوت و بازرگانی و خۆسەپاندن، کەواتە خوای پەروەردگار کە لەم ئایەتەدا بانگماندەکات بۆ ئەوەی لە مەیدانی جەنگداو لەو هەلومەرجانەدا کە بە توانای خۆمانەوە شانازیدەکەین، بەجەنگاوەرانی خۆمانەوە شانازیدەکەین، بەپێداویستی بەرگری و سەربازیی خۆمانەوە شانازیدەکەین، لەوساتە هەستیارانەدا خوای پەروەردگار ئاگادارە کەچی بە خەیاڵی جەنگاوەراندا دێت و دەشزانێت لەو هەلومەرجانەدا مرۆڤی سەرکەوتوو هەموو شتێك بۆ خۆی بەڕەوادەبینێت، وەك چۆن ئێستا سوپاگەورەکانی دونیا کاتێك کە سەردەکەون لە شوێنکێکدا هەموو یاساو ڕێسایەك بۆ خۆیان بەڕەوادەبینن، دەبینین تەنانەت لە پەیماننامە نێودەوڵەتییەکاندا دەستەڵاتی داگیرکار هەموو مافێك دەدات بەخۆی، لەو هەلومەرجەدا خوای پەروەردگار ئاگای لە ناخی مرۆڤەکانە، لەبەرئەوە ئاگاداریان دەکاتەوە کە ئاگایان لە ئامانجە بەرزەکان بێت، ئاگایان لە دادگەری و

مرۆڤدۆستی بێت، مسوڵمان پێش هەمووکەس داوای لێکراوە بۆ ئەوەی واز لە جەنگو کوشتار بهێنێت و بگەڕێتەوە بۆ یاسا بنەڕەتییەکەی ئیسلام لە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا، ئەو یاسا بنەڕەتییەش بریتییە لە ئاشتی و بڵاوکردنەوەی کەلتووری ئاشتی و تەبایی و پێکەوەژیان، چونکە ئەگەر وانەبێت بەڕاستی گومانی زۆر لەسەر ئەوەهەیە کە بانگەوازو تێکۆشان و جەنگەکەی لە پێناوی ئارەزووبازییدا دابێت، کەواتە دەبینین لە ژیانی سەرکردەیەکی وەك (سەلاحەددینی ئەیوبی[١])دا (ڕەزای خوای لەسەر) لە گەلێك کاتدا کە دەیتوانی هەموو خاچپەرستەکانی ئەو ناوچانە لەناو ببات کە دەستی بەسەردا دەگرت، بەڵام تائەو شوێنانەی کە ئەوان جەنگیان لەگەڵدەکرد ئەمیش جەنگی دەکرد، کە جەنگیش تەواوبوایە نەدەچوو دوایانبکەوێت و جینۆسایدیان بکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەموو هەلومەرجێکی پێکەوەژیان و هەموو هەلومەرجێکی نەفەستازەکردنەوەی بۆ فەراهەم دەکردن، تەنانەت پزیشکی دەنارد بۆ ئەوەی فەرماندە و سەرکردەکانیان تیماربکات.

گەر بەم شێوەیە نەبێت رەنگە مرۆڤـ بە دەمارگیری و لە پێناوی بیروبۆچونەکەی خۆیدا، لە ساتێکدا ڕەنگە هەمووشتێك لە ناوببات، وەك دیکتاتۆرەکانی مێژوو کردویانە لە ( نیرۆن)ەوە بیگرە هەتا (جەنگیزخان[٢])و (هیتلەر[٣]) و (مۆسۆلۆنی[١])، هەموو ئەمانە لە ساتێکی

---

[١] صەلاحەددینی ئەیوبی(١١٣٨ ـ ١١٩٣ز).

[٢] ـ جەنگیزخان(١٢٢٧ ـ ١١٦٥ز ) دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی.

[٣] ـ ئەدۆڵف هیتلەر( ١٨٨٩ ـ ١٩٤٥ز ).

تووڕەبووندا بڕیاری لەناوبردنی گەلانێکیان دەدا، نەك هەر کۆمەڵەمرۆڤێك.

کاتێك دەگەینە فیقهی سزادانی ئیسلامی و تەماشای بنەما گرنگەکان دەکەین، دەبینین هـزری ئیسلامی کە هەڵگۆزراوە لە قوئانی پیرۆز زۆر بەحورمەت و ڕێزەوە تەماشای گیانی مرۆڤـ دەکات، هەموو مافێکی دەداتێ لە ژیانێکی سەربەست و دوور لە دەستدرێژی بۆ سەری‌و دوور لە زۆرلێکردن، ئەوەتا خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ﴾ الأنعام١٥١. وتارەکە وتارێکی گشتییە ڕووی لە هەموو کەسێکە کە گوێی لەم قورئانە دەبێت، واتە مرۆڤـ مەکوژن، ئەم ئایەتەش چ بەڕەهاییەکەی چ بەگشتگیرییەکەی باس لەوەدەکات کە گیانی مرۆڤ پارێزراوە، بەتایبەتی ئەگەر لە جیهانی ئیسلامییدا بژی، مەگەر لەوحاڵەتەدا نەبێت کە تاوانێکی کردبێت کە شایستەی سزادانبێت بەکوشتن، دیسان جەخت لەسەر ئەم بابەتە دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿مَن قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَل ٱلنَّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً﴾ المائدة٣٢. واتە: هەرکەسێك کەسێك بکوژێت بەبێ تاوان و ڕێگەبدات بەخۆی کەسێکی بێتاوان بکوژێت، وەك ئەوەوەهایە هەموو مرۆڤایەتی کوشتبێت، واتە ئەگەر ڕێگەی بدەن هەموو مرۆڤایەتیش دەکوژێت، مانای وایە ئەوکەسە لەناخەوە نەخۆشە. ئەم ڕاستیە فیقهی سزادانی

---

[1] ـ بنیتو مۆسۆلینی(١٨٨٣ ـ ١٨٤٥ ز ).

ئیسلامی کردوویەتی بەیاسایەك بۆ ئەوەی کە مسولْمانەکان لە هەموو سەردەمێکدا ڕەچاوی بکەن. کەواتە چۆن دەبێت ئێمە ئەم ئایەتەمان هەبێت لەولاوە ببینین گیانی مرۆڤەکان بەوشێوەیە هەرزانفرۆش بکرێت لە بازاڕی سیاسەتی نێودەوڵەتی ئەمڕۆدا؟ کەسانێك دەکوژرێن لە بازاڕی کوشتاری نێودەوڵەتیدا کە هیچ پەیوەندییەکیان بەسیاسەت و دەستەڵات و کاروباری دەوڵەتەوە نییەو هیچ پەیوەندییەکیان بەو ململانێ سیاسییەوە نییە کە لە وولاتێکدا ڕوودەدات، لە حاڵێکدا ئێمە دڵنیاین لەوەی کە خودای پەروەردگار ئازاردانی مسولْمانانی بەیەکێك لە تاوانە گەورەکان لەقەڵەمداوە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَاكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَاناً وَإِثْماً مُّبِيناً﴾ الأحزاب٥٨. کەواتە هەرکەسێك ئازاری مسولْمانێك بدات بەقسە یان کردەوەبێت بەتاوانێکی زۆرگەورە دادەنرێت لە ئەستۆیاندا، کەواتە ئەم جۆرە ئایەتانە بۆ خۆی گرەنتی ژیانێکی سەربەرزانەیە بۆ هەمووکەسێك کە لە کۆمەڵگەی مسولْماندا بژی، بۆ ئەوەی هەست بەکەرامەت و گەورەییو ڕێزو حورمەتی خۆی بکات و لەگیان و ماڵو نامووسی خۆی دڵنیابێت.

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿إِنَّ اللّهَ لاَيُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّاناً أَثِيماً﴾ النساء١٠٧. ئەو کەسەی بەردەوام خیانەت لە خەڵك بکات و دەستدرێژی بکاتە سەرخەڵك لە میهرو خۆشەویستیی خوای پەروەردگار بێبەش دەبێت، لە حاڵێکدا دەزانین هەمووکەسێك لەم سەرزەوییەدا پێویستی بەسۆزو بەزەیی خودایە، کەواتە فیقهی سزادانی ئیسلامی بەهەموو شێوەیەك لە ڕوانگەیەکی تایبەتیی خۆیەوە گرنتی

ئەوەی کردووە لە ڕووی تیۆرییەوە هیچ کەسێك ئازار نەدرێت و دەستدرێژی نەکرێتە سەری و هیچ کەسێك نەکەوێتەمەترسییەوە.

که دێینەسەر لایەنی پەروەدەی ئیسلامی، دەبینین ئەو بەرنامە پەروەردەییەی که شەریعەتی ئیسلامی دایمەزراندوە بۆ تاك و کۆمەڵگە، هاوسەنگی ئەو تاك و ئەو کۆمەڵگەیە ڕادەگرێت و گیانی لێبوردن و هاوسۆزی لەناویاندا بەهێزدەکات، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ۞ أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ﴾ البلد١٧– ١٨.

هەر سێ تایبەتمەندیی:

تایبەتمەندییەکیان تایبەتمەندی بنەڕەتی و دەروونی و ویژدانییە که دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ البلد١٧.

پاشان دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ۞﴾ البلد١٧.

واتە: ئەرکی سەرشانی کۆمەڵگەی مسوڵمانەکە لە ناو خۆیاندا ئامۆژگاری یەکدی بکەن بەئارامگرتن و سۆزو میهرەبانی، کاتێك ئەم ئایەتە بەوردییەکی زیاترەوە بخوێنینەوە بۆماندەردەکەوێت که بە خۆڕایی نییە خوای پەروەردگار ئەو دوو تایبەتمەندییەی کردووە بەلقی ئیمان (ئامۆژگاری بەئارامگرتن) لەگەڵ (ئامۆژگاری بەمیهرەبانی).

لەچ کاتێکدا مسوڵمانان دەبێت یەکتری بانگبکەن بۆ ئارامگرتن؟، لەو کاتانەی که مسوڵمانان کەمینەن لەناو کۆمەڵگەدا، کاتێك کەمینە بوویت لەناو کۆمەڵگەدا و مافەکانت پارێزراوبێت ئەوە کارێکی باشە!

کەواتە ئەمە بۆ ئەو قۆناغەیە کە کەسێکی مسوڵمان یان کەسانێکی مسوڵمان لە کۆمەڵگەدا کەمینەن، لەبەرئەوە دەفەرموێت: ﴿وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ البلد١٧.

بەڵام لەو حاڵەتانەدا کە بۆ خۆیان زۆرینە و دەستەڵاتدارن و ڕاگەیاندنیان بەدەستەوەیە و ئابورییان بەدەستەوەیە، پەروەردەیان بەدەستەوەیە، سیاسەتیان بەدەستەوەیە، لەو حاڵەتانەدا مسوڵمانان دەبێت خاوەنی میهرەبانی بن لەگەڵ کەسانی دەرەوەی خۆیان و پارێزەری مافی ئەوانەبن کە کەمینەن، نابێت بڵێن ئێمە خۆمان زۆرینەین لە وڵاتداو ڕێگە بەکەسانی دەرەوی خۆمان نادەین، بەهەموو یاسایەکی دیموکراتی قسە هەردەبێت قسەی ئێمە بێت، ئەمە لەگەڵ ئەم ئایەتەدا یەکناگرێتەوە، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَتَوَاصَوْا بِالمرحمة﴾ البلد١٧.

واتە: لە ناو خۆیاندا ببن بەهێزێکی وەها کە یەکتر بانگ بکەن بۆ سۆزو میهرەبانی لە بەرامبەر ئەوکەسانەدا کە پێویستییان بەسۆزو میهرەبانی هەیە، لە هەژاران و نەداران و ئەوانەی کەمینەی نەتەوەیین و لە ژێر باڵی ئەماندا دەژین، نەك دەرگاکانی ژیان و ئازادییان لەسەر دابخەن، بەڵکو ژیانیان لێتەنگو ناڕەحەت بکەن، ئەمە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەم ئایەتە پیرۆزەدا یەکناگرێتەوە، پێویستە ئەوکەسانەی کە جڵەوی دەستەڵاتی وڵاتێکیان بەدەستەوەیە پتر پارێزەری مافی ئەو

کەسانەبن کە لە ژێر دەستەڵاتی ئەواندان، لەوەش پتر دەبێت جوانترین ڕەفتار بەکاربهێنن لە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا، خوای پەروەردگار لە سورەتی (البقرة)دا دەفەرموێت:

﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ مَاأَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ البقرة٢١٥. پرسيارت لێدەکەن، چی ببەخشین؟، پێیانبڵێ هەرچی خێربێت و ئێوەبیبەخشن، با بۆ باوكو دایکتان و خزمانی نزيكو بێباوکان و هەژاران و ڕێبواران بێت، ﴿وَمَا تَفْعَلُواْ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾ البقرة ٢١٥، هەرکارێکی باش گەرچی بەژمارە و ئەندازە، کەمبێت، خوای پەروەردگار پێیدەزانێت و بۆتانی دەنووسێت، ئەگەر بەوردیی سەرنجی ئەم ئایەتە بدەین باسی هیچ ڕەنگو ئینتیمایەکی مەزهەبی و نەتەوەیی و ئایدۆلۆژی ناکات، دەفەرموێت:﴿فَلِلْوَالِدَيْنِ﴾ البقرة٢١٥، بۆ باوكو دایك، دەگونجێت باوكو دایك بیروبڕوای جیاواز بێت، هەروەها خزمان، هەتیوان، نەیوتووە هەتیوەکان دەبێت مسوڵمانبن، دیارینەکردووە و شوناسی بۆ دانەناوە، هەر بەتەنها هەتیوبوون مایەی ئەوەیە کەسۆزو بەزەییان لەگەڵدا بەکاربهێنین، هەژاران و ڕێبوارانیش بەهەمانشێوە.

کەواتە هەرکەسێك بیەوێت بەشێوەیەکی بەرجەستە ئەم هـزرو وانەو کەلتووری پێکەوەژیان و لێبوردەییە بەخەڵك بگەیەنێت، دەبێت بگەڕێتەوە بۆ ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزو هاوچەشنەکانی، چونکە

داواكراوه له مسوڵمان كه چاكبێت لەگەڵ هەموو ئەو كەسانەدا كە پێویستیان بە یارمەتییە، بەبێ دیاریكردنی ئاین و ئینتیمای سیاسی و مەزهەبی، واتە ئەگەر مسوڵمانێك ئەم مەرجانەی هێنایەئاراوە لە كاتی هاوكاری لێقەوماو و هەژاراندا، مانایوایە ئایەتەكەی جێبەجێ نەكرد، چونكە ئایەتەكە ڕەهایە و باسی یارمەتیدانی خەڵك دەكات بەشێوەیەكی ڕەها، بۆ ئەوەی لە ناخی مرۆڤدا ئەو گیانی مرۆڤدۆستییە بەهێزبكات و ئەوەش زۆر گرنگە بۆ ئێمە كە تەركیزی لەسەر بكەین و خەڵكی لەسەر باربهێنین.

لەهەندێك دەقی قورئانیدا دەبینیت بانگەوازكراوە بۆ چاكەكردن، تەنانەت لە وەڵامدانەوەی خراپەدا بەچاكەو لەگەڵ دوژمنانیشدا، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿وَيَدْرَؤُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ﴾ الرعد٢٢. ئەوەش موژدەیەكی گەورەیە بۆ ئەوكەسانەی وەڵامی خراپەی خەڵك بەباشە دەدەنەوە، باوەڕیشیان بە ترساندن و چاوسووركردنەوە و تۆقاندن نییە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾ فصلت٣٤. دیارە بەلۆژیكی عەقڵی هەموو مرۆڤێك چاكە و خراپە وەك یەك نین و هەموو مرۆڤێك چاكەی پێ باشە. كەواتە هەمیشە كە دەتەوێت لە بەرامبەری یەكێكەوە بوەستیت و كێبركێیەكی شارستانی بكەیت، با وەڵامدانەوەی تۆ جوانتربێت لە قسەكانی ئەو، هەڵوێستی تۆ جوانتربێت و مرۆڤانەتربێت بەرامبەر بەهەڵوێستی ئەو، ئەوەتا خوای پەروەردگار

بە(اذا)ی (فجائی) دەفەرموێت: ﴿وَلَاتَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَاالسَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾ فصلت٣٤.
خۆت وێنەی ناکەیت ئەم هەڵوێستەی تۆ چەند کاریگەری دەبێت لەسەر بەرامبەرەکەت، لێرەدا وەك ڕەهەندی پەروەردەیی، قورئانی پیرۆز مسوڵمانەکان پەروەردەدەکات لەسەر مامەڵەی چاکە و وەڵامدانەوەی خراپە بەچاکە لەو کاتەدا کە **چاکەپەروەری** رۆڵی خۆی دەبینێت.

**ئەو ئەخلاقییاتەی کە قورئانی پیرۆز جەختی لەسەردەکاتەوە و دەیکات بەکۆڵەکەی بڵاوکردنەوەی کەلتووری لێبوردەیی لەناو خەڵکدا:**

## پابەندوون بە راستییەوە

یەکەمین بنەمای ئەخلاقی کە دەبێت ئێمە جەختی لەسەربکەینەوە لە ڕوانگەی قورئانی پیرۆزەوە، ئەوەیە پابەندی راستی بین، هەمیشە بەدوای راستیدا بگەڕێین بەبێئەوەی بپرسین کێ وتوویەتی و کێ خاوەنیەتی و کێ داوای دەکات، چونکە راستی وەك ئاسمان وەهایە، بەسەرخەڵکدا سێبەری کردووە و هەمووی لای تۆ یان لای من یان ئەوی دی نییە، راستی بە هەرکەس بوو قبووڵی بکە و پێویستە کەسانیتریش ئەو راستییە قبووڵبکەن کە لە لای تۆیە، بەبەڵگەی ئەو ئایەتە پیرۆزەی کە دەفەرموێت ﴿لاتُظلمون ولا تظلمون﴾ واتە: نەستەم بکەیت لە خەڵك و نەقبولێ بکەیت خەڵك ستەمت لێبکات.

# گرنگیی بەرژەوەندیی کەسانی دیکە

بنەمایەکی دیکەی رەوشتی ئەوەیە کە هەمیشە هەوڵبدەیت خۆشی و شادی و بەرژەوەندی خەڵك پێش خۆشی و چاکی بەرژەوەندیی خۆت بخەیت، وەك خوای پەروەردگار باسی هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی باوەڕداران دەکات و دەفەرموێت:﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ الحشر٩. باسی ئەوەدەکات مسوڵمانی ڕاستەقینە ئەوەیە کە هەرچەندە خۆی موحتاج بێت، لاوازو ڕەنجوور بێت، ئامادەیە لە بەشی خۆی بدات بەخەڵکی و جەنگی چلێسی و ڕژدیی دەروونی خۆی بکات، جا گەر کەسێك وەهابێت و کۆمەڵگەش لە کۆمەڵە کەسێکی وەها پێکهاتبێت، ئەو کۆمەڵگەیە سەرەنجام سەردەکەوێت. کۆمەڵگە سەرکەوتووەکان بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی لەو جۆرە ئەندامو تاکانە پێکهاتووە کە ئامادەبوون لە پێناوی بەرژەوەندیی کۆمەڵدا ببن بەمۆم و بسوتێن تا ڕووناکی بە دەوروبەر ببەخشن، ئامادەبوون ببن بەقەترەو لە بیابانی گەلەکەیاندا بتوێنەوە، نەك ئەوەندە خۆپەرستبووبن کە بڵێن ئەگەر ئێمە نەبین، بەرژەوەندی گەل کەس ناپارێزێت، ئەوە عەقڵییەتێکی زۆر مەترسیدارەو ئێمەش لە ئەنجامی عەقڵییەتی مەترسیداری وەها تووشی ئەو هەموو نەهامەتییە هاتووین، چونکە سیستەمی پێشووی وڵاتی ئێمە بەو شێوەبوو، سەددام حوسەینی سەرۆکی عێراق دروشمی ئەمەبوو دەیوت (یان من، یان هیچ). ئەوەبوو تووشی چەندین شەڕو

کارەساتی کردین و خۆیشی بە شێوەیەکی ناشایستە کۆتاییپێهات. کەواتە مرۆڤی مسوڵمانی ڕاستەقینە هەمیشە راستی لەخۆی خۆشتردەوێت و هەمیشە بەرژەوەندیی گەل‌و میللەت و بەرژەوەندیی گشتی پێشدەخات بەسەر بەرژەوەندیی خۆیدا، ئەمەیە ڕێگاخۆشکەرە بۆ کەلتووری لێبوردەیی لە ناو خەڵکدا، ئەمەیە کە بتەکانی خۆپەرستی دەشکێنێت.

## وەڵامی جوان و جوانتر

**بنەمایەکی رەوشتیی دیکە:** ئەوەیە کاتێك مامەڵە لەگەڵ یەکێکیتردا دەکەین هەمیشە دەبێت وەڵامت وەڵامێکی جوانبێت بۆ خەڵك، یەکێك پێیوتیت (السلام علیکم) تۆ دەبێت پێیبڵێیت (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته)، هەرکەسێك چەپکەگوڵێکت بۆ دەهێنێت تۆ دوو چەپکەگوڵی پێببەخشە، تەنانەت ئەگەر بیروبڕواکەی وەك بیروبڕوای تۆنەبوو نزای هیدایەتی بۆ بکەیت، خوای پەروەردگار دەفەرمێت: ﴿وَإِذَا حُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيباً﴾ النساء٨٦. هەرکەسێك سڵاوێکی لێکردن پێویستە بەجوانتر وەڵامی بدەیتەوە یان لانیکەم وەڵامی بدەیتەوە، بۆ ئەوەی هانی بدەیت بەردەوامبێت لەسەر ئەو سڵاوکردنەی، گەرچی ئەوکەسەی کە سڵاو لەتۆدەکات ڕەنگە بیروبۆچوون و مەزهەب‌و عەقیدەکەی لە تۆ جیاوازبێت.

لەوەش پتر دەبێت ئێمە هەوڵبدەین جوانترین ووشەو دەستەواژە بەکاربهێنین لەگەڵ خەڵکیدا، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ الإسراء٥٣. بڵێ بەبەندەکانی من با هەمیشە ئەوقسەیە بکەن کە جوانترە، ئەو دروشمە بەرزبکەنەوە کە جوانترین دروشمە، ئەو دروشمە بڵاوبکەنەوە کە وەرگیراوترو پەسەندترین دروشمە لەناو خەڵکدا. چونکەخوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلإِنْسَانِ عَدُوّاً مُّبِيناً﴾ الإسراء٥٣. چونکە بەڕاستی شەیتان بێکار دانەنیشتووە لەناو خەڵکدا، شەیتان هەمیشە دەیەوێت کێشە دروستبکات و پتر ئاگری فیتنەی نێوانیان خۆشبکات.

بنەمایەکی دیکە: لە ڕووی یاساییەوە خوای پەروەردگار ئازادییەکی داوە بەکەمینە ئاینییەکان لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا وەك دەفەرموێت

﴿فَإِن جَآؤُوكَ فَاحْكُم بَيْنَهُم أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْئاً وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ المائدة٤٢. بەپێی هۆی دابەزینی ئایەتەکە دەردەکەوێت کۆمەڵێك یەهوودی ویستویانە بێنە لای پێغەمبەر(دروودی خوای لە سەر)و داوەری بکات لە نێوانیاندا، پەروەردگار بەو شێوەیە هانی پێغەمبەرەکەی دەدات دەفەرموێت: ئەگەر هاتن بۆ لات تۆ ئازادیت، یان داوەری بکە لە نێوانیاندا یاخود حەقتنەبێت بەسەریانەوە، ئینجا دەفەرموێت ئەگەر داوەریت کرد لە نێوانیاندا دەبێت بەدادگەری داوەری بکەیت ﴿فَاحْكُم بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ﴾ المائدە٤٢.

لەشوێنێکیتردا لە قورئانی پیرۆزدا خوای پەروەردگار کە باسی زنجیرە ئاینێك دەکات دەفەرموێت:﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَادُواْ وَالنَّصَارَى وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحاً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَخَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَهُمْ يَحْزَنُونَ﴾ البقرة:٦٢. ئایەتەکە باسکردن و ناوبردنی زنجیرە ئاینێکەو جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی کە ئیسلام ئیعتراف بەبوونی ئاینەکانیتر دەکات و نایەوێت بیانسڕێتەوە، نایەوێت بێت ئەم ڕەنگاڵە ئاینییەی کە لەسەر نەخشەی سیاسی جیهان هەیە بسڕێتەوە، چونکە ئەگەر بیویستایە هەمووی دەسڕییەوە، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە ئەم تەرکیزدەکات لەسەر بوونی ئەمانە و مافی یاسایی خۆیان دەداتێ و حەقی یاسایی دەدات بەهەموو گەلو نەتەوەکان و دەفەرموێت:﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ الحجرات:١٣.

ئەمە دانپێدانانە بەبوونی نەتەوە جیاوازەکاندا، جەختدەکاتەوە لەسەر چاکەکردن، ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلاَكُفْرَانَ لِسَعْيِهِ وَإِنَّا لَهُ كَاتِبُونَ﴾ الأنبياء:٩٤.

واتە: خوای پەروەردگار بەهیچ شێوەیەك چاکەی هیچ کەسێك نادیدە ناگرێت و چاکەی هیچ کەسێك لە قەڵەم ناخات.

زنجیرەیەك بەرنامەو یاساو ڕێسای دیکەش هەن کە ڕەنگە نەتوانین لەم باسەدا ئاماژە بەهەموویان بکەین، بەڵام ئەوەندە دەڵێین ئەگەر ئێمە لەسەر بنەماو پرانسیپە قورئانیەکان ڕەفتار بکەین و لەگەڵ ئەویتر کە جیاوازی هەیە لەگەڵمان لە ڕوی ئاین و ئایدۆلۆجی و شارستانیەت و هـزرو

سیاسی و مەزهەبییەوە، بەوشێوەیە مامەڵەبکەین کە قورئانی پیرۆز دەستنیشانی کردووە، هەرگیز تووشی کێشە نابین لەگەڵ یەکتردا، هاوکات هەست بە کەسێتی خۆمان دەکەین و هەست بە کەسێتی ئەویتر دەکەین، چەندێك سوور دەبین لەسەر پاراستن و داکۆکیکردن لە مافەکانی خۆمان، بەو ئەندازەیەش - بەڵکو پتریش - پێداگری دەکەین لەسەر داکۆکیکردن لەسەر مافی ئەوکەسانەی کە لە بەرامبەرمانەوەن، یان ئەوکەسانەی کە ڕەنگە خۆیان بەنەیاری ئێمەش بزانن وەك مسوڵمان.

یەکێك لە گرنگترین خاڵ کە پێویستە زۆر پێیەوە پەیوەست بین، ئەوەیە کە دەفەرموێت:

﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِ اللّهِ إِذَا عَاهَدتُّمْ وَلاَتَنقُضُواْ الأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلاً﴾ النحل:٩١. زۆر گرنگە ئێمە هەرکات لەگەڵ ئەو خەڵکەی دەوروبەرماندا لەسەر بنەمای گرێبەستێکی سیاسی هاوبەش، پێکەوە بژین، کە ئەو گرێبەستەمان پێکەوە مۆرکرد، دەبێت پابەندبین پێیەوە، بۆ ئەوەی سەربەرزبین لە دونیاداو خوای پەروەردگاریش خێر و خۆشی ئاخیرەتمان بەنسیب بکات...

ئەمانە چەند مەبەستێك بوون کە پێویستبوو جەختی لەسەربکەینەوە لەم هەلومەرجە دژوارەی ئەمڕۆی هەرێمەکەماندا، هیوادارین بەنەفەسێکی زۆر قورئانییانە و ئیسلامییانەو مرۆڤییانە (کەهەرهەموویان هاومانای یەکترین) مامەڵە لەگەڵ یەکتری بکەین، بۆ بڵاوکردنەوەی کەلتووری تەبایی و پێکەوەژیانی ئاشتییانەو لێبوردەییانە ...

## قەیرانی فیکری و ڕێگاکانی چارەسەر

### قەیرانەکانی نەتەوەی مسوڵمان و ڕێگاکانی چارەسەری ئەو قەیرانانە

بێگومان ئەوەی کە هۆشیارو هۆشمەندبێت بیر لە واقیعی ئەمڕۆی نەتەوەی ئیسلام بکاتەوە بیەوێت و نەیەوێت، هەستدەکات بەوەی نەتەوەی ئیسلام وەك ئەوەی خوای پەروەردگار داوای لێکردوە و بڕیاری لەسەر داوە کە پێشەنگو جڵەوبەدەستی کاروانی ژیاری مرۆڤایەتی بێت، وانییە..

بەداخەوە ئێستا بەو شێوەیە نییە، ئەم نەتەوەیە لە حاڵەتێکی دواکەوتوو و شپرزەیی بێسەروبەردا بەسەردەبات، هیچ نەتەوەیەك خۆزگەی پێناخوازێت لە هێڵە سەرەکیو گشتییەکانی ژیاردا، چونکە ئەم نەتەوەیە خەریکە لە زۆر لایەنەوە شوناسو پێناسی خۆی لە دەستدەدات و ڕابردووی پرشنگداری خۆی فەرامۆش دەکات، بەشێوەیەك ناتوانێت خودی خۆی بناسێت و ئەو توانا و ووزە شاراوانەی لە هەناویدا هەن بۆ خۆی بدۆزێتەوە و بیانگۆڕێت بۆ کارو کردەوە و ڕێگای ژیانی خۆی پێ تەختبکات، ئەم حاڵە خەمئامێز و ترسناکەی نەتەوەی ئیسلام مایەی نیگەرانی و هەڵوێستەکردنی زۆرلەژیران و بیرمەندانی ئەم نەتەوەیەیە، ساڵانە لە گۆشەو کەنارەکانی دونیای ئیسلامدا بیرمەندان کۆبونەوە و کۆنگرەی فراوان دەبەستن بۆ لێکۆڵینەوە لەم مەبەستە، بۆ دیاریکردن و شیکردنەوەی نەخۆشییەکانی نەتەوەی ئیسلام، چ ئەو نەخۆشیانەی دەستەویەخەی تاکی مسوڵمان بوون، چ ئەو نەخۆشییانەی دەستەویەخەی کۆمەڵگەی

مسوڵمان بوونەتەوە، هەروەها دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکان و دۆزینەوەی ڕێگاچارەی گونجاو بۆیان.

زۆر لە بیرمەندان لە پێشدا دەیانەوێت بزانن سروشتی ئەم قەیرانە چۆنەو قەیرانی نەتەوەی ئیسلام لە چییەوە سەرچاوەدەگرێت؟ چونکە وەك دەبینین قەیرانەکە فرەڕەهەند و فرەلایەنە و تەنها لایەنێك ناگرێتەوە، تەنها پەیوەندیی بەسیاسەتەوە یان پەیوەندیی بەئابورییەوە نییە، تەنها لە بواری کۆمەڵایەتیو کەلتوری و فەرهەنگی و زمانەوانی و پەروەردەییدا ڕەنگینەداوەتەوە، لە هەموو لایەنەکانی ژیانی تاکو کۆمەڵگەدا ئەم قەیرانە بوونی هەیە، لە لایەکەوە دەزانین ئەم قەیرانە ڕەگوڕیشەی لە باگڕاوندێکی هـزرییدا هەیە، لە مێژوودا هەیە، ڕەگوڕیشەی لەم دەستەڵاتە خوێناوییانەدا هەیە، کە ماوەیەکی دوورودرێژ خۆی سەپاندوە بەسەر گەلانی مسوڵماندا، لەلایەکیتریشەوە پەیوەندییەکی زۆری بەهەوڵ و دەستێوەردانی کەسانی ئارەزووپەرستەوە هەیە کەویستویانەو دەیانەوێت هەمیشە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و کەلتوری ئیسلامی و هـزری ئیسلامی تێکەڵ بەمەرامو ویستەکانی خۆیان بکەن. یەکێك لە کۆسپە گەورەکانی بەردەمی سەرهەڵدانی ئەم نەتەوەیە بەدرێژایی مێژوو ئەو کەلتورە کلاسیکییەبووە کە نوێنەرایەتی فەرمی ئیسلامی کردووە لە قۆناغە جیاجیاکاندا، هەرئەو کەلتورە بووە کە ڕێگای لە مسوڵمانان گرتوە ڕاپەڕن و بەخۆدابێنەوە و عەقڵو ژیریی خۆیان ڕزگاربکەن لەو کۆت و بەندانەی کە هەمیشە لەبەردەم عەقڵو ژیریدان. ئێستاش دەبینین

چەندین کۆسپ لەبەردەم بەخۆداهاتنەوەی نەتەوەی ئیسلامییداهەیە، لە گرنگترینیان ڕەنگە ئەو سەرسامییەبێت کە نەوەکانی ئەمڕۆ، لاوان و خوێندەوارانمان تووشی بوون، سەرسامبوونیان بەوەی کە لە خۆرئاواوە دێت بەبێ ئەوەی جیاکارییەك بکەن لە نێوان باش‌و خراپی خۆرئاوادا، لە نێوان شتی سوودبەخشی خۆرئاواو شتی زیانبەخشی خۆرئاوادا، ئەم قەیرانە قەیرانێکی فیکرییە پێشئەوەی قەیرانێکی سیاسی بێت، قەیرانی بیرکردنەوە و وردبوونەوەیە، قەیرانی دیدو ڕێبازی توێژینەوەیە لە ناو مسوڵماناندا، بەتایبەتی لەناو بژاردەی ڕۆشنبیران و زانایاندا، لە ئەنجامی ئەم قەیرانەشدا نەتەوەکەمان تووشی گەلێك دەردو نەخۆشی بووە کە ڕەنگە گرنگترینیان ئەوەبێت هێشتا ئەم گەلەی خۆمان خۆی بەباشی نەناسیوە و ئاوڕی لە واقیعی خۆی نەداوەتەوە و سەرنجی لە ئێستاو داهاتووی خۆی نەداوەتەوە، لەبەرئەوە زۆر پێویستە هەوڵی بەپەلەی زانستی بدرێت بۆ ئەوەی ئەم نەتەوەیە جارێکیتر متمانە بەخۆی پەیدا بکاتەوە و متمانە بەڕۆڵەکانی و زاناکانی‌و بیرمەندانی پەیدابکاتەوە.

یەکێکیتر لە ڕێگاکانی چارەسەری ئەم قەیرانە ئەوەیە سەرکردەکانمان لە زۆر گرێ‌وگۆڵی خۆبەکەمزانی و یەخسیری و نەخۆشییەکانی دەستەڵات ڕزگاریان ببێت:

هەموو ئەمانەش بەداڕشتنی سیاسەتگەلێکی پەروەردەیی زانستی و فێرکاری ڕیفۆرمخوازی و سیاسیی گشتگیر ئەنجامدەدرێت، بەڵام کێ هەستێت بە داڕشتنی ئەم سیاسەتانە جگە لە ئەهلی (حەلل‌و عەقد)؟

یان زانایان و بیرمەندان و سەرکردە سیاسییەکان؟ کەسانێکیتر ناتوانن داڕێژەری ئەم سیاسەتانە بن، بەڵێ بەدرێژایی مێژوو هەوڵو تێکۆشان و بزاڤی زۆر بۆ ڕیفۆرمی دۆخی هـزری و سیاسی و گشتی ئەم نەتەوەیە دراوە، بزاڤگەلێکی چاکسازی زۆرو زەبەند لە گۆشە و کەنارو جێگە جیاوازەکانی نەتەوەی ئیسلامدا سەریهەڵداوە، هەم لە سەرەتاکانی ڕابوونی ئیسلامییەوە لە کۆتاییەکانی سەدەی (١٩)ی زایینییەوە ژمارەیەکی زۆر کەسانی ڕیفۆرمخوازو دڵسۆزبەئاین و گەلانی مسوڵمان پەیدابوون هەوڵیانداوە و خۆیان تەرخانکردووە بۆ دووبارە زیندووکردنەوەی ڕۆحی مسوڵمانەتی لە جەستە و بوونی ئەم نەتەوەیەدا، بۆ ئەوەی جارێکیتر مسوڵمانان بەهیممەتەوە بێنە مەیدان بۆ ئەوەی چاکی مەردانەی لێبکەن بەلاداو بزانن بۆ چی هاتوونەتە سەرزەوی؟ لە پێناوی چیدا خوای پەروەردگار ئەفراندوونی و چ ئەرکو بەرپرسیارێتییەکی گەورەیان لە ئەستۆدایە؟

بێگومان ئەم هەوڵو تێکۆشان و ڕیفۆرمانە کاریگەرییان هەبووە، کاریگەریەکی ڕێژەیی لەسەر کات و شوێنی خۆیان هەبووە و کەسانێك لە لاوان و ژیران و خاوەن غیرەتەکانی نەتەوەی ئیسلام چوون بەپێشوازی ئەم بانگەوازانەوە، بیرو هـزری ئیسلامی تەکانێکی بەخۆیداوەو، بیر و هـزری بزاڤە ڕیفۆرمخوازەکان جۆرێك لە جوڵە و تەکانێکی لەناو نەتەوەی مسوڵماندا دروستکردووە، بەڵام ئەوەی کە ببێتە ڕێنیسانسێكو بەخۆداهاتنەوەیەکی گشتگیری سەرانسەری، لەمەدا ئەم ڕیفۆرمو بزوتنەوانە سەرکەوتوو نەبوون، بەڵکو سەرکەوتنەکانیان

زۆرجار سنووردار بووه بەشوێن و کاتێکی تایبەتەوە، لە زۆر شوێن سەرکەوتنیان بە دەستهێناوە، بەڵام بەشێوەیەکی کاتی، لە هەندێك شوێن سەرکەوتنیان بەدەستنەهێناوە و لە بێشکەدا خەفەکراون.

بابزانین بۆ چی ئەم هەوڵ و تێکۆشانە ڕیفۆرمخوازییانە لە مێژووی تازەی نەتەوەی ئیسلامدا شکستیان هێناوە؟ یاخود بڵێین بەرهەمی چاوەڕوانکراویان لێنەکەوتووەتەوە.

بیرمەندان لەسەر ئەم بابەتە قسەی زۆریان کردووە، بەڵام تێکڕا وتوویانە: هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی ڕیفۆرمی مسوڵمانان دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك:

**یەکەم:** ئەو جیاوازیو بەگژداچوونە مەزهەبییەی کە یەخەی مسوڵمانانی گرتووە، مسوڵمانان لەناوخۆیاندا پارچەپارچە بوون لە ڕوی مەزهەبییەوە، چاکسازی و ڕیفۆرم لەناویاندا پێناسەی جیاوازی بۆ کراوە، لەسەر پێناسەکردنی ڕیفۆرم ڕێکنەکەوتون، لەسەر ئالیەت و میکانیزمی ڕیفۆرم و تێگەیشتن لە بنەماکانی ئیسلام جیابونەوە و جیاوازییان لەسەر بابەتە مێژووییەکان و لە سەر دەستەبەندەییەکان و تێڕوانین و هەڵسەنگاندنەکان گرنگترین هۆی شکستی ڕیفۆرمخوازی بووە لە مێژووی نوێی هـزری ئیسلامییدا.

**دووەم:** بەشێوەیەکی دەستەجەمعی هۆشیارییەکی کۆمەڵایەتی وەها دروستنەبووە کە خەڵك لە ڕاستیدا هەستبکەن بەوەی کێشەیەك هەیە لەبەرنەبونی دامەزراوە و سیستەمێکی پەروەردەیی پێشکەوتوو لە وڵاتەکەماندا، چونکە دەستەڵاتی سیاسی هەرگیز نەیویستووە ئەم

نەتەوەیە لە حاڵەتێکی هەستبەخۆکردندا فێری زانست و زانیاری ببێت.
هۆکارێکیتر ئەوەبووە لە چاخەکانی چاولێکەری و ڕەدووکەوتنی هـزریی و شارستانێتییدا کەسانێك هەبوون ئەم خەڵکەیان خەواندووە و سەرقاڵی چەندین شەڕو کێشەی لاوەکی و کێشەی مێژوویییان کردووە، سەردەمانێکی دوورو درێژی مسوڵمانان سەرقاڵی ئەوەبوون کە بزانن مەزهەبی حەنەفی ڕاستە یان مەزهەبی شافعی؟ سەرقاڵی ئەوەبوون بزانن موعتەزیلە لەسەر حەقن یان ئەشعەرییەکان؟ سەرقاڵی ئەوەبوون ئایا سەلەفی لەسەر حەقە یان صۆفی؟ لەسەر ئەم بنەمایە شەڕە گەورەکەیان لەبیرچووەتەوە، نەخۆشییە گەورەکەیان لەبیرچووەتەوە، ئەو نەخۆشییە گەورانەی کە لە ناو جەستەیاندا لانەی کردووە فەرامۆشکراوە و خۆیان سەرقاڵی ئەو شەڕە لاوەکیانە کردووە.

**سێیەم:** هۆکارێکی دیکە ئەوەیە ئەم جیاوازییانەی کە لە ناو نەتەوی ئیسلامییدا دەیبینین ئەگەر بەعەقڵ و ئەدەبێکی زانستییانەی جیاوازی مامەڵەمان لەگەڵ بکردایە، دەمانتوانی بیکەین بەخاڵی هێز بۆ خۆمان، بیکەین بەخاڵی دەستپێکردن و بزاڤپێکردن، بەڵام لەبەرئەوەی خۆمانمان خواردوەتەوە، ئاگاداری ستراتیجێکی بنەڕەتی نەبووین لە ژیانی خۆماندا، بەڵکو هەر خاوەنی ستراتیج نەبووین.

ئەو جیاوازییە بۆ خۆی پاشخان و ڕەسیدێکی گەورەیە بۆ پێشکەوتن، بەڵام کردوومانە بەخاڵی لاوازی! لەبەرئەوە کە پشتمان بەجیاوازییەکان و خاڵە جوزئییەکان بەست، ئیتر خاڵە گشتییەکانمان لەبیرچوویەوە و ئامانجە گەورەکانمان لەبیرچوویەوە، لەبەرئەوە

ئێستاکەش دەبینین نەتەوەکەمان خەو بەئایدیاڵە جوانە مێژوویەکانەوە دەبینێت، ئێستاش ژیان لە خەونێکی قووڵدا بەسەردەبات، بەبێئەوەی خۆی دەرك بکات یان لە واقیعی خۆی تێبگات! لە ئەنجامی ئەوخەونە قووڵەی کە بەسەرماندا فەرز کراو لە ئەنجامی ئەوەی کە نەمانتوانی خۆمان بناسین، لە ئەنجامی ئەوەی خۆمان سەرقاڵ کردووە بەشەڕی مەزهەبی و تائیفی و نەتەوەیی، خۆمان قەتیسکرد لەو سنورە جوگرافییە سیاسییانەی کە داگیرکەران بۆمانی داڕشتبوو، چەندین کێشەمان بۆ دروستبوو لە بواری بیروبڕوا و سیاسەت و فیقه و زمان و و ڕەوشت و ئاکاردا...هتد، تەماشادەکەیت ئێستا ئەگەر پرۆگرامێکی عەقیدە ببینین کە لە پەیمانگەکاندا دەخوێندرێت، یاخود مسوڵمانان پێوەی سەرقاڵن، هەموو ئەو بابەت و بیروبڕوایانەی تێیدا باسدەکرێت زۆربەی زۆریان پەیوەندییان بەواقیعی ئەمڕۆی خەڵکەوە نییە، شەڕی سەردەمەکۆنەکانە کە ئێستا مسوڵمانان پێوەی مەشغوولن لە بواری سیاسەتدا، ئێستاش ئێمە ئەو کەلتورە دەخوێنین و ڕەواجی پێدەدەین، کە ڕەنگە لە سەردەمی ئەمڕۆدا هەرهیچ بەهایەکی نەمابێت.

ئێستاکە زۆر جێگەی پرسیار نییە کە ئایا مواصەفاتی وەلی ئەمر دەبێت چۆن بێت، چی سیفەتێکی تێدابێت؟ چونکە ئێستا لە هەموو دونیادا هەرکەسێك دەبێت بەدەستەڵاتدار پێویستە لە چوارچێوەی یاساو دەستوردا ڕەفتار بکات، پێویستە ملکەچبێت بۆ ئەو یاساو دەستورەی کە لە وڵاتدا پەیڕەودەکرێت، هیچ کەسێك ناتوانێت ئەو قارەمانە میللـیەبێت کە جاران لە پەرتووکەکاندا یان لە مێژووی

حەماسەکاندا بۆ خەڵك باسدەکرا، کێشەمان بۆ دروستبووە لە بواری فیقھ و زمان و بواری ڕەوشتدا، چاولێکەری بووەبەسیفەتێکی زاڵ بەسەرماندا، ھەمیشە چاو لەوکەسە دەکەین کە دەستەڵاتی زیاترە، چاولێکەری لەو کەسە دەکەین کە فەرمانڕەوایە بەسەرمانەوە، چاولێکەری خۆرئاوا دەکەین و پێمانوایە لەم ململانێیەدا ئێمە قەدەرمان وایە کە ھەر لە دواوەبین، واتە تووشی نەخۆشییەك بووین ھەر شتێك خۆماڵی بێت گەرچی زۆرچاکیش بێت قبوڵمان نییە و بەلاوازی دەزانین، بەڵام ھەر شتێك لە دەرەوە بۆمان ھێنرابێت ھەرچەند لاوازبێت ئێمە بەچاکی دەزانین و بە بەھێزی دەزانین، لە ئەنجامدا بەتەمای شتی سەیروسەمەرەین کە سەرکەوتنمان بۆبەدەستبھێنێت، لەبەرئەوە پەنا دەبەینە بەر خورافات و بەر فاڵچیەتی و حاڵەتی تەوەزەلی و پشتبەستن بە کەسانیتر، کە ھەمیشە بیرمەندان خەڵکیان ئاگادار کردووەتەوە لە زیانەکانی.

ھۆکانی ئەمەش دیارە بەشێکی پەیوەندی بەو دابڕانەوە ھەیە لە خودی خۆمان، دابڕاوین لە ئاینەکەمان و بڕواکەمان و یەکتاپەرستی، ئینجا لەلایەکیتریشەوە نەمانتوانیوە جیھان بخوێنینەوە، ژیانی ئەمڕۆ بخوێنینەوە و گەردوون بخوێنینەوە، لەبەرئەوە ویژدانی مسوڵمانان ئەمڕۆ ویژدانێکی نەخۆشە، ئەوەندە نەخۆشە بەشی چەندین سەدە دەکات لە دواکەوتن و پشتبەستن بە کەسانیتر، ئەوپەڕی ناتەواوی و شپرزەییمان بۆ دروستدەکات، لەبەرئەوە گەورەترین ڕێگاچارە بۆمان ئەوەیە کە دانبنێین بەنەخۆشی و دواکەوتوویی خۆماندا، دانبنێین

بەوەدا کە ئێمە لە ئاستێکی پێویستدانیین، هەوڵبدەین ئەم نەتەوەیە فێری ئەوە بکەین کە دانبنێت بەهەڵە و کەموکووڕییەکانی خۆیدا. گەورەترین نەخۆشی کە تووشی مرۆڤێك دەبێت ئەوەیە کە لەگەڵ بوونی نەزانیدا دان بەنەزانی خۆیدا نەنێت، ئەوەی کە لە مێژووی ئێمەدا پێیدەوترێت (الجهل المركب) واتە: نازانێت کە نازانێت، یاخود لە ڕێگای نازانستییەوە بەدوای زانستدا بگەڕێت و بە مرۆڤی خورافی سەرسام بێت، لە ئەنجامدا مرۆڤ ڕەگەزەکانی هێز لە دەستدەدات، کە یەکەمینیان بریتییە لە (زانست و زانیاری)، فێربوونی زانستەکانی ڕۆژ، فێربوونی زانستە تەکنیکی و سروشتییەکان تێگەیشتن لەو سروشتەی کە خوای پەروەردگار بە ئێمەی بەخشیوە، ئەوەش بەزانست و زانیاری، تابتوانین جڵەوی سەردەمی خۆمان بەدەستی خۆمانەوەبێت و بتوانین چارەسەری کێشەکانی مرۆڤ بکەین. ئەمەش کاتێك دەبێت کە بتوانین لەگەڵ قورئاندا بکەوینە گفتوگۆ، لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا بدوێین و لە سوننەتی پێغەمبەری خۆشەویست(درودی خوای لەسەر) تێبگەین، پاشان بزانین چ پەیوەندییەکی واقیعی و بابەتییانە لە نێوان قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەردا(درودی خوای لەسەر) هەیە..

کەواتە ئێمە چەندین ڕێگاچارەمان لەبەردەستدایە بۆ ئەوەی لەم قەیرانە هـزرییە ڕزگارمانبێت، ئەم قەیرانەی کە هۆکاری هەموو قەیرانەکانی دیکەمانە و هۆکاری قەیرانی سیاسی و قەیرانی ئابورییە، هۆکاری قەیرانی کۆمەڵایەتی و کەلتورییە.

دەڵێین دەبێت لەگەڵ قورئانی پیرۆز بکەوینە گفتوگۆ، چونکە قورئان بۆ خۆی بریتییە لە کۆمەڵێك چەمك و رێنومایی و یاسا، تا چارەسەری کێشەکانمان بۆ بکات و پێویستە ببن بەواقیع، ببن بەدەزگا لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکدا. بە داخەوە ئێستا تێنەگەیشتنێك هەیە لە ڕۆحی قورئان، تێنەگەیشتنێکی سەرتاسەری هەیە بۆ قورئان، کەسانێك قورئان تەنها بۆ ئەوە بەکاردەهێنن کە وەك دەقێکی پیرۆز سوێندی پێبخورێت لە دادگاکاندا، وەك دەقێکی پیرۆز بۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەی ئاهەنگەکان بەکاربهێنرێت، تەنها بۆ ئەوە بەکاربهێنرێت لەژوورسەری نەخۆشێکەوە دابنرێت، ڕەنگە لە گەلێك شوێندا وەها مامەڵە لەگەڵ قورئانی پیرۆزکرابێت. تەفسیری ڕۆژانەو هاوچەرخ بۆ قورئان پێویستە، تەئویلێك بەپێی یاساو ڕێسای زانایانە بێت نەك بە پێی ئارەزوو.

بەداخەوە هەندێك بەبیانوی ئەوەی کە دەیەوێت پەیڕەوی لە سوننەتی پێغەمبەر بکات (درودی خوای لەسەر) واز لە قورئان دەهێنێت، لە حاڵێکدا قورئان و سوننەت هاوتای یەکن و دەبێت پێکەوەبن و قابیلی ئەوەنییە کە لە یەك جیابکرێنەوە، بۆ تێگەیشتن لە قورئان پێویستمان بەسوننەتە و بۆ تێگەیشتنیش لە سوننەش پێویستمان بەبنەماکان و یاسای قورئانی هەیە، لە حاڵێکدا قورئانی پیرۆز بنەمایە و سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لە سەر) بریتییە لە پراکتیزەکردنی واقیعی بابەتیانەی مێژووییانەی قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی زۆر ڕێكوپێکی کەم وێنە، بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوەبین

سوننەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) پێویستە لە چوارچێوەی خۆیدا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و ئاگاداری ڕەهەندە کاتی و شوێنییەکەی بین، ئاگاداری ئەوەبین کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) ئەگەر فەرموودەیەکی فەرمووبێت، لە هەلومەرجێکی تایبەتدا، ئاگامان لە هەلومەرجەکەی بێت، چونکە بەبێ ڕەچاوکردنی ئەو هەلومەرجە لە تێگەیشتنی قورئاندا توشی کەموکورتی و هەڵە و کورتهێنان دەبین، لێرەدا ڕۆڵی زانایان و کەسانی پسپۆڕی مسوڵمان بۆ تێگەیشتنی ئەم پەیوەندییە دوولایەنەی قورئان و سونەت دەردەکەوێت، چونکە هەموو کەسێك مەرج نییە کە عەرەبیزانی، ئیتر لە قورئان تێبگات، یان لە فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) تێبگات، دەبێت ئەم دووانە بە عەقڵێکی پەسەندەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین، ئەگەر وانەبێت پەیامە قورئانییەکە بەشێوە ڕاست و ڕەوانەکەی خۆی ئەداناکرێ و پەیڕەویی لێناکرێت، کەواتە ئەمەش ڕێگایەکیترە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و بۆ چارەسەرکردنی ئەو قەیرانە هزرییە جارێکیتر هێنانەوەی ڕۆڵی قورئان بۆ ژیانی تاکی مسوڵمان و کۆمەڵگەی مسوڵمان، بەڵام ئەم تێگەیشتنە لە قورئان بەبێ هاوتایەتی سوننەتی پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) ناگوجێت و ڕوونادات.

**چوارەم:** مسوڵمانان کەمتر ڕوویان لە بابەتە گشتیەکان کردووە لە کەلتووری هۆشیاری مسوڵماناندا، کەمتر کاریان لەسەر ئەوە کردووە کە ئاگامان لە مافی گشتی و گیانی هەرەوەزی بێت، ئاگامان لە پاراستنی بەرژەوەندیی گشتی بێت. دیارە ئەمە بەشێکی پەیوەستە بەدەستەڵاتی

سیاسییەوە کە نەیویستووە زانا مسوڵمانەکان خەریکی مافەگشتییەکان بن، نەیانویستووە مسوڵمانان کەلتوورێکی گشتی وایان هەبێت کە بەرجەستەکاری ڕۆڵی ئوممەت بێت لە ژیانی سیاسییدا، بۆ ئەوەی هەمیشە دەستەڵات زاڵبێت بەسەر ئوممەتدا، چونکە هەرکات گەلی مسوڵمان لاواز دەبێت گەلێك ئاسانە مافە گشتییەکانی فەرامۆش بکرێن و لەناوببرێن، لەبەرئەوە دەبینین لە کەلتوری فیقهی ئیسلامییدا زمانی تاك زاڵە تازمانی کۆمەڵگە، دیکتاتۆریەتی سیاسیش ئەمەی ئەوەندەی تر تۆخکردووەتەوە و هەوڵیداوە ئاین هەر بەم شێوەیە نیشانبدات کە کاروبارێکی تاکەکەسییە و بریتییە لە نوێژکردن و لە ڕۆژووگرتن و..هتد. هەموو ئەرکە ئاینییەکانیتری ئاین تەنها لەو ئاستانەدا کورتهەڵهێنراوە کە دەستەڵاتدارو سیاسەتمەدارەکان بۆی دیاریکردووە، هەرکاتێك وابێت ئاین هەر بریتییبێت لە کاروبارە تاکییەکان، لە کاروباری تاکەکەسەکان ئەوکاتە دەستەڵاتدار بەناوی ئاینەوە دەتوانێت هەموو لقەکان و کەرتە گشتییەکان بۆ خۆی دەستەبەربکات و دەستەڵات بگرێت بەسەریاندا، لەبەرئەوە کەمتر بیریان لەوەکردووەتەوە یان ڕێگەیان بەوەداوە کە فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە ببێت بەدەزگایەك لەناو کۆمەڵگەدا کە ڕێگریی بکات لە کەموکورتی و لادانی دەستەڵاتداران، لە ئەنجامدا جیابوونەوەیەکی زۆر ناقۆڵا دروستبووە لە نێوان باری گشتی و باری تایبەتییدا، لە نێوان فیقهی گشتی و فیقهی تایبەتیدا، تەنانەت کاتێك تەماشای پەرتووکە فیقهییەکان دەکەین ئەوەندەی گرنگییان بەکاروباری پەرستش داوە گرنگییان بەکاروباری بەڕێوەبردنی وڵات

نەداوە، ئەوەی کە هەیە هەندێك ئاماژەی گشتییە، چونکە ڕێگەنەدراوە کە زانای مسوڵمان و فەیلەسوفی مسوڵمان ئەو ئاستە ڕۆشنبیرییەی خۆی بڵاوبکاتەوە بەناو ئاپۆرەی جەماوەردا، لە ئەنجامدا تەماشادەکەین لایەنی گتشی فیقهـ زۆر لاوازو ڕەنجوورە، بەڵام لایەنی تاکلایەنی پەرستش و لایەنی ئەوەی کەپەیوەندیی بەتاکەکەسەوە هەیە هەتا بڵێیت لایەنێکی دەوڵەمەندو فراوانە، لەبەرئەوە تەماشادەکەیت بابەتە ئاینییەکان تەنها بریتیین لە بابەتە هەندەکی و جوزئییەکان، بریتیین لە بابەتی باری کەسێتی لە خزمەتکردنی سوڵتان و گوێڕایەڵی کوێرانە بۆ دەستەڵاتدار، لە ئەنجامدا هەموو لاوازییەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێمە دەزگایەکمان نەبێت پارێزەری مافەگشتییەکانمان بێت.

بەڵام چۆن ڕزگارمان بێت؟ ڕێگاکانی دەربازبوونی هـزری مسوڵمان و نەتەوە لە چیدا خۆی دەبینێتەوە؟

لەسەر ئەم بابەتە بیرمەندان لە سەرەتای ڕابوونی ئیسلامییەوەباسی چەند میکانیزمێکیان کردووە.

**یەکەم:** لە ناخی مرۆڤەکانەوە ئازادی و ڕزگاربوون دەستپێدەکات، کەواتە پێویستە لە پەروەردەو بارهێنانەوە دەستپێبکەین و فێرخوازەکانمان لە هەموو ناوەندەکانی خوێندن لە چەندگرێیەکی دەروونی ڕزگاربکەین:

١. لە گرێی خۆبەکەمزانین: نابێت لە بەرامبەر هەژموونی خۆرئاواییو بەرامبەر نەتەوەیەکتر خۆیان بەکەم بزانن.

٢. له گرێی خۆپەرستی: گەرچی ئێمە کاتێك پەروەردەی تاکێکی خۆمان دەکەین دەبێت وا پەروەردەی بکەین متمانەی بەخۆی هەبێت و باوەڕی بەخۆی هەبێت کە خاوەنی تواناو ووزەیەکی وایە کە بتوانێت ململانێ لە گەڵ ئەوانی تر بکات، بەڵام فێریشیان بکەین لە ناوخۆماندا خۆپەرستیمان نەبێت، ئەو گرێیەمان نەبێت کە: هەوڵ بۆ خۆم بدەم بەتەنهاو ئاگاداری خوشك و براکەم نەبم.

٣. خۆپاراستن لە گرێی نەتەوە و وولاتپەرستی:

واتە لە پێناوی ئەو وولاتە بچکۆلەی کە تیایدا دەژیم، ئاگام لە جیهانی ئیسلامی و ئاگام لە جیهانی مرۆڤایەتی نەبێت.

٤. خۆپەرستن لە گرێی مەزهەبگەرایی: واتە ئامادەبم تەنها لە پێناوی مەزهەبەکەی خۆمدا و لە پێناوی لقە تایبەتەکەی خۆمدا هەوڵبدەم، ئەمە گرێیەکی زۆر مەترسیدارە، دەبینین لە وولاتێکی وەك عێراقدا بەو گرێی مەزهەبگەراییە گەلێك کەس ئامادەیە دوژمن بهێنێتە سەرماڵی خۆی، هەر تەنها لەبەرئەوەی مەزهەبەکەی بەرامبەر لە ناوببات، ئەمە کێشە و نەخۆشییەکی زۆر قورسە، مێژووی مەزهەبگەرایی دروستیکردووە.

مەزهەبپەرستی، وولاتپەرستی، نەتەوە و خۆپەرستی، مێژوویەك لە شکست و ململانێ و پاوانخوازی دروستیکردبن، دەبێت خۆمانی لێدەربازبکەین.

ئینجا ڕۆڵێکی زیاتر بەزانایان بدرێت، ئەو کەشوهەوا بارگاوییەی لە نێوان نەوەی دوێنێو نەوەی ئەمڕۆدا هەیە پاکبکرێتەوە، پێمانوابێت

زاناکانی پێشین هەوڵ و کۆششی باشیان هەبووە کە هـزرو بیرو بڕوایان گەیاندووەتە دەستی ئێمەو بەئەمانەتەوە گەیاندوویانە، بەڵام ئەوانیش دەبێت متمانەیان بەنەوەی تازە هەبێت و پێمانوابێت جۆرێك لە هەماهەنگی دروستبکرێت لە نێوان دوێنێ‌و ئەمڕۆدا، لە نێوان زانستی دوێنێ‌و ئەمڕۆدا و سیاسەتی پەروەردەو فێرکردنی خۆمان لەسەر ئەو بنەمایە دابڕێژین.

**دووەم:** دەستەڵاتی سیاسی بەتەواوی بێلایەن بێت لە نێوان باڵەکانی هـزرو ئەندێشەی ناو نەتەوەی ئیسلام، بەتەواوی دەستەڵات دەستەڵاتی خزمەتگوزاری بێت و لایەنگریی ڕووگەیەکی سیاسی دیاریکراو نەبێت.

**سێیەم:** سیغەیەکی دروست و ڕاستەقینەی جوان و گونجاو بدۆزینەوە بۆ دروستکردنی پەیوەندیی لە نێوان لایەنی دینی و لایەنی سیاسییدا، لە نێوان گوتەزای ئاینی و گوتەزای سیاسییدا، ئەویش بەدروستکردنی جۆرێك لە هاوسەنگی‌و تەواوکاری و جۆرێك لە هەماهەنگی لە نێوان دەستەڵاتی ئاینی زانایان و دەستەڵاتی سیاسی دەستەڵاتداران، بەتێپەڕاندنی هەموو ئەو تراژیدیا مێژوویانەی کە ئێستا باسیان لێوەدەکرێت، یان وەك خەڵکانێك دێن بینای لەسەردەکەن، دیارە هەموو ئەمانە بەوەدەکرێت کە ناوەندەکانی زانست و زانیاری بەشێوەیەکی زانستیانە و ژیرانە پێکەوە هاوکارو تەبابن، پسپۆڕییە جیاوازەکان بخرێنە پاڵ یەکتری و یەکتری تەواوبکەن لە هەموو وڵاتەکاندا، لە هەموو ناوەندەکاندا، هەرەوەزییەکی کەلتووری لە نێوان زانکۆکان و پەیمانگە ئیسلامییەکاندا هەبێت لە هەموو جیهانی ئیسلامدا

و هاوکاری دارایی و ئاڵوگۆڕکردنی پسپۆڕی لە نێوان هەموو پسپۆڕییەکاندا هەبێت، چ پسپۆڕییە مرۆییەکان و چ پسپۆڕییە شەرعی و ئیسلامییەکان، ئینجا ژمارەیەکی باش کەسانی پێگەیشتوو و تێگەیشتوو ڕابهێنین لەناو زانایان و دەرچوانی زانستگە شەرعییەکاندا، پەروەردەیان بکەین لەسەر ئەو نەریت و چەمکە قورئانییانەی کە خودای پەروەردگار دەیەوێت مرۆڤی لەسەر پەروەردەبکات، بەتایبەتی هەوڵبدەین زاناکان و بیرمەندانمان لە ڕێگای تۆڕی ئەنتەرنێتی و ڕێگاکانی پێکەوە گەیاندنی نوێ پەیوەندیان هەبێت و ئاگاداری یەك بن و پێکەوە دابنیشن، چونکە دووربوون جۆرێك لە هەستیاری دروستدەکات بەرامبەر بەیەکتری، بەڵام هەر ئەوەندە بەسە کە خاوەنی بیروڕاجیاوازەکان بەیەکەوەدابنیشن و چا و قاوەیەك پێکەوەبخۆنەوە، ئەوسا بۆیان دەردەکەوێت جیاوازییەکانی ئەوان زۆربەی پەیوەندیی بەزمان و هەلومەرجی کەلتوری و ئابوری و کۆمەڵایەتی و هاووێنەکانیانەوە هەیە، ئەوکاتەی دەتوانین بیکەین، دڵنیابین یان دڵخۆشوگەشبین بین بەداهاتووی کارەکەمان، پاش ئەو کارانە دەبێت هەوڵبدەین پەیامی گشتی و هەرەوەزی ئەم ئاینەپیرۆزەمان دیارییبکەین و بزانین ئەم ئاینە پیرۆزە لە ئێستای مرۆڤایەتییدا دەتوانێت چی بکات؟ چونکە خەڵکانێك هەیە شارەزانین یان ئاگاداری ئەوە نین چی لەباری هـزری ئیسلامییدایە کە بۆ مرۆڤایەتی بکات! پێویستە چەندین کۆڕی زانستی لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا دروستبکەین، کۆنگرەو سمیناری پسپۆڕانە دروستبکەین، ئاڵوگۆڕی نامەو زانیاری لە نێوان

هەموو زانستگەکانی جیهانی ئیسلامییدا دروستبکەین، ئینجا هەموو بۆنە ئایینییەکان بەکاربهێنین بۆ چارەسەری کێشەو گرفتەکان و سیاسەتی کرانەوەمان بەرامبەر ئەویتر هەبێت کە لەگەڵ ئێمە جیاوازە، بێگومان لەم پرۆژەیەدا پێویستە خۆشمان ئامادەبکەین بۆ زاڵبوون بەسەر ژمارەیەکی زۆر کۆسپو تەگەرەدا کە دێتە رێگامان، کۆسپ و تەگەرەکان سروشتیین، بەشێك لە کۆسپو تەگەرەکان لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتییدا هەبون، لەبەردەم ڕیفۆرمخوازان و کەسانی دڵسۆزی مرۆڤایەتییدا.

**یەکێك لەو کۆسپانە** بریتییەلەوەی هەندێك لەو کەسانەی کە ئێمە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین ئاسۆی بیرکردنەوەیان تەسکەو خاوەنی بیرکردنەوەیەکی کلاسیکین و دەمارگیرن لە بیروبۆچوونی خۆیانداو ئامادەنین دان بنێن بەبوونی تۆدا یان بەبوونی کەسێکیتردا بنێن، ئامادەنین دان بەبوونی جیهانبینییەکیتردا بنێن.

**کۆسپێکی دیکە ئەوەیە:** دەستەڵاتی سیاسی دەیەوێت خۆی بسەپێنێت و بۆمانەوەی خۆی ڕێگا لە هەموو گۆڕانکاری و وەرچەرخانێکی فیکری دەگرێت و تەنانەت دەیەوێت ئەو جیاوازییانە بەشێوەیەك بەکاربهێنێت کە ڕێگا خۆشبکات بۆ مانەوەی خۆی.

زاناکان بەسروشتی خۆیان هەستیارییەکیان بەرامبەر بەیەك بۆ دروستدەبێت، ئەمەش گەلێکجار کێشە بۆ پەیوەندییەکان دروستدەکات.

**کۆسپێکی دیکە ئەوانەی کە توندوتیژن لە خستنەڕووی بیروباوەڕی خۆیاندا وئامادەنین ڕێگا بەلایەنی بەرانبەر بدەن**، ئەوانەی کە بیروبۆچوون و تێگەیشتنێکی جیاوازیان هەیە ڕێگەیان پێنادەن کە بیروبۆچوونی خۆیان دەرببڕن، کەواتە ئەو کەسانەش کە دەیانەوێت بەدەمارگیرییەوە مامەڵە لەگەڵ وتەو وتەزاکانی خۆیان بکەن و بیسەپێنن بەسەر خەڵکیتردا، ئەمانەش کۆسپن لەبەردەم ئەم پڕۆژە هـزرییەدا.

بەڵام لە هەموو کۆسپەکان مەترسیدارتر ئەو تەوژمە ئیلحادی و دژ بەئایینییانەیە کە لە وڵاتانی ئیسلامییدا دروستبوون و دەیانەوێت بەهەمووشێوەیەك نەتەوەی مسوڵمان دابڕن لە شوناسی خۆی و بیروبڕوای خۆی، هەروەها ئەو دیکتاتۆرانەی کە بە ناوی نیشتیمانپەروەرییەوە یان بەناوی نەتەوەپەروەرییەوە بەسەر نەتەوەمسوڵمانەکاندا فەرمانڕەوایی دەکەن.

بەڵام ئەم کۆسپانە هەرچەند زۆربن، ئەگەر خەڵکانی مسوڵمان و بیرمەندانی مسوڵمان پێکەوەبن دەتوانن سەربکەون و لە ئەنجامدا پڕۆژەی چارەسەرکردنی قەیرانی فیکریی سەردەکەوێت و لە ئەنجامدا دەتوانین ئێمەش بەشداربین لەو ڕێنیسانسەدا کە چاوەڕوانی نەتەوەی ئیسلام دەکات.....

# ڕێگاکانی چەواشەکردنی هزریی

ڕێگاکانی چەواشەکردنی هـزر لە لایەن نەیاران و ناحەزانی ئیسلامەوەیە، بێگومان بەتێگەیشتن لەم ڕێگایانە و دەستنیشانکردنیان دەتوانین بەشێوەیەکی باشتر ڕێنمایی خۆمان و دەوروبەرمان بکەین بۆ بیرکردنەوەیەکی ڕاست.

ڕێگای جۆراو جۆر هەیە بۆ ئەوەی فێڵ لە بواری هـزرییدا لە خەڵکی بکرێت، لێرەدا هەوڵئەدەین بەشێوەیەکی کورت و پوخت ئاماژە بەهەندێك ڕێگا بکەین:

**یەکەم: گشتاندن (تعمیم):** واتە بەبوونی تەنها نمونەیەك یان دوو نمونە یان سێ نمونە لەسەر بابەتێك، حوکمێکی گشتی لەوبارەیەوە دەدرێت، لێرەدا ئەو خەڵکانەی کە دەیانەوێت خەڵك گومڕابکەن دەتوانن یەك دوو نموونە بهێننەوە بۆ گومڕاکردنی خەڵك و گشتاندنێکی خێرایان بۆ بهێننەوە.

بۆنمونە: ئەگەر بینییان مسوڵمانێك یان کەسێك پابەند نییە بە ئاینەکەیەوە و بە بیری ئیسلامی و ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامییەوە، دەڵێن: ئەوەتا ئیسلام هەر ئەوەیە و هەموو مسوڵمانان بەو شێوەیەن، ئەگەر بینییان کەسێك لایداوە یاخود ڕاستگۆنییە و دەستپاك نییە، زۆر بەئاسانی دێن ئەم حوکمە گشگیردەکەن، یان بۆ نموونە لەناو گەلێکدا

یان لەناو هۆزێکدا یەك دوو کەسی خراپ بینرا، دێن زۆر بەئاسانی دەڵێن هەموو ئەو گەل و هۆزە خراپن، بەڕاستی ئەمەش هەڵەیەکی کوشندەیە لە بواری هـزردا، چونکە دەرکردنی حوکمی گشتی لەسەر گەلێك یان لەسەر نەتەوەیەك، ئاینێك یان لەسەر خەڵکانێك بەچەند نموونەی سەقەت، ئەوە بەڕاستی حوکمێکی ستەمکارانەیە. بۆ نموونە: کە بیانەوێت باس لە هەندێك جێبەجێکردنی هەڵە بکەن بۆ شەریعەتی ئیسلام یان بۆ یاساو ئەحکامی ئەخلاقی کە لە ئیسلامدا هەیە، تەماشادەکەین هەندێك نموونەی خراپ دەهێننەوە لەو نموونانەی کە بە بۆچونی زانا مسوڵمانەکان بۆ خۆی خراپە، ئێستاکە لە وڵاتی ئێمەدا هەندێك دابونەریتی نەفامی بڵاوبووەتەوە بەناو خەڵکدا، گەر سەیری ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بکەین زۆر بەئاسانی دەڵێن ئەمە خەتای ئاینە، لە حاڵێکدا ئەو نموونانە دەرچوونن لە ئیسلام و دەرچوونن لە سیستەمو یاساو ڕێسای ئیسلامی.

**دیارە گشتاندن بە دوو ڕووەوە خۆی دەنوێنێت:**

**یەکەمیان:** ئەو ووشەیەی کە بەکاردەهێنرێت ووشەیەکی گشتییە و هەندێك جێبەجێکردنی باشی هەیە وسوودی تێدایە بۆ خەڵك.

بۆ نموونە باسی ئازادی دەکرێت، ئازادی ووشەیەکە هەموو کەسێك پێیجوانە و چەمکێکی زۆر پیرۆزە لای مرۆڤەکان، بەڵام کە دێن یەك دوو نمونەی خراپی بۆ دەهێننەوە و دەڵێن: ئەمە ئازادییە، یاخود دەیانەوێت بڵێن بێبەندوباری و بێیاسایی و بێدەستوریی و نەبوونی

داب‌ونەریتێك كە خەڵك پەیڕەوی لێبكات ئەمە شتێكی باشەو ناویدەنێن ئازادی.

هەروەها یەكسانی، دەبینین ئەم ووشەیە لای هەموو كەسێك ووشەیەكی پیرۆز و جوانە، بەڵام تۆبەناوی یەكسانییەوە بتەوێت ئەوەی كە ئازاد و جوامێر و لێهاتووە، ڕێك وەك كەسانی تەمەڵو تەوەزەل حسابیان بۆ بكەیت، وەك یەك مافیان پێبدەیت، ئەمە لە ڕاستیدا ستەمە.

كەباسی پێشكەوتن دەكرێت پێشكەوتنیش بەهەمان شێوەیە، پێشكەوتن تەنها پێشكەوتنی ئابوری نییە، بەڵام دەیانەوێت بڵێن پێشكەوتن تەنها بریتییە لە پێشكەوتنی ئابوری...هتد, كەواتە زۆر لەو ووشە و چەمكانەی كە ئەمڕۆ بەكاردەهێنرێن و بەشێوەیەكی نازانستیانە گشتاندنیان بۆ دەكرێت لە بوارە فیكرییەكاندا دەچێتە بواری بەهەڵەبردنی خەڵكو چەواشەكردنی خەڵك.

جاری واهەیە ئێمە دەتوانین هەندێك شت بەسەرنجو ڕێگەی تاقیكردنەوە بسەلمێنین، ئەوەی كە لە بواری ماددەو ئەزمونگەراییدا بواری پێدەدرێت، بەڵام ناتوانیت ئەمە گشتگیر بكەیت، تەنانەت بۆ بوارە نمونەییەكانیش، لەبەرئەوە بەڕاستی نموونەی زۆر خراپ هەیە لەو بارەیەوە، كاتێك تەماشای هەندێك لەو ئاینە خورافییانە كراوە لە مێژوودا ــ لەو ئاینانەی كە بەڕاستی خەڵكیان خەواندوە و بوونبەهۆی دواكەوتنی خەڵكو كۆمەڵگەكان ــ هەندێك كەس زۆر بەشێوەیەكی خێرا و نازانستیانە وتویانە هەموو ئاینێك وەهایە، تەنانەت ئاینی ئیسلامیش.

ئەمە گشتاندنێکی ستەمکاریانەیە، چونکە لە ڕاستیدا تۆنابێت ئاینێکی وەك ئاینی ئیسلام کە بە هەموو شێوەیەك خەڵك هەڵدەنێت بۆ زانست و خوێندەواری و بیرکردنەوە و سەرنجدان لە بوونەوەر و لە خودی مرۆڤ، وەك ئاینێکی خورافاتیو ئەفسانەیی سەیربکەیت، کەواتە گشتاندنی بەپەلە و بێبنەما یەکەمین ڕێگایە کە بۆ چەواشەکردنی خەڵكو بەهەڵەدابردنی خەڵکە.

**دووەم ڕێگا:** شارینەوە و کاڵکردنەوەی راستییە گشتی و هەمەگیرەکان، بۆ نمونە: هەموو گەلان لە ڕاستیدا لە ڕووی پێکهاتە و لە ڕووی دروستبوون و لە ڕووی مرۆڤایەتییەوە و لە ڕووی مافی مرۆڤایەتی و نەژادەوە دەگەڕێنەوە بۆ یەك خێزان کە بریتییە لە خێزانی ئادەمو حەوا. گەر لەم دۆخەدا بڵێیت نەخێر لەناو ئەم گەلانەی جیهاندا (گەلێك) تایبەتەمەندە و خوا بەجیاواز دروستیکردووە، وەك زایۆنیستەکان دێن لەناو مرۆڤایەتیدا خۆیان جیاکردووەتەوە لەسەر بنەمایەکی ڕەگەزی و ڕەگەزپەرستانە. ئەمەش لە ڕاستیدا چەواشەکردن و فێڵکردنە لە خەڵك.

یان ئەو کەسانەی کە بە ناوی نەتەوایەتییەوە لە وڵاتی ئێمەدا کاردەکەن دەیانەوێت بەهەمووشێوەیەك بڵێن کورد جیاوازە و خوای پەروەردگار بەجیا دروستیکردووە و نەتەوەیەکە هەموو تایبەمەندییەکی باشی هەیەو یاخود هەرچی خراپە هەیە لەناو ناحەزاکانماندا کۆبووەتەوە، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە بەڕاستی، چونکە پێویستە هەموو گەلانی جیهان بەیەك چاو تەماشابکەین و بزانین کە هەموو گەلێك بۆ خۆی ڕێزو حورمەتی هەیە، هەموو گەلێك کە لتورو زمان و

تایبەتمەندی خۆی هەیە، چارەنووسی خۆی هەیە. ئەم هەڵەیەش ئیسرائیلییەکان و نازییەکان و نەژادپەرستانی باشوری ئەفەریقا تێیکەوتن، ماوەیەکی زۆری دوورو درێژیش لە ئەمەریکا مافی ڕەشپێستەکانیان زەوتکردبوو، ئەمە هەمووی لەسەر ئەو بنەما هەڵەیە دامەزرابوو.

لەڕاستیدا شۆفینیزم لەم بیروبۆچوونەوە سەرهەڵدەدات کە پۆلێنی شتێکی گشتی بکەیت بەپێچەوانەی ئەوەی کە خوای پەروەردگار دروستیکردووە، بەڵام دیارە هەوڵو تەقەلای خۆیانە کە جیاوازییان بۆ دروستدەکات کاتێك بۆ خۆیان دەوڵەت دروستدەکەن یان بۆ خۆیان کیانێکی سیاسی پێکدەهێنن.

**سێهەم: دەستکاری کردنی دەق:**

ئەو دەقانەی لە پەرتووکە پیرۆزەکاندا هەن بەشێوەیەك لە شێوەکان دەستکاری دەکرێت. بەڕاستی کەسانێکی زۆر ئەم کارەیان بەرامبەر بەبیری ئیسلامی ئەنجامداوە، تەنانەت لە سەردەمانی کۆندا لە سەدەی دووەم و سێیەمی کۆچی بەدوا، خەڵکانێك پەیدابوون بەناوی پێغەمبەری خواوە(درودی خوای لەسەر) فەرمودەیان دروستدەکرد و بە ناوی پێغەمبەرەوە(درودی خوای لەسەر) بڵاویاندەکردەوە بەناو خەڵکدا، بەمەبەستی جیاوازی سیاسی یان حزبیی یان ئیلحادی بێت، یان شێواندنی بیروباوەڕو ئەندێشەو رەفتاری مسوڵمانان، ئەمەش پێیدەوترێت چەواشەکردن(تدلیس)، کە بریتییە لە دەستکاریکردن و

گۆڕین یاخود بەشێوەیەك لە شێوەكان شێواندنی ڕوخساری ڕاستەقینەی دەق بەدەستكاریكردنێكی ئەنقەست.

بۆنمونە ئەگەر ئێمە لە قورئانی پیرۆز وردببینەوە دەبینین خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ﴾ آل عمران١٩. ئەگەر یەكێك بێت یەك ووشە بۆ ئەم دەقە زیاد بكات بۆ نموونە بلێت ﴿ان الدين عندالله غير الاسلام﴾ دەبینیت كە ماناكەی بە تەواوی دەگۆڕێت، جا لەبەرئەوە هەستدەكەیت بەدرێژایی مێژوو ناحەزانی ئیسلام لە جولەكە و كەسانی مولحید هەوڵیانداوە بەهەرشێوەیەك بێت دەستكاری ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز بكەن بەڵام خوای پەروەردگار لە هەموو سەردەمێكدا كەسانێكی زاناو وریاو ژیرو كارامەی ڕەخساندووە بۆ بەرگریكردن لە قورئانی پیرۆز، لەبەرئەوە هیچ كەسێك هەتا ئێستا نەیتوانیوە ووشەیەك، دێڕێك، پیتێك، لە قورئان زیادبكات یان كەمبكاتەوە. لە بواری فەرموودەشدا بەرێكخستن و تۆكمەكردنی زانستی فەرموودەناسی، فەرمودەی ڕاست و لاواز و هەڵبەستراو لێكجیاكراونەتەوە.

**چوارەم: دابڕینی هەندێك لە چەمكە بنەڕەتییەكان:**

ڕێگایەكی دیكە كە ناحەزانی ئاین هەوڵدەدەن بەكاریبهێنن بۆ چەواشەكردن لە بابەتە فیكرییەكاندا بریتییە لە دابڕین و نەهێشتن یاخود شێواندنی هەندێك لە چەمكە بنەڕەتییەكان كە لە دەقەكاندا هەیە. بۆ نموونە بنەمای دەستەڵاتدارێتی(حاكمیەت)، بەمانای ئەوەی

کە پێویستە دەستەڵات خۆی ببەستێت بەخوای پەروەردگارەوە، بەرنامەو بیروبۆچوون و تەشریعاتی خۆی لە شەریعەت وەربگرێت. بەڵام بەگەلێك شێوە هەوڵدراوە لە بیروبۆچوونی مسوڵماناندا کاڵبکرێتەوە و بەشتێکی زۆر لاوەکی حسابی بۆ بکرێت، واتە ئەو بانگەشە زۆروزەبەندەی لە زۆر لە شوێنانی جیهانی ئیسلامدا باسی لێوەدەکرێت و دەڵێن: ئیسلام کاری بەسەر دەوڵەت و یاسادانان و ژیانی سیاسی خەڵکەوە نەبێت، ئەمەش لەو بنەماوە سەرچاوە دەگرێت کە دەیانەوێت پایەیەکی سەرەکی هـزری ئیسلامی بگۆڕن یان لایبەن یان رەچاوی نەکەن، یاخود دێن دەستکاری دەقەکان دەکەن و دەق بە شێوەیەك بەکاردەهێنن و دەستبژێری دەکەن، واتە ئەوەی کە پێویستیان بێت لە دەقەکان ڕەواجی پێدەدەن و بڵاویدەکەنەوە، بەڵام ئەوەی ڕۆحی دەقە، یان بنەڕەتییە لە دەقەکانی شەریعەتی ئیسلامو قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر) دەیشارنەوە یاخود بەشێوەیەکی خراپ مانای دەکەن.

بۆنموونە لەناو فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر) بەشێکی دەهێنن و بەشەکانی تری پشتگوێدەخەن و دەیشارنەوە، بۆ نمونە دەڵێن پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) ڕێگەی گرتووە لەوەی کە خەڵك بیربکاتەوە و مەجالی بیرکردنەوەی نەداوە بەمسوڵمانان، بەڵگەش ئەوەیە کە گوایە فەرمویەتی(ولاتفكروا في ذات الله فتهلكوا)، واتە: بیرمەکەنەوە لە زاتی خوا چونکە دەبێت بەهۆکاری ئەوەی کە بە هیلاکدا بچن، ئەم دەقە سەرەتاکەی ـ کە زۆرگرنگە ـ لادەبەن، لە

سەرەتادا فەرموویەتی(تفكروا في خلق الله) واتە: بیر لە دروستكراوەكانی خودا بكەنەوە. ئەگەر دەقەكە بە تەواوی بنووسنەوە، راستی و دروستی فەرموودەكە ئاشكرادەبێت، بەڵام ئەوان ئەوەیان ناوێت و دەیانەوێت بڵێن: لە ئیسلامدا ڕێگەی بیركردنەوە نەدراوە، ئیتر هەموو ئەو ئایەتانەی كە هەیە لەو بارەیەوە نادیدە دەگرن یان دەیشێوێنن یان دەیشارنەوە، ئەمەش بەڕاستی ڕێگایەكە بۆ تێكدانی بیركردنەوە و چەواشەكردنی خەڵك.

**پێنجەم: دەستكاریی دەقەكان دەكەن بەتحریف یان بە(تصریف):**

(تحریف) ئەوەیە كە ووشەكە لابەرن یان ووشەیەكیتر بخەنە شوێنەكەی، (تصحیف)یش ئەوەیە كە لە خاڵبەندیدا دەستكاری دەقەكە بكەن، كە بە ڕاستی ئەوەش زۆر مەترسیدارترە، بەڵام خوای پەروەردگار لە هەموو سەردەمانێكدا كەسانێكی ناردووە كە نەهێڵن و هەمیشە لەكەمیندابن بۆ ئەو كەسانەی كە دەیانەوێت دەستكاری دەقەكانی ئیسلام بكەن.

**شەشەم: یاریكردن بەدەق:**

ئەمە ڕێگایەكە بۆ تێكدانی بیری ئیسلامی و ڕێگەگرتن لە بیركردنەوەی مسوڵمانان، كە بریتییە لە یاریكردن بەدەق بۆ ئەوەی ئەو مافەی كە لە شەریعەتدا هەیە بەتاڵی بكەنەوە و ئەو بەتاڵەی كە لای خۆیانە وەك راستی نیشانیبدەن، بەتایبەتی ئەوكەسانەی كە دەیانەوێت

بڵێین ئەوەی کە لە ڕووکەشی ئەم قورئانەدایە مەبەست نییە، ڕووکەش مەبەستی شەریعەتە. لە مێژووی ئیسلامدا پێیانوتراوە (باطني)یەکان، ئەمانە دێن بەپێی مەرامی هـزری و سیاسیی خۆیان دەقەکان وەها مانادەکەن و لێکیدەدەنەوە کە گەلێك جیاوازە لەوەی کە پێشینانی ئوممەتی ئیسلامی لەسەر پەروەردەبووە و بانگەوازیان بۆ کردوە.

لەڕاستیدا لە پشتی ئەم (باطني)یەتەوە پێدەچێت لە مێژووی ئیسلامدا یەهود ڕۆڵێکی زۆر کاریگەرو بنەڕەتییان هەبووبێت، چونکە هاتوون بیرۆکە و نەخشەیان بەو ڕەوتانە بەخشیوە کە لە مێژووی ئیسلامدا بە ڕەوتی (باطني) ناسراون، ئەمانە پێیانوایە دەبێت ئەوەی لە فیقهی ئیسلامیدا باسدەکرێت بخرێتە کەنار و شەریعەتی ئیسلام تەنها کۆمەڵێك چەمکی (باطني)یە کە پێویست بەجێبەجێکردن ناکات، لەم بۆچوونەدا نوێژکردن مانای نییە، حەج مانای نییە، زەکات مانای نییە، تەنانەت بوونی پێغەمبەران ئەوەندە گرنگ نییە، تەنها بوونی کەسانێك نەبێت، کە بە لای خۆیانەوە هەندێك چینبەندیی سەیریان بۆ کردوون. گرووپی (باطني) لەسەر ئەو بنەڕەتە دروستبوون، لەبەرئەوە بەمسوڵمان دانانرێن.

ئەمە ڕێگایەکە هەمیشە ویستراوە کە بە ناوی تەئویلەوە ڕێگا لە بیرکردنەوەی مسوڵمانان بگیرێت دەربارەی ئەوەی کە بەردەوام پێویستیان پێیەتی، چونکە مسوڵمان پێویستی بەدەقەکانی قورئان و سوننە هەیە لە چارەسەری گیروگرفتی ڕۆژانەی خۆیاندا و بۆ ڕێکخستنی ژیانی خۆیان، بەڵام ئەو لادەرانە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە قورئان

ڕووکەش‌و دیوی ناوەوەی هەیە، دیوی دەرەوەی ئەوەیە کە لە ووشەکان وەردەگیرێت، بەڵام ناوەوە(باطن)ی لای کۆمەڵێکی تایبەتی هەیە کە لە ڕاستیدا پێشەوای خەڵکن و دەبێت تەنها لە ڕێگەی ئەوانەوە لەم قورئانە تێبگەین. ئەم هـزرە جیاوازە لە بزوتنەوی (تەصەوف) چونکە بزوتنەوی تەصەوف ئەو بزوتنەوەیەیە کە پەیوەستە بە قورئان و سونەتەوە و پێیناوترێت بزوتنەوەیەکی (باطني)، بەڵکو هەوڵ‌و تێکۆشانی کۆمەڵێك لە زانایانی ئیسلامە بۆ ڕێگەگرتن لە (باطني)یەتێکی مەترسیدار کە لە مێژووی ئیسلامیدا لە گروپی (إسماعیلییەکان)[1]دا خۆی نواندووە.

## شەشەم: وورووژاندنی هەندێك بیرۆکەی هەڵبەستراو:

ڕێگایەکیتر کە بەکاردەهێنرێت بۆ چەواشەکردنی بیرو هـزری مسوڵمانان بریتییە لە وورووژاندنی هەندێك بیرۆکەی بێبنەما، تا ڕێگای

[1] - ئیسماعیلییەکان: گروپێکی موتەتەریفیی شیعە بوون، بڕوایان بە ئیمامەتی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەرصادق بوو، دوای مردنی لەشیعەی ئیمامی جیابونەوە، بیروباوەڕێکی باتینی و تێڕوانینێکی عەقڵیان ڕەتکردووەتەوە، بۆچون‌و قیاسیان لەدیندا ڕەتکردووەتەوە، لەبەرامبەر ئەمەدا وایان بەباش داناوە کە دەستبگرن بەوەی کە پێشەوا مەعصوم‌و بانگخوازەکانیان دەیڵێن، بڕوایانوایە ئیمامەکانیان لەڕوکەشدا مرۆڤن‌و لەناخیشەوە سیفاتی خودایەتییان تیادایە...بڕوایانوایە دەبێت تەئویلێکی باتینی بۆ قورئان بکرێت، ئەو تەئویلەش تایبەتبێت بە (پێشەوا عەلی)و نەوەکانی. (مصطفى غالب، مقدمة تحقيق كتاب الينابيع، لأبی يعقوب السجستاني، الإسماعيلي، بيروت: المكتب التجاري للطبع والنشر، ١٩٩٠، لا١٠).

بیرکردنەوە لە مسوڵمانان ببەستن و گومانیان بۆ دروستبکەن لە بنەمای ئاینەکەی خۆیان.

بۆنمونە: دەڵێن پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) سرووش(وحی)ی لە لایەن خوداوە بۆ نەهاتووە، بەڵکو قورئان لە (بوحەیرای ڕاهیب[1])ەوە فێربووە، لە حاڵێکدا هەموو مێژوونووسان و ئەوانەی کە سیرەیان نوسیووە تێکڕا هاوڕان لەسەرئەوەی کە لە ژیانیدا تەنها جارێك ـ ئەویش بەمندالّی ـ (بوحەیرا)ی ڕاهیبی بینیوە، ئەویش نەك ماوەیەکی دووردرێژ لەگەڵیدا دابنیشێت، تەنها ئەو پیاوەی بینیوە، گفتوگۆشی لەگەڵدا نەکردووە، بەڵکو بوحەیرا لەگەڵ مامی پێغەمبەردا (درودی خوای لێبێت) قسەی کردوە، ئەگەر هەرکەسێکیش قسەکانی بخوێنێتەوە تەنها پێویستی بە چەند خولەکێکە، دواتر وتوویەتی ئەم کوڕە ببەنەوە بۆ ووڵاتی خۆتان.

ئەمە نمونەیەکە کە لە پێناوی چەواشەکردندا پەنا ببەیتەبەر ڕووداوێکی ئاوا بچووك و بیرێکی ئاوا ترسناکی لەسەر بونیاتبنێیت...

نمونەی زۆرمان هەیە لەوبارەوە کە خودی بنەماکان جێگەی پرسیارە، چ بنەمای مارکسیەت بێت یان فەلسەفەی هیگڵ یان فەلسەفەی برگسۆن بێت، یان بۆچوونەکانی فرۆید، ئەمانە بنەماکانیان هەتا ئێستاش نەبوون بەحەقیقەتی زانستی، ئێستاش گفتوگۆی تێروتەسەلی لەسەردەکرێت لە ناوەندە ئەکادیمییەکاندا، بەڵام گەر

[1] - بوحەیرای راهیب لە باشووری سوریادا کەنارگیری کردووە و خەریکی خواپەرستی بووە لەسەر ئاینی مەسیحی.

کەسێك ئەم بیرۆکانە بکاتەبنەما بۆ دارشتنی فەلسەفەیەك بۆ ژیان ئەمە گەورەترین چەواشەکارییە کە رووبەڕووی بیری مرۆڤ دەبێتەوە.

**حەوتەم: هەڵبەستنی وتەو هـزرو بۆچوون و مەزهەب و ناونانی فیکرو بیروبۆچون و مەزهەب بەناوی کەسانێکەوە**، ئەوکەسانەش شتی وایان نەگوتووە، واتە زۆرجار ئەوانەی ویستویانە ڕەواج بەهـزرێکی نائیسلامی بدەن بیروبۆچوونەکانی خۆیان داوەتەپاڵ زانایەك یان فەیلەسوفێکی گەورە، بۆ نموونە (باطني)یەکان لە مێژوودا دەیانوت فلان زانای گەورە لەسەر مەزهەبی ئێمەیە، بۆنمونە دەیانوت (ئەبوعەلی سینا) (باطني)بووە، یان (ئەبونەصری فارابی) (باطني)بووە، یان دەیانوت: ئەو کەڵە زانایانەی کە بیری گەورەیان هەبووە لەسەر بیروبۆچوونی ئێمە بوون، بەتایبەت بیدعەکاران و ئارەزووپەرستان لەناو مسوڵمانان‌دا ئیشیان ئەوەبووە کە کار لەسەر ئەو بڕوایە بکەن کە زانا گەورەکان یان ئەوانەی کە جێگەی شانازی مرۆڤایەتین یان جێگەی شانازی مسوڵمانانن، پەیڕەوی هەمان ڕێگای ئەوان بوون، وەك چۆن یەهودییەکان و دەمارگیری مەسیحی دەیانوت ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر) مەسیحی بووە، کە ئەمەش ڕێگایەکی چەواشەکارانە بوو دەیانگرتە بەر.

ئێستاش لە ناوەندە هـزرییەکاندا هەرکەسێك‌و هەر گروپێك و هەر قوتابخانەیەکی هـزریی یان سیاسی هەبێت، هەوڵدەدات کەسانێکی بەناوبانگ بخاتە ناو بازنەی خۆیەوە.

**هەشتەم: شاردنەوەی دەقی ڕاستەقینە:**

ئەم میکانیزمەش زۆر بەکارهاتووە بۆ چەواشەکردنی بەرامبەر، بە شاردنەوەی دەقی ڕاستەقینە و شاردنەوەی ئەو گەواهیدانەی کە زاناکان داویانە سەبارەت بە پرسێك لە پرسەکانی ژیان، لەم بارەیەوە خوای پەروەردگار زۆر بەڕوون و ئاشکرا دەفەرموێت: ﴿يَاأَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ آل عمران٧١. ئەم گوتارە لە سیاقی گوتاری خوایە بۆ بەنی ئیسرائیل هەمیشە پێیانی فەرمووە کە ئێوە حەقو باتڵ تێکەڵ بەیەك مەکەن وەحەق مەشارنەوە لە کاتێکدا کە ئەزانن حەق چییە.

لەسورەی (ال عمران)دا دەفەرموێت: ﴿وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ وَمَايُضِلُّونَ إِلاَّ أَنفُسَهُمْ وَمَايَشْعُرُونَ، ياأَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ، ياأَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ آل عمران٦٩ – ٧١. لێرەدا ئەمە زۆر بەڕاشکاوی باسی دیاردەیەك دەکات لەناو خاوەن پەیامەکاندا بەتایبەتی دوای موسا پێغەمبەر(سەلامی خوای لەسەر)و لە سەردەمی پێغەمبەری گەورەمان(درودی خوای لەسەر)، خاوەنپەرتووکەکانی پێش ئیسلام هەوڵیانداوە مسوڵمانان یان مرۆڤایەتی گومڕابکەن، لە حاڵێکدا خۆیان گومڕابوون، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار پێیاندەفەرموێت: ئەی

خاوەن پەیامەکان! بۆچی ئێوە بەڵگەکانی خوا بەدرۆدەخەنەوە؟ لە کاتێکدا خۆتان بە چاو دەیبینن و دەزانن ڕاستی کامەیە، خوای پەروەردگار زۆر بەگرنگییەوە لە قورئانی پیرۆزدا باس لەوە دەکات کە پەیمانی لە زانایان وەرگرتووە کە پێویستە ئەوەی ڕاستییە بۆ خەڵکی ڕوونبکەنەوە و چەواشەکاری نەکەن، راستی نەشارنەوە و نەیکەن بەژێرلێوانەوە، لە پێناوی پارەیەکی کەمدا یان قازانجێکی دونیایی تێپەڕدا واز لە ڕاستی نەهێنن، هەروەك دەفەرموێت: ﴿وَإِذَ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَتَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاء ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْاْ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾ آل عمران١٨٧. واتە: بۆیان باسبکە کاتێك خوای پەروەردگار پەیمانی لە خاوەن کتێبەکان وەرگرت ئەوانەی کە پەیامیان بۆ هاتبوو، دەبێت ئەو پەیامە ڕوونبکەنەوە بۆ خەڵکی و نەیشارنەوە، بەڵام ئەوان لە ئەنجامدا وازیان لە پەیامەکە هێنا و نەیانکردە بەرنامەی ژیانی خۆیان، بەڵام لە بەرامبەر دونیایەکدا کە خوای پەروەردگار ناویدەبات بە﴿ثَمَناً قَلِيلاً﴾ ، بەنرخێکی کەم، ﴿فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾ ، شتێکی خراپ دەکڕن!

بەدرێژایی مێژوو خەڵکانێك ویستوویانە راستی بگۆڕن یان ناشیرینی بکەن یان لەگەڵ بەتاڵدا تێکەڵی بکەن، چونکە هەرکات راستی لەگەڵ بەتاڵدا تێکەڵ بکرێت، هەندێك لە جوانییەکانی راستی دەڕژێت بەسەر

بەتاڵدا و هەندێك ڕەونەق، بەتاڵەکە دەگرێتەوە، لەبەرئەوە گەلێك کەس دوای بەتاڵ دەکەوێت و راستییان لە بیردەچێتەوە.

## هەشتەم: دۆزینەوە و بەکارهێنانی هەندێك چەمکی ناڕەوا:

هەندێك چەمکی نابارو پەڕگیر کە ڕەنگە هەموو مسوڵمانان لەسەری هاوڕانەبن، هەندێك کەس ئەو چەمکانە دەهێنن کە لە ڕاستیدا خزمەت بەڕەوتی مسوڵمانان و شارستانیەتی نەتەوەی ئیسلام ناکات و خزمەت بەبونیاتنانی ناو کۆمەڵگە ناکات، وەك هێنانی هەندێك لەو ئیجتهادە لاوازانەی کە هەیە لەلای مەزهەبێك، وەك جەبرگەرایی لە بیروباوەڕدا، کە بە ڕاستی زۆرجار بەکارهێنراوە بۆ خەواندنی مسوڵمانان و تەمبەڵکردنیان لە ئاستی ئەو لێپرسراوێتییە گەورەیەی کە لە ئەستۆیاندایە.

کەس ناتوانێت نکوولی لەوەبکات سەردەمانێك لە ناو نەتەوەی ئیسلامدا کەسانێکی(جەبری) هەبوون، بڕوایان وابووە کە مرۆڤ هیچ کارێکی بەدەستنییە و هەمووشتێك خوا خۆی دەیکات، ئەوکەسەی دەبێتە دەستەڵاتدار بەسەرمانەوە ئەوە ویستی خوای لەسەرە و پێویستە ملکەچی بین، هەرکێشە و دواکەوتن و نەبوونییەك کە دێت بەسەرماندا تاوانی ئێمە نییە و خوا لە چارەی نووسیوین، و دەبێت ئێمە قبووڵی بکەین. ئەم عەقڵییەتە جەبرییە لە ڕاستیدا لەلای هەندێك سوڵتان و هەندێك لە تاقمە ئیسلامییەکاندا هەبوە، بەڵام ئەم بۆچوونە

قبوولنەکراوە لە لایەن زانا مسولمانەکانەوە،و بە هـزرێکی ریزپەڕ و هەڵە دانراوە، بەڵام ئێستا کەسانێك بێن لە ڕوانگەیەکی سیاسییەوە یان بە مەرامێکی سیاسی بەکاریبهێنن وەك لە مێژوودا زۆر ڕوویداوە، تەنانەت هەندێك لە خۆرهەڵاتناسان ئەو فیکرانەیان قۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی بڵێن هەموو مسولمانان دەبێت جەبری بن یاخود ئەو جەبرییەتە ڕەواج پێبدەن لە ناو مسولمانانیدا بەناوی جۆراوجۆرەوە، ئەمەش ناپاکییە بە مسولمانان کە ئەم رێبازە وەك هـزرێکی ئیسلامی بەکاریبهێنیت و ڕەواجی پێبدەیت.

هەندێك کەس لەناو نەتەوەی ئیسلامدا هەبوون کە بە هیچ شێوەیەك گوێیان بەگفتوگۆو دیالۆگ و بانگەوازو بەئامۆژگاری و حیکمەت نەداوە، تەنها باوەڕیان بەزەبروزەنگ هەبووە، ئێستا خۆرهەڵاتناسان دێن دەیانەوێت بڵێن: ئەم ئیسلامە هەر بە شمشێر بڵاوبووەتەوە.

لەڕاستیدا ئیسلام وەك دەستەڵاتی دەوڵەت و خەلافەت، پێویستی بە هێز هەبووە بۆ مانەوە و پاراستنی خۆیان و گەیاندنی دەنگی ئیسلام بەو سەرزەمینانەی پێویستە باوەڕی ئیسلامی پێبگات، بەڵام مسولمانبوونی خەڵك بەبڕوای خۆی بووە، بەدیالۆگ بووە، وەك مێژوونوسە خاوەن ویژدانەکان باسیان لێکردووە و تۆماریان کردووە.

**نۆیەم: هەندێك کەس دەڵێن:** پێشکەوتن و شارستانییەتی، بەرهەمی بیری پێشکەوتخوازی نائاینییە، تا ئەو رادەیەی دەڵێن: لە ڕاستیدا

خۆرئاوای بێباوەڕ هەموو ئەو شتانەیان بۆ ئێمە هێناوە! ئیتر ئەو ڕاستییە دەشارنەوە کە لە ناو خۆرئاواشداو ئەوانەش کە ئەم کارە گەورەو گرانەیان کردووە ئیمانیان بەخوای پەروەردگار هەبووە و باوەڕێکی پتەویان لە ناخدا هەبووە بەرامبەر بەبەدیهێنەرێك کە ئەم جیهانە بەڕێوەدەبات.

وەك بینیمان لە سەردەمی سۆڤیەتدا بە هەموو شێوەیەك دەیانویست دەستکەوتە زانستییەکان بەکاربهێنن بۆ خزمەتی ئایدۆلۆژیای مارکسی، بەڵام سەرەنجام دەرکەوت کە ئایدۆلۆژیای مارکسی نەبنەمای زانستی هەیە نەبنەمای ئەکادیمی.

**دەیەم: بیربردنەوەی شتە بنەڕەتییەکان:**

ئەم چەمکە بەکاردەهێنن بۆ ئەوەی خەڵك بیرنەکاتەوە و بابەتە بنەڕەتییەکانیان فەرامۆش بکەن و بێئاگایان بکەن لە پرسو بابەتە جەوهەرییەکانی ژیانیان، بەڵکو سەرقاڵیان بکەن بە شتی لاوەکییەوە.

لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا ئەم ڕێگایە دەگیرێتەبەر بۆ چەواشەکردنی خەڵكو بۆ ئەوەی خەڵك بیرنەکاتەوە لە بنەمای کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان، لێرەدا دیارە دەستانێك هەن بەشێوەیەکی وورِیا و زیرەکانە کاردەکەن بۆ ئەوەی خەڵك بیر لە کێشەکان نەکاتەوە، بیر لە ڕەگوڕیشەی دواکەوتن و گەندەڵی نەکاتەوە. کەواتە ئەو کەسەی قسە لەسەر ئاین و هـزری ئیسلامی دەکات، پێویستە شارەزای ئەو بابەتانەبێت بزانێت ئێستا مسوڵمانان پێویستییان بەچی هەیە؟ دەبێت

بیر لە شتی جەوهەری بکەینەوە و بابەتە لاوەکییەکان هەژموونیان بەسەر هەموو پانتایی ژیانماندا نەبێت.

**دەیەم: گەڕان بەشوێن شتی سەرنجڕاکێش‌و کارکردن لەسەر سۆز:**

دەگەڕێن بەناو خەڵکدا بزانن چ بابەتێك زیاتر سەرنجڕاکێشە بۆیان، سۆزی خەڵك بە چ بابەتێك دەوروژێت؟ بابەتی نەتەوایەتی؟ بابەتی پەیوەست بەدەوڵەت؟ بابەتی ئاینی و مەزهەبی؟. دێن سۆز و ڕای گشتی ئەو خەڵکە دەقۆزنەوە و بەکاریاندەهێنن، بۆ ئەم مەبەستەیان میدیا بەکاردەهێنن، بۆ ئاڕاستەکردنیان بەو شێوەی خۆیان دەیانەوێت، زۆرجار خەڵك بێئاگادەبێت لە بنەمای کێشەکان و نازانێت چ کێشەیەکی گەورە لە ئارادایە، بەزۆر دووبارەکردنەوەی ئەو دروشمە سەرنجڕاکێشانە، ڕەنگە ئێستا بووبن بەشتی بەڵگەنەویست لە ناو خەڵکدا، لە حاڵێکدا گەر بە وردیی سەرنج بدەین، دەبینین ئەو خەڵکە بەهەموو شێوەیەك بەکاردەهێنرێن و چەواشەدەکرێن و فێڵیان لێدەکرێت، زۆرجار ئەو دروشمانە دەخرێنەقاڵبی شاکاری ئەدەبییەوە، یان فیلمی سینەمایی‌و شانۆگەرییەوە، جاری واش هەیە بە شێوەی نوکتە دەیانەوێت ئەو لایەنی سۆزدارییەی خەڵك بجوڵێنن.

**یانزەیەم: بەکارهێنانی هەندێك ووشە لە دەرەوەی ماناکانی خۆی:**

بۆنموونە: ئەگەر کەسێك پابەندی راستی بێت و لەسەر بیری یەکتاپەرستی خۆی بەردەوامبێت و لەسەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام

لانەدات، هەندێك مرۆڤـ بێویژدانانە لەناو خەڵكدا بڵاویدەكەنەوە و دەڵێن ئەمە كەسێكی دەمارگیر و توندڕەوە و نازانێت راستی چییە! هەروەها گەلێك تۆمەت و قسەو قسەلۆكیتر، لە ڕاستیدا ئەمەش شێوازێكە لە شێوازەكانی چەواشەكردن و ڕێگرتن لە بیركردنەوەی هۆشیارانەی خەڵك. سەیربكە چۆن خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً قَالُواْ وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءنَا وَاللّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللّهَ لاَيَأْمُرُ بِالْفَحْشَاء أَتَقُولُونَ عَلَى اللّهِ مَا لاَتَعْلَمُونَ﴾ الأعراف٢٨. لێرەدا پەروەردگار باسی خراپەی دەمارگیری دەكات، بەڵام خەڵكێك دەیانەوێت ڕەخنە لە ئیسلام بگرن بەوەی كە گوایە دەمارگیرە، لە حاڵێكدا ئیسلام بۆ خۆی گەورەترین بانگەوازی كردووە بۆ نەهێشتنی دەمارگیری، وەك لەو ئایەتەدا باسیكرد، لەبەرئەوە زۆرجار دەیانەوێت بەو شێوەیە ڕێگا لە هـزریاران بگرن و چەواشەكاری بكەن، بەوەی كە بە توندڕەو یان دەمارگیر ناوزەدیان دەكەن و چەند دروشمێكیان بەسەردا دەسەپێنن، كەلەڕاستیدا دوورە لەوان و ئەوان تەنها باوەڕدارن و راستیخوازن.

ئەمە چەند ڕێگا و شێوازێك بوو كە لە كۆمەڵگەی ئیسلامییدا بەكاردەهێنرێن بۆ وروژاندن و شێواندنی بۆچون و شێوازی بیركردنەوەوی خەڵك....

### پێگەی ئاكارو ڕەوشت لە هـزری ئیسلامییدا

یەكێك لەو كێشانەی كە دەستەو یەخەی مسوڵمانانی گرتووە كێشەی گیروگرفتە ڕەوشتییەكانە، چونكە ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە

بەرنامەی خۆیدا بۆ داڕشتنی کەسایەتی مرۆڤ لە پەنای داڕشتنی لایەنی فیکری و لایەنی بڕوایدا، گرنگییەکی زۆر بە پێکهاتەی ڕەوشتی و ئاکاری مرۆڤ دەدات. لە بابەتەکانی پێشودا بەشێوەیەکی خێرا باسی ئەم بابەتەمان کرد، بەڵام لەم بابەتەدا دەمەوێت بەشێوەیەکی وردترو کراوەتر باسی لێوەبکەین.

ئاکار لە ئیسلامدا پێگەیەکی تایبەتی هەیە خوای پەروەردگار گرنگییەکی زۆری بەبابەتی ئەخلاق داوە تەنانەت ئەخلاقی ئیسلامی لە کەسایەتی پێغەمبەرەکەیدا محەممەد (درودی خوای لەسەر) بەرجەستە کردووە، خۆی ئەم پێغەمبەرەی بەوە پەسەندکردووە کە دەفەرموێت ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ القلم٤، کە بێگومان ﴿خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ ناونیشانێکە بۆ هەموو ڕەوشتێکی چاکو بۆ هەموو ڕەوشتێك کە دەبێتەمایەی خێرو بەختەوەری بۆ مرۆڤ، یەکێك لە گەورەبیرمەندانی ئیسلام لە سەدەکانی ناوەڕاستدا (شێخ ئیبن تەیمییە) لەم بارەوە دەفەرموێت (أما الخلق العظيم الذي وصف الله تعالى به محمدا (صلى الله عليه وسلم)، فهو دين جامع لجميع ماأمر الله به مطلقا، هكذا قال مجاهد وغيره، وهو تأويل قرآني كما قالت عائشة (رضي الله عنها) كان خلقه القرآن، وحقيقته المبادلة للامتثال لما يحبه الله تعالى بطيب النفس وانشراح الصدر). ئەم باسەی لە(مجمع الرسائل الكبرى)دا هێنراوە، واتە ڕەوشتی بەرز کە خوای پەروەردگار پێناسەی محەممەدی(درودی خوای لەسەر) پێکردووە بریتییە لەو ئاینە کۆبەندە کە هەموو فەرمانەکانی خوای بەتێکڕایی گرتوەتەوە، کە ئەمەش لێکدانەوەی پێشەوا

(موجاهیدی کوڕی جەبر)ە، کە یەکێك بووە لە پێشەواکانی تابعین، بریتییە لە تەئویلی قورئان، حەزرەتی عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) کاتێك کە باسی پێغەمبەری کردووە، وتوویەتی: ڕەوشتی پێغەمبەر بریتییە لەبەرجەستەکردنی قورئان، یاخود بەئەنجامگەیاندنی قورئان، بەئەنجامگەیاندنی پەیامەکانی قورئان، جەوهەری ئەم ڕەوشتە گەورەیەش بریتییە لە هەوڵدان یاخود تێکۆشان بۆ جێبەجێکردنی هەر شتێك کە خوای پەروەردگار پێیخۆشە، ئەنجامدانی بەدەروونێکی پاك‌و بە سینەیەکی گوشاد و فراوان. بێگومان ئەگەر ئێمە تەماشای ژیانی پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) بکەین، لە گوفتارەکانی، لە ڕەفتارو هەڵوێستەکانی، بۆ ماندەردەکەوێت کە ڕەوشت، ئاکار، ئەخلاق، لە ژیانی مرۆڤدا چ گرنگییەکی هەیە و چەند کاریگەری هەیە لەسەر پێکهێنانی کەسایەتی مرۆڤ، تەنانەت پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) لە فەرموودەیەکی زۆر پەسەندا دەفەرموێت: (إن المؤمن ليدرك بحسن خلقه، درجة الصائم القائم)، واتە: باوەڕداری ڕاستەقینە بێگومان ئەگەر ڕەوشتی جوانبێت، هەر بەڕەوشتە جوانەکەی دەتوانێت پلەیەکی بەرزی دەستبکەوێت وەك پلەی ئەو کەسانەی کە بەردەوام خەریکی ڕۆژووگرتنن، یان بەردەوام خەریکی نوێژکردنن، کەواتە پەیوەندییەکی زۆر ئۆرگانی ڕاستەوانە هەیە لە نێوان ڕەوشت و ئیماندا.

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت (أكمل المؤمنين إيمانا أحسنهم خلقا) کە ئەمە فەرمودەیەکی پەسەندەو هەریەك لە پێشەوایان (ئەبوداوودو تیرمیزی‌و حاکم) گێڕاویانەتەوە.

لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت(إن من أحبكم إلي وأقربكم مجلسا يوم القيامة أحسنكم أخلاقا)، واتە: ئەو کەسانەتان لای من خۆشەویستن و لە من نزیکترن لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەتان کە ڕەفتاریان جوانتربێت.

کەواتە پلەوپایەی ئەخلاقو ڕەوشت لە شەریعەتی ئیسلامدا هیچ جێگەی پرسیار نییە، بەڵکو بووە بە بابەتێکی گومانهەڵنەگر، کە کەس ناتوانێت نکوڵی بکات، لە ڕوانگەی ئایەتەکان و فەرموودەکان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)و بەرهەمی زانایانی مسوڵمانەوە دەردەکەوێت کە ئێمە دەتوانین بیر لەوەبکەینەوە بیردۆزێکی ڕەوشتیی پێشکەش بەمسوڵمانان بکەین، ئەم تیۆرە خاوەنی میتۆدێکی کردەیی و ئایدیالی نییە کە بڵێیت کەس ناتوانێت جێبەجێی بکات، ئەم بیردۆزە لە هەناوی ژیاننامەی پێغەمبەری خواوە(درودی خوای لەسەر) هەڵهێنجراوە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لە سەر) بۆخۆی لە ژیانی تاکەکەسی و ژیانی خێزانی و ژیانی کۆمەڵایەتیدا، لە ژیانی ناو یارویاوەران و شوێنکەوتوانیدا بەشێوەیەکی جوان بەرجەستەی کردوە، هەر بەم ڕەوشتە جوانەبوو کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) ئەو پلەو پێگەیەی دەستکەوت لەناو پەیڕەوانیدا و لەناو هەموو مرۆڤایەتیدا، تاوای لێهات قسەی ئەویان پێشدەخست بەسەر قسەی خۆیاندا، کردەوەی ئەویان پێشدەخست بەسەر کردەوەی خۆیاندا، بۆچوونی ئەویان پێشدەخست بەسەر بۆچوونی خۆیانداو پەیڕەوییان لێدەکرد لە هەموو کاروبارێکی ژیانیاندا، کۆمەڵگەیەکی پڕ لە تەبایی و خۆشەویستییان پێکهێناو ئەخلاقی خۆشیان گەیشتە لوتکە، تاوای

لێهات بەرژەوەندیی خەڵکیان پێشخست بەسەر بەرژەوەندیی خۆیاندا، تاوای لێهات خوای پەروەردگار دەربارەیان بفەرمێت ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ، وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ الحشر٩. وایان لێهات بووبوون بەکۆمەڵێك کە خاوەنی پێگەبوون، خاوەنی بڕوابوون، بەتایبەتی خەڵکی مەدینە، ئەوانەی کە کۆمەکی مسوڵمانانیان کردو باوەشیان گرتەوە بۆ کۆچبەران و هاوبیرو بڕواکانیان و هیچ جۆرە دڵتەنگییەکیان بەرامبەریان نەبوو، تەنانەت هەموو داراییان بەشدەکرد لەگەڵ هاوبیرەکانیاندا، بەڵکو جاری واهەبوو مەبەستی ئەوانیان پێش مەبەستی خۆیان دەخست، لە حاڵێکدا کەخۆشیان پێویست و ئاتاجی ئەوەبوون.

خوای پەروەردگار دەفەرمێت ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ﴾، هەرکەسێك خوای پەروەردگار لە ڕژدیی دەروون بیپارێزێت، لە ئەنجامدا کۆمەڵێك دروستدەبێت کە دەفەرموێت: ﴿فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ الحشر٩.

بێگومان رەوشت یەکەمین پایەی ژیانی کۆمەلایەتییە، رەوشتێك کە لە سەر بنەمای بیروبڕوایەکی ڕاست دابمەزرێت، لە ئەنجامدا کۆمەڵگەیەك دروستدەکات کە ململانێی شەریف دەکەن و هیچ کەسێك پتر لە مافی خۆی ناوێت، بەڵکو تەنانەت مافی کەسانیتر دەخاتە پێش مافی خۆیەوە، ئەمەش لە حاڵەتی ئەرێنیدا کاتێك کە رەوشتی جوان زاڵبێت بەسەر کۆمەڵگەی مسوڵمان و بەسەر تاکی مسوڵماندا، بەڵام لە بەرامبەردا هەرکاتێك ئەو رەوشتە جوانە نەما، لە ڕووی ئاکارەوە

کۆمەڵگە ئەو ڕەوشتەبەرزانەی تیا نامێنێت، واتە لابدات لەو ڕاستەشەقامەی کە شەریعەتی ئیسلام دیاریکردوە، ئەوکاتە دیاردەیەك دروستدەبێت پێیدەوترێت بەدڕەفتاری یان بەدئاکاری و بەدڕەوشتی، کە دیارە دەرئەنجامی زۆر خراپی لێدەکەوێتەوە و زاناکان زۆر بەوردیی باسیانکردووە و لەناو بیردۆزی ئاکاری ئیسلامییدا بیریان لەوە کردووەتەوە بزانن سەرچاوەی هەموو ڕەوشتە خراپەکان لە چیدا خۆی دەبینێتەوە.

دیارە لەناو زانا مسوڵمانەکاندا ڕەنگە جیاوازی هەبێت کە سەرچاوەی ڕەوشتە خراپەکان بریتییبێت لە چی؟

ڕەوشتە باشەکان دیاریکراون و سەرچاوەیان بریتیین لە: (دادپەروەریو ئازایەتی و پاکداوێنیو حیکمەت)، کە پێیدەوترێت بنەمای ئەخلاقی و هەموو زاناکان لەسەری ڕێککەوتوون.

هەرکەسێك هەر ڕەوشتێکی جوانی هەبێت بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەو ڕەوشتە جوانە دەگەڕێتەوە بۆچی؟

(ئیبن قەییم[1]) کە یەکێکە لە زاناگەورەکانی ئیسلامو شاگردی ڕاستەوخۆی (شیخ ئیبن تەیمییە) بووە پێیوایە ڕەوشتە خراپەکان دەگەڕێنەوە بۆچوار ڕەوشت کە لە هەمووی خراپترن:

یەکەم: بریتییە لە نەزانین (الجهل).

دووەم: بریتییە لەستەم (الظلم).

---

[1] - ابن قيم الجوزية(١٢٩٢ ـ ١٣٥٠ز ) زانایەکی گەورەی زانستە شەرعییەکانە و خاوەنی گەلێك پەرتووکی بەنرخە.

سێیەم: بریتییە لە ئارەزوبازی (الشهوة).

چوارەم: بریتییە لە توڕەیی (الغضب).

ئەمەی لە کتێبی (مدارج السالکین)دا باسکردووە و یاسایەکی هێناوە کە دەفەرموێت: (أصول الأخلاق الذمیمة تقوم علی أربع: الجهل، والظلم، والشهوات، والغضب).

لەلایەکی دیکەوە پێشەوا (ئیبن حەزم) کە یەکێکە لە زانا گەورەکانی ئیسلام و چەند سەدەیەکیش پێش (ئیبن قەییم) بووە، پێیوایە سەرچاوەکانی ڕەوشتی خراپ، کە هەر کارێکی خراپ لەوانەوە سەرچاوە دەگرێت، چوارن: (یەکەمیان بریتییە لە ستەم و دیکتاتۆرییەت (پێش هەمووی دەخات)، دووەم: نەزانی، سێهەم: ترس و دڵـلاوازی، چوارەم: ڕژدی و پیسکەیی)، ئەو دەڵێت: (أصول المساوئ الخلقیة أربع: الجور, والجهل، والجبن، والشح)، ئەم بابەتەشی لە پەرتووکی (الاخلاق والسیر)دا باسکردووە.

بێگومان ئەگەر ئێمە بەراوردێکی ئەم دوو بیروبۆچوونە بکەین دەتوانین بڵێین هەردووکیان لەسەر دوو دانەیان ڕێککەوتون: (نەزانی، ستەم)، دوو دانەشیان لێك نزیکن و دەتوانین لێکیانبدەین، کەواتە بنەمای ڕەوشتە خراپەکان شەش دانەن گەر ئەم تیۆرە تێهەڵکێش بکەین: (نەزانی، ستەم، ئارەزوو، توڕەیی، ڕژدی، ترسنۆکی).

بۆنمونە کە باسی نەزانی دەکرێت زۆربەی ڕەوشتە خراپەکان لە نەزانییەوە سەرچاوەی گرتووە، لەبەرئەوە ئەرکی سەرشانی زانایان و ڕۆژنامەنووسو میدیاکارانە کە خەڵك وریابکەنەوە کە ڕەوشتی باش

کامەیە، چونکە ئەگەر خەڵك نەزانێت ڕەوشتی باش کامەیە هەوڵنادات بەدەستی بهێنێت، مرۆڤ بەنەزانی خۆی دوای کارێك دەکەوێت و بەلایەوە باشە، بەڵام پاشان بۆی دەردەکەوێت خراپە، مانای ئەوەیە نەزانبووە، مرۆڤ کاتێك کە درۆدەکات لە ڕاستیدا نەزانە سەبارەت بەڕاستی، کاتێك فێڵدەکات نەزانە سەبارەت بەئەمانەت.. هتد، هەموو ڕەوشتەکانیتر بەهەمان شێوەیە، لەبەرئەوە یەکەمین چارەسەر بۆ مرۆڤ فێرکردن و پەروەردەکردنە لەسەر زانست.

سەرچاوەیەکی دیکەی بەدڕەوشتی و خراپەکاری لە بیردۆزی رەوشتی ئیسلامییدا بریتییە لە ئارەزووبازی. ئەوەی کە هێزی ئارەزووبازی لە مرۆڤدا داخوازی دەکات کە مرۆڤ بەلای فێڵو غەشو سەرخۆشی و بەدڕەوشتی و داوێنپیسیدا بڕوات.

توڕەییش بەڕاستی سەرچاوە و ڕێکارێکیترە بۆ بەشێك لەو تاوانانەی کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات و دەستدرێژی دەکاتە سەر ماڵو ناموسی خەڵکی، یان هەوڵدەدات خەڵك بەدناو بکات و ناویان بزڕێنێت.

ئێمە کە ئێستا سەیری ڕۆژنامەکان و نووسینەکان بکەین، هەستدەکەین نوسەرەکانیان لە حاڵەتی توڕەییدا دەنوسن، توڕەییەکیان بۆ دروستبووە بەرانبەر یەکێك، بەرامبەر لایەنێك، لە ئەنجامی ئەو توڕەییەدا هاتوون لاپەڕەکانیان ڕەشکردووەتەوە بەجۆرەها قسەهەڵبەستن و درۆو چاوبەستکردن و ناوزڕاندن، ئەگینا ئەگەر مرۆڤ لە حاڵەتێکی تەندروستدابێت و لە وەزعێکی دەروونی لەباردابێت، هەرگیز ڕێگەبەخۆی نادات لە ڕۆژنامەیەکدا یان لە گۆڤارێکدا

یان لە کەناڵێکی تەلەفزیۆنییەوە جامی تورەیی خۆی بڕێژێت بەسەر خەڵکیدا، بیەوێت بەدناوی بکات و ناشیرینی بکات، چونکە ئەوکەسە ئەگەر دڵسۆزی بنوێنێت بۆ لایەنی بەرامبەر دەبێت بەشێوازێکیتر هەوڵی ئەو دڵسۆزییەی خۆی بنوێنێت و بەشێوازێکی دیکە چاکسازی بکات، بەشێوازێکی دیکە ڕاستییەکان باسبکات.

یەکێك لە زانا گەورەکان کە پێشەوا(لیث[1]) لە پێشەوا (موجاهید کوڕی جەبر) دەگێڕێتەوە (والشهوة والغضب مبدأ السیئات) واتە: ئارەزووبازی و تورەیی دەسپێکن بۆ خراپەکاری، کەواتە مرۆڤ ئەگەر دوای ئارەزوو بکەوێت ئارەزووەکان زۆرن. یەکێکیش لە ئارەزووەکان ئەوەیە کە مرۆڤـ بیەوێت دەربکەوێت وخۆی بسەپێنێت، بیەوێت خۆی بسەلمێنێت، ئەمە ئارەزووبازییە.

لەتورەییشدا هەستدەکات مافی پێویستی خۆی پێنەدراوە و زەمینەی گونجاوی بۆ نەڕەخساوە، پێداویستی پێنەدراوە، لە ئەنجامدا توورەدەبێت لە دۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دەوروبەر و ئامادەیە هەموو کارێك ئەنجامبدات بۆ ڕازیکردنی دەروونی خۆی.

با کەمێك بەوردی لەهەر یەك لەم سەرچاوانەی بەدڕەوشتی و بەدئاکاری بکۆڵینەوە.

---

[1] - پێشەوا (لیث بن سعد ٩٧ کۆچی - ١٧٥کۆچی) موجتەهید و بەخشندەی گەورەی میسری، پێگەیەکی تایبەتی هەبووە لە نێو زانایانی سەردەمی خۆی و پاش خۆی.

**یەکەم: نەزانی (الجهل):**

زاناکان دەڵێن: بریتییە لە کەمیی زانست، واتای ئەوەیە کارێك بکەیت بەبێ زانست و ئاگاداری و شارەزایی..

نەزانی وەك (ئیبن مەنظور)[1] لە فەرهەنگی (لسان العرب)دا ئاماژەی بۆ دەکات و دەفەرموێت: (نقیض العلم) واتە (دژی زانست)، واتە کارێك ئەنجامبدەیت، قسەیەك بکەیت، هەڵوێستێك دەرببڕیت بەبێ شارەزایی، پرسیارێکت لێبکەن بەبێ ئەوەی لە پرسیارەکە تێبگەیت، یان بەبێ ئەوەی زانیاری پێویستت لەسەر شتەکە هەبێت وەڵام بدەیتەوە، (مەولانای ڕۆمی[2]) پێیوایە سەرچاوەی هەموو خراپەکارییەك لە نەزانییەوە دێت، دەڵێت: (وەك چۆن لە شێر ڕادەکەیت، دەبێت لە کەسی نەزانیش ڕابکەیت). نەزانی ئەوە نییە کە مرۆڤ عەقڵی خاڵی بێت و نەزانێت بەرژەوەندیی لە چیدایە تا بەدوایدابچێت و ، نەزانێت بەرژەوەندیی لە چیدا نییە بۆ ئەوەی وازی لێبهێنێت، بەڵکو جاری واهەیە نەزانی وادەکات کە دژ بەزانایان بوەستێت، دژ بە دڵسۆزان

[1]– جمال الدين محمد بن المكرم، به (ابن منظور) ناسراوە، لە (٦٣٠ – ٧١٤ك) ژیاوە، لای زانایانی سەردەمی خۆی ژیاوە، لەدیوانی نوسینەوەدا کاری کردووە، دادوەری تەرابلوسی کردووە، لەدانراوەکانی (لسان العرب، سرور النفس بمدارك الحواس الخمس). تاريخ الأدب العربي، احمد الزيات، دار المعرفة، بيروت، الطبعة التاسعة، ٢٠٠٥، ٢٩٩–٣٠٠.

[2] ـ محمد بن محمد البلخی(١٢٠٧ ـ ١٢٧٣ز ) شاعیر و زانا و عاریفی گەورەی فارسی، بەرهەمە شیعرییەکانی وەرگێڕاوە بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان. لە ساڵی ٢٠٠٧ دا (بی بی سی) رایگەیاند کە پڕخوێنەرترین شاعیرە لە ئەمریکادا. بە پەرتووکی شیعریی (مثنوي) بەناوبانگە.

بوەستێت،، لووتی بەرزبێت بەرامبەر هەربانگەوازێکی چاکسازی و ڕیفۆرمخوازی.

کاتێك تەماشای سورەتی (هود) دەکەین خوای پەروەردگار لەسەر زاری پێغەمبەری خوا نوح (سەلامی خوای لێبێ) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ﴿وَيَاقَوْمِ لاأَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مَالاً إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللّهِ﴾ هود٢٩. ئەی نزیکەکانم! من کە بانگتان دەکەم بۆ لای خوا بەتەمای ماڵو سەروەت و پاداشتێك نییم کە ئێوە بمدەنێ، چونکە پاداشتی من هەر لەسەر خودایە، خودا دەتوانێت بیداتەوە، ئینجا فەرمووی: ﴿وَمَا أَنَاْ بِطَارِدِ الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّهُم مُّلاَقُو رَبِّهِمْ وَلَـكِنِّيَ أَرَاكُمْ قَوْماً تَجْهَلُونَ﴾ هود٢٩، واتە: لێرەدا حەزرەتی نوح داکۆکی دەکات لەسەر ئاکارێك و نیشانیدەدات سەرچاوەی هەموو خراپەکارییەك لەناو کۆمەڵەکەیدا بریتییە لە نەزانی، واتە بەرژەوەندیی خۆتان نازانن، لەبەرئەوە دوای بانگەوازی پێغەمبەرێك ناکەون کە داوای هیچ دەستکەوتێکتان لێناکات.

حەزرەتی(لوط)یش بەگەلەکەی دەڵێت: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاء بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ النمل٥٥. واتە: ئەو بارە ڕەوشتییە خراپەی کە گەلی (لوط) هەیانبوو، (لوط) دەیگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان نەزان بوون و نەیاندەزانی کە خەریکی چ تاوان و گوناهێکن.

کەواتە هۆکاری سەرەکی ئەوەی کە ئەوان سەرنەکەوتن و ڕاستییان وەرنەدەگرت و پەیڕەوییان لە کاری خراپ دەکرد، ئەوەبوو کە بە ڕاستی نەزان بوون، بەرژەوەندیی خۆیان نەدەزانی، لەبەرئەوە زانایانی

دەروونناسی و کۆمەڵناسییش پێیانوایە نەزانین کاریگەرترین هۆکارە بۆ لادانی مرۆڤ، چونکە یەکێك نەزانێت باشە لە کوێدایە چۆن دەچێت بۆی، یەکێك نەزانێت خراپە لە کوێدایە چۆن ناکەوێتە خراپەوە، لەبەرئەوە هەرکەسێك نەزانبێت ئەو نەزانییە زۆر کارئاسانی بۆ دەکات تا بکەوێتە ناوهەڵەوە، بەتایبەتی کە ئێمە دەزانین دەوروبەرمان پڕە لەو شتانەی کە بەڕاستی سەرنجڕاکێشن و پڕن لە ئارەزووبازی و ئەوشتانەی کە تێکدەری ئارەزووەکانی مرۆڤن.

**دووەم: سەرچاوەیەکی دیکەی تاوان، یان ڕەوشتخراپی، بریتییە لە ئارەزووبازی، کاتێك کە نەفس داوای تێرکردنی ئارەزووەکانی دەکات.**

لە ئەدەبیاتی زانامسوڵمانەکاندا، بۆ ئارەزووبازی ووشەی عەرەبی (هوی) دانراوە، لەبەرئەوە پێیدەوترێت (هوی) چونکە ئەو ئارەزووبازییە مرۆڤ تووشی هەڵدێردەکات،و لە قیامەتیشدا فرێیدەداتە ناو چالاّییەکانی دۆزەخەوە، پێشەوا (ماوەردی) لە پەرتووکی (أدب الدنیا والدین)دا باسی ئەوەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت (الهوی أصل من أصول الرذائل السلوکیة)، واتە: هەواو ئارەزووبازی ڕێگرێکە بۆ ئەنجامدان (وللعقل مضاد) دژایەتی هەیە لەگەڵ هۆش‌و ژیرییدا (لأنه ینتج من الفعل قبائحها) ئارەزووبازی ڕەوشتەخراپەکان بەرهەمدێنێت، (ویظهر من الأفعال فضائحها)، لە کاروکردەوەکاندا کامیان ناشیرینترە ئەوە نیشاندەدات، (ویجعل ستر المروءة مهتوکا، ومدخلا للشر مسلوکا)

ئارەزووبازی وادەکات پەردەی مەردایەتی و جوامێری لە مرۆڤدا بدڕێت،و ڕێبازی خراپەکاری ڕێبواری زۆربێت.

(ئیبنولجەوزی)[1] دەڵێت: ئارەزووبازی وادەکات کە مرۆڤ هەمیشە بیر لە خۆشی و چێژی ئێستابکاتەوە، بیر لە دواڕۆژو دەرئەنجامەکان نەکاتەوە، کەواتە ئەگەر مرۆڤـ بەدوای ئارەزووە خێراکاندا بڕوات، بەدوای ئەو ئارەزووانەدا بڕوات کە ئێستا لەبەردەستیدایە، هەرچەندە لە ئەنجامدا زیانی پێبگەیەنێت، ئەوا دەبنە بەربەست لە بەردەم خۆشی و چێژەکانی دواتر.

خوای پەروەردگار زۆر بە خراپی باسی ئەم سیفەتەی کردووە لە قورئانی پیرۆزدا و ستایشی ئەوکەسانەی کردووە کە پێچەوانەی ئارەزووپەرستی کاردەکەن و دەجووڵێنەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى۞ فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ النازعات٤٠ – ٤١. واتە: هەرکەسێك بترسێت لەوەی رۆژێك لەبەردەم خوای پەروەردگاریـدا دەوەستێت بۆ لێپرسینەوە و نەفسی خۆی ڕابگرێت و نەهێڵێت تووشی ئارەزووپەرستی ببێت، ﴿فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ النازعات٤١. سەرئەنجام دەگاتە بەهەشت و ماڵوئامێزی کۆتایی بریتییە لە بەهەشت.

---

[1] – ئبن جەوزی: عەبدولرەحمان کوڕی عەلی کوڕی محەممەد ئەبوفەرەج بەغدادی ساڵی لەدایکبوونی نەزانراوە، (٥٩٨ ك) مردووە، فەرمودەناسو فیقهزانی حەنبەلی بووە، بانگخوازێکی زمانپاراوو دانەرێکی بیرتیژ بووە، دانراوەکانی : المدهش، المنعش، المرعش، نزهة الفضلاء تهذيب سير أعلام النبلاء، ل١٦٣٢.

زۆرجار مرۆڤ لە ڕووی ئارەزووپەرستییەوە واز لە دادگەری و یەکسانی دەهێنێت، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلاَ تَتَّبِعُواْ الْهَوَى أَن تَعْدِلُواْ﴾ النساء١٣٥. واتە: ئارەزووبازی واتان لێنەکات کە واز لە یەکسانی و دادگەری بهێنن لە کاروباری ژیانتاندا، بەڵکو هەمیشە دەبێت پەیوەستبن بە دادگەرییەوە. زاناکان وتوویانە: (العدل أصل في كل فضيلة) دادگەری، بنەمایە بۆ هەموو کارێکی باش، (والجور أصل في كل رذيلة)، ستەمکارییش بنەمایە لە هەموو کارێکی خراپدا.

لەڕاستیدا ئارەزووبازی بنەمایە بۆ هەموو ئەو خراپییانەی کە باسمان کرد، لە چاوبڕینە ماڵ و پێداویستییەکانی خەڵکی، ئەمە هەمووی سەرچاوەکانیان پێیدەوترێت ئارەزووبازی، کە لە دەقە شەرعییەکاندا بەشێوەیەکی مەترسیدار باسی لێوەکراوە.

### سەرچاوەیەکی دیکە لە سەرچاوەکانی تاوان لە ئیسلامدا بریتییە لە (تووڕەیی لە مرۆڤ)دا:

مرۆڤـ لە سروشتیدا بونەوەرێکی تووڕەیە، تووڕەیی وەك بەشێك لە مرۆڤدا هەیە، چونکە هەندێکجار ئەو توڕەییە پێویستە بۆ بەرگریکردن لە مرۆڤـ، بۆ ئەوەی ڕێگەنەدەیت بەکەس دەستدرێژی بکاتە سەر بەرژەوەندییەکانت. (ئیبن قەییم) دەفەرموێت: (تووڕەیی چەند سنوورێکی هەیە، سنورێکی هەیە لەو سنورەدا پێوستە مرۆڤـ ئازادبێت و بتوانێت بەرگری لە خۆی بکات و خۆی لەوە بەگەورەتر بزانێت کە لەو سنورەدا تاوان ئەنجامبدات، بەڵام ئەگەر لەو سنووورە تێپەڕی، لە

سنووری ئازایەتی تێپەڕی، دەبێت بە هەڵەشەیی(تهور)، ئەگەر لەو سنورەش کەمتربێت و مرۆڤ غیرەتی نەجوولێت کاتێك یەکێك تەماع دەکاتە سەرماڵ و سامانی، ئەوە پێیدەوترێت ترسنۆکی(جبن)، ئەوەش بۆ خۆی یەکێکە لە ڕەوشتە خراپەکان).

بەڵام ئەم هێزی توڕەبوونە لە مرۆڤدا ئەگەر لە ژێر کاریگەریی ئاین و ئەخلاقدا نەبێت ئەو سنوورانەی کە هەیە نەتوانێت ڕەچاویان بکات، زیانێکی زۆری لێدەکەوێتەوە و دەبێتە هۆکاری هەندێك ئاکاری ناشیرین لە مرۆڤدا، بۆ نمونە: وای لێدێت مرۆڤ خۆی بەگەورە بزانێت و ڕقی لە خەڵك هەبێت و ئیرەیی بەخەڵك ببات و دەستدرێژی بکاتە سەرخەڵك، کاری ناشایست و نەگونجاو بەرامبەر خەڵك بنوێنێت.

لەبەرئەوە کەسێك هاتەلای پێغەمبەری خوا(د.خ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی (لاتغضب)، (تووڕەمەبە)، چەندجار هەر وتی ئامۆژگاریم بکە، دەیفەرموو: (لاتغضب) توڕەمەبە، ئینجا پێشەوا عەلی دەفەرموێت: (حد الحلم ربط النفس عند هیجان الغضب)، (عند هیجان) ئەوەیە مرۆڤ ئاگاداربێت توڕەییەکەی خۆی هەڵگرێتەوە و ئاگاداری توڕەییەکەی خۆی بێت.

بۆ ئەوەی مرۆڤ خۆی بپارێزێت لە نەزانی و ئارەزووپەرستی و تووڕەیی، دیارە هەندێك پێوەرمان هەیە کە زانا مسوڵمانەکان ئەو بابەتەشیان پشتگوێ نەخستوە و باسیانکردووە.

لێرەدا ئاماژەدەکەین بەوەی کە مرۆڤـ بتوانێت پێوەر بۆ خۆی دابنێت و بتوانێت چارەسەری نەخۆشییە ئاکارییەکانی بدۆزێتەوە، لە پێشدا بزانین ئاکاری خراپ کامەیە بۆ ئەوەی خۆی لیّ دووربخاتەوە:

**یەکەم: پێوەر پێیدەوترێت پێوەری مەنهەجی:** بریتییە لەوەی کە دەبێت ئێمە ستاندارێکمان هەبێت بەو پێوەرە بتوانین ئاکاری باش‌و خراپ لە یەکتری جیابکەینەوە، ئەو پێوەرە مەنهەجییە لە فێرستەکانی قورئانی پیرۆز و لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) دەخوێنرێتەوە و دەبینرێت:

١. ئەوەیە کە ئێمە هەولّبدەین لەو راستییەبگەین کە هەر ئاکارێك کە ئیسلام داوای کردووە ئەوە ئاکاری باشە، هەر ئاکارێکیش ئیسلام ڕێگری لێکردووە ئەوە ئاکاری خراپە، ئەوە پێوەرە مەنهەجییەکەیە، ئیسلام داوای ڕاستگۆیی کردووە کەواتە درۆ خراپە، ئیسلام داوای دەستپاکی کردووە کەواتە دزیکردن خراپە، ئیسلام ڕێیگرتووە لە ئازاردانی خەڵك، کەواتە نابێت مرۆڤـ ئازاری خەڵك بدات، ئیسلام داوای کردووە کە ڕوخۆشبین بەرامبەر بەخەڵك، کەواتە نابێت ڕوگرژبین، داوای ئەمانەتی کردووە کەواتە نابێت ناپاکی(خیانەت) بکەین..

کەواتە فەرمانەکانی قورئان داوای چی کردووە، دەبێت ئێمە خۆمان لە پێچەوانەکانی دووربخەینەوە.

**٢. له سیفەتە باشەکانیشدا لە سنور تێنەپەڕێت:**

بۆنموونە ئەگەر یەکێك زۆر سەخی بێت وای لێبێت کە زیادەمەسرەف بکات ئەمە ڕێگەی پێنەدراوە، مرۆڤ ئەگەر زۆر ئازابێت بەهەموو شتێك غیرەتی هەستێت ئەمە سیفەتێکی باش نییە دەبێت مرۆڤ خاڵی هاوسەنگی هەبێت، لەبەرئەوە پێشەوا (ماوەردی) هەر لە (أدب الدنیا والدین)دا ئاماژە بەوەدەکات کە هەر شتێك دیارە دوو سنوری هەیە، سنووری لای کەمی، لەگەڵ سنووری ئەوپەڕی، ئەگەر لە سنوورەکەی تێپەڕی ئەوە دەبێتە دووڕویی، ئەگەر لەملاشەوە تێپەڕی پێیدەوترێت ماستاوچییەتی (تملق)، کەواتە مرۆڤ نابێت ماستاوچییەتی بکات و ناشبێت نیفاقی هەبێت، کەواتە پێوەری مەنهەجی ئەوەیە کە ئێمە دەبێت سەیری ژیانی پێغەمبەر بکەین (درودی خوای لەسەر)، بەتایبەتی لەو پەرتووکانەوە کە زۆر ورد باسی ژیانی ڕۆژانەی ئەو پێغەمبەرە دەکەن وەك پەرتووکی (زاد المعاد) شێخ (ئیبن قەییم) یاخود کتێبی (إحیاء ْعلوم الدین)ی پێشەوا (غەزالی)، شوێنی ژیانی پێغەمبەر بکەوین بەبێ زیادوکەم، چونکە پێغەمبەری خوا لە ڕەفتاردا پێوەرە بۆ ئێمە، باشترین ڕەفتاری لە خۆیدا بەرجەستەکردووە، خوای پەروەردگاریش لەبارەیەوە دەفەرموێت:﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ القلم٤. خۆیشی فەرمانی پێدەکات دەفەرموێت: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ الحشر٧. خۆیشی لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت (من عمل عملا لیس علیه أمرنا فهو رد).

**پێوەری دووەم: بریتییە لە پێوەری ڕەوشتیی:**

پێوەری ڕەوشتیی ئەوەیە کە مرۆڤ هەوڵبدات ئەو سیفەتانە لە خۆیدا بەرجەستە بکات کە لە ناو خەڵکدا بەئاکاری باش ناسراوە، واتە ئەو ڕەوشتانە لە خۆیدا بەرجەستە بکات کە شانازی پێببەخشێت و لە ڕەوشتە شەرمهاوەرەکان بەدوور بێت، پێوەرە رەوشتییەکان لەوەدا خۆی دەبینێتەوە مرۆڤ هەرکارێکی باشی کرد هەوڵبدات نیازی پاکبێت، واتە ئەمە بابەتێکە کە زۆر گرنگیی پێدراوە لە فەرمودەکانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر)، لە لای زانا مسوڵمانەکان، واتە دەبێت ئەم نیەتجوانییە بۆ خۆنواندن نەبێت، بۆ ئەوە نەبێت کە بڵێن کەسێکی زۆرباشە، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) (أول الناس يقضى عليه يوم القيامة رجل يستشهد فأتي به فعرف نعمه فعرفها قال ماعرفت فيها؟ قال قاتلت فيك حتى استشهدت. قال كذبت، ولكنك قاتلت لأن يقال جريء)، ئەمە فەرمودەیەکی زۆر دووورودرێژە کە لە صەحیحی موسلیمدا گێڕدراوەتەوە کە کەسێك گیانی بەختکردووە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت چیتکردووە، دەڵێت من شەڕم کردووە هەتا شەهید بم، خوای پەروەردگار پێیدەفەرموێت درۆت کرد، بۆ ئەوە شەڕت کرد کە پێتبڵێن ئازایە، کەواتە هیچ پاداشتێکی قیامەتیت نییە، (ثم أمر به فسحب على وجهه حتى ألقي في النار)، واتە هەرکەسێك مەبەستێکی لە کاری باش ئەوەبێت کە لە دونیادا باسبکرێت لە ڕاستیدا لە یاسای رەوشتیی ئیسلامییدا حسابێکی ئەوتۆی بۆ ناکرێت، کەواتە بۆ ئەوەی ئێمە رەوشتمان جوانبێت پێویستمان بەم دوو پێوەرە هەیە.

پێوەرێکی مەنهەجی، ئەوەیە کە کاربکەین لەسەر کارو ژیانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر).

پێوەرێکی دیکە ئەوەیە کە ئەو کارانەی کە دەیکەین تەنها لەبەر خوابێت نەك لەبەر خاتری تیشکی کامێراو دونیابێت.

ئەمەش زۆرگرنگە، چونکە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێت (إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل امرئ مانوى)، واتە: هەمووکارێك بەپێی نیەت و مەبەستەکەی هەڵدەسەنگێندرێت، پاکی و کامڵییەکەی بەپێی نیەتەکەیەتی، لەبەرئەوە دەبێت هەمیشە ئاگامان لەو دوو پێوەرە بێت...

# تیۆری ئاكارو ڕەوشتی ئیسلامی

لەبابەتی پێشوودا باسی سەرچاوەكانی ئاكاری خراپ و لادانی خراپمان كرد، لەم باسەدا باسی لادانی ڕەفتاریی دەكەین (انحرافات السلوك)، تا بزانین لە چوارچێوەی هـزری ئیسلامییدا دەكەوێتە ئەستۆی كێ، چونكە هەركاتێك هەستمانكرد بەوەی لە كۆمەڵگەدا كەسێك یان كۆمەڵێك تووشی لادان بوون، ئەمە چەندە هەڵەی ئەو خەڵكانەیە بەو ئەندازەیەش هەڵەی ئەو كەسانەیە كە بەرپرسیاریی ئەخلاقی ئەو كۆمەڵگەیەیان لە ئەستۆدایە، كەواتە نابێت ئێمە بێین بەرپرسیارێتی لادانە ڕەوشتییەكان بخەینە ئەستۆی لایەنێك، چەند لایەنێك هەن لە كۆمەڵگەدا كە لە ڕوانگەی هـزری ئیسلامییەوە بەرپرسن لە لادان و پێویستە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بكرێت، كاتێك كە هەستكرا كەسێك تووشی لادان و هەڵدێران بووە، بەپێیئەوەی كە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت (كلكم راع و مسؤول عن رعيته)، واتە: هەركام لە ئێوە چاودێرن، وەك شوان كە چاودێرە بەسەر مەڕومالاتەكەیەوە، بەرپرسیشە لەو كەسانەی كە ئەم، چاودێرییان دەكات. (الإمام راع ومسؤول عن رعيته، والرجل راع في أهله ومسؤول عن رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها ومسؤولة عن رعيتها، والخادم راع في مال سيده ومسؤول عن رعيته). هەموو زانایانی حەدیس تێكڕا

یەکدەنگن لەسەرئەوەی کە ئەم فەرمودەیە فەرمودەیەکە لە ڕووی ماناو سەنەدەوە پشتی پێدەبەسترێت. هەندێك کەس ڕەنگە ئەم فەرمودەیە خراپ لێکبدەنەوە و بڵێن: بۆ دەبێت مرۆڤ حسابی شوان (راعی)یان بۆ بکرێت؟ کەواتە ئەو خەڵکە کە لە ژێر دەستیاندان حسابی مەڕوماڵاتیان بۆ دەکرێت!

بەڕاستی ئەمە تێنەگەیشتنە لە فەرمودەکە، چونکە ئەم فەرمودەیە باسی چاودێریکردن دەکات، لەبەرئەوە ئەوناوەیان ناوە لە شوان چونکە چاودێری دەکات، کەواتە هیچ نەنگییەکی تیادانییە کەسێك چاودێر بێت بەسەریەوە، چونکە چاودێریکردن مانای گرنگیپێدانی ئەو چاودێرەیە بەوکەسەی کە چاودێریی دەکات، بەپێی ئەم فەرموودەیە پێش هەمووشتێك فێری ئەوەبین هەر تاکێك لە ئێمە واتە یەکەمین کەس کە دەکەوێتە ژێر بەرپرسیارێتییەوە ئەوتاکە خۆیەتی، هەموو مرۆڤێك بەحوکمی ئەو عەقڵو ژیری و ئاوەزو توانا مەعریفی و ئاکارییەی کە هەیەتی، هێندەی ئەوەی لەسەر شانە کە پرسیاری لێبکرێت، چونکە پێش هەموو کەسێك مرۆڤ بۆ خۆی لێپرسراوە لە هەڵسوکەوتی خۆی، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿کل نفس بما کسبت رهینة﴾ المدثر ٣٨. هەر مرۆڤێك بارمتەی کارو ئەنجامدراوی دەستی خۆیەتی، هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ﴾ الزلزلة٧. واتە: هەکەسێك هەرکارێکی باش ئەنجامبدات لە ڕاستیدا بۆ خۆی ئەنجامەکەی دەبینێت و بۆ خۆی بەرپرسە لێی، کەواتە هەموو

کردەوەیەك کە مرۆڤ دەیکات پێش هەموو کەسێك خۆت بەرپرسیت لێی.

کەواتە مرۆڤـ نابێت بەهانە بهێنێتەوە بۆ لادانەکانی خۆی و بڵێت: من بەدەست خۆم نەبووە. بەڵێ، کاریگەری کۆمەڵگە و دەوروبەر لەسەر مرۆڤ هەیە، ناتوانێت کاری ئەوەبکەین کە مرۆڤ تاوانبارە بەهەندێك بنەماو یاساو ڕێسای کۆمەڵایەتی، بەڵام لە پێش یاساو ڕێسای کۆمەڵایەتی مرۆڤـ کە خاوەنی ویست و ئیجتهادو خاوەنی ویست و خواست بوو بۆ خۆی دەتوانێت بڕیاربدات، تەنانەت ئەگەر کۆمەڵگە بەپێچەوانەی بڕیارەکانی بوەستێت، ئەم مرۆڤ دەتەوانێت لەسەر بڕیاری خۆی شێلگیربێت و کەسێك بێت خاوەنی تەصمیمو خاوەنی ئیرادەبێت، چونکە خوای پەروەردگار مرۆڤی ڕەها نەکردووە بەوشێوەیەی کە هیچ شتێکی لەباردا نەبێت، خۆی دەفەرموێت ﴿و هديناه النجدين﴾ الشمس٨. واتە مرۆڤ لەگەڵ ئەوەدا کە لە ناو کۆمەڵگەدا ڕەنگە بکەوێتە ژێر کاریگەری زۆر فاکتەر و بابەتی کاریگەر لە ژیانیدا، بەڵام بۆ خۆی دەبێت بزانێت ڕێگەی باش کامەیە و ڕێگەی خراپ کامەیە، خوای پەروەردگار لە سروشتی مرۆڤدا ئەو هێزو ووزەیەی زۆر داڕشتووە، خراپە لە باشە جیابکاتەوە و ڕێگەی ڕاست لە ڕێگەی چەوت جیابکاتەوە، پێشەوا (شەوکانی[1]) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (عرفها وأفهمها ما لها وما فيها من الحسن والقبح). دیارە

[1]- محمد بن علي الصنعاني( ١٧٥٩ ـ ١٨٣٩ز ) زانای گەورەی یەمەنو جیهانی ئیسلام، گەلێك پەرتووکی لەبوارە جیاوازەکاندا بەجێهێشتووە، بەتایبەت لەتەفسیرو فەرموودەدا.

ئیمامی شەوکانی خاوەنی تەفسیرێکی گرنگە بەناوی (فتح القدیر)و یەکێکە لەو تەفسیرانەی کۆی بیروبۆچونی موفەسیرانی پێش خۆی تیادا ڕوونکردوەتەوە هەم لایەنی گێڕانەوەی فەرموودەی تیادا بەهێزەو هەم لایەنی عەقڵی تیایدا بەهێزە، دەفەرموێت: (خوای پەروەردگار مرۆڤی فێری ئەوە کردووە کەچی پێویستە بیکات و ئەوەی کە باشەیەو خراپەیە بەمرۆڤی ناساندووە)، کەواتە مرۆڤ لێپرسراوە بۆ خۆی، مرۆڤ جیاوازی لەگەڵ بێگیان و گیاندارانیتر ئەوەیە کە بۆ خۆی دەتوانێت چاکەو خراپە لە یەکتری جیابکاتەوە، لەبەرئەوە مافی خۆیەتی کە لێپرسراوبێت بەرامبەر هەرکردەوەیەك کە ئەنجامی دەدات وەك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: (لاتزول قدما عبد یوم القیامة حتی یسأل عن عمره فیم أفناه، وعن علمه فما فعل، وعن ماله من أین اکتسبه وفیم أنفقه، وعن جسمه فیم أبلاه)، واتە: مرۆڤ لە ڕۆژی قیامەتدا لە شوێنی خۆی ناگوازرێتەوە بۆ شوێنێکیتر هەتا پرسیاری ئەم شتە گرنگانەی لێنەکرێت: پرسیار دەکرێت: تەمەنی خۆی لە چیدا بەسەربردووە؟ ئەو زانستەی کە هەیبووە چی پێکردووە؟ ئەو سامانەی کە بەدەستیهێناوە چۆنی بەدەستهێناوە و سەرفکردووە؟ هەروەها ئەو لەشەی کە خوا پێیداوە لە چیدا کۆنی کردووە و لە چیدا بەسەریبـردووە؟

کەواتە مرۆڤ بۆ خۆی لێپرسراوە و یەکەمین لێپرسراویەتی لە هەر لادانێکی ڕەفتاریی، دەکەوێتە سەر ئەستۆی مرۆڤ خۆی، باشترین

بەڵگەش کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووەتەڕوو ئەوەیە کاتێك خوای پەروەردگار باسی خێزانی فیرعەونمان بۆ دەکات کە لە ژینگەیەکدا بووە بەهەموو شێوەیەك پێچەوانەی ژینگەی باوەڕو پێچەوانەی ژینگەی کاری چاك بووە، لە ژینگەی کاری خراپدا بووە، خوای پەروەردگار باسی ئەوەدەکات کە ئەم ئافرەتە چۆن ئیرادەی بەهێزبووە و توانیویەتی باش‌و خراپ جیابکاتەوە، لەبەرئەوە ئاوابەپێداهەڵدان و بەپەسەندییەوە باسیدەکات و دەفەرموێت: ﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِّلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَةَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ التحريم١١. کەواتە ئەوەنابێت بەبەڵگە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان یەکێك تووشی لادان هات بڵێین دەستی خۆمی تێدانەبوو، ئەوەتا ئافرەتێك لە ماڵی فیرعەوندا گەورەدەبێت، لەناو خێزانی فیرعەوندا هاوسەری فیرعەونە، بەڵام چونکە خاوەنی ئیرادەیە خۆی بەبەرپرس دەزانێت و تووشی لادان نابێت، بەڵکو دەپاڕێتەوە و دەڵێت خوایە لای خۆت خانوویەکم بۆ دروستبکە لە بەهەشتداو ڕزگارم بکە لە فیرعەون و کارو کردەوەکانی فیرعەون و بیشمپارێزە لە کەسانی ستەمگەر. کەواتە بەرپرسییارێتی ڕووبەڕووی ئەو کەسە بکەینەوە تووشی لادان بووەتەوە، بڵێین ئایا ژیریت نەبوو؟ لە ڕاستیدا لە هزری ئیسلامییدا لێپرسراویی پێش هەمووشتێك لێپرسراوێتی تاکییە.

**دووەم لێپرسراوی دەکەوێتە ئەستۆی خێزان:**

پێناسەی خێزان لە لایەن بیرمەندانی مسوڵمانەوە بەوجۆرە کراوە کە کاتێك دەوترێت خێزان، بریتییە لەو چەند کەسەی کە پەیوەندییەکی خێزانیی لە نێوانیاندایە، ئەم پێناسەیە ژێرخانێکی فیکریی لە پشتەوەیە.

ئەمڕۆ خێزانە مسوڵمانەکان دووچاری زۆر گیروگرفت و کۆسپ و تەگەرەی هـزری و بڕوایی و ڕەوشتی دەبنەوە بەتایبەتی کە ئێستا باسی جهانگیری دەکرێت، باسی ئەوەدەکرێت هیچ جۆرە جیاوازییەکی ڕەوشتی و ئاینی لە نێوان مرۆڤەکاندا نەمێنێت، ئەمە وای کردووە کە خێزانەکان لە جاران پتـر ئەرکی بەرپرسیارێتییان بگرنەئەستۆ، چونکە ئێستا دەزانین زۆر لەو لادانانەی کە تووشی لاوان و گەنجانمان دەبێت لەودیوی سنورەکانەوە بۆیان دێت، بەشێکی پەیوەندیی بەناخی خۆیانەوە هەیە کە لە ناخەوە خاوەنی ئەو ئیرادەو ویست و خواستەبەهێزە نەبن. لەلایەکیتریشەوە چەندین میدیا، کار لەسەر ئەم بابەتە دەکەن و گەلێك شەپۆلی جیاوازی کاریگەر دێتە نێو ماڵەکانەوە، لەبەرئەوە تەماشادەکەین خێزانی مسوڵمان گۆڕانکارییەکی زۆر ڕووی تێکردووە، چ ئافرەتان چ منداڵ یان لاوان، هەرکامێکیان بەشێوەیەك لە شێوەکان بوون بەماشێنێك لەناو ئەم کارخانە گەورەیەی دونیادا، کەواتە دەبێت خێزان بەشێك لەو لێپرسراوێتییە بگرێتەئەستۆ، کاتێك کە بینی یەکێك لە ئەندامەکانی یان تاکێك لە تاکەکانی تووشی لادان بووە، چونکە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) هەر لەو فەرمودەیەی کە

باسمانکرد دەفەرموێت: (والرجل راع في أهله وهو مسؤول عن رعيته)، واتە باوك لێپرسراوی یەکەمە لە ناو خێزاندا شانبەشانی دایك، (والمرأة مسؤولة عن مال زوجها ومسؤولة عن رعيتها)، کەواتە لە هەموو خێزانێکدا دوو چاودێر هەیە بەسەر تاکەکانیانەوە، کەواتە دەبێت ئاگامان لەوەبێت کە چاودێرەکان بۆخۆشیان چاودێر هەیە بەسەر ڕەوشت و ئاکاری تاکەکانی ئەو، کەواتە دەبێت ئاگامان لەوەبێت دەبێت چاودێرەکان بۆخۆیشیان لە ڕاستیدا ئەوەندە لە ڕووی پەروەردەیی‌و لە ڕووی ڕەوشتی و ئاکارییەوە پەروەردەکرابن و ئامادەکرابن و بەهێزکرابن، ئەو بەرگری‌و توانای بەرگرییەیان لە ناودا هەبێت کە بتوانن ڕێگری بکەن لە هەموو ئەو دەردە کوشندانەی کە ڕووبەڕووی خێزان دەبێتەوە.

دیارە خێزان وەك فێرگەیەکی بچوك وایە بۆ مرۆڤ، دوای لێپرسراوێتی تاك گرنگیی لێپرسراویەتی خێزان لە ئارادایە، چونکە خێزان ئەو شوێنە سروشتییەیە کە مرۆڤی تێدا گەورە دەبێت، لاوانی تێدا ئۆقرە دەگرن، لەبەرئەوە هەموو خێزانێك پێویستە سومبولێکی هەبێت، کەسێك بێت ئامۆژگاری باشیان بکات و فێری پەندی باشیان بکات، فێری ژیانیان بکات، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ التحريم٦. ئەمەش دیسان جەختدەکاتەوە سەر بەرپرسیارێتی خێزان، واتە: ئەی بڕواداران خۆتان و کەس‌وکارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سووتەمەنییەکەی بریتییە لە مرۆڤ و لە بەرد.

(ئیبن عەبباس[1]) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (اعملوا بطاعة الله واتقوا الله وامروا أهلكم بذكر ينجيكم الله من النار).

عەلی کوڕی ئەبوطالیب دەفەرموێت: (أي: علمهم وأدبهم).

کەواتە پاراستنی خۆت یان پاراستنی کەس وکارت بەدوو ڕێگایە:

یەکەم: فێربوونی زانست.

دووەم: فێربوونی ئاکاری پەسەند.

ڕەوشتیش تەنها لە لایەنێك لە لایەنەکان کورتناکرێتەوە، کە ڕەنگە لای هەندێك کەس تەنها لایەنی جنسی بگرێتەوە لە مرۆڤدا، بەڵام لە ڕاستیدا لایەنی قسەکردن و هەڵس وکەوتکردن، لایەنی ئەمانەت، دەستپاکی، دڵپاکی، داوێنپاکی، دەمپاکی...هتد دەگرێتەوە، هەموو ئەو ئاکارانەی کە مرۆڤ حەز بە بینینی دەکات وەك ئەوەی ڕاگرتنی خاڵی هاوسەنگی لە نێوان خۆت و خەڵکدا، لەبەرئەوە سەلەفی صاڵحی ئوممەت زۆر بەگرنگییەوە تەماشای ئەم لایەنەیان کردووە و پێیانوابووە پەروەردەی خێزان گەورەترین پایەی پەروەردەی مرۆڤە، لەبەرئەوە بۆ خۆشیان جوانترین نمونەیان پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە لەوبارەیەوە.

(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) کاتێك دەبیستێت کوڕەکەی مستیلەیەك دەکڕێت بەهەزار درهەم، نامەیەکی بۆ دەنوسێت و دەڵێت: کوڕم! بیستوومە کە تۆ مستیلەیەکت کڕیوە بەهەزار درهەم، پێمباشە

---

[1] ـ عبدالله بن عباس بن عبدالمطلب(٦١٩ ـ ٦٨٧ز ) ئامۆزا و یاری پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر)، زانای گەورە لەشەریعەتی ئیسلام و قورئان و فەرموودەدا.

کە بیفرۆشیت و پارەکەی بدەیت بەهەزار هەژار و لە بریتی ئەوە برۆ مستیلەیەکی ئاسن بکڕەو ئەم دروشمەی لەسەر بنوسە: (رحم الله امرأ عرف قدر نفسه). ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز تەنانەت لە شتێکی زۆر لاوەکیداو لە دۆخێکی زۆر لاوەکیدا دەستێوەردانی کردووە و نەیویستوە منداڵەکەی لەسەر خۆشگوزەرانی بەوشێوەیە بژی کە خەڵکی برسیی لە بیربچێت.

ئەمڕۆ لە جیهاندا بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش لەناو تاکەکاندا بەتایبەتی لەناو گەنجەکاندا بازرگانانی مەرگ خەریکی بڵاو کردنەوەی مادده هۆشبەرەکانن، لە یەکێك لە توێژینەوە مەیدانییەکاندا دەرکەوتوە کە لە (٣٨,٢٪)ی ئەو کەسانەی کە توشی ماددەی هۆشبەر دەبن ئەوانەن کە لە تەمەنێکی زۆر منداڵییەوە تەماعیان تێدەکرێت، واتە لە تەمەنی خوار ٢٠ساڵەوەن، چونکە لەم تەمەنەدا مرۆڤـ زۆر دەکەوێتە بەر کاریگەریی ئارەزووبازی، لەم کاتەشدا دەبێت خێزانەکان زۆر بەتەنگی منداڵەکانیانەوەبن، کەواتە بەشێك لە لێپرسراویەتی ئەو لادانە ئەخلاقی و ڕەوشتییەی کە لە ناو خەڵکدا هەیە دەکەوێتە ئەستۆی خێزانەکان، کە بینیمان خێزانەکان کەمتەرخەمن لەو بوارانەداو گرنگی نادەن بەپەروەردەکردنی منداڵەکانیان و بەرەڵایان دەکەن و دەبنە ئامانجێك بۆ هەموو ئەو شەپۆلە ڕاگەیاندنانەی کە لە دەرەوە بۆماندێت، دەبینین بێگومان ڕێژەی لادان لە ناو گەنجەکانماندا زۆردەبێت، لادانی ئەخلاقی و بڕوایی و فیکریی زۆرتر دەبێت، لەبەرئەوە بەڕاستی بەشێك لە لێپرسراوێتی لادانی ڕەفتاریی دەکەوێتە ئەستۆی خێزان، نابێت هەموو

شتەكان بخەینە سەرشانی منداڵەكان، لەم بارەیەوە ئامارگەلێكی زۆر هەیەو ئێمەش لێرەدا بوارمان نییە ئەو ئامارانە دەستنیشان بكەین، بەڵام پوختەی ئامارەكان هەمان ئەو ئەنجامە دەگەیەنن كە باسمانكرد.

### سێیەم: بەشێكی گەورە لە ئەركی لێپرسراوی لادانەكە دەكەوێتە ئەستۆی كۆمەڵگە:

تازەترین تیۆرەكانی ئاكار، بۆچوونی وایە كە كۆمەڵگە پشكێكی زۆری هەیە لەسەر ڕەنگرێژكردنی ڕەفتارو ئەخلاقی مرۆڤ، لەبەرئەوە تەماشادەكەین لە قورئانی پیرۆزدا و لە هـزری ئیسلامییدا گرنگییەكی زۆردراوە بە بوونی گەل بەو تایبەتمەندییانەی كە لە قورئانی پیرۆزدا دیاریكراوە بۆ نەتەوەی ئیسلامی كاتێك خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ آل عمران١١٠. واتە: نەتەوەی ئیسلام لەوڕووەوە باشترین نەتەوەیە كە بە گوفتار و ڕەوشتیان بانگەوازدەكەن و فەرماندەكەن بەچاكەكردن و ڕێگری دەكەن لە هەموو كارێكی خراپ، كەواتە نەتەوە كاتێك نەتەوەیە بتوانێت ڕۆڵی هەبێت لە ڕەوتی ژیانی مرۆڤایەتییداو ئەوتایبەتمەندییەتە هەمیشە بەزیندوویی لە خۆیدا بهێڵێتەوە، ئەگینا ئەگەر ئەم تایبەتمەندییە لە ناو نەتەوەدا نەمێنێت تاكەكانی باوەڕیان بەوەهەبێت هەركەس تەنها بۆ سوودی خۆی كاربكات، باوەڕیان بەوە هەبێت كە (چیمانە بەسەر خەڵكیترەوە)، یاخود پێیانوابێت (هەركەسێك دەچێتەقەبری خۆیەوە)و (هەمووكەس ئازادە تەنانەت

هەرکارێك دەیکات بیکات، هەر قسەیەك دەکات بیکات). لە ڕاستیدا بەم چەمکە سەقەتە زیانێکی زۆر بەکۆی جەستەی کۆمەڵایەتی و کۆی جەستەی نەتەوە دەگەیەنێت، دەگێڕنەوە کە پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب لە یەکێك لە حەجەکانیدا تەماشای کرد خەڵك وازیانهێناوە خەریکن واز لە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە دەکەن، ئەم ئایەتەی خوێندەوە بەسەریاندا فەرمووی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ آل عمران١١٠، بەخۆڕایی ئەم نەتەوە ئەو وەسفەی پێنەدراوە کە باشترین نەتەوەیە، لەبەرئەوە فەرمووی: (من سره أن يكون من هذه الأمة فليؤدِّ شرط الله فيها، ومن لم تتصف بذلك أشبه أهل الكتاب الذين ذمهم الله)، چونکە لە ڕاستیدا خاوەنـپەرتووکەکان لەبەرئەوە توشی لادان بوون ﴿كانوا لايتناهون عن منكر فعلوه﴾ ، وەك قورئان باسیان دەکات ئەهلی کیتاب ڕێگرییان نەدەکرد لەو کارەخراپانەی دەکران و نەیاندەوت ئەو خراپەیە مەکەن، لەبەرئەوە مەرجی باشی ئەم نەتەوەیە ئەوەیە کە ئەرکی فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە جێبەجێ بکرێت، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ آل عمران١٠٤. واتە: ئەمەی کردووە بەفەرمانێك کە هەمیشە دەبێت لەناو نەتەوەی ئیسلامدا کۆمەڵێك هەبن کە خاوەن زانستبن و چاکسازیخواز بن و خەڵکی بانگ بکەن بۆ چاکەکردن و فەرمان بەچاکە و ڕێگری بکەن لە خراپە، بەڵام دیارە لەناو کۆمەڵگەدا ڕەنگە زۆر شت بەدڵی ئێمە نەبێت، زۆرجار کە

کارێکی خراپ ڕوودەدات ڕەنگە توانای ئەوەمان نەبێت بەدەست گۆڕانکاری تیادابکەین، واتە بەکردەوە بیگۆڕین، ئەوکاتە دەبێت بەزمان بیگۆڕین، لە ڕێگەی میدیاکانەوە بیگۆڕین، لە ڕێگەی وتارەوە، لە ڕێگەی نوسینەوە، لە ڕێگەی سمینارەوە بیگۆڕین، ئەگەر ئەوەشمان پێنەکرا و بوارمان نەبوو، دەبێت بەدڵ لە ناخەوە پێماننناخۆشبێت و بەگژی ئەو دیاردە خراپانەدا بچینەوە.

بێگومان بەرپرسیارێتی کۆمەڵگە تەنها لەوەدا کورتناکرێتەوە کە ڕێگری بکرێت لە کارەخراپەکان، بەڵکو پێوستە کۆمەڵگە بەدوای ڕەگوڕیشەی خراپەکارییدا بگەڕێت بۆ ئەوەی هەموو خراپەکارییەك لە ڕەگوڕیشەوە چارەسەربکرێت، کەواتە یەکێك لە گرنگترین و درەوشاوەترین سیمای کۆمەڵگەی ئیسلامی ئەوەیە کە بە دوای ڕەگوڕیشەی گەندەڵیدا دەگەڕێت، لەبەرئەوە لە ئیسلامدا ئەوەندە گرنگی دراوە بەچاکەکاری، چونکە ئەگەر مسوڵمان هەوڵی ئەوەبدات بگات بەپلەی چاکە، دەبێت بەهەموو شێوەیەك بنەڕەتیترین و ڕیشەییترین هۆکاری خراپەکاری کە بریتییە لە هەژاریی و نەداریی، چارەسەر بکات.

لەبەرئەوە تەماشادەکەین خوای پەروەردگار ئەم بابەتەی زۆر بەگرنگی وەرگرتووە کاتێك کە دەفەرموێت: ﴿لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾ آل عمران٩٢. واتە: ئێوە ناتوانن بگەنە پلەی چاکەکاری، ئەو پلەیەی کە هەموو کەسێکی بڕوادار هەوڵی بۆ دەدات، تا وەهاتان لێنەیەت لەو شتانە ببەخشن کە

لاتان خۆشەویستە، چونکە هەر شتێك کە ئێوە خۆشتان بوێت و بیبەخشن مانای پلەی باوەڕێکی بەهێزە بەئێمە، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار دیسان دەفەرموێت: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ اللّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾ آل عمران٩٢. لە ناو یارانی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر) ئەبوتەڵحەی ئەنصاری کاتێك کە ئەم ئایەتەی بیست، پاشان لەناو سامانەکانیدا چ سامانێکی لە هەمووی زیاتر خۆشدەویست، ئەوەی بەخشی لە پێناو خوادا، کاتێك ئەمەی باسکرد بۆ پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) زۆر خۆشحاڵ بوو بەم کارە، وەك (پێشەوا بوخاری) لە فەرمودەی (٤٥٥٤)دا بۆمانی دەگێڕێتەوە.

### چوارەم: لێپرسراوێتی دەوڵەت:

هیچ کۆمەڵگەیەك بەبێ بوونی سیستەمێکی حوکمڕانی ناتوانێت بوونی هەبێت، دەوڵەت و سیستەمی حوکمڕانیش پێویستی بەسەرپەرشتیار و سەرۆکێك هەیە کە فەرمانی خودا جێبەجێ بکات، چونکە ئەگەر فەرمان و دەستوری خودایی جێبەجێ نەکات ناتوانێت ئەو مافانەی کە خوای پەروەردگار دیاری کردوون بۆ مرۆڤەکان دابینی بکات و بیانچەسپێنێت، گرنگترین ئەرکی سەرشانی دەستەڵاتدار لە ڕوانگەی هـزری ئیسلامییەوە نەهێشتنی خراپەکارییو ڕێگرتنە لە دووبارەبوونەوەیان و هەوڵدانە بۆ چارەسەرکردنیان. دیارە دەستەڵاتدار لە ڕوانگەی هـزری ئیسلامییەوە لە ناو کۆمەڵگەدا دوو دەستەڵاتدارە

(دەستەڵاتی سیاسی، دەستەڵاتی هـزری)، دەستەڵاتی سیاسی بەدەست سیاسەتمەدارانە و دەستەڵاتی فیکری بەدەست زانایانە.

که دەڵێین سیاسەتمەداران، هەموو دەزگاکانی دەوڵەت دەگرێتەوە.

دەستەڵاتی هـزرییش هەموو زانایان و مامۆستایانی زانکۆو پەروەردە و مامۆستایانی خوێندنی باڵاو ئەوانیتر دەگرێتەوە...هتد.

له هەموو ئەم حاڵەتانەدا دەبێت بیری ئەوەمان هەبێت که فەرموودەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) چ ئەرك و بەرپرسیارێتییەکی خستە سەرشانمان که فەرمووی (کلکم راع وکلکم مسؤول عن رعیته، الإمام راع وهومسؤول عن رعیته).

تەنانەت پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر) له فەرموودەیەکیتردا دەفەرموێت (مامن عبد یسترعیه الله رعیة ویموت وهو غاش لرعیته إلا حرم الله علیه الجنة)، واتە: هەرکەسێك خوای پەروەردگار بیکات بەسەرپەرشتیاری کۆمەڵێك و ناپاکییان لێبکات و لەو چاودێرییەدا خێری ئەوانی نەوێت و چاکەیان بۆ بەدینەهێنێت و هەوڵی چاکەکارییان نەدات، خوای پەروەردگار بەهەشتی لیٚ قەدەغە دەکات.

لەفەرمودەیەکیتردا پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت (مامن أمیر یلي أمر المسلمین ثم لا یجهد لهم وینصح، لم یدخل معهم الجنة)، دەفەرموێت: هەرکەسێك ببێت به فەرمانڕەوای مسوڵمانان بەڵام هەوڵنەدات بۆیان و تێنەکۆشێت بۆیان و دڵسۆزییان

نەبێت و ئامۆژگارییان نەکات، ئەوە لەگەڵ ئەوان نابێت، واتە ئەوان بچنە بەهەشت ئەم ناچێتە بەهەشت.

گرنگترین کارێك کە دەبێت دەوڵەت بیکات بۆ ئەوەی لادانی ڕەوشتی و ئاکاری لە ناو تاکەکاندا ڕوونەدات، ئەوەیە کە پارێزگاری لە ئیسلام بکات وەك ئەو بنەما ڕۆشن و ئاشکرایانەی کە ئوممەتی ئیسلام کۆدەنگییان لەسەری هەیە، واتە: دەبێت هەمیشە بیکات بەستراتیژێك لە کاری خۆیدا، چ دەستەڵاتداری سیاسی بێت چ هـزری، هەمیشە هەوڵبدات ئەو ڕوانگە ڕاست و دروستەی کە ئاین هەیەتی و زانایانی مسوڵمان لەسەری ڕێککەوتوون ئەوە بەخەڵکی نیشانبدات و ڕێگە بەوەش نەدات بەناوی ئیسلامەوە بیروبۆچوونی چەوت بڵاوبکەنەوە.

**دووەم:** دەبێت دەوڵەت لە هەرشوێنێکدا هەستیکرد کە گیروگرفت و کێشە هەیە لە ناو خەڵکدا دەبێت هەوڵی چارەسەری ئەو کێشەیە بدات، ئەو کێشەیەش ڕەنگە کێشەیەکی سیاسی بێت یان کۆمەڵایەتی یان رەوشتی و کەلتوری بێت. نابێت وەك بینەر سەیری بابەتەکە بکەن.

**سێیەم:** پاراستنی سنوورەکانی دەوڵەت، بۆ ئەوەی خەڵك دڵنیابن لە ژیان و ماڵو لە ناموس‌و پێداویستییەکانی خۆیان.

**چوارەم:** جێبەجێکردنی یاسا بۆ ئەوەی خەڵك تووشی حەرام نەبێت، بۆ ئەوەی مافەکانی خەڵك بپارێزرێت.

پێنجەم: ڕێکخستنی ماڵی مسوڵمانان، واتە ڕێکخستنی ماڵی گشتی، ڕێگرتن لە بەهەدەردانی سامانی سروشتی، کە ئەمە کارێکی زۆر گرنگە

هەم دەبێت دەستەڵاتدارانی سیاسی کاری بۆ بکەن، هەم دەبێت دەستەڵاتدارانی هـزریی کاری بۆ بکەن.

واتە ئەگەر لە ڕاستیدا دەستەڵات هەستێت بەو ئەرکانەی کە بیرمەندانی مسوڵمان بەتایبەتی کەسێکی وەك (ماوەردی) لە (الأحكام السلطانية)دا دەستنیشانی کردوون، بەم شێوەیە لادانی ڕەوشتی لەناو خەڵکدا کەمدەبێتەوە، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەست بکەین سەنگەرێکمان دروستکردووە بۆ پاراستنی هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگە، تا تووشی لادان و گەندەڵی نەبن.

کەواتە دەوڵەت ئەرکی سەرشانیەتی هەموو دامودەزگاکان بسپێرێت بەکەسانی شایستەو لێهاتوو، بەڵکو (شیخ ئیبن تەیمییە) دەقێکی هەیە لە کتێبی (السياسة الشرعية)دا دەفەرموێت: (ويجب على الدولة ممثلة في حاكمها ألا توكل الأمور إلا إلى الأكفاء، فإن الخلق عبادالله.....) خەڵك بەندەی خوان، دەستەڵاتداران فەرمانبەرن لە لایەن خواوە بەسەر بەندەکانەوە، (وهم وكلاء عبادي على أنفسهم) ئەوان نوێنەری بەندەکانن لەسەر خۆیان وەك چۆن دوو شەریك هەریەك نوێنەری یەکدی دەکەن، (ففيهم معنى الولاية والوكالة ثم الولي والوكيل متى استناب في أموره رجلا وترك من هو أصلح للتجارة أو العقار، من باع سلعة بثمن وهو يجد من يشتريها بخير من ذلك، فقد خان صاحبه). کەواتە وەك چۆن هاوەڵ بۆی نییە خیانەت بکات لە شەریکەکەی، بەهەمانشێوە دەستەڵاتدار بۆی نییە خیانەت بکات لە گەلەکەی، لەو کەسانەی کە

هەڵیانبژاردووە و کردویانە بەنوێنەری خۆیان، هەرکاتێکیش وەهای کرد، ئەوکاتە پێویستە لاببرێت و دووربخرێتەوە.

کەواتە دەوڵەت بۆ خۆی لێپرسراوە لە زۆرێك لەو لادانانەی کە دەستەویەخەی لاوان و ڕۆڵەکانی کۆمەڵگە دەبێتەوە.

بۆ چارەسەرکردنی هەموو لادانێکی ڕەوشتی، دەبێت هەموو توێژەکانی کۆمەڵگە دەستبدەن بەدەستی یەکترییەوە و هەوڵبدەن بۆ دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشەی لادانەکان. دەوڵەتیش هەموو ڕێگایەك تەرخانبکات و کۆمەڵگەو خێزان بێنە مەیدان، ئینجا تاکەکەس بۆ خۆی ئەوەندە خاوەنی بڕیارو بڕشت بێت کە بتوانێت زاڵ بێت بەسەر تەنگو چەڵەمەکانیدا...